ئیسماعیل بێشکچی

# کوردستان
# کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی



وەرگێڕانی
حەمە ڕەشید

پێشەکی
شاهۆ سەعید

ئیسماعیل بێشکچی

# کوردستان
# کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی

وەرگێڕانی
**حەمە ڕەشید**

پێشەکی
**شاهۆ سەعید**

سلێمانی \ ٢٠٠٢

**پێشکەشە بە ( شەوبۆ )**

**ناوی کتێب:** کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی

**ناوی نووسەر:** ئیسماعیل بێشکچی

**ناوی وەرگێڕ:** حەمە ڕەشید

**بابەت:** لێکۆڵینەوەی سیاسی

**دەرهێنانی هونەری :** سەیران عەبدولرەحمان

**هەڵەچن:** هەوار شەریف

**تیراژ:** ٦٠٠ دانە

**ژمارەی سپاردن :** ٣٠٩ ی ٢٠٠٢

**زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٨٣)**

**www.sardam.org**

# پێشەکی

## بێشکچی لە نێوان ئاکاری زانستی و ئاکاری مرۆییدا

ئایا ئیسماعیل بێشکچی نموونەی زانستخوازێکی گەورەیە یان مرۆڤدۆستێکی گەورە، یان نموونەی هەردوکیانە پێکەوە؟ بەڵام ئایا جیاوازییەك لە نێوان زانستخوازی و مرۆڤدۆستیدا هەیە؟ داخۆ دەبێ هاوڕای ئەو کەسانە بین کە پێیان وایە زانین شتێکە مرۆڤ لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی بەرهەمی دێنێ، یان هاوڕای کەسانێك بین کە پێیان وایە خێرخوازی و زانستخوازی دوو دیوی یەك گەوهەرن؟!

ئەم پرسیارانە لە سەردەمی سۆفیستەکان و سۆکراتەوە هەمیشە دووبارە دەبنەوە، هەرچی سۆفیستەکان بوون پێیان وابوو مەعریفە شتێکە مرۆڤ بۆ تێرکردنی پێداویستیەکانی بەرهەمی دێنێ و بە جیاوازی بەرژەوەندیی مرۆڤەکان حوکمی مەعریفی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگۆڕێ، بەڵام سۆکرات و هاوڕێکانی پێیان وابوو مەعریفە زادەی ئاستە قووڵەکانی ویژدانی مرۆڤایەتییەو تاوەکو مرۆڤ زیاتر لە مەعریفە نزیك بکەوێتەوە دەبێتە خاوەنی ئاکاری جوانتر هەڵوێستی ویژدانی گەورەتر.

مێژووی بیست و پێنج سەدەی ڕابردوو نموونەی چەندین بیریار و ڕۆشنبیری پێشکەشکردووین کە زۆربەیان کوڕی سەردەمی خۆیان و زادەی پێداویستی قۆناغی مێژویی خۆیان بوون، زۆربەشیان لە نێوان پێوەری زانستی و ئاکاری ویژدانیدا قوربانییان بە یەکێکیان داوە. بەڵام لە بەردەم پیاوێکی وەك ئیسماعیل بێشکچیدا دەبێ بە سەرلەبەری دیدو تێڕوانینەکانی خۆماندا بچینەوە و سەرلەنوێ بپرسینەوە: ئایا کام ئەنگێزە بێشکچی هاندەدا بە جورئەتێکی هێندە گەورەوە ڕازی نەبێت سازش

لەسـەر هیـچ تـێزێکی خـۆی بکـا لـەو تێزانـەی کـە بـە گوێـرەی دەسـتوری تورکیـاو ئایدیولۆجیـای ڕەسمـی ئـەو وڵاتـە لـە خانـەی حـەرام و خیانـەتی نیشـتمانیدایەو خاوەنەکەی ڕاپێچی زینـدان و قورسـترین سـزای یاسـایی دەکا؟ ئـەنگێزەی زانسـتی یـان ئـــەنگێزەی ئـــەخلاقی؟ یـــان هـــەردووکیان پێکـــەوە کـــە دەشـــێ نـــاوی بنێـــین (ئەخلاقی زانستی)؟!

بەڵام ئایا ئەو ئەخلاقە زانستییەی هەموو زانکۆکانی جیـهان بانگەشـەی بـۆ دەکـەن چەند ئەکادیمیـیەکی وەك بێشکچی بەرهەمهێناوە؟ یان بەلانی کەمەوە چەند جار ئـەو (خاوەن ئەخلاقە زانستیانە!) بۆ بەرگریکردن لە کەسێکی وەك ئیسماعیل بێشکچی، کە زیندانـی دەکـرێ و ئەشـکەنجە دەدرێ، یـان کەسـێکی وەك نەسـر حـامد ئـەبو زەیـد کـە تەکفیر دەکرێ و لە ژنەکەی جیادەکرێتەوە، هاتوونەتە دەنگ؟

واتە ئەخلاقی زانستییش، وەك ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، دروشمێك نیە، قسەیەك نیە بوترێ و دووبارە بکرێتەوە، بەڵکو هەڵوێستێکە لـە ژیـان و نوسـیندا پـراکتیـس دەکـرێ. واتە وەك چۆن مرۆڤی ڕاستگۆ لە ژیانی کۆمەڵایـەتیدا پابـەندی ئەخلاقێکـە لـە ڕێگـای هەڵوێستی ڕۆژانەیەوە پراکتێسـی دەکـا، بـە هـەمان شـێوە ڕاسـتگۆیی ئـەخلاقی زانسـتی بەندە بە ڕەنگدانەوەی ئەو ئەخلاقەوە لەناو نوسیندا. بەڵام کێشەیەك کە ڕووبـەڕووی زانسـتە مرۆییـەکان دەبێتـەوە لـە زۆربـەی زانکۆکـانی جیـهاندا، بـە تایبـەتی لـەو وڵاتـە تۆتالیتارانەی کە دەسەڵات تیایدا خـاوەنی ئایدیۆلۆجیـای ڕەسمییـە، ئـەخلاقی زانسـتی زۆرجـــار وەك دروشمێکـــی ســـواو بـــەکاردەبرێ. و بـــە کـــردەوە دەچێتـــە خزمـــەتی ئایدیۆلۆجیـای ڕەسمییـەوە، یـان زۆر جـار ئـەخلاقی زانسـتی بـە جۆرێـك دەچێتـــە هاوپـــەیمانی لەگـــەڵ ئـــەخلاقی کولتووریـــی بـــاوەدا کـــە زانکـــۆ خـــۆی لـــە هـــەموو ڕووبەڕووبوونەوەیـەکی کردەیـی بـە دوور دەگـرێ و دەبێتـە درێژکـراوەی سیسـتمی خوێندنی حوجرەیی و پاساو هێنانەوە بۆ دەسەڵاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگا.

بێشـکچی لـە کتێبـی (کوردسـتان کۆلۆنییـەکی نێودەوڵـەتی) هەسـت بـەم قەیرانـە ترسناکەی ئەخلاقی زانستی دەکا لە وڵاتێکـی وەك تورکیـا، بـە ئاشـکرا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکا کـە ڕۆڵـی مامۆسـتایانی زانکـۆ و زۆربـەی ڕۆشـنبیرانی تـورك زیـاتر لـە ڕۆڵـی ئـەو

ئەفسەرانەی سوپا یان ئەو سیخوڕانەی دەزگا ڕەسمییەکان دەچن بۆ شاردنەوەو شێواندنی ڕاستیەکان و خزمەتی ئەو ئایدیۆلۆجیا ڕەسمییەی دەوڵەت دەکەن کە وەك ئەرکێکی سەربازی بۆیان دیاری کراوەو دەبێ بێ یەك و دوو جێبەجێی بکەن. ئەمەش بەر لەوەی قەیرانێکی ئەخلاقیی-مرۆیی بێت قەیرانێکی زانستییە کە باخەکەی زانکۆکان و خوێندکاران و نێوەندە ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانیەکان دەیدەن کە دەسبەرداری پەیامی ڕاستەقینەی خۆیان بوون و بە ناوی پەردەهەڵماڵین لەسەر ڕاستیەکان زیاتر پەردەپۆشیان دەکەن و دەیانشێوێنن.

کاتێك بێشکچی دەربارەی حەقیقەتی کورد و کۆیلایەتی کورد لە تورکیاو پارچەکانی کوردستان بە گشتی دەدوێ، کاتێك پەنجە بۆ بابەتێکی هێندە هەستیار و نامۆ بە ئەدەبیاتی تورك درێژ دەکا، هەرگیز بە نەغمەی شاعیرێك یاخود کەسێکی ڕۆمانسی نایەتە قسە، پەنا بۆ ئەو دەستەواژەو ڕستانە نابا کە هەستی بەرامبەر دەوروژێنن، بەڵکو وەك سۆسیولۆجستێکی ئەکادیمیك و وەك ئەوەی باس لە حەقیقەتێکی زانستی حاشاهەڵنەگر بکا قسەدەکا. واتە هەرگیز هەڵوێست بە بەرامبەرەکەی نافرۆشێتەوە بەوەی کە ئەو مرۆڤێکی بە ویژدان و دەگمەنە، تەنانەت کاتێك باس لەو جەللادە کوردانە دەکا کە لە زیندانەکاندا ئەشکەنجەی خودیی بێشکچی-یان داوە بە تۆمەتی ئەوەی باسی حەقیقەتی کوردبوونی کردووە، هیچ بوغزێکی خۆی بەرامبەری ڕەفتاری ئەو جەللادە کوردانە تۆمار ناکاو باس لەوە ناکا کە بە زەلکاوی نۆکەریدا ڕۆچوون.. بەڵکو وەك قوربانی گەلێك تەماشایان دەکا کە لە ئەنجامی چەوساندنەوەی درێژخایەنی میللەتەکەیاندا دووچاری تێکشکانی دەروونی هاتوون و ئیدی شەڕانگێزی و هەستکردن بە غەدر لە ناخیاندا چەکەرەی کردووە.

بێشکچی کە تورکێکی ڕەسەنی خەڵکی (چۆروم)ە، بە جۆرێك دەربارەی کورد دەنوسێ وەك ئەوەی ماوەیەك لە پێستی نەتەوەکەی خۆی هاتبێتە دەرو بووبێتە کورد و هەموو ئەو ئازار و مەینەتیانەی چەشتبێت، کە خۆمان -وەك کورد- هێندە لە ئاستیدا خۆشە بووین دەشێ هەستی پێنەکەین. بێشکچی لە غەفڵەتێکی ترسناك و خەونێکی قووڵ بێدارمان دەکاتەوە، ئاوێنەیەکمان دەداتە دەست و پێمانەڵێ بڕواننە

خۆتان ئــەو مرۆڤگەلـەی کـە لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی بیسـتەمدا لـە دژوارتریـن دۆخـی کۆیلایـەتیدا دەژیـن. بـەوەش دوو دیــوی دژ بەیــەکی نەتــەوەی تورکمــان نیشــان دەدا، دیوێکی تاریك کە ئەفسەرەکان و شۆڤێنیەکان نوێنەرایەتی دەکەن، دیوێکـی ڕووناکیش کە ڕۆشنبیری وەك بێشکچی بەرهەم دێنێ.

بێشکچی وەك نووسەرێکی ئازادیخوا کە هەمیشە دژی داگیرکـاری و بـە کۆیلـەکردنی مرۆڤـە لـە هـەر گۆشـەو سـووچێکی دنیـادا بێـت، جیـاوازی لــە نێــوان دوو جــۆر کۆلۆنیالیزمدا دەکا: یەکێکیان زادەی هەڵپەی وڵاتە پیشەسـازییە سـەرمایەداریەکانە لـە پێنــاو دۆزینــەوەی بــازاڕی نــوێ بــۆ کــاڵا بازرگــانی و بەرهەمــە پیشەســازیەکانیان و دەستگەیشــتنیان بــە ســەرچاوەکانی وزەو مــادە خامــەکان لــە جیــهاندا؛ ئــەم جــۆرە کۆلۆنیالیزمـە دوو قۆنـاغی سـەرەکی پیـادە دەکـا: یەکـەمیان داگیرکـاری ڕاسـتەوخۆ لـە ڕێگای سوپاوە، دووەمیان داگیرکاری ناڕاسـتەوخۆ لـە ڕێگـای پاشکەشـێ و بووژاندنـەوەی ئـابوریی وڵاتـە کۆلۆنیـەکان تـاوەکو مـادە خامــەکانیان بــە نرخێکـی کـەم لێبکـڕێ و سـەرچاوە پیشەسـازییەکانیان بـە نرخێکـی گـران پـێ بفرۆشـێ، ئـەو مامەڵەیـەی کـە ئـەمریکاو خۆرئـاوا بـە گشـتی لەگـەڵ وڵاتـە پۆسـت کۆلۆنیـەکانی دنیـای خۆرهـەڵات ئـەنجامی دەدەن. بـە بـڕوای بێشـکچی هەرچـەندە مەبەسـتی ئـەم جـۆرە کۆلۆنیالیزمـە هەڵپەو قازانجی ئابورییە بە پلەی یەکەم، بەڵام دیوێکی پۆزەتیڤیشی هەیە کە بریتییە لە گەشەی ئابوریی وڵاتە کۆلۆنیالەکان و کرانەوەیان بەسەر جیهانی دەرەوەدا.

بەڵام جۆری دووەمی کۆلۆنیالیزم، کە ترسناکترین و بەدترین جۆری کۆلۆنیالیزمـە، بریتییـە لـەو داگیرکارییـەی کـە لــە پێنـاو خـودی داگیرکـاری و سـڕینەوەی ئێتنــی و کولتووریدایـە، خـاوەنی هیـچ غایـەتێکی ئـابوری، بازرگـانی، پیشەسـازی نیــە جگـە لـە غایـەتی بـە کۆیلــەکردنی بەرامبــەر و تێکشـکاندنی کیبریـائی مرۆیــی و کولتــووری و نەتەوەیی. واتە لایەنی کۆلۆنیالیست هـەرگیز هـەوڵنادا ئـابووریی وڵاتـە داگیرکراوەکـان ببوژێنێتەوە بەڵکو کار بۆ داتەپاندنی زیـاتری بـاری ئـابوری و شارسـتانییان دەکـا تـاکو نەیانپەرژێتـە سـەر بیرکردنــەوە لـە ناسـنامەو حەقیقـەتی خۆیـان و لـەتاو هـەژاری نۆکەرایـەتی قبـووڵ بکـەن و لـە بـری شـەڕی داگیرکـەر شـەڕی یـەکتری بکـەن. بێشـکچی

سیاسەتی ئەم جۆرە کۆڵۆنیالیزمە ناودەنێ سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە"، واتە پەرتیان بکە ئیدی بە ئاسانی بەسەریاندا زاڵ دەبیت، چونکە بۆ مانەوەی سەروەریی لایەنی داگیرکەر دەبێ کۆیلە بندەستەکان هەست بە ناسنامەی هاوبەشی نێوان خۆیان نەکەن و هەمیشە سەرقاڵی بوغز گۆڕینەوە و شەڕی یەکتربن. ئەو سیاسەتەی بە شێوەیەکی جەهەنەمی لە دژی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا پێڕەو کراوە.

بەڵام ئەم نارەزاییەی بێشکچی بۆ هەموو جۆرەکانی ئیمپریالیزم و کۆڵۆنیالیزمی جیهانی و نا وچەیی و لە پێش هەمووشیانەوە داگیرکەرانی کورد، ئەوە ڕەتناکاتەوە کە ڕەخنەیەکی توندیش ئاراستەی وەهمەکانی بزوتنەوەی چەپ لە جیهانی خۆرهەڵات و تورکیا بە تایبەتی بکا، کە بە ئاگابن یان بێئاگا، بە ناوی دژایەتیکردنی ئیمپریالیزمەوە کار بۆ بەهێزکردنی دەکەن بە تایبەتی لە نیشتمانێکی وەك کوردستاندا، چونکە بزوتنەوەی چەپی تورکیا هەمیشە بە ناوی دژایەتیکردنی شۆڤێنیزم و سەرمایەداری و نادادپەروەریی ئابورییەوە ڕێگەی بە کورد نەداوە بیر لە حەقیقەتی کوردبوونی خۆی بکاتەوە و لە پاڵ چەوساندنەوەی ئابووریدا هەست بە چەوساندنەوەی نەتەوەییش بکا، بە جۆرێك ئەو قەناعەتە لای بەشێکی زۆری چەپە کوردەکانیش دروستبووە بەوەی قسەکردن لە جیاوازی نەتەوەیی دەچێتەوە خزمەتی سەرمایەداری و دژی خەباتی بزوتنەوەی چەپ و پرۆلیتارە. لە کاتێکدا جیاوازی نێوان تورك و کورد تەنها جیاوازییەکی ئێتنی پەتی نیە، بەڵکو جیاوازییەکی ئابووریشە، چونکە لە سایەی ئەو جیاوازییەدا ئابووری زۆر بە ناڕێکیی دابەشکراوە و بەشی هەرە زۆر بۆ نەتەوەی سەردەست بووەو بەشێکی کەمیش بۆ نەتەوەی ژێردەست بووە، کە لە ڕووی نەتەوەیی و ئابووریشەوە وەك هاوڵاتیانی پلە دوو ئەژمارکراون، بەڵام ئەمە ئەو حەقیقەتەیە کە زۆربەی چەپەکان نایسەلمێنن.

بێشکچی ئەم حاڵەتە بە جۆرێك لە جۆرەکان گرێدەداتەوە بە بەکارهێنانی لە مێژینەی ئاینی ئیسلام لە لایەن نەتەوە سەردەستەکانەوە، بە تایبەتی لە لایەن عوسمانیەکانەوە، وەك ستراتیجێك بۆ لەیادبردنەوەی جیاوازیی ئێتنی نەتەوە ژێردەستەکان، ئەو ستراتیجەی کە کورد کلۆڵترین قوربانیی بووە لە سایەیدا. چونکە

هەروەك چۆن دروشمی هاوخەباتی نێوان چینی پرۆلیتاری هـەموو نەتـەوەکانی جیـهان کراوەتە ئامرازی لـە یادبردنـەوەی هەسـتی نەتەوایـەتی لای کـورد کـە دواجـار چۆتـەوە خزمـەتی نەتـەوە سەردەسـتەکان، بـە هـەمان شـێوە دروشمـی برایـەتی موسـڵمانان وەك ئامرازێك بەکارهاتووە لە لایەن نەتەوە سەردەستەکانی وەك عەرەب و تورك و فارسەوە بـۆ لـە بـەینبردنی هەسـتکردن بـە جیـاوازی نەتـەوەیی لای کـورد و دواجـار بـۆ بەعەرەبکردن، یان بە تورککردن، یان بە فارسکردنی کورد.. لـە کـاتێکدا کـورد هـەرگیز ئـەو پرسـیارەی لـە خـۆی نـەکردووە: باشـە ئەگـەر باڵادەسـتی زمـانی عـەرەبی پەیوەندییەکی بە ئاینەوە هەبێت، ئەی بە زۆر سەپاندنی زمـانی فارسـی یـان تورکـی چ پەیوەندییەکی بە برایەتی نێوان موسڵمانانەوە هەیە.

لە تەك ئەم دوو ستراتیجە دەسەڵاتخوازەی داگیرکەرانی کورد، کە یـەکێکیان کـوردی بە هاوخەباتی بەرەی چـەپ و یـەکێکیان بـە هاوخـەباتی گـەلانی موسـڵمان لـە قەڵـەمی داوە، بەرەی سێهەم بەری شۆڤێنیەکانە کە نکوڵییان لە بوونـی نەتەوەیـەك کـردووە بـە ناوی کوردەوە، بەڵکو بە بەشێك لە نەتـەوەی سەردەسـت لـە قەڵـەمیان داوە. سـتراتیجی ئەم بەرەیەش ئەوە بووە کە هەروەکو چەپخواز و ئیسلامیخوازەکان بە کوردیـان وتـووە هەقە ئێوە شانازی بە خۆتانەوە بکەن، چونکە ئێوە بەشـێکن لـە میللـەتی سەردەسـت و جیاوازییەك لە ئارادا نیە، بەمەش هەر سێ بەرەکە چوونەتەوە خزمەتی یەك ستراتیج بەڵام بە سێ میکانیزمی جیـاواز کـە دواجـار لـە خزمـەتی بـە کۆیلـەکردن و گێلکردنـی کورد و سەروەرکردن و باڵادەستکردنی نەتەوە سەردەستەکاندا بووە.

لە پاڵ ئەم سێ ستراتیجەدا، کە وەك سێ ئایدۆلۆجیای دەسـەڵاتخوازی بـەکارهاتووە، لەسەر زەمینی واقعیش سیاسەتی پاکتاوکردنی ئێتنی و کوشـتن و وێرانکـاری و چـەکی کۆکوژ بەکارهاتووە، واتـە پرۆسـە سـەربازیەکان لـە دژی کـورد دیـوی کردەیـی ئـەو سـێ سـتراتیجەن. بۆیـە بێشکچی لـە سـێ شـوێنی جیـاوازدا سـێ پرسـیاری جـوان ئاراسـتەی هەرسێ بەرەکە دەکا بەمجۆرە:

بەرەی یەکەم/ بەرەی چەپەکان: ئەگەر خەباتی کورد بەشێکە لـە خـەباتی میللەتـە چەوسـاوەکانی جیـهان لـە ڕووی ئابوورییـەوە دژی ئیمپریـالیزم و سـەرمایەداری.. باشـە

بۆچی چەپەکان لە وڵاتێکی وەك تورکیا بۆ نموونە، نقەیان لێنەهات کاتێ ئەو هەموو ماڵوێرانی و کاولکارییە بەسەر هاوخەباتە چەپەکانیان لە کوردستان هات؟ یان بۆچی وڵاتێکی وەك یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو نارەزایی بەرامبەر بە بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ دژی کورد ڕانەگەیاند؟

بەرەی دووەم/ بەرەی ئیسلامیخوازەکان: ئەگەر کورد بەشێك بێت لە ئومەتی ئیسلام و مێژوویەکی هاوبەشی لەگەڵ موسڵمانانی جیهانی ئیسلامیدا هەبێ.. باشە بۆچی وڵاتە ئیسلامی و بزوتنەوە ئیسلامیەکان هیچ نارەزاییەکیان بەرامبەر بە کۆمەڵکوشتنی برا موسڵمانەکانیان نیشاننەدا لە پارچەکانی کوردستان؟ تەنانەت بێشکچی نموونەیەکی جوان دێنێتەوە و دەڵێ: چوار ڕۆژ دوای کیمیابارانکردنی هەڵەبجە سەرجەم وڵاتە ئیسلامیەکان کۆنگرەی خۆیان بەست زۆر بابەتی جۆراوجۆریان تاووتوێ کرد، بەڵام لە دوور و نزیك باسیان لە کوشتنی پێنج هەزار موسڵمان نەکرد لە هەڵەبجە. ئەڵبەتە زۆربەی بزوتنە ئۆپۆزیسیۆنەکانی ئیسلامی سیاسیش ئەم ستراتیجە پێڕەو دەکەن کاتێ بزوتنەوەی کوردی بە بیدعەیەکی خۆرئاوایی لە قەڵەم دەدەن بۆ پەرتکردنی ڕێزەکانی ئومەتی ئیسلام.

بەرەی سێهەم/ بەرەی شۆڤێنیەکان: ئەوانەی نکوڵی لە میللەتێك دەکەن بە ناوی کوردەوە و بە بەشێك لە تورك یان عەرەب یان فارس لە قەڵەمیان دەدەن، بە تایبەتی لە وڵاتێکی وەك تورکیا کە کورد بە تورکە کێوییەکان ناودەبرێ. بەڵام بێشکچی پرسیارێك دەکاو دەڵێ: باشە ئەگەر کورد تورك بێت بۆچی جیاوازی دەکرێ لە نێوان تورکێکی ئەستەمبوڵ و تورکێکی دیاربەکردا؟ بۆچی پرۆژەی ئابوری و خزمەت گوزاری گەورەو زەبەلاح لە خۆرئاوای تورکیادا بنیاتدەنرێ، کەچی تورکەکانی باشوری خۆرهەڵات لە زۆربەی پرۆژە خزمەتگوزاری و ئابوریەکان بێبەشن؟ چما هەموویان تورك نین؟ دواتر بێشکچی بە تەوسەوە بە مانایەکی لەمجۆرە پرسیاریان لێدەکا: ئەگەر کورد تورك بێت ئەی بۆچی نارەزاییتان لە ئاست کوشتنی پێنج هەزار تورك لە هەڵەبجە نیشان نەدا کاتێ لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە بە غازی کیمیایی خنکێنران، لە

کاتێکدا بەرامبەر هەر ڕەفتارێکی خراپی بولگاریا بەرامبەر تورکەکانی ئەو وڵاتە گەورەترین نارەزایی دەردەبڕن؟!

بێشکچی بە درێژیی لەسەر پێکهاتەو بنیاتی کۆمەڵگای کوردی دەوەستێ و باس لە فاکتەرە خودی و بابەتیەکان دەکا لە پرۆسەی بە کۆیلەکردنیکورد-دا، بە وردی لەسەر ئەو دۆخە سایکۆلۆجییە نێرڤسییە دەوەستێ کە تاکەکانی کۆمەڵگای کوردی تووشی هاتوون و پێی وایە قەدەغەکردنی زمان و کولتوور لەسەر ئاستی دەروونی وەك قرتاندنی زمان وایە لەسەر ئاستی جەستەیی. هەروەکو چۆن کەسی زمان بڕاو تووشی پەشێوییەکی دەروو نی ئەوتۆ دەبێ کە ناتوانێ تەعبیر لە خۆی بکا، دەروونی کوردیش لەسەر ئاستی تاکەکان و کۆمەڵگا تووشی وێرانبوونێکی ترسناك بووەو کوردەکان هاوسەنگی دەروونی و سروشت و متمانەیان بە خۆیان لە دەستداوەو ڤێز لە بوونی خۆیان دەکەن. هەر ئەمەشە وا لە کورد دەکا لە کاتی جاشایەتی و نۆکەرایەتیدا گوێڕایەڵی بۆ داگیرکەر بەرێتە ئاستی پەرستنی داگیرکەر و زۆر دڵڕەقانە مامەڵە لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆی بکا. ئەم دۆخە لە لایەکەوە زادەی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە"یە کە داگیرکەرانی کورد پێڕەویان کردووە، لە لایەکی تریشەوە زادەی کولتوور و پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردییە، کە کۆمەڵگایەکە لەسەر بنەمایەکی خێڵەکی بەرتەسك دامەزراوە و هەمیشە هاوپەیمانیی دەرەکی لە هاوپەیمانی ناوەکی پێباشترە.

سەرەڕای ئەو بەرگرییە سەرسەختەی بێشکچی لە حەقیقەتی کوردبوون و مەسەلەی کورد، بەڵام دواجار ئەو ڕۆشنبیرێکی ئەکادیمیەو بە شێوەیەکی بابەتی ڕەخنە لە پێکهاتەو بنیاتی ئەقڵیی کوردیش دەگرێ، لە وەهمێك بێدارمان دەکاتەوە کە ڕەنگە زۆربەمان تێی کەوتبین بەوەی "کورد میللەتێکی ئازایە". بێشکچی ئەو ئەفسانە لە بنەوە هەڵدەتەکێنێ و ڕەگەزەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە، پێی وایە ئازایەتی کورد هەمیشە دژی کورد بووە، پەیوەندیی بە تۆڵە سەندنەوەی خێڵەکی و مەسەلەی شەرەف و شەڕی نێوان بنەماڵەکانەوە بووە، بەڵام هەر ئەو کوردانەی کە لەسەر مەسەلەی ناموسپەرستی گەورەترین شەڕ لە نێو خۆیاندا بەرپادەکەن، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو غەیرە کوردانەی کە خاکیان داگیردەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر شەرەفی

خێزانـەكانیان بێدەنـگ و ملكـەچن. هـەروەها داگیركـەرانی كـورد هەمیشـە "ئازایـەتی كـورد"یـان وەك گەمەیـەك بـەكارهێناوە بـۆ پاكتـاوكردنی شـەڕەكانی خۆیـان لەگـەڵ نـەیارەكانیان، بـۆ نمونـە زۆرجـار داگیركـەرانی كـورد شـەڕی میللـەتانی تریـان بـە كـورد كردووە، لە سەردەمی جەنگی ئیمپراتۆریا ئاینیەكاندا كـە هەمیشـە عـەرەب یـان تـورك یـان فـارس سـەركردایەتییان كـردووە، كـورد لـە ڕیـزی پێشـەوەی سـوپای ئـەو ئیمپراتۆریانەدا بووە، تەنانەت لە سەردەمی تازەشدا كەمالیەكانی توركیا كە خۆیـان لـە بنـەڕەتدا عـەلمانی بـوون شـەڕی یۆنانیـەكان و ئەرمەنـەكانیان بـە كـورد كـردووە گوایـا كوشتنی ئەوانە غەزایە. بەمجۆرە ئەفسانەی "ئازایەتی كورد" هەمیشـە وەك چـەكێكی دووفاق لەلایەن داگیركەرانی كوردەوە بەكارهاتووە لە لایەكی بـۆ هەڵخەڵـەتاندنی كورد لە لایەكی تریشەوە بۆ لێدانی ئەو میللەتانەی لەگـەڵ داگیركـەرانی كـورد-دا لـە كێشـەدا بوون. لە سەردەمی زۆر تازەشدا هەمان چەك بەكارهاتووە بەڵام بە جۆرێكی دیكـە، بـە تایبـەتی لـە چوارچێـوەی هاوئاهـەنگیی پەنـهانی نێـوان هـەردوو حكومـەتی ئـەمریكاو توركیـا بـۆ لاوازكردنـی هەسـتی نەتەوایـەتی لای كـورد، بـەوەی حكومـەتی ئـەمریكا ئامۆژگاریی توركیای كـردووە كـە پشـتگیری بڵاوبوونـەوەی ئیسـلامی سیاسـی بكـا لـەناو كورد-دا تـاوەكو بـیر لـە مەسـەلەی نەتەوایـەتی و جیـاوازی ئێتنـی نەكەنـەوە، ئەمـە لـە كـاتێكدا توركیـا خـۆی حكومـەتێكی عەلمانییـەو لـە ناوچـە توركنشـینەكاندا دوژمنایەتییەكی سەرسەختی ئیسلامی سیاسی دەكا.

بەمجۆرە بێشكچی دەریدەخا كە كورد قوربانیی دەستی پیلانێكە هەموو چەكـەكانی تێدا بـەكارهاتووە هـەر لـە چـەكی كولتـووری و خێڵەكییـەوە، بـۆ چـەكی چـەپخوازی و ئیسلامی خـوازی، تـاوەكو چـەكی كۆلۆنیـالیزمی ناوچـەپی و ئیمپریـالیزمی ئـەمریكی. لەمبارەیەوە لە شوێنێكدا دەڵێ "ناتوانین بە هیـچ شـێوەیەك گوزارشـت لـە تراجیدیـای كـورد بكـەین"، تراجیدیـای میللەتێكـە دوژمنـەكانی لەمپـەڕی چەپـەوە بـۆ ئەوپـەڕی ڕاست، لەمپەڕی جیهانەوە بۆ ئەوپەڕی جیهان، تەنها لە دژایـەتیكردنی ئـەودا دەبنـەوە بـە دۆسـت و هاوپـەیمان. واتـە ئەگـەر دوژمنـەكانی كـورد لـە هیـچ شـتێكدا كۆك نـەبن لەسەر یەك شت كۆكن، ئەویش داگیركردنی كوردستان و بە كۆیلەكردنی كوردە.

له بەرامبەر ئەو داگیرکارییە ڕاستەوخۆیەدا بێشکچی باس لە داگیرکاری ڕۆحیش دەکا، کە ترسناکترین نموونەی بریتییە لە هەوڵدان بۆ سڕینەوەی یادەوەریی کورد و زمانی دایك و کولتووری میللی و هونەری کوردی. ئاماژە بۆ تەتریکی هونەری کوردی دەکا لە ڕێگای دەرهێنانی وشەی کوردی لە گۆرانیە میللیەکان و دانانی وشەی تورکی لە بیریان، یان لە ڕێگای جیاکردنەوەی منداڵ لە دایکی و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی وێنەی دایك و زمانی دایك لە یادەوەریی منداڵداو دروستکردنی قوتابخانەی زۆرەملێ کە مانەوەی قوتابی تیایدا ئیجبارییەو تەنها وەك سەرباز چەند مانگ جارێك دەبێ مۆڵەت وەربگرێ.

ئیدی ئەو کوردەی نکوڵی لە ڕەچەڵەکی ڕاستەقینەی خۆی بکاو تەسلیم بەو دۆخە ببێ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژیانی ئاسا یی دەبێتەوە و دەتوانێ ببێتە فەرمانبەر و وەرزشکار و مامۆستاو گۆرانیبێژ و هاوڵاتی. بەڵام هەرگیز ناتوانی ببێتە "مرۆڤ" چونکە یەکەمین پەیوەندیی مرۆڤ بە حەقیقەتی مرۆڤبوونی خۆیەوە لە ڕێگای زمانی دایکییەوەیەتی.

بێشکچی کە لە دەرەوەی بنیاتی کوردییەوە تەماشای تراجیدیای کورد دەکا، هەندێ جار وەك پزیشکێك پەنجە دەخاتە سەر هەندێ شوێنی نەخۆشیەکانمان کە خۆمان نایانبینین یان نامانەوێ بیانبینین، تەنانەت هەندێ جار وەك گریمانە تورك دەخاتە جێگای کوردو باس لە تراجیدیای تورك دەکا تاوەکو سەرنجی خوێنەری تورك بۆ لای تراجیدیـ ای کورد ڕاکێشێ، هەندێ جاریش بۆ ئەوەی کورد هەست بە کلۆڵیی خۆی بکا خۆی دەخاتە جێگەی کورد و لەبری ئەو بیردەکاتەوە، لە بری ئەو ڕێگەچارەی خەبات دادەنێ کە لە شوێنێکدا لە سێ خاڵدا چڕی دەکاتەوە: یەکەمیان فراوانکردنی ئاستی لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر کوردستان و کۆمەڵی کوردەواری، دووەم: فراوانکردنی ئاستی خوێندن و نوسین بە زمانی کوردی، سێهەم: چڕکردنەوەی خەباتی دیبلۆماسی بۆ خستنە ڕووی کێشەی کورد لە بەرچاو ڕای گشتی نێودەوڵەتیدا.

هەرچەندە زۆرجار ناوەندی زانکۆیی و ڕۆشنبیریی تورکیا، کە لەژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەوڵەتدان، دژایەتی ئیسماعیل بێشکچی دەکەن و هەندێ جاریش بە خائین لە قەڵەمی دەدەن، بەڵام ئەو سوورە لەسەر ئەوەی بە هەڵوێستە فیکریەکانی

بـەر لـەوەی خزمـەتی کـورد بکـا خزمـەتی تـورك دەکـا. بێشـکچی زوو زوو هەڵوێسـتی نارەزایی ڕۆشنبیرانی فەرەنسا لـە ئاست داگـیرکردنی جـەزائیر لـە لایـەن وڵاتەکەیانـەوە دێنێتەوە یادی ڕۆشنبیرانی تورك و جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە چاوداخستن لـە ئاست حەقیقەتی کورد-دا هـەرگیز خزمـەت بـە تورکیـاو پاشـەڕۆژی تورکیـا ناکـا، چونکـە بـە بڕوای ئەو نەتەوەی ئازاد ئەو نەتەوەیە نیە کە خۆی بە تەنها بـە ئـازادی دەژی، بـەڵکو نەتەوەیەکە بە ئازادی و ئاشتی لەگەڵ نەتەوەکانی تردا دەژی.

**شاهۆ سەعید**

## پێشەکی چاپی عەرەبی:

نوسینی: د. زوهێر عەبدوڵەلیك
دوكتۆرا له بواری كۆمەڵناسی

ساڵی ١٩٩٠ كۆمەڵناسی ناوداری تورك ئیسماعیل بێشكچی له ئەستەنبوڵ كتێبی "كوردستان كۆلۆنییەكی نێودەوڵەتییە- Somurge Kurdistan Develetlerase"ی بڵاوكردەوە. بێشكچی كەسێكی دەروەسته (ملتزم) بە میتۆدی لێكۆڵینەوەی زانستی و پشتگیری له كێشەی گەلان و نەتەوه چەوساوەكان دەكات (بڕوانه گەشتی ژیانی ئیسماعیل بێشكچی). ئەم كتێبە بە دەرچونی بە تایبەتی لەنێو چەپی توركیا هەڵایەكی گەورەی نایەوە، هەروەها شۆكێكی گەورەش بو له فیكری سیاسی باوی كورد لەنێو ڕێكخراوو پارته سیاسیه كوردیەكاندا به جیاوازی بیروڕایانەوە.

ئەم كتێبه ساڵی ١٩٩١ به ناوی "Kurdistan International Kolonoe" له كۆلۆنیا بە زمانی ئەڵمانی بڵاوبۆتەوە. ساڵی ١٩٩٢ به ناوی "Kurdistan Una Colnia Internationil" له مەدرید بە زمانی ئیسپانی بڵاوبۆتەوە، ساڵی ١٩٩٦ كاتێك سەرپەرشتی وەرگێڕانە فرەنسییەكەیم دەكرد بە ناوی "Kurdistan Une Coloinie International" زانیاری تەواوم لەسەر ئەم كتێبە پەیداكردو هەر له زمانی فرەنسییەوە وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، ئەوەش بە بەراوردكردن لەگەڵ دەقە ئەسڵییەكەی و بە هاوكاری و كۆمەكی ژمارەیەك وەرگێڕی لێهاتو له زمانی توركی -ئەڵمانی و ئەڵمانی- توركی، بۆ ئه وەی به ئەمانەت و به وردی فیكری نوسەر بگەیەنمە خوێنەری عەرەب.

خوێنەرانی عەرەبی زۆرن و زانیاریان لەسەر مەسەلەی كورد و لەسەر پەرەسەندن و بە دواداچونی گەشەكردنی وشیاری نەتەوایەتی كورد بایەخێكی گەورەی دەبێت، چونكە پەیوەندی مێژویی و شارستانی نەتەوەی عەرەب و كورد و نەتەوە موسڵمانەكانی دی پێكەوە دەبەستێتەوە، چونكه میللەتی كورد وەك هەر نەتەوەیەكی

موسـڵمانی دی پشـت بـە کۆمـەکی ئـەو نەتەوانـەو هـەوڵی ڕوناکبـیرو سیاسـیـەکانی دەبەستێت تا لە کۆتی کۆیلایەتی ڕزگـاری بێت و دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ دروسـت بکـات وەك نەتەوە موسوڵمانەکانی تر.

بێگومان هەر ناونیشانی کتێبەکە بوو، سەرنجی ڕاکێشام بۆ ئەوەی وەریگێڕمـە سـەر زمانی عەرەبی، چونکە بەبێ ترس ناوەڕۆکی مەسەلەی کوردی دەستنیشـان کـردووە بـە شێوەیەك شایانی بایەخ پێدان و تێڕوانینی بیرکردنەوەیەکە دوو ڕەگـەزی بابەتگـەرایی و کرانەوەی بێشکچی پێوە دیارە، ئەمە سەرباری ئـەوەی دیـدو بۆچونـەکانی هێنـدە بـە ڕونی و ڕاشکاوی دادەڕێژێت سـەرنجی هـەمو ئـەو خەڵکانـە ڕادەکێشـێت کـە گرنگـی بـە چارەسـەرکردنی مەسـەلەیەك دەدەن کـە لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمەوە تـا هەنوکـە بـەبێ چارەسـەر ماوەتـەوەو چـاوەڕوان دەکـرێ لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتویەکدا ئـەم کێشەیە بکەوێتە پێشەوەی کێشەکانی هـەردوو هـەرێمی ڕۆژهـەڵات نزیـك و ناوەڕاسـت، ئـەویش لـە ئـەنجامی ئـەو ئاڵۆزییـە نـاوخۆیی و هەرێمایـەتی و نێودەوڵەتیـەی لـە دابەشکردنی کوردستان لە نێوان دەوڵەتەکانی ناوچەکە دەکەوێتەوە، هـەروەها بـە پێـی بـەرژەوەندی مـادی و سیاسـی و سـتراتیجیان و بـە هـۆی ئـەو ڕەهـەندە سۆسـۆلوجیانەی میللـەتێك ژمـارەی خەڵکەکـەی بـە پێـی تێکـڕای گەشـەکردنی و تێکـڕای گەشـەکردنی دیموگرافی هەرێمەکە لە کۆتایی نیوەی دووەمی سەدەی داهـاتو بـە نزیکـەی (٦٣) مليـۆن کەس دەخەمڵێنرێت، کە (٣٢,٣ ) ملیۆن کەسیان لە تورکیاو ١٦,٢ ملیۆن کەس لە ئێران و ١٠,٩ ملیۆن کەس لە عراق و ٢,٧ ملیۆن کەس لە سوریاو (٩٠٠) هـەزار کـەس لـە وڵاتـانی (یەکێتی سۆڤێتی جاران) دەژی.

(Mehndad R. Izady, The Kurds. P. 119. Taylor and Fzancis publisher, 1992)

لە خوێنەری ناشارمەوە کە هەستکردن بە ترس پەیدابوویەوە لـە لام بـۆ یەکـەمجار پاش ماوەیەکی دورو درێژ لە وشەی کۆلۆنیـالیزم و لـە وشـەی کۆلۆنـی-یش تـوڕە دەبم. ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ژیانی گەنجێتیم کە لـە سـایەی کۆلۆنیـالیزمی بـەریتانیدا بـە سـەرم بـردوە. ئـەم بیرۆکەیـە زیـاتر پـەیوەندی بـە کۆلۆنیـالیزمی بـەریتانی و فەرەنسییەوە هەیە پاشان بە ئەمریکایەکانەوە، هەروەها پەیوەندی بە خـەبات لـە دژی باڵادەسـتی کۆلۆنیـالیزم و تێکۆشـانی لـە پێنـاوی ڕزگـاربون و بــە دەسـت هێنـانی

سەربەخۆیی نیشتمان و دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی سەربەخۆوە هەیە. سەرباری ئەوەش لە خۆم دەپرسم چۆن ڕوناکبیرانی عەرەب و فارس و تورك ڕازی دەبن و وڵاتەکەیان بەشێك لە نیشتمانی کورد داگیر بکەن و هەموویشیان پێکەوە کوردستان داگیر بکەن؟!!

چەمکی کۆلۆنیالیزمی ناوخۆیی لە ئەدەبیاتی کۆمەڵناسی سیاسیدا چەمکێکی زانراوە بۆ وەسفکردنی ئەنجامە جیاوازەکانی گەشەکردن لەسەر ئاستی هەرێمایەتی، هەروەها تیۆری پەیوەندیە ئەتنیکیەکان بۆ ڕونکرنەوەی ئەو حاڵەتی بێبەش کردن و چەوساندنەوەی کەمایەتی‌یەکان لە کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە بەکاری دێنن. مارکسیستەکان ئەم چەمکە بۆ نایەکسانی سیاسی و ئابوری نێوان هەرێمەکانی کۆمەڵگەیەك بەکاردەهێنن. دەکرێن لە نێوان سەرجەم ئەو میتۆدانەدا سەرنج بدەینە ئەم ڕەگەزە هاوبەشانەی لای خوارەوە.

١-ئەو گریمانەیە ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێت گەشەسەندنی پیشەسازی لە ماوەیەکی دوردا دەبێتە مایەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی کامڵ و هاوشێوەی یەك لە ڕووی شارستانیەوە کە لە سایەیدا هەمو دانیشتوان وەك هاووڵاتی مافی یەکسانیان دەبێت.

٢-جیاوازی نێوان هەرێمەکان دیاردەیەکی تێپەڕ نیە، بەڵکو پابەندە بە گەشەکردنی کۆمەڵگەی پیشەسازییەوە. ئەگەر پەیوەندی نێوان وڵاتی کۆلۆنیالیزم و کۆلۆنی – لە حاڵەتی کۆلۆنیالیزمی دەرەکیدا- بە نایەکسانی و چەوسانەوە بناسرێتەوە، ئەوا هەمان پەیوەندی نایەکسانیش بە نێوەندو لۆکاڵەوە دیارە. لە سایەی کۆلۆنیالیزمی ناوخۆدا ئەو ناوچانەی پەیوەندییەکی زیاتریان بە دەوڵەتەوە هەیە سامانێکی گەورەتریان دەست دەکەوێت. دانیشتوانی کۆلۆنی ناوخۆ لە ڕوی ئەتنی یا ئاینی یا زمان یا هۆکاری کولتوری دی لە تێکڕای دانیشتوان جیادەکرێتەوەو بە ئاشکرا یا بە نهێنی لە هەمو مافێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئاوارتە دەکرێن The Penguin Dictionary at of p. 112-113).

بەڵام وەك نوسەر دەڵێت: لە لایەکی دی، پێویستە ئەو زانیاریانەی لەسەر کوردستان بە دەستمان دەگات لەگەڵ ئەو پێشنیازانەی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد پیشکەش

دەکرێ، تێکەڵ نەکرێت، بۆ نمونە بەکارهێنانی زاراوەی "کۆلۆنی" وەك چەمکێکی گرنگ بۆ ڕاڤەکردنی شێوەی پەرەسەندنی مێژوی کۆمەڵگەی کوردەواری. بەڵام هێندێك گروپ و تاقمی چەپی تورك ئەم چەمکە ڕەتدەکەنەوە بە بیانوی ئەوەی بنەمایەکی مادی بۆ دروستکردنی ڕێکخراوێکی جوداخوازانە دەخولقێنێ و هەروەها دەڵێن کوردستان کۆلۆنی نیە بەڵام ئەوانە بە هەڵەدا چوون، چونکە چەمکێك ڕەتدەکەنەوە توانای ڕاڤەکردنی سروشتی بونیادی کۆمەڵگەی کوردەواری هەیە. سەرباری ئەوەش کوردستان کۆمەڵگەیەکە تەنانەت لە ئاستی کۆلۆنی نزمترە.

پەرچەکردارەکان جیاواز دەبن، ڕەنگە نەك هەر لە لای ڕوناکبیرانی نەتەوە دراوسێکان بەڵکو لەنێو زۆرێك لە ڕوناکبیرانی کوردیش پێشبینی کردنی زەحمەت بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکەی بێشکچی شایانی لێکۆڵینەوەو تێڕوانینێکی قووڵە لەسەر ناوەڕۆکی ئەو تێزانەی پەیوەستە بە سیاسەتی ئەو دەوڵەتانەی کوردستان لە نێوان خۆیان دابەش دەکەن، بە تایبەتی دەوڵەتی تورکیا کە نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی میللەتی کورد دەکات و ماوەی (٧٠) ساڵ زیاترە بە ئاگرو ئاسن بە شێوازێکی ڕەگەزپەرستانەی ڤێزەون مامەڵەی لە تەکدا دەکات.

ئیسماعیل بێشکچی (٣٥) ساڵ پێش ئێستا نوسیویێتی: "کاتێك گەیشتمە باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بە چاوی خۆم میللەتێکم بینی لە ڕووی زمان و مێژوو نەریتەوە لە ئێمەی تورك جیاوازە، ئەم میللەتە بە خۆیان نالێن "تورکی چیا" هەروەك تورك پێیان دەڵێن بەڵکو بە خۆیان دەڵێن ئێمەی کورد".

لە حەقیقە کۆنکرێتیەکانی مێژوی کۆن و نوێ و هاوچەرخی کوردستان حەقیقەتێك بەرجەستە دەبێت، ئەویش، کورد بۆ دەوڵەتە دراوسێکان و خەڵکانی دی ملکەچ ناکات، هەروەها لە هەمان کاتیشدا نەیتوانیوە سەربەخۆیی سیاسی بە دەست بهێنێ و دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکات، بەڵکو تاکە نەتەوەیە ژمارەی دانیشتوانی لە (٣٠) ملیۆن کەس زیاتر دەبێت (خەملاندنەکانی ١٩٩٦- هەمان سەرچاوەی پێشو) بەڵام قەوارەیەکی سیاسی نیە.

ئیسماعیل بێشكچی ئەم لایەنە بابەتیانە شیدەكاتەوەو دەست دەخاتە سەر لایەنی لاوازو پارچە پارچەبون و پێكهاتەی چینایەتی و ڕەفتاری كارێزما سیاسی و ئاینیەكانی كۆمەڵگەی كوردەواری و تیشك دەخاتە سەرئەو فاكتەرە دەرەكی و ناوەكیانەی پەیوەندیان بە تراجیدیای ئەم میللەتە كلۆڵەوە هەیەو چارەسەركردنی كێشە درێژخایەنەكانیش دەست نیشاندەكات.

هەوڵ و كۆششێكی زۆرمدا بۆ ئەوەی دەقە عەرەبی و توركیەكە وەك یەك بن، ئەمەش كارێكی مەحاڵ بو بەبێ ڕاوێژكردن و ئاخاوتن لەگەڵ ئەو كەسانەی ناوەرۆكی ئەم كتێبەیان لەلا مەبەست بو لە ئەتنیە جیاوازەكان و بەبێ هەوڵ و كۆششی-ڕاستكردنەوەی ڕەشنوسەكان و چاپكردن و دەرهێنانی كۆمپیوتەری كە وەختێكی زۆری لە خاتو (ماجیدە مایتونی و بەڕێز هیشام مەحجوب) گرت.

لە كۆتاییدا ئەم تەقەلا خاكییە پێشكەش بە كتێبخانەی عەرەبی دەكەم بە مەبەستی دەوڵەمەندكردنی پەیڤین و قوڵكردنەوەو بەرەو پێشەوەبردنی بۆ هەر شتێك خێرو خۆشی نەتەوەكانی تیابێ كە میللەتی كوردیش لە هەمو ئانوساتێكدا هاوبەشی لە ئێشو ئازارو هیواكانی كردوە.

**ڕۆما**

**هاوینی ١٩٩٨**

# تێڕوانینێك دەربارەی ناسنامەی کوردو کوردستان
# تێڕامانێك یا تێڕوانینێك

## پێشەکی

ساڵی ١٩٧١ لە ڕۆژهەڵات ساڵی گرتنی بە کۆمەڵ و دادگاییکردن بوو. یانەی کولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵات و پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لەو ڕێکخراوە سەرەکیانە بون کە نوێنەرایەتی جەماوەرێکی بەرفراوانیان دەکرد. گرتوخانە سەربازییەکان جمەیان دەهات لەو گیراوانەی سەر بە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری بون، لەوانە قوتابی، خوێندکار، جوتیار، خاوەن وەرشەکان، کرێکار، پشەوەران و موچەخۆرە بچوکەکان، موڵکداری گەورە و شێخ و سەرەك خێڵەکان.. حاکمە سەربازییەکانی سەر بە فەرماندەیی ئەرکان لە شارەکانی دیاربەکرو سێرت، سوربون لە ئاراستەکردنی ئەو تۆمەتانەی بە هۆی ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی بوبون بە کلێشەیەکی زۆر باش زانراو، و بەبێ وەرزبون دوبارەیان دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە گومانلێکراوەکان تاکە وشەیەکی تورکییان نەدەزانی و تەنها بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد کەچی حاکمە سەربازییەکان و لێکۆڵەرەوەکان سەرباری ئەوەی وەرگێڕ لە نێوان دەستەی دادوەران و گومانلێکراوان دا هەبو بەڵام هەر سوربون لەسەر ئەوەی ئەوا نە تورکن و نکوڵییان لە زمانی کوردی دەکردو بە زاراوەیەکی زمانی تورکییان دادەنا.

پرۆفیسۆر و زانکۆکان بە پەرۆشەوە پاساویان بۆ بیروبۆچونی حاکمەکانی دەوڵەت دەهێنایەوەو بە ناوی زانستەوە بانگەشەکانی ئەو حاکمانەیان بە ڕاست دادەناو بەوەی لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەم حەقیقەتەیان ڕوونکردۆتەوە.

لایەنێکی سەرەکی دادگاییکردنەکانی ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٧١ دژایەتی نێوان ئەم جەختکردن و واقیعە کردەییانە دەردەخات. لەبەرئەوە پێویستە ئەو دادگاییکردنانە

به یەکێك لەو هۆیانە دابنرێ کە ڕێگەی بۆ سەرەتای قۆنـاغێکی زۆر گرنـگ لـە مێـژوی کورد خۆشکرد. لە ماوەی ئەم دادگایی کردنانـەدا مرۆڤـی کـورد کەوتـە بیرکردنـەوە لـە ناسنامەی خۆی و لە میللەتی کورد و کۆمەڵگەی کوردەواری و لە مێژوی کورد و زمان و کولتور و ئەدەبی کوردی لە کوردستان و بەراوردکردنی بارودۆخی میللەتی کورد لەگەڵ میللەتانی دی، بۆیە گرتن و دادگاییکردن و گرتوخانەکان نەیانتوانی ڕێگە لـە پرۆسـەی گەشـەکردنی وشـیاری نەتەوایـەتی و گۆڕینـەوەی زانیـاری لەسـەر ئـەو بابەتانـــە بگـــرن بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو بابەتانەیان چڕتر کردەوە.

لە پێش هەشـتاکاندا ئاسـتی زانیـاری لەسـەر کۆمەڵگـەی کـوردەواری بـە شـێوەیەکی قوڵترو لەسەر ئاستێکی بەرفراوانتر پەرەیسـەند. هـەروەها ئـەم قۆناغـە کـاریکردە سـەر شـێوەی بیرکردنـــەوەی کـــورد و هەڵوێســت و جــۆری ڕەفتاریــان، بــۆ نمونــە لــە کــاتی دادگاییکردنەکانی ساڵی ١٩٧١ کورد هەوڵی دەدا بە دادگاکانی بسەلمێنێ کە زمـانی کـوردی جیاوازی لەگەڵ زمانی تورکی هەیە، بەڵام لـە هەشـتاکان ڕاسـتەوخۆ بـە زمـانی کـوردی قســـەیان دەکـــردو بـــە ســـوربون و خۆڕاگـــری خۆیـــان ئـــەم هەڵوێســـتەیان بەســـەر دادگاکاندا سەپاند.

ئــەم لێکۆڵینەوەیــە ئامــانجی باســکردنێکی قووڵــە لەســـەر بــارودۆخی کۆمەڵگــەی کوردەواری لە تورکیاو ڕۆژهەڵاتی نزیك و لـە جیـهان هـەروەها لـەم لێکۆڵینەوەیـە ئـەو حە قیقەتە ئاشکرا دەکات کە کوردستان وڵاتێکی کۆڵۆنی نیە. بارودۆخی میللـەتی کـورد زۆر لە کۆڵۆنی خراپترە. لێرەدا نامــەوێت ڕونـی بکەمـەوە بۆچـی کوردسـتان و میللـەتی کورد نەکرا بە کۆڵۆنی یا بۆچی میللەتی کورد خرایە دۆخێکـەوە کـە ڕۆژێـك لـە ڕۆژان نابێت بە کۆڵۆنی.

بێگومـان ئـــەم بابەتانـــە پێویســـتیان بـــە لێکۆڵینەوەیـــەکی ورد هەیـــە. بـــەڵام ئـــەم لێکۆڵینەوەیـە هـەوڵدەدا گرنگـی بـە هێندێـك ڕەهـەندی پـەیوەندیدار بـدات و تەنـها هێندێك پرسیار بخاتەڕوو.

## دروستبونی کۆڵۆنییەکانی سەدەی نۆزدەهەم

مێژوی کۆڵۆنیالیزم دوو جۆری سەرەکی کۆڵۆنی بە خۆیەوە بینیوە:
کۆڵۆنـی و نیمچـه کۆڵۆنـی. کۆڵۆنییـەکان ئـەو کۆمەڵگانەیـە هێشـتا نەگەیشـتونەتە قۆناغی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ. لەم حاڵەتەدا ئەو دەوڵەتـە سـەرمایەدارییەی گەیشتۆتە قۆناغی ئیپمریالیزم ئابوری کۆمەڵگەیـەکی کلاسـیکی ژێردەسـتەڵاتی دەکاتـە ئ ابورییەکی پاشکۆ ئینجا بۆ ئەوەی پرۆسەی چەوسانەوەی سیاسی ئاسان بکـات، شـێوەی رێکخستنی سیاسی خـۆی دەسـەپێنێ بەسـەر وڵاتـە کۆڵۆنیەکـەدا. بێگومـان ئـەو نەزمـە سیاسییە سەپێنراوە بەرهەمی دەوڵەتـە ئیمپریالییەکەیـە، واتـە دەوڵـەتی کۆڵۆنیـالیزم. دەوڵەتی ئیمپریالیزم بەمشێوەیە لە ڕوی سیاسـی و کـارگێڕی و سـەربازی و کولتـوری و کۆمەڵایەتییەوە کۆڵۆنی دەخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە.

لـە ڕێگـەی ئەمشـێوە ڕێکخسـتنەدا دەوڵـەتی کۆڵۆنیـالیزم دەزگـاو ئیدارەکـانی خـۆی بەسەر کۆڵۆنیدا دەسـەپێنێ. بەرپرسـانی ئـەو ئیدارانـە پێیـان دەوتـرێ حـاکمی گشـتی، کۆمیسـەر، سەرپەرشـت (وەسـی) و حـاکمی سـەربازی و هتـد. ئەمشـێوە ڕێکخسـتنە لـە وڵاتێکـدا دەسـەڵات دەگرێتـە دەسـت کـە پێشـتر سـنوری بـۆ دیـاریکراوە. بـە پێـی ئـەم مانایەش دەتوانین ئەم نەزمە بە دەوڵەتی کۆڵۆنی وەسف بکـەین. بـۆ نمونـە پـەیوەندی بریتانیا بە وڵاتانی هیند و سیلان و مالیزیا و بۆرما لە ئاسـیا و پـەیوەندی بـە وڵاتـانی کینیا و ئۆگـەندا و سـۆماڵ و تانزانیـا لـە ئـەفریقیاو هینـدۆراس لـە ئـەمریکای باشـورو نیوزلەندە و ئۆقیانوسیا پەیوەندی فرەنسا بە مەغریب و جەزائیر و تونس و سەنگال و گانا و مۆریتانیا و فۆڵتای سەرو، و داهۆمـی و پـەیوەندی بـەلجیکا و زائـیر و پـەیوەندی پورتوگال لەگەڵ ئـەنگۆلاو موزامبیـق و گینیـا بیسـاو پـەیوەندی هۆڵـەنداو ئیندونیسـیا لەسەر هەمان بنەما دامەزراوە.

لەبەرئـەوەی دەزگـا ئـابوری، سیاسـی، کۆمەڵایـەتی، کولتـوری و ئاینیـەکانی وڵاتـە کۆلۆنیەکان دەکرێتە وێنەیەکی کۆپی کراوی وڵا تە کۆلۆنیالیزمەکان بۆیە پێویستی بـە چوارچێوەیەکی خۆجێ (محلـی) هەیـە. بـەڵام ئـەم چوارچێوەیـە تەنـها ئـەو خەڵکانـەی دەگرتەوە کە سەر بە کۆلۆنیالیستەکان بون. ئەو خەڵکانە لە وڵاتەکەی خۆیان بـەرگری و پارێزگاری لە بەرژەوەندی کۆلۆنیالیزمەکان دەکەن و تا ڕادەیـەك وەك پاشکۆیەك لـە وڵاتی کۆلۆنی نوێنەرایەتی وڵاتە کۆلۆنیالیزمەکانیان دەکەن.

بـەڵام نیمچـە کۆلۆنیـەکان ئـەو کۆمەڵگانەیـە کـە دەوڵـەتی خۆیـان هەیـەو بـە پێـی سیسـتمێکی کۆمەڵایـەتی خـاوەن مێـژوو دروسـت بـوە. چـین و هینـد و ئیمـپراتۆرێتی عوسمانی نمونەی نیمچە کۆلۆنین، ئەم وڵاتانە بە هۆی کاریگـەری و گوشـاری زۆری وڵاتـە ئیمپریالیزمەکانی سەدەی نۆزدەهـەم پێویسـتیان بـەوە هـەبو چـاو بـە چوارچێـوەی کـاری فەرمانبەرە گەورەکاندا بخشێننەوەو دەزگا ئـابوری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و کولتـوری و سـەربازییەکان ڕێـك بخەنـەوە. بـەڵام ئـەم دەرهاویشـتانە هیچیـان لـە سـەرباری کوردسـتان جێبەجێ نابێ. کورد لە هیچ شوێنێك وەك کورد قبوڵ نەکرا بەڵکو وەك تـورك و ئـێرانی و عـەرەبی پلـە دوەم قبـوڵ کـرا. بۆیـە دەبینـین سیاسـەتێکی چـڕی بـە تـورك و فـارس و عـەرەب کـردن لـە دژی کـورد پیـادە دەکـرێ و بـەردەوام نکۆڵـی لـە ناسـنامەی کـورد و کوردستان دەکرێ. لە بەشی داهاتودا گفتوگۆ لەسـەر ئـەو مافانـەی کـورد دەکـەین کـە لـە ململانێی چەکداری نێوان عراق- ئێران بەدەستیان هێناوە.

لـە دوای شـەڕی جیـهانی یەکـەم واتـە دوای داڕوخـانی ئیمـپراتۆرێتی عوسمـانی کۆلۆنیالیسـتەکان دەوڵـەتی کۆلۆنـی وەك عـراق و سـوریا و ئـەردەن و فەلەسـتین و لوبنانیان دروست کرد بەڵام دەوڵەتێکیان لە کوردستان دروست نەکرد واتە کۆلۆنییەکی بریتانی لە کوردستان دروست نـەبو بۆیـە کوردسـتان نـەبوە کۆلۆنـی، بـەڵکو لـە جیـاتی ئـەوە نەتـەوەی کـورد و هـەرچی شـتێك پـەیوەندی بـە کـورد و کوردسـتانەوە هـەبو دابەشکرا بۆ ئەوەی زمان و مێژوی کورد لەنێو زمان و مێژوی ئەوانی دی لەناو بچێت.

بەمشێوەیە بەشێکی کوردستان خرایە ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی تورکیا و بەشەکەی دی بە عراقی ژێر دەسەڵاتی ئینتدابی بریتانیاوە لکێنراو بەشی سێیەمی بە سوریای ژێر دەسەڵاتی ئینتدابی فرەنسییەوە لکێنرا.

بەڵام کوردستانی ڕۆژهەڵات هەر لە سەدەی حەڤدەهەمی زاینییەوە (١٦٣٩ز) لەژێر دەستی فارس مایەوە. ڕاپەڕینی کوردەکان لە دژی ستەم و لە پێناوی سەربەخۆیی و بۆ هێنانەدی مافە نەتەوایەتیەکانی خۆیان زۆر دلڕەقانە سەرکوتکرا. شۆڕشی گشت پارچەکانی کوردستان سەرکوت کران. لە کوردستانی باشور بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود بەرزنجی و مەلا مستەفای بارزانی، لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بە سەرکردایەتی سمکۆو قازی محەمەد، لە کوردستانی باکور بە سەرکردایەتی شێخ سەعید و ئیحسان نوری و سەید ڕەزا. ئەو ڕاپەڕینانە لە ڕێگەی ئۆپراسیونە سەربازییە هاوبەشەکانی نێوان ئیمپریالیزمی بریتانی و نۆکەرەکان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا نوقمی ڕوبارێکی خوێن کران، لە بەر ئەوە ناکرێ قسە لەسەر سنورێکی ئاشکرای کوردستان بکرێ. ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆڵۆنییەکی هاوبەش لەنێو خۆیاندا دابەشدەکەن لە ڕێگەی پرۆسەی ڕاگواستنی کورد بۆ وڵاتان و هەرێمەکانی دی و پرۆسەی قەلاچۆکردنیان و سیاسەتی پێشوازیکردن لە پەنابەرانی بولگارستان و ئەفغانستان و لە ڕێگەی تەتریك و تەعریب و تەفریس کردنی کورد توانیویانە گۆڕانێکی گەورە بەسەر بونیادی دانیشتوانی کوردستان دا بهێنن، هە روەها بە گرتنەبەری هەمان ڕێوشوێن توانیویانە گۆڕانێکی لەبەرچاو بەسەر سنوری سروشتی کوردستان دا بهێنن.

کاتێك کورد لە ماڵ و مەزرای خۆی دەردەکرێ و گوندەکانیان دەکرێن بە شوێنی نیشتەجێ بوونی تورك و عەرەب و فارس و زەوت دەکرێ، کاتێك دەزگا کشتوکاڵییەکانی سەر بە دەوڵەت زەوییە بە پیتەکانی کورد بە کاردەهێنن یا پێگەی سەربازی لەسەر دروست دەکەن ئەوا بێگومان ئەم کارەیە پەیوەندی هەیە بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی تایبەتەوە دژی نەتەوەی کورد.

هەروەها پێویستە ئەو بەشە بچوکەی کوردستانمان لە بیر نەچێتەوە کە بە زۆر بە سنوری ئەرمینیاو یەکێتی سۆڤێتەوە لکێنراوە. لەم بەشە بچوکەی کوردستاندا

سیاسـەتی ڕاگواسـتنی بـە زۆر پیـادەکراوە، چونکـە سـاڵی ١٩٤٤ پرۆسـەی ڕاگواســتنی بــە کۆمەڵ لە دژی کورد بەرەو ئاسیای بچوك پیادە کرا.

## خەسڵەتەکانی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"

ئـەوەی سیاسـەتی "پەرتکــە- زاڵبــە" جێبــەجێ بکـات زنجیرەیــەك خەسـڵەتی بــۆ بـەدیدەهێنێ -هـەرکاتێك چـەند وڵاتێـك بیانــەوێ بەرژەوەندییــە هاوبەشــەکانیان لــە وڵاتێکی دی دەستەبەر بکەن، ئەوا ئەمجۆرە سیاسەتە بەشدارییەکی چالاك لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان دەکات و پیادەکردنی ئەمجۆرە سیاسەتە دەبێتـە کـارێکی پێویست. چاوچنۆکی هەرێمایەتی نێوان ئەو وڵاتانە مەرج نییە بگاتە ئاستی پێکدادان بــەڵکو بـە پێچەوانەوە بۆ ئـەوەی گـەورەترین بـەرژەوەندی هاوبـەش بـە دەسـت بـهێنن گەشـە بـە پەیوەندی نێوانیــان دەدەن و بـە پێیـی توانـاش بـە دوای ئـەو ئامرازانـەدا دەگـەڕێن کـە دژایەتی نێوانیان چارەسەر دەکات، هەروەها بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان وا دەخـوازێ بەردەوام پەیوەندی نێوانیان خۆش بێت.

لە ساڵانی ١٩١٥-١٩٢٥ شەڕی ئیمپریالییانە لەسەر کوردستان هەڵایسا، ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی کوردستان دەزانی بۆ ئەوەی دەست بەسەر کوردستاندا بگرن توشی شـەڕێکی بەربڵاو بون. ئەم قۆناغە بە قۆناغی پێکدادان و شەڕی چـەکداری دەناسـرێتەوە، بـەڵام هــەر زوو لایەنـــە شـــەڕکەرەکان لەســـەر تـــەماح و چـــاوچنۆکی و پاراســـتنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ڕێگەی پیلانگێڕانیان لە کوردستان گرتە بەر کە لە ئەنجامدا پارچەپارچـە کـردن و دابەشـکردنی کوردسـتانی لێکەوتـەوە. بـەڵام قۆنــاغی دواتــر بــە قۆناغی هاوکاری نێوان لایەنە نەیارەکان دەناسـرێتەوە. ئـەو دەوڵەتانـەی کوردسـتان لـە نێوان خۆیان دابەشدەکەن گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە زامــن کردنـی بەرژەوەندییـەکانیان تەنها لە ڕێگەی پتەوکردنی هاوکاری نێوانیانەوە دێتە دی.

لــە ڕێگــەی بــەراوردکردنی سیاســەتی ئیسـرائیل بەرامبــەر بــە فەلەســتینیەکان و سیاسـەتی هـەر یـەکێك لـە ئـێران و عـراق و تورکیـا و سـوریا بەرامبـەر بـە کــورد چــەند ئامـاژەو نیشـانەیەکی گرنگمــان دەسـتدەکەوێت. ڕۆژنامــەو تەلەفزیۆنــەکانی تورکیــا لــە

سـەرەتای سـاڵی (١٩٨٨)ەوە هـەواڵ و ڕیپۆرتـاج لەسـەر فەلەسـتینیەکان بڵاودەکەنــەوە، بـۆ نمونە شەڕی نێوان فەلەستینی و هێزەکانی ئاسایشی ئیسرائیل بە تێروتەسـەلی بـە وێنـەو فیلمی تایبەت بەو ڕوداوانە بڵاودەکەنەوە، هەروەها لـە ڕێگـەی خۆپیشـاندان و سـازکردنی کۆڕو کۆبونەوە سیاسەتی ئیسرائیل بەرامبـەر بـە فەلەسـتینیەکان ڕەخنـە دەکـەن. هـەمو ئەو چالاکیانە لە ڕۆژنامەو ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی تورکیا ئامادەگی خۆیان هەیـە. هـێزە سیاسیەکانی تورکیا بەبێ جیاوازی ڕاست و چـەپیان بـە ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان دەزانـن بەهەر نرخێك بوە بەشداری لە خۆپیشاندانەکان بکەن. بێگومان ئەم ڕەفتارەی ڕۆژنامـەو ڕادیـۆ و تەلەفزیۆنـەکانی تورکیـا سـەبارەت بـە دەنگـەوەچونی ئــەو ڕوداوانــە ڕەفتــارێکی ئاساییە بەڵام کێشەکە پەیوەندی بە هەڵوێستی تورکیاوە هەیـە بەرامبـەر بـەو ڕوداوانـەی لە مەڵبەندێکی دی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك ڕودەدا.

لە ناوە ڕاستی مانگی ئازار پێشمەرگە کوردەکانی دۆسـتی ئـێران، شـاری هەڵەبجـەیان لە باشوری کوردستان ئازاد کرد. حکومەتی کۆلۆنیالیزمی عراقی پەلاماری شارەکەیدا و دوای ئـەوەی پێشــمەرگەکانی ناچـار کـرد شـارەکە بـەجێ بـهێڵن ئینجـا کیمیابـارانی شارەکەی کرد. بە پێی زانیاری ئاژانسەکانی هەواڵ ئەم هێرشە بوە هـۆی ٥٠٠٠ کـوژراو و زیاتر لە ١٠٠٠٠ بریندار کورد بـەڵام سـەرچاوە کوردییـەکان زیانـە مرۆییـەکانی ئـەو هێرشـە زۆر لـەو ژمارەیـە بـە زیـاتر دەزانـن. بێگومــان ئــەم پرۆســەیە پــەیوەندی بــە پرۆسەی قەلاچۆکردنێکی گەورەتر هەیــە کـە قوربانیـەکانی هـەزاران منـاڵ و ژن و پـیر بون. ئەگەر لە نزیکەوە چـاودێری هەڵوێسـتی حکومـەتی تورکیـاو پارتـە سیاسـیەکان و زانکۆکان و نوسەرو ڕۆژنامــەو تەلـەفزیۆن و ڕادیـۆی تورکیـا بکـەن بەرامبـەر بـەم کـارە دڕنـدەو وەحشـیانەیە دەبینــین ئــەو دەزگایانــەی لــە کــاتی هەڵایســانی شــەڕی نێــوان ئیســرائیل و فەلەســـتینیەکان بــە ئاشــکراو بــە دەنگێکــی بڵنــد لەســەر کوشــتنی فەلەسـتینیەك نـاڕەزایی دەردەبـڕن بـەڵام بەرامبـەر بـە قـەتڵوعامکردنی نزیکـەی ٥٠٠٠ کوژراو ١٠٠٠٠ بریندارى کورد بێدەنگ دەبن.

وڵاتە یەکگرتوەکان لە جەنگی ڤێتنامدا گازی ژەهراوی دژی دانیشتوان بەکارنەهێنا. یـەکێتی سـۆڤێت بـە درێژایـی شـەڕی لەگـەڵ موجاهیدەکانی ئەفغانسـتان ئـەم چەکـەی

بەکارنەهێنا. ئیسرائیل ناتوانێ دژی فەلەستینیەکان ئەم چەکە بەکاربهێنێ. ئیسرائیل چەند ڕق ئەستوربێ بەرامبەر فەلەستینیەکان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین دیسانەوە هەر ناتوانێت ئەم چەکە بەکاربهێنێ و تەنانەت ئەگەر ئیسرائیل لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا بیەوێ ئەم چەکە بەکاربهێنێ بەڵام بە فیعلی ناتوانێت ئەو کارە بکات چونکە ئیسرائیل لە ترسی پەرچەکرداری وڵاتە ئیسلامی و عەرەبی و وڵاتانی دراوسێ و ڕای گشتی جیهانی ئازایەتی ئەوەی نیە کە کیمیایی بەکاربهێنێ. هەروەها نابێ ئەوەشمان بیربچێتەوە کە کۆمەڵگەی ئیسرائیل کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیە بۆیە لە ترسی پەرچەکرداری ڕای گشتی خودی ئیسرائیلیەکانیش ناتوانێت چەکی کیمیایی بەکاربهێنێ. بەڵام سەدام حوسەین زۆر بە ئاسانی چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت چونکە دەزانێت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە دژی کوردو وڵاتە دراوسێ و عەرەبی و ئیسلامیەکان و تورکیا ناوروژێنێ، ئەمە سەرباری ئەوەی سەدام حوسەین پەرچەکرداری ڕای گشتی جیهانی دیموکراتی بەلاوە گرنگ نیە. یەکێك لەو هۆیانەی سەدام حوسەینی والێکرد ئەم تاوانە دزێوە بکات لاوازی پەرچەکردارەکانی هەڵسەنگاندبو. بێگومان ئەم کارە یەکێکە لەو خەسڵەتانەی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" دەیرەخسێنێ – عراق و ئێران لە ماوەی شەڕی نێوانیاندا چەکی کیمیاییان لە دژی ئەو کوردانە بەکاردەهێنا کە لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستان بە تەنها درێژەیان بە خەباتی خۆیان دەدا.

ڕژێمی فاشیستی کۆلۆنیالیزمی عراق لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٧ شاری هەڵەبجەی لە کوردستانی باشور کیمیاباران کردو لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٠ کۆنگرەی باڵای ئیسلامی لە کوێت بەسترا. ئەم کۆنگرەیە گفتوگۆی لەسەر تێکڕای بابەتەکان کرد، هەر لە مەسەلەی ئەفغانستانەوە تاکو کێشەی فەلەستین و لە جەنگی عراق و ئێرانەوە تا مەسەلەی چەوسانەوەی تورکەکانی بولگارستان- کۆنگرە لەسەر گشت مەسەلەکان بڕیاری خۆیدا کەچی قەتلوعامی کورد لەسەر خشتەی کارەکانی کۆنگرەدا نەبو، بۆیە قسەی لەسەر ئەم مەسەلەیە نەکرد، بەڵام کۆنگرە ناڕەزایی لەسەر ئەم مەسەلانە دەربڕی، سیاسەتی یەکێتی سۆڤێت لە ئەفغانستان و سیاسەتی تیرۆریستانەی ئیسرائیل بەرامبەر بە

فەلەستینیەکان و گۆڕینی ناوی تورکەکانی بولگارستان شەرمەزار کردو ناڕەزایی لەسەر دەربڕی بەڵام تاکە ئەندامێکی کۆنگرە بە خەیاڵیدا نەهات ناڕەزایی لە دژی ڕژێمی سەدام حوسەین دەربڕێت یا تەنها قسە لەسەر کوشتنی زیاتر لە (٥٠٠٠) منالْ و ژن پیر و بریندار بونی (١٠٠٠٠) کەس بکات.

ئەمەش یەکێکە لەو هۆیە سەرەکیانەی ڕێگەی بە ڕژێمی سەدام حوسەین دا بەبێ ترس یا ڕێگرێکی ویژدانی ئەم قەتلۆعامە بکات. سەرەڕای دزێوی ئەم ڕەفتارە کەچی ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و عەرەبی و ئیسلامیەکان ناڕەزاییان لەسەر دەرنەبڕی و نەیشیانوێرا لەسەر ئەو قەسابخانەیە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکەن. ئەم مەسەلەیە وەك پێویست نەخرایە بەردەم دەزگا نێودەوڵەتێکان. بەهەرحاڵ، هەمو هەوڵێك کە لە تواناندا بوو درا بۆ ئەوەی کورد نوێنەری لەو جۆرە دەزگایانەدا نەبێت.

ئەمەش خەسڵەتێکی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"ی کۆلۆنیالیزمە لەبەر ئەوەی ئێمە کوردستان بە کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتی دادەنێین باشترە قسە لەسەر لایەنەکانی دی بکەین کە تایبەتە بەو جۆرە پەیوەندییانە.

## بارودۆخی سیاسی کوردستان و میللەتی کورد

بارودۆخی سیاسی کوردستان لە بارودۆخی کۆلۆنی نیمچە کۆلۆنی ناچێت و تەنانەت لە ئاستی کۆلۆنیش نزمترە. میللەتی کورد بارودۆخێکی هەیە لە بارودۆخی هیچ میللەتێکی کۆلۆنیکراو ناچێت. بارودۆخی سیاسی کوردستان و میللەتی کورد زۆر لە بارودۆخی کۆلۆنی خراپترە. کوردستان بارودۆخێکی سیاسی دیاریکراو و شوناسێکی سیاسی نیە لەبەرئەوەی داگیرکەران دەیانەوێ میللەتی کورد ببێت بە کۆیلەو ناسنامەی خۆی لە دەست بدات، بە وشەیەکی ڕونتر دەیانەوێ کوردو شارستانی و زمانەکەی لەناوبەرن. فەوتاندن و لەناوبردنی ئەم میللەتە دوا ئامانجی ئەو دەوڵەتانەیە. بەڵام میللەتی کورد بەم بارودۆخە ڕازی نابێت یا ڕاسترە بڵێین کورد ئەو بارودۆخە ڕەتدەکاتەوە کە دەوڵەتە ئیمپریالی و هاوکارەکانی لە چارەکی یەکەمی سەدەی

بیستەمەوە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك بە سەریا سەپاندویانە بۆیە میللەتی كورد بۆ بەدەستهێنانی ئازادی خۆی پەنا بۆ هەمو ڕێگەیەك دەبات بە خەباتی چەكداریشەوە.

پێویستە چەمكی "دەوڵەتە ئیمپریالی و هاوكارەكانی" ڕاڤە بكەین. ئەو دەوڵەتانەی لە وێرانكردنی كوردستان و چەوسانەوەی میللەتی كوردو هاوكاری دەوڵەتە ئیمپریالیزمەكان دەكەن سیفەتی دەوڵەتێكی داگیركەر وەردەگرن. بە پێچەوانەی هاوكاری نێوان وڵاتانی دی و دەوڵەتە ئیمپریالیزمەكان لە بوارە دیاریكراوەكاندا بە پەیمانی سەربازیشەوە وەك هاوكاری زۆربەی وڵاتان لە دوای جەنگی جیهانی دوەم بۆ نمونە هاوكاری میسرو وڵاتە یەكگرتوەكان بەڵام هاوكاری توركیا، عراق، ئێران و سوریا بە دەوڵەتە ئیمپریالیزمەكانەوە هەمیشە بە مەبەستی داگیركردنی كوردستان بوە، چونكە ئەم دەوڵەتانە كوردستانیان داگیركردوەو بە خاكی وڵاتەكەی خۆیانەوە لكاندوە.

بێگومان ئەم كاراكتەرانەی خوارەوەش لەسەر بارودۆخی كوردستان پیادە دەبێت:

هەرێمە كۆلۆنیەكان وەك سەرچاوەیەكی كەرەستەی سودیان لێوەردەگیرێ و سامانی ژێر زەوی و سەرچاوە سروشتیەكانی وەك نەوت و مس و خەڵوزو فۆسفات و دارستان و ئاوی بەكاردەهێنرێت، هەروەها ئەم كۆلۆنیانە دەبێتە بازاڕێك بۆ ساغكردنەوەی بەروبومی دەوڵەتە كۆلۆنیالیزمەكان، بەڵام ئەو خاسییەتانەی لە كوردستاندا هەیە لە كۆلۆنیە كلاسیكیەكان بە دیناكرێ چونكە ئەو خاسییەتانە ڕۆڵی بنەڕەتیان وازیكردوە بۆ ئەوەی ئاستی بارودۆخی كوردستان لە كۆلۆنی خراپتر بێ. ئەو تایبەتمەندیانەی لە كۆلۆنیە كلا سیكیەكاندا بەرچاو ناكەوێ لە كوردستان زۆر بە جوانی دەبینرێ. ئەگەر چاوێك بە پەیوەندییەكانی بریتانیاو ئۆگەندادا بخشێنینەوە وڵاتێك دەبینین پێی دەوترێ ئۆگەندا كە وڵاتێكی كۆلۆنیە، ئەم وڵاتە سنورێكی زانراو و دیاریكراوی هەیە، لەم وڵاتە میللەتێك دەژێت ئینگلیز نیە، و ئۆگەندەش نابێتە بەشێك لە بریتانیا، هەروەها هیچ هەوڵێك بۆ بە ئینگلیز كردنی ئەم میللەتە نادرێت. ئەم كارە ئینگلیز و ئۆگەندییەكان بە باشی لێی تێدەگەن. كاتێك ئۆگەندە لە كۆتایی شەستەكان لە ڕێگەی گفتوگۆی دەستورییەوە سەربەخۆیی بە دەست هێنا سنورەكەی نەگۆڕاو هەر بەو سنورەشەوە سەربەخۆیی وەرگرت. پەیوەندی نێوان بریتانیاو هەر یەكێك لە هیندو

نیوزلەنداو کینیاو سۆماڵ و بۆتسوانا هەمان شتی لەسەر جێبەجێ دەبێت. هەروەها هەمان هێڵی سوریش لە نێوان پەیوەندییەکانی فرەنسا و تونس و جەزائیرو مەغریب بەدی دەکرێت. کۆلۆنیەکانی مەغریب و جەزائیر و تونس نە فەرەنسی بون و نە هەوڵی بە فەرەنسی کردنیان دەدرا. ئەم ڕاستییە فەرەنسی و هاووڵاتیانی ئەو کۆلۆنیانە بە باشی درکیان پێدەکردو هەمان شت لەسەر پەیوەندی نێوان پورتوگال و ئەنگۆلا و موزامبیق و غینیا- بیساو- یش جێبەجێ دەبێت.

دابەشکردنی ئەفریقیا لە نێوان وڵاتە ئیمپریالییە ئوروپاییەکانی بریتانیا و فرەنسا و بەلجیکاو هۆڵەندا و پورتوگال و ئیسپانیا و ئەڵمانیا جیاوازییەکی گەورەی هەیە لەگەڵ پارچە پارچەکردنی کوردستان کە لە لایەن دەوڵەتە ئیمپریالییەکانی فەرەنساو بریتانیاو بە هاوکاری ئێران و کەمالییەکان لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ئەنجامدرا.

ئێستا لە ئەفریقیا نزیکەی (٥٠ ) وڵاتی سەربەخۆ هەیە. ئەم وڵاتانە لە چوارچێوەی ئەو سنورە سەربەخۆییان بە دەست هێناوە کە دەوڵەتە ئیمپریالیەکان ساڵی ١٨٨٥ سنوریان بۆ کێشابوو. بەڵام ژمارەی نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگاتە نزیکەی (٣٠ ) ملیۆن کەس کەچی سەرباری ئەوەش بارودۆخێکی سیاسی شایستەی نیە. کورد بۆ پارێزگاریکردن لە ناسنامەی خۆی و ڕەتکردنەوەی ئەو فۆرمە ئیمپریالی و کۆلۆنیالی و ڕەگەزپەرستانەی بەسەر یا سەپێندراوە پەنای بۆ خەباتی چەکداری بردوە.

ئیمپریالیزم لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە نەتەوەی عەرەبی دابەشکرد. بەڵام هەتەر (حریص) بون لەسەر ئەوەی دەوڵەتی عەرەبی ژێر دەسەڵاتی ئینتداب دروست بکەن، واتە دەوڵەتی سەر بە کۆلۆنیالیزم. پاش جەنگی جیهانی دوەم ئەو دەوڵەتە عەرەبییانە توانییان سەربەخۆیی خۆیان وەرگرن. لە نێوان دابەشکردنی عەرەب و دابەشکردنی کورد پەرتەوازەکردنیان جیاوازییەکی گەورە هەیە. ئەڵمانیاو کۆریاو ڤێتنام بە هەمان ڕێگە دابەشکران. بەردەوام نەتەوەی دابەشکراو هەبوە. بەڵام کوردستان لە دوای داڕوخانی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە نێوان دەوڵەتە تازە دروست بووەکان و ئێران دابەشکرا تا بە ڕێگەیەکی ئاسانتر ناسنامەی کورد و کوردستان لەناوببرێت.

## کوردستان کۆلۆنییەکی هاوبەشە

لە ڕۆژهەڵاتی نزیك جیاوازییەکی گەورە لە نێوان حاڵەتی فەلەستین و کوردستاندا هەیە. کورد چواردەوری بە دەوڵەتی دوژمن گیراوە بۆیە پێویستە لە سەریان وەك ئەوەی لە دۆزەخ بژین بەرگری لە خۆیان بکەن. بەلام فەلەستینیەکان چواردەوریان بە دەوڵەتی دۆست گیراوە یا بە لایەنی کەمەوە ئیدعای دۆستایەتی دەکەن. فەلەستین بە تەنها یەك دوژمنی هەیە ئەویش ئیسرائیلە. بەڵام ئیسرائیل تەنها فەلەستینیەکان دوژمنی نیە بەڵکو "٤٢" دەوڵەتی ئیسلامی دوژمنایەتی ئیسرائیل دەکات کە "٢٢" دەوڵەتیان عەرەبن. بەهەرحاڵ، ئەگەر ئەو وڵاتانە بە فیعلیش دژایەتی ئیسرائیل نەکەن ئەوا ئیدعای ئەوە دەکەن کە میانەیان لەگەڵ ئیسرائیل دا خۆش نیە. ئەمە لە کاتێکدا دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی کوردستان ژمارەی دوژمنەکانی کوردی زیادکردوە و بەبێ دۆست ماونەتەوە. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا دەبینین کوردیش دۆستی بۆ پەیدا بوەو هەرچەند ژمارەی دۆستەکانی کورد بەردەوام زیاد دەکات بەڵام دۆستانێکی پەرتەوازەن و دوورن لە کوردستان.

فەلەستینیەکان کاتێك خەبات لە دژی ئیسرائیل دەکەن پشت بە کۆمەکی مادی و مەعنەوی وڵاتانی عەرەبی دەبەستن و لە حاڵەتی دژوارو تەنگژەدا یارمەتی لەم وڵاتانەوە وەردەگرن و هەر لە خاکی ئەوانیشەوە درێژە بە خەباتی سیاسی و سەربازی خۆیان دەدەن. فەلەستینیەکان دەتوانن پەنا بۆ دەوڵەتە عەرەبیەکان بەرن، وەك میسر، ئەردەن، سوریا، لوبنان، عراق، تونس، کوێت، میرنشینی عەرەبی سعودی، جەزائیر و یەمەن و ناوچەکانی دی. سروشت و ئاستی پەیوەندی نێوان فەلەستینی و دەوڵەتە عەرەبیەکان هەرچۆنێك بێ ئەو پەیوەندییە لە چ ڕادەیەکدا بێت، فەلەستینییەکان هەست دەکەن کە لە شوێنێکی پارێزراودان و ئەو دەوڵەتانە بۆ ئەوەی ڕای گشتی وڵاتەکەیان ڕازی بکەن، ناچارن یارمەتی مادی و مەعنەوی فەلەستینیەکان و ڕێکخراوی

ڕزگاریخوازی فەلەستین بدەن، ئیتر هەڵوێستی فەلەستینیەکان بەرامبەر بە ئیسرائیل و وڵاتان ی دی، ئەو وڵاتانە ڕازی بکات یا نا دەچێتە خانەی دوەمەوە.

کورد لە باشوری کوردستان لە ترسی بۆردومانی گازی ژەهراوی پەنایان بۆ کوردستانی باکوری ژێر دەستەلاتی تورکیا هێنا بەلام کاتێك گەیشتنە تورکیا دەستەلاتدارانی تورك لە ئۆردوگا تەلبەند کراوەکاندا دەست بەسەری کردن. ئەو کێشە دژوارانەی کوردەکان لە کاتی پەڕینەوەیان بۆ خاکی تورکیا لە ناوچە سنورییەکان ڕوبەڕوی بونەوە پێویستی بەوە نیە قسەیان لەسەر بکرێ چونکە لەسەر ئاستێکی فراوان ئەو دژوارییانە دەزانرێت. لە ڕاستیدا تورکیا هەمو شێوازێکی لە تواناو لەبەرچاو بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی کورد بەکاردەهێنێ بۆیە کارێکی زۆر ئاساییە تورکیا هاوکاری عراق بکات. ئەمەش ڕەنگدانەوەی دیدو بۆچونێکی بابەتیانەی هەڵوێست و ڕەفتاری تورکیایە بەرامبەر بە کورد.

لە لایەکی دی، ئەنجامی پارچەپارچەکردن و دابەشکردن بە ڕونی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەردەکەوێت لەبەرئەوەی کێشەی فەلەستین بە کێشەی عەرەب دادەنرێت بۆیە ئەو دەوڵەتانەی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبیەکان دەبەستن یا بیانەوێ درێژە بە پەیوەندی ئاسایی نێوانیان بدەن بە شێوەیەك لە شێوەکان ناچاردەبن پاڵپشتی لە کێشەی فەلەستین و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین بکەن، بەلام مەلەسەی کورد وەك مەسەلەیەکی دژ بە عەرەب دەردەکەوێت چونکە ئەو دەوڵەتەی بیەوێت لەگەڵ وڵاتە عەرەبیەکان گەشە بە پەیوەندییەکانی بدات پێویستە هەڵوێستێکی دژ بە کورد وەربگرێ، واتە پشتگیری لە بەرژەوەندی عراق و سوریا بکات و بایەخ بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو شۆڕشەکەی نەدات. لەبەرئەوەی وڵاتە عەرەبیەکان نەوتیان زۆرە بۆیە پتەوکردنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ عەرەب و زیادکردنی هەناردەکان بۆ وڵاتە عەرەبیەکان و وەرگرتنی کەمکردنەوەی (مناقصە) ئاشکراو سەرمایەگوزاری لە وڵاتە عەرەبیەکان بووە بە چالاکییەکی ئابوری و سیاسی سەرەکی.

سەرباری ئەوەش، شۆڕشی کورد تەنها دژی عەرەب نیە بەڵکو شۆڕشێکە دژایەتی تورکیاو ئێرانیش دەکات. لەبەرئەوە ئەو وڵاتانەی بە مەبەستی گەشە پێدانی پەیوەندییەکانیان دانوستان لەگەڵ تورکیا و ئێران دەکەن هیچ جۆرە تێگەیشتنێکیان بەرامبەر بە خەباتی ڕەوای گەلی کورد نیە بۆیە ئەو وڵاتانە سیاسەتی کۆلۆنیالی و ڕەگەزپەرستی تورکیا و ئێران بەرامبەر بە کورد قبوڵ دەکەن. گەشەپێدانی پەیوەندی ئابوری پێش چەمکە گشتییەکانی وەك چەمکی مافی مرۆڤ و یەکسانی نێوان نەتەوەکان دەکەوێت. تورکیا، ئێران، عراق و سوریا دەزانن چۆن قەوارەی بازرگانی و سەرمایەگوزاری و کەمکردنەوەکان (مناقصات) لە دەرەوە وەك ئامرازێکی گوشار بەکاربهێنن، "ئەگەر لەسەر ئەم بابەتە یا ئەو بابەتە بڕیار وەربگرن یا لەو بڕیاردانە بەشداری بکەن کە لە دەزگا نێودەوڵەتێکان دژی بەرژەوەندییەکانی ئێمە دەدرێ ئەوا پێشنامەکان (عروضات) ئێمەتان لە کیس دەچێت.. ئەگەر دژی تورکیا هەڵوێست وەرنەگرن دو پۆل فڕۆکەتان لێدەکڕین.. هتد".

لەسەر ئاستی سیاسی و لە دەزگا نێودەوڵەتییەکاندا زۆر بە گەرمی پشتگیری لە کێشەی فەلەستین دەکرێ و بە پێچەوانەشەوە بە هیچ جۆرێك یارمەتی کورد نادرێ ئەمە لە کاتێکدا خەباتی کورد وەك خەباتی فەلەستینیەکان خەباتێکی ڕەوایە کەچی بەردەوام کێشەی کورد پشتگوێ دەخرێ. خەباتی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە لە دژی ئیسرائیل دەستی پێکردوە بەڵام زۆر بە خێرایی بووە چاودێر لە دەزگا نێودەوڵەتییەکانی وەك نەتەوە یەکگرتوەکان و کۆنگرەی ئیسلامی و دەرفەتی ئەوەیان پێدراوە نوێنەرایەتی خۆیان بکەن. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی فەلەستینیەکان لەسەر ئاستی سیاسەت و دەزگا نێودەوڵەتێکان دۆستی کاریگەریان زۆرە بەڵام کورد دوژمنی کاریگەری زۆرە.

دۆستەکانی کورد دوودڵن لە پشتگیری کردنی خەباتی ڕەوای کورد لەبەر ئەوەی ئیعتبار بۆ دوژمنانی کورد دادەنێن. ئەمەش هەڵوێستی هێندێك دەوڵەت و دەزگای نێودەوڵەتییە بەڵام ڕای گشتی جیهانی دیموکراتی گرنگییەکی زیاتر بە مەسەلەی کورد دەدات.

ولاّتانی وەك يەكێتی سۆڤێت و ولاّتـە يـەكگرتوەكانی ئـەمريكاو ڕێكخراوەكـانی وەك يــەكێتی ئوروپــاش هــەر لــەو چوارچێوەيــە گەشــە بــە سياســەتەكانيان دەدەن. ئــەو دەوڵەتانــە لــە ڕووی توانــا ئــابوری و پيشەســازيی زيــاتر لــە (١٠٠) مليــۆن عەرەبــەوە تەماشای مەسەلەی كـورد دەكـەن، هـەمان پرەنسيپ لەسـەر توركيـا و ئـێران جێبـەجێ دەكـەن. سياسـەتی ولاّتــە سوســياليزم و كۆمۆنيزمــەكانيش هــەر لــەو چوارچێوەيــەدا دەســوڕێتەوە. ئەگــەر لــە ڕوانگــەی بڕيــاری مــافی چــارەی خۆنوســينی گــەلان كــە پرەنسـيپێكی بنـەڕەتی سوسـياليزمە بڕوانينـە مەسـەلەی كـورد ئـەوا تـا ڕادەيــەكی زۆر هەڵوێستی ئەو دەوڵەتانە مايەی سەرسوڕمانە چونكە لـە واقيعـدا جياوازييـەكی گـەورە لـــە نێـــوان سياســـەتی ولاّتـــانی سوســـياليزم و كۆمۆنـــيزم و هەڵوێســـتی ولاّتـــە سەرمايەدارەكاندا نيــە. سوسياليسـت و كۆمۆنيسـتەكان زۆر بـە سـەركەوتويی سياسـەتی خۆگێلكـردن و گـوێ لێخـەواندن پيـادە دەكـەن. عـراق لـە دوای كيميابـاران كردنـی كوردەكانی باشوری كوردستان لە لايەن ولاّتـە يـەكگرتوەكان و يـەكێتی ئوروپـا و چـەند ولاّتێكـی دی ڕوبـەڕوی پەرچـەكرداری لاوازو شـەرمنانە بـووە، بـەلاّم ولاّتـانی بلۆكـی ڕۆژهـەلاّت لەسەرويشـيانەوە يـەكێتی سـۆڤێت بچوكـترين نارەزاييـان لـە دژی عـراق دەرنـەبڕی و ڕێكخـراوی ڕزگـايخوازی فەلەسـتينيش بێدەنگی لێكـردو بـە هيـچ جۆرێك ڕەخنە يا نارەزايی دەرنەبڕی بۆيە پێم وايە كاتێك ڕێكخـراوی ڕزگـاريخوازی فەلەسـتين پشتگيری لە ڕێو شوێنە كۆلۆنيالی و فاشييەكانی سەدام حوسـەين دەكـات بـەو كـردەوەی لايەنگری لە قەتلوعام و كوشتنی بە كۆمەڵ دەكات. ئـەمجۆرە هەڵوێسـتە كارئاسـانی بـۆ سـەدام حوسـەين دەكـات بـۆ ئـەوەی پرۆسـەی قـەلاّچۆكردن جێبـەجێ بكـات و بۆچونـە فاشيستی و كۆلۆنياليەكانيش هاندەدا.

پيـادەكردنی سيسـتمی كۆلۆنيـاليزمی جيـهانی لـە كوردسـتان و چەوسـانەوەی وەك كۆلۆنيەكی هاوبەش لە هەناوی ئەم كێشەيەدا هەيە.

پێشــتر ئــەوەمان باســكردوە ئيســرائيل نــە دەتوانــێ و نــە ئازايــەتی كيميابــارانی فەلەسـتينيەكانی هەيـە. ئێسـتا ئەگـەر بـە مەبەسـتی ڕودانـی ڕوداوێكـی لـەو جـۆرە گريمانەيەكی زۆر لاواز وێنا بكەين: ئەگەر ئيسرائيل چەكی كيميـايی بەكاربـهێنێ ئـەوا

سیاسەتی هەمو دونیا دەشلەژێت چونکە لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامی و وڵاتەکانی دی خۆپیشاندان لە بەردەم بارەگای ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان سازدەکرێ و بەیاننامە دەردەکرێت و کۆڕو کۆبونەوەو کۆنگرە دەبەسترێت و سیاسەتی ئیسرائیل شەرمەزار دەکرێت. پارلەمانەکانی دونیا بڕیار لە دژی ئیسرائیل دەردەکەن و تاوانەکە دەچێتە خشتەی کاری دەزگا نێودەوڵەتییەکانەوەو پرۆژە لە دوای پرۆژە گەڵاڵە دەکرێت و لەسەر ئاستی جیهان ئیسرائیل گۆشەگیر دەکرێ و سەپاندنی گەمارۆی ئابوری و دارایی و دیبلوماسی لەسەر ئیسرائیل گفتوگۆی لەسەر دەکرێ. بەڵام بە کیمیابارانکردنی کورد هیچ شتێکی لەو جۆرە ڕونادات بۆیە ئەو کەسانەی سەرەڕۆیی لە جێبەجێ کردنی جینۆساید دەکەن دەرکردنی ناڕەزاییەك یا دو ناڕەزایی لاوازو شەرمن نایانترسێنێت.

واقیعی پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان ئەم حاڵەتەی لێکەوتۆتەوە. سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" خەسڵەتی گەورەی دەبێت بۆ ئەو کەسانەی پیادە دەکەن. دزینی سامانی کوردستان دەبێتە مایەی هاوکاریکردنی ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆڵۆنیەکی هاوبەش لە نێوان خۆیان دابەشدەکەن.

## مەسەلەی کورد مەسەلەی کەمایەتی نیە

لێرەدا پێویستە بڵێین کورد کەمایەتی نیە چونکە کورد لە نیشتمان و لەسەر خاکی خۆی دەژی و خەڵکی ڕەسەنی ئەم وڵاتەیەو لە هەرێم و ناوچەکانی دی نەهاتووە بۆ کوردستان، بەڵام تورك لە سەدەی یازدەهەمی زاینی گەیشتۆوەتە ئەنادۆڵ. کورد وەك عەرەب و فارس خەڵکی ڕەسەنی ڕۆژهەڵاتی نزیکە. کوردستان بە ویستی سیاسەتی ئیمپریالیزم و کۆڵۆنیالیزم پارچە پارچە و دابەش و پەرتەوازە کراوەو دابەشکردنی کوردستان ڕێژەی دانیشتوانی کورد لەناو سنوری هەر یەکێك لەو دەوڵەتانە کەمبۆتەوە، بەڵام ئەوەی شایانی جەخت لەسەر کردنە کە ئەستەمە قسە لەسەر کەمایەتیەك بکرێ ڕێژەی دانیشتوانی نزیکەی (٣٠) ملیۆن کەس دەبێت.

لەم دواییانەدا کەسانێك لە سیاسییە ڕەگەزپەرست و کۆڵۆنیالیستە تورکەکانی وەك بوڵند ئەجەوید دەڵێن: کورد کەمایەتی نیە، بەڵکو وەك هەر تورکێکی دی سەر بە

زۆ رینەیەکە کۆماری تورکیایان دامەزراندوە، لەبەرئەوە نابێت کورد داوای مافی زمان و کولتـور و مافـە نەتەوایـەتیو دیموکراتیـەکانی بکـات چونکـە تەنـها کەسـانی جوداخـواز ئیدعای بارودۆخێکی تایبەت بە خۆیان دەکـەن، ئەمـە لـە کـاتێکدا ئـەوانیش وك تـورك میللەتێکن کۆماری تورکیایان دامەزراندوە. لە لایەکی دی، بولنـد ئەجـەوید "تـورك بـە گروپێکـی ئـەتنی دانـانێت بـەڵکو بـۆ نـاوی نەتەوەیـەك بـەکاریدەهێنێ لـە دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە چوارچێوەی پەیمانێکی نیشتمانی لە ڕێگەی تێکەڵ بون و توانەوەی تورك و کوردو عەرەب و قوقاز و ئەوانی دی دروست بوە".

پێویستە ئەم پێناسە هەڵەیە هەم بە درۆ بخرێتەوەو هـەم دژایـەتی بکـرێ. ئایـا لـە کوێ زۆرینەیەك هەیـە تەنانـەت وەك ئەرمـەن و یۆنـان و جولەکـەش مـافی کەمایـەتی نەبێت، چ جای دانپیانان بە مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی کورد؟! لە تورکیـا ئـەم ڕستەیە بەکاردەهێنرێ: "نەتەوەی کورد بونی نیە، ئەوانە هـەمویان تورکـن"، هـەرچی شـتێك لەگـەڵ ئـەم وتەیـە نـاکۆك بێـت نکۆڵـی لێدەکـرێ، واتـە نکۆڵـی لـە بونـی کـورد دەکرێت. کاتێك تورکیا ڕایدەگەیەنێت هەمو کورد تورکـە، دەیـەوێت بڵێـت نەتەوەیـەك بوونی نەبێت ئەستەمە داوای مافەکانی بۆ بکرێت. هێندێك لە سیاسییە ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالیسـتە تورکـەکانی وەك بولنـد ئەجـەوید لـە پـاڵ گـەلێك لـەو ڕوناکبیرانـەی دەڵێن: "کورد بەشێکە لە زۆرینە" کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی مافـە نەتەوایـەتی و دیموکراتیـەکانی کـورد دەکـەن. ئـەم دوو فۆرمـە بـۆ ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی دەوڵـەت جیاوازییـەکی گـەورەی نیـە. ئـەم بیروڕایانـە بەرهـەمی چەمکێکـە لـە جـۆرە دیموکراسییەتێك کە تایبەتە بە تورك و بە ڕێگەیەکی تورکـی پـەتی لـە پێنـاوی تـورك دروسـت بـووە دیموکراسـییەتێکیش کـە ئـەم جـۆرە هەڵوێسـتە ڕەگەزپەرسـتی و کۆلۆنیالیزمەی لەخۆ گرتبێت دەبێ هەر بەم سـیمایەوە دەربکـەوێ کـەچی خـودی ئـەو کەسانە هـەر زوو تـوڕەو نارەحـەت دەبـن ئەگـەر ڕۆژنامەنوسـێکی بولگـاری لەسـەر کەمایەتی تورکی بولگارستان بنوسێت و بڵێت تـاوانی تـورك نیـە کـە نـازانێ بـە زمـانی بولگاری نادوێت چونکە دەوڵەت فێری زمـانی بولگـاری نـەکردون. ئـەم بۆچونـەش ئـەو ڕاسـتیە دەردەخـات کـە فـێربون و قسـەکردن بـە زمـانی تورکـی یەکێکـە لـە مافـە

سەرەكییەكان. ڕەگەزپەرستی چیە جگە لەوەی كاتێك مرۆڤ داوای مافی قسەكردن و مافی كولتوری بۆ كەمایەتیەكەی خۆی دەكات بەلأم هەمان ماف بۆ نەتەوەیەكی دی یا میللەتێكی دی ڕەتدەكاتەوە. ئەم هەڵوێستە زۆر بە ساكاری هەڵوێستێكی ڕەگەزپەرستانەیە. هەڵوێستی ڕەگەزپەرستی كۆلۆنیالیزمی ڕەفتارو بیركردنەوەی تاك و دەزگاكان والێدەكات كە بە پێی پرەنسیپی بانێك و دو هەوا هەڵسوكەوت بكەن.

سیاسی و ڕوناكبیرە توركەكانی وەك بولّند ئەجەوید ڕەخنە دوو هەڵوێستی و دووڕوویی وڵاتە ڕۆژئاواییەكان و ڕای گشتی ڕۆژئاوا دەگرن لەبەرئەوەی وەك پێویست ناڕەزایی لە دژی چەوسانەوەی توركەكانی بولگارستان دەرنابڕن بەلأم ئەو كەسانە تەنانەت بەمشێوە تاوانبار كردنەش ناتوانن دوو هەڵوێستی و دووڕوویی خۆیان بشارنەوە، چونكە لە توركیا كورد ڕووبەڕووی ستەم و چەوسانەوەیەك دەبێتەوە نەك هەر لە چەوسانەوەی توركەكانی بولگارستان ترسناكترە بەڵكو لە دونیادا وێنەی نیە، بۆیە هەتا سیاسی و ڕوناكبیرانی تورك لە دژی ستەم و چەوسانەوەی كوردەكان توركیا ناڕەزایی دەرنەبڕن و هەتا لە دژی كردەوە ڕەگەزپەرستی و كۆلۆنیالیەكان لە تێكۆشان دوابكەن و هەتا لایەنگری لە سیاسەتی چەوسانەوەو ستەم بكەن و هەتا بەڵگە بۆ دووهەڵوێستی خۆیان بهێننەوە، لە لایەن وڵاتانی ڕۆژئاواوە داواكارییەكانیان لەسەر بارودۆخی توركەكانی بولگارستان بە هەند وەرناگیرێ. لەم ساڵانەی دواییدا ڕۆژئاوا بە شێوەیەكی باشتر دەڕوانێتە مەسەلەی كورد. ئەو گرنگییەی دەزگا دیموكراتیەكان و ڕای گشتی دیموكراتی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە مەسەلەی كورد دەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاترو بەهێزتر دەبێت.

مەسەلەی كورد پەیوەندی بە كەمایەتی و مافی كەمایەتیەوە نیە. گەوهەری مەسەلەی كورد لەو ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێ كە دەوڵەتە ئیمپریالی و دەستوپێوەندەكانی لە ڕۆژهەلأتی نزیكدا نەتەوەی كورد و كوردستانیان دابەش و پارچە پارچە كردووەو مافی دامەزراندنی دەوڵەتێكی سەربەخۆیان لە نەتەوەی كورد زەوتكردووە.

پێویسته سەرنج بدەینە ئەو چەمکەی لەم ڕۆژانەدا بە زۆری دوبارە دەبێتەوە، نوێنەرە نمونەییەکانی سیاسەتی کۆلۆنیالیزم و ڕەگەزپەرستە تورکەکانی وەك ئیردال ئینونو Erdal Inonu و جوشکون کیرجە Coskun Kirca بانگەشەی چەمکی "پان کوردیزم Pan Kurdisme " دەکەن، ئیردال ئینونو دەڵێت؛ نامانەوێت مەسەلەی کورد لە پرۆگرامی حزب گەلاڵە بکەین چونکە لەم حاڵەتەدا دەبێتە بانگەشە بۆ جوداخوازی. ئەوەی مایەی بێزاری و توڕەبونە، ئەو سیاسی و نوسەرە تورکە ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالیستانەی بانگی یەکگرتن و لێك نزیك بونەوە دەدەن و چەمکی "پان کوردیزم" دادەهێنن بەرامبەر بە حەقیقەتی پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان بە هاوکاری ئیمپریالیزمی فەرەنسی و بریتانی بێدەنگ دەبن. ئەو خەڵکانە بارودۆخی کۆیلایەتی بۆ کورد پێشنیاز دەکەن و هەر لەبەر ئەو هۆیەش حەوت پارلەمانتاری کوردیان لە حزب دەرکرد لەبەرئەوەی لە ئوکتوبەری ١٩٨٩ لە پاریس بەشدارییان لە کۆنگرەی "کورد: مافی مرۆڤ ناسنامەی کولتوری" کردبو. پێش ئەوەش تورکیا حەسانەی (حصانە) لە پارلەمانتارێك سەندبووە لەبەرئەوەی وتەیەکی لەسەر میللەتی کورد لە ئەنجومەنی پارلەمانی کۆمەڵەی ئوروپا پێشکەش کردبو. ڕەفتاری پارتی گەلی سوسیال دیموکرات ئەو پارتەی ڕەگەزپەرستی و ئیمپریالگەرایی تورکی زیندوکردۆتەوە ڕەفتارێکی نامۆ نیە چونکە سیاسەتی پارتی ناوبراو ئیرادەی میللەت و پێداویستیەکانی لەبەرچاو ناگرێت. ئەم حزبە لەسەر ڕێبازی ئایدولوجیای ڕەسمی و دەزگا گرنگەکان خۆی ڕێکدە خات. ئەم ڕستەیەش بە جوانی ئەم بۆچونە ڕوندەکاتەوە: "ئەم کارە نەك پەیوەندی بە حەوت پارلەمانتارەوە هەبێت بەڵکو ئەگەر پەیوەندی بەهەر پەنجاو حەوت پارلەمانتارەکەوە بێت دیسانەوە هەر دەبێ لە حزب دەربکرێن، تەنانەت ئەگەر لە دوای ئەم ڕەفتارە پارلەمانتارەکان هەمویان بەشداری نەکەن، لەم حاڵەتەشدا هەر ناچار دەبین لە حزب دەریان بکەین".

بەڵام ئەوەی بە ڕاستی مایەی شەرمەزارییە، هێندێك کورد بەشداری و پاڵپشتی لە جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە کۆلۆنیالیزمی و ڕەگەزپەرستانەیە دەکەن. ئەم ڕەفتارە سوك و ڕیسوایە سروشتی مرۆڤ پێشێل دەکات. هەڵوێستی هێندێك ئەندامی پارتی

گەلی سوسیال دیموکرات کە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ لە برۆکسل وەك چاودێر بەشدارییان لە کۆبونەوەکانی پارلەمانی ئوروپا کردوە لە نمونە زەقەکانی ئەم ڕەفتارەیە. کاتێك پارلەمانی ئوروپا ئەم بڕیارەی دەرکرد: "ئەو وڵاتانەی کوردی تیا دەژیت پێویستە مافی ئۆتۆنۆمی ئیداری و کولتورییان بۆ دەستەبەر بکرێ، ئەندامەکانی پارتی ناوبراو ناڕەزاییان لەسەر ئەم بڕیارە دەربڕی و هەوڵیاندەدا تەگەرەی بۆ دروست بکەن و ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە هەست بە ئارامی دەکەن لە تورکیادا و ئۆ تۆنۆمییان ناوێت. پارلەمانتارەکانی ئوروپا ڤێزیان لەو ئەندامانەی پارتی گەلی سوسیال دیموکرات دەکردەوە کە ئۆتۆنۆمیان ڕەتدەکردەوەو ژیانی کۆیلایەتیان قبوڵ دەکرد. ڕۆژنامەی جمهوریەتی تورکی لە ڕۆژی ١٩٨٩/١٢/٦ بەمشێوەیە لەسەر ئەم ڕوداوە دەنوسێت: "ئەو کەسانە هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەن بۆ ئەوەی دەرسی دیموکراسی و سەربەخۆیی بە کورد بڵێنەوە" ڕەوانەکردنی پارلەمانتارە کوردەکان بۆ ئەمجۆرە کۆبونەوانە بە یەکێك لە سیاسەتە ئیستراتیجیەکانی پارتی گەلی سوسیال دیموکرات دادەنرێت و ئەمەش ڕوویەکی دزێو و قێزەونی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیستی تورکیایە. ئەو کەسانەی داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەکەن و دەیانەوێت لەو کۆبونەوانە وتارێك بخوێننەوە لە حزب دەردەکرێن وەك کۆبونەوەی برۆکسل بەڵام ئەوانەی ئۆتۆنۆمی ڕەتدەکەنەوە و کۆیلایەتی قبوڵ دەکەن بە بیانوی ئەوەی خەڵکانی سوسیال دیموکراتن ڕەوانەی ئەو کۆبونەوانە دەکرێن. حکومەتی تورکیا پێی باشە ئەو جۆرە کارانە بە حزبی ناوبراو بسپێرێ.

پێویستە لەسەر مەسەلەی ڕەگەزپەرستی چەند وشەیەك باس بکرێ، ڕەگەزپەرستی تورکیا لە ڕەگەزپەرستی وڵاتە یەکگرتوەکان و سەردەمی پێشووی باشوری ئەفریقیا ناچێت بەوەی ڕەگەزەکان لەسەر ئاستی گەڕەك، خوێندنگە، گازینۆو کەناری دەریا لە یەکتری جیابکرێنەوە بەڵکو ڕەگەزپەرستی تورکیا دیوێکی دی هەیە، چونکە لە تورکیا تیرۆری دەوڵەت بە مەبەستی لەناوبردنی کولتوری کورد بەکاردەهێنرێ تاکو کولتورو زمانی تورکی بەسەر کوردا بسەپێنێت. ڕەگەزپەرستەکان نکوڵی لە بونی زمان و نەتەوەی کورد دەکەن و هەمو دانیشتوان بە تورك دادەنێن.

جیهان هاوتای ئەمشێوە ڕەگەزپەرستیەی بە خۆیەوە نەدیوە لەبەرئەوەی لە سیاسەتی ئەفریقیا زۆر وێرانکارترو کۆنەپەرستترە. ئەم سیاسەتە ڕەوشتێکی بەردەوامی کۆلۆنیالیزمی تورکیایە لە کوردستاندا.

## هەڵوەشانەوەی کۆلۆنییە کلاسیکییەکان و کوردستان

جیاوازییەکی گرنگی دی لە نێوان کۆلۆنییە کلاسیکییەکان و کوردستان دا هەیە، کاتێك لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە چوارچێوەی کۆمەڵەی (عصبە) نەتەوەکان کۆلۆنیە تازەکان دروست کران یا ڕاستترە بڵێین دۆخێکی تازە بۆ کۆلۆنییەکان دەست نیشانکرا کەس پێی وا نەبو ئەو دۆخە تازەیە دەبێتە حاڵەتێکی هەمیشەیی، بەڵکو پێیان وابو کۆلۆنیەکان لە دوای ئەوەی پەیکەری ئابوری و سیاسی و کارگێڕییان بەهێز دەبێ ئیتر وڵاتە ئیمپریالییە کۆلۆنیالیستەکە دەکشێتەوەو کۆلۆنییەکانیش سەربەخۆییان پێدەبەخشرێ و تا ئەوەش دێتە دی کۆلۆنیالیزم ئەرکی بە سیڤیل کردنی میللەت -تمدین الشعب- ئەنجام دەدا. لە ئەفریقیا تەنها چەند دەوڵەتێکی دیاریکراو بە شۆڕشی چەکداری سەربەخۆییان بە دەست هێنا، ئەگینا زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا لە ڕێگەی تێکۆشان و کردەوەی یاساییەوە سەربەخۆییان بە دەست هێناوە، بەڵام کورد چارەسەرێکی هەتاهەتایی بەسەرا سەپێنراوە چونکە دەیانەوێ نەتەوەی کورد بۆ هەتاهەتایە بەبێ ناسنامەو بە کۆیلەیی لە دۆخێکی پارچە پارچەبون و پەرتەوازەییدا بمێنێتەو ە. لەگەڵ ئەوەی بارودۆخی کوردستان لە ئاستی کۆلۆنی نزمترە کورد و کوردستانیش بێ ناسنامەیە.

ئەو ڕوداوانەی بوە هۆی دروستبونی کۆلۆنییە کلاسیکیەکانی پەیوەندییان بە کوردستانیشەوە هەبو بەڵام ئەو کاتە مەسەلەی کورد نەخرایە ڕوو، هەروەها ئەو کێشانەی ڕوبەڕوی کوردستان بوونەوە لەکێشەی کۆلۆنییە کلاسیکیەکان ترسناکتر بوون. لە سەدەی نۆزدەهەم گەلێك هۆکار بووە مایەی سەرهەڵدانی کۆلۆنیالیزم. لە لایەك، وڵاتە پیشەسازییەکان پێویستیان بە کەرەستەی خاوی وەك نەوت و کرۆم و لاستیك و شتی دی هەبو کە بە زۆری لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و دوور و لە ئەمریکای

ناوەڕاست و ئـەمریکای باشورو ئـەفریقیا پـەیدا دەبـو بۆیـە کـارێکی سروشـتی بـوو بایەخێکی زیاتر بەو هەرێمانە بدرێت. لە لایـەکی دی پێویست بـوو بـازاڕێکی تـازە بـۆ ساغکردنەوەی بەروبومە پیشەسازییەکان بدۆزرێتەوە بـە جۆرێـك ئـەو وڵاتـەی دەبێـت بـە سـەرچاوەی کەرەسـتەی خـاو لـە هـەمان کـاتدا ببێـت بـە بـازاڕێکی تـازەش بـۆ ساغکردنەوەی بەروبومی وڵاتە پیشەسازییەکان.

لەبەرئەوەی هەر وڵاتێکی پشەسازی دەیویست پێش وڵاتەکانی دی بگاتە هەرێمەکـە دژایەتی نێوانیان زۆر گەرم بوو چونکە ئەو دەوڵەتانە بە پێی ئەم پرەنسیپە ڕەفتاریان دەکـرد: "ئەگـەر ئـەم هەرێمانـە بـۆ بـەرژەوەندی خـۆم مسـۆگەر نەکـەم، خـەڵکانی دی دەستی بەسەرا دەگـرن"، بەمشـێوەیە کاریـان دەکـرد بـۆ ئـەوەی بـە زووتریـن کـات ئـەو هەرێمانـە بـە ئـابوری و وڵاتەکـەی خۆیانـەوە بلکێنـن. سـەرەتا وڵاتـە کۆڵۆنیالییـەکان دەستیان کرد بـە نـاردنی خـەڵکانی هونـەری و فەرمانبـەرانی کـارگێڕی و مامۆسـتایانی زانکۆو پیاوانی ئاینی و پیاوانی ئاسایش و.. هتـد، دوای ئـەوەش هـاندەرێکی گرنگـی دی بـۆ دەرکـەوتنی سیسـتمی کۆڵۆنیـالیزم پـەیدابوو. دەوڵەتـە کۆڵۆنیالیزمـەکان بـۆ ئـەوەی هاووڵاتیانی خۆیان لە دانیشتوانی وڵاتەکەو مرۆڤ خۆرەکـان بپـارێزن ژمـارەی پیـاوانی ئاسایشیان لەو وڵاتانە زیاد دەکرد.

یەکێك لە هۆیەکانی بە کۆڵۆنیالیکردنی هەرێمێك یا لکاندنی بە ناوچەی کاریگەری ئیمپریالیزمـەوە هـۆی ئیسـتراتیجیە. بـۆ نمونـە بـەرژەوەندی سـەرەکی لـە نێـوان وڵاتـە یـەکگرتوەکان و ڤێتنـام لـە سـاڵانی شەسـتەکان تەنـها لەسـەر چۆنێتـی بـەکارهێنانی سەرچاوە سروشتیەکان یا دۆزینـەوەی بـازاڕی تـازە لـە هەرێمەکـە ڕانەوەسـتابوو بـەڵکو پەیوەندی بە بەرژەوەندییـە ئیسـتراتیجیەکانی ئـەمریکاوە هـەبو، واتـە هـەر دەوڵـەتێك ڤێتنام کۆنـترۆڵ بکات دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێت سەرتاسـەری هـەرێمی ڕۆژهـەڵاتی دوور کۆنـترۆڵ بکات بە پێچەوانەشەوە ئەگەر ڤێتنام لە دەسـت بـدات کاریگـەری لەسـەر گشت هەرێمەکە لاواز دەبێ. ئەم پرەنسـیپە لـە سیاسـەتی دەرەوەی وڵاتـە یـەکگرتوەکان بـە "تیـۆری دۆمینـۆ" نـاودەبرێت، واتـە ئەگـەر بزوتنەوەیـەکی شۆڕشـگێڕی یـا بزوتنەوەیەکی کۆمۆنیستی لە هەر وڵاتێکی باشوری ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا بتوانێـت ڤێتنـام

کۆنترۆڵ بکات ئەوا حکومەتەکانی هەرێمەکە یەك لە دوای یەك دەکەونە ژێر دەستی ئەو بزوتنەوە شۆڕشگێڕە، بەوەش سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکان توشی ئیفلیجییەکی تەواو دەبێت.

هەمان هۆکار لەسەر پرۆسەی بە کۆلۆنیکردنی کوردستان هەبوە، کەرەستەی خاوی وەك نەوت و ئاسن و مس و فۆسفات و کانە خەلوزو سەرچاوەکانی دی کوردستان و پرەنسیپی "ئەگەر منیش ئەم سامانە بۆ خۆم نەبەم خەلکانی دی دەستی بەسەرا دەگرن" و بیرۆکەی پاراستنی هاوولاتیان هاندەری زۆر گرنگ بون لە کۆلۆنیکردنی کوردستاندا. ئایا تا ئەمڕۆش هەمان هۆکارو هاندەر لە پشتەوەی مەسەلەی کورد نیە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی کوردستان ڕوندەبێتەوە، واتە سیاسەتێکی کۆلۆنیالیزمی بە شێوەیەکی هاوبەش لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە جێبەجێ دەبێت کە دەیانەوێت بەرژەوەندی ئیستراتیجی بەدەست بهێنن.

کاتێك چەند دەوڵەتێك بە شێوەیەکی هاوبەش سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی پیادە دەکەن ئیتر مەسەلەکە پەیوەندی بە کێشەی چەندایەتییەوە نامێنێ، چونکە پیادەکردنی سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی بە شێوەیەکی هاوبەش لە لایەن چەند د ەوڵەتێکەوە -کوردستان لە لایەن چوار دەوڵەتەوە- دەبێتە مایەی گۆڕانکاری چۆنایەتی لە خاسیەتی پەیوەندی نێوان میللەتی کۆلۆنیالیکراو کۆلۆنیالیستەکان ئەوەش ئەوەیە کە مەبەستمانە کاتێك دەڵێین "کوردستان وڵاتێکە تەنانەت لە ئاستی کۆلۆنی نزمترە".

هەروەها پێویستە "ئەو سیاسەتەی کە لە وڵاتەکانی بەلقاندا پەیڕەو کراوە تێکەڵ نەکەین لەگەڵ دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی کوردستان لەبەرئەوەی "بەلقەنە کردن" ئەلتەرناتیفێکە بۆ سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"، کەواتە بۆ ئەوەی ناوچەی بەلقان لە ڕوی سیاسییەوە ببێتە مەڵبەندێکی نائارام کاری شەڕئەنگێزی لە نێوان میللەتە دراوسێکانی ناوچەکە دەوروژێنرێ، بۆیە دەبینین کاتێك ئاگری ناکۆکی نێوان ئەو میللەتانە خۆشدەکرێ کە زۆر بە هێمنی و دۆستانە پێکەوە دەژین، بەوەش دوژمنایەتی نێوان ئەو میللەتانە تەشەنە دەکات. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە دژایەتی لە نێوان بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان لەو مەڵبەندە قوڵتر بۆتەوە.

بەڵام ئەوەی لە کاتی پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان ڕویدا بە تەواوەتی پێچەوانەی ڕوداوەکانی ناوچەی بەلقان بوو چونکە ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆڵۆنیەکی هاوبەش دەچەوسێننەوە، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ڕێگەی تەبایی و هاوکارییان گرتەبەر. ئەگەر شەڕو پێکدادان لە نێوان هێزە نیشتمانیەکانی کوردو دەوڵەتە کۆڵۆنیالیستەکان ڕوبدات ئەوا حاڵەتی نائارامی شەقڵێکی زۆر جیاواز بە خۆیەوە دەگرێ. ئەم حاڵەتە بەبێ ئەوەی بیانەوێ بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئارەزو و ئیجرائاتەکانی هەر چوار دەوڵەتە کۆڵۆنیالیستەکە دروست دەبێت.

## ململانێی ئیمپریالیزم لەسەر دابەشکردنی کوردستان

## ( ١٩١٥-١٩٢٥ )

پێشتر باسی ئەوەمان کردوە کە سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" سیاسەتێکی ئیمپریالییە. لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم کورد و کوردستان بە پێی پەیماننامەی لۆزان دابەشکرا. گرنگترین لایەنی پەیماننامەی لۆزان وەك پەیمانێکی ئیمپریالی لە ساڵی ١٩٢٣ بریتیە لە دابەشکردنی کوردستان و نەتەوەی کورد. ئەم پەیماننامەیە بۆ کوردو تورك بایەخ و گرنگی زۆر جیاوازی هەیە. ئەم پەیماننامەیە بۆ تورك مانای دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەگەیەنێ، و پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتیە گرەنتی جۆراوجۆر بۆ تورکیای سەربەخۆ زامن دەکات. بەلام ئەم پەیماننامەیە بۆ میللەتی کورد بریتیە لە چەسپاندنی چەوساندنەوەو کۆیلایەتی و بە کۆڵۆنی کردنی کوردستان و ملپێدانی بۆ سیستمی کۆڵۆنیالیزمی نێودەوڵەتی -بۆئەوەی بتوانین بە شێوەیەکی ڕاست ڕوداوەکان بخوێنینەوە پێویستە تەنها لە ڕوانگەی ململانێی چینایەتییەوە تەماشای مێژوو نەکەین بەڵکو پێویستە لە ڕوانگەی ئیرادەو داواکاری گروپە ئەتنیەکانیشەوە (جماعات عرقيه) تەماشای مێژوو بکەین، بۆ نمونە تورك و یۆنانی تێڕوانینی جیاوازیان لەسەر شەڕی تورکیا- یۆنان هەیەو عەرەب و تورك بیروڕای زۆر جیاوازیان هەیە لەسەر دیاریکردنی هەڵوێستی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە

ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمداو تورك و ئەرمەن دید و بۆچونی زۆر جیاوازیان لەسەر مەسەلەی ئەرمەنیەکان هەیەو ڕاڤەکردنی مێژوونوسە بولگاری و ڕۆمانیەکان بۆ مێژوی تورك لەگەڵ ڕاڤەکردنی مێژوونوسە تورکەکان جیاوازی زۆرەو عەرەب و ئێرانیەکانیش یەك دیدو بۆچونیان لەسەر شەڕی کەنداو نیە. لەبەرئەوە پێویستە کورد خۆی بە دوای مێژوی خۆیدا بگەڕێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات چونکە مێژوی کورد هەرگیز لەسەر زانیارییەکانی زانکۆکانی تورکیاو ڕۆژنامەو دەزگا کولتورییەکان و ڕوناکبیرانی تورك نانووسرێتەوە، کەواتە ئەو زانیاریانەی لە کتێبخانەی زانکۆکان و لەلای نوسەرە تورکەکان دەستدەکەوێت بۆ ڕەوایەتی (الشرعیە) و درێژەپێدانی کۆلۆنیالیزمی تورك سوودیان لێوەردەگیرێ و هەمیشە بۆ بە تورك کردنی کورد، پشت بەو زانیاریانە دەبەستن.

دووبارەکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە ئەرکی سەرشانی هەمو کەسێکە چونکە لێکۆڵینەوەی ڕوداوەکان لە ڕوانگەی گروپە ئەتنیەکانەوە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم پرەنسیپە لە هەمو دونیا پیادە کراوە. مارکسیەکان لەبەرئەوەی خۆیان بە مارکسیزمی دەزانن لە گۆشەنیگای چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕوداوەکان دەکەن. تەنها کاتێك دەتوانین کێشەی ناسنامەی نەتەوایەتی کورد پشت گوێ نەخەین ئەگەر لە گۆشەنیگای چینە کۆمەڵایەتێکانەوە تەماشای ڕوداوەکان بکەین.

هەروەها پێویستە بیرۆکەیەکی دی بۆ سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" زیاد بکرێ لەبەرئەوەی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" قەوارەی نەتەوە وێراندەکات و لەبەریەك هەڵیدەوەشێنێتەوە. ئەو میللەتەی دەبێتە ئامانجی ئەم سیاسەتە گەورەترین کارەساتی بەسەرا دێت. ئەو میللەتەی ئەمجۆرە لێدانە کەمەرکشێنەی بەربکەوێت زۆر جاران ناتوانێت خۆی بونیاد بنێتەوە. کۆمەڵگەی کوردەواری لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم ڕووبەڕووی ئەم کارەساتە بوویەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمیش جارێکی دی کاریگەری ئەم کارەساتە گەورەتر بۆوە، کورد ماوەی (٧٠) ساڵ زیاترە هەوڵدەدا زیانەکانی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" قەرەبو بکاتەوەو ڕای گشتی وڵاتانی دیموکراسی لە ستەمی ئەم سیاسەتە تێبگەیەنێت. میللەتی ئەرمەن لە سەردەمی

حوکمی ئیمپراتۆرێتی فارس- عوسمانی ڕووبەڕووی پارچە پارچەبون و دابەشکردن بوەتەوەو پاشان جاری دوەم لە نێوان ڕوسیای قەیسەری و ئێران دابەشکرایەوە.

کاتێك کەمالیەکان لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم و لە ماوەی شەڕەکانی یۆنان- تورکیاو تورکیا-ئەرمەن دژایەتی ئینگلیزەکانیان دەکرد لە ڕاستیدا تەماحیان لە بەشێکی گەورەی کوردستان هەبو بۆیە ئەو شەڕە بە شەڕێکی ئیمپریالی و کۆلۆنیالی دادەنرێ. شەڕی نێوان کەمالی و ئینگلیزەکان هەرگیز سیمای دژ بە ئیمپریالیزمی نەبو.

چ ڕوداوێك لەوە خراپترە میللەتێك ببێت بە ئامانجی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"؟ مەگەر بومەلەرزەیەك (٢٠-٣٠) ملیون کەس لە ڕۆڵەکانی ئەو میللەتە لەناوبەرێت. ڕەنگە میللەتێك لەژێر کاریگەری گوشاری دەرەکی بە تەواوەتی لەناوبچێت وەك ئەمریکای ناوەڕاست و باشور لە سەدەی شازدەهەم و ئەمریکای باکور لە سەدەی نۆزدەهەم. کاتێك کۆلۆنیالیستە ئسپانی و پورتوگالی و ئوروپاییەکانی دی بە خۆیان و چەکەکانیان بە ڕێگەی ئاو گەیشتنە ئەمریکا، خەڵك و کولتورو شارستانی میللەتانی مایاو ئەنکاو ئەزتیك-یان لەناوبرد. مێژوی ئەو میللەتانە پڕە لە کارەساتی گەورە بەڵام ئاکامی کارەساتی ئەو میللەتەی دەبێتە قوربانی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" نەك هەر لەو مەترسیانە کەمتر نیە بەڵکو لەوانەیە خراپتریش بێت.

مێژوی کوردستان ڕوداوی یەکلایی کەرەوەی تیایە، بۆیە جێگەی خۆیەتی لێکۆڵینەوە بکرێ لەسەر پەیوەندی گوتی-ئاشوری و پەیوەندی پارس- میدیا لەگەڵ ئەو دەورەی ئۆراتۆ لەم پەیوەندییانەدا بینیویێتی. ئەو زانیاریانەی لەسەر گۆتیەکانی میزۆپۆتامیا (ناوچەی دوئاوان) هەیە بۆ ساڵی (٣١٠٠ پ. ز) دەگەڕێتەوە.

شالاوی ئاشورییەکان بۆ سەر کورد ڕوداوێکی گرنگ بو، تابلۆیەکی قوڕ دۆزراوەتەوە کە لەسەری نوسراوە: "سەرتاپای وڵاتی میللەتی گۆتی هەر لە شاخەکانی ئاراراتەوە تا حەران لە دەریایەکی خوێن نوقوم کرا". ساڵی ٦٠٠ پ. زاینی مادەکان مەملەکەتی ئاشورییەکانیان لەناوبرد.

لە سەدەی حەوتەمی زاینی وەرچەرخانێکی گرنگ لە مێژوی کورد ڕویدا. لە دەوروبەری ساڵی ٦٤٠ زاینی و لە ڕۆژگاری خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب شەڕێکی

خوێناوی لە نێوان کورد و ئیسلام ڕویدا، لەبەرئەوە پێویستە بە هەموو دڵنیاییەکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم مەسەلانە بکرێ: سروشتی سیستمی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد تا سەدەی حەوتەمی زاینی چۆن بو؟ سروشتی سیستمی ئابوریان چۆن بوە؟ چاندن و دروێنەیان چۆن بو؟ چۆن کشتوکاڵیان دەکرد؟ ئامرازی بەرهەمهێنانیان چی بو؟ ئەو تەکتیکەی پشتیان پێدەبەست چی بو؟ چ جۆرە بیروباوەڕێکی ئاینیان لە پێش ئیسلام دا هەبو؟ دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییە باوەکانی کوردستان لە پێش داگیرکردنی ئیسلام چۆن بوە؟ ئیسلام چۆن ئەو دەزگایانەی گۆڕیوە؟ ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە مێژووەوە هەیە زۆر گرنگن و پێویستە بە تێرو تەسەلی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ.

هەروەها لە سەدەی یازدەهەمی زاینی مێژوی کورد وەرچەرخانێکی گرنگی بە خۆیەوە دیوە چونکە کورد لە نیوەی دوەمی ئەم سەدەیەدا ڕووبەڕوی ئەو تورکە ئۆغۆزانە بۆوەتەوە کە لە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتبون. پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ڕوبەڕوبونەوەیەو دەرئەنجامەکانی بکەین. هەروەها پێویستە سروشتی سیستمی ئابوری و کۆمەڵایەتی کورد لە پێش ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ تورکە ئۆغۆزەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ. سروشتی دەزگا ئابوری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی کورد چۆن بوە؟ ڕواڵەتی ژیانی ڕوحییان چۆن بو؟ کاریگەری ئەو ڕوبەڕوبونەوەیە چی بو؟.. هتد.

لە سەدەی سیازدەهەم و چواردەهەم وەرچەرخانێکی یەکلایی کەرەوە لە مێژوی کورد ڕویدا، چونکە ئەمجارەیان کورد بەرەنگاری شاڵاوی مەغۆل و تەیمورەکان بووە. پێویستە شەڕەکانی نێوان هەردوولاو دەرئەنجامەکانی لەسەر کوردو کوردستان شیبکرێتەوە.

ڕوداوەکانی چارەکی یەکەمی سەدەی شازدەهەم بایەخێکی گەورەی هەیە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دوای شەڕی چاڵدێران (ساڵی ١٥١٤ز) لە نێوان ئیمپراتۆرێتی عوسمانی- فارسی دەستی بەسەر بەشێکی گەورەی کوردستاندا گرت و بە هۆی کارامەیی ئیدریسی بەتلیسی زۆرینەی کورد ئیعترافیان بە سەروەری سوڵتانی عوسمانی کرد.

لە سەدەی حەڤدەهەمی زاینی بۆ یەکەمجار کوردستان لە نێوان ئیمپراتۆرێتی عوسمانی- فارسی دابەشکرا. هۆیەکانی ئەو دابەشکردنە چی بو؟ چ کەسێك لێی بەرپرسیارە؟ ئەو دابەشکردنە چۆن ئەنجامدرا؟ ئەو دابەشکردنە چ خەسڵەتێکی بۆ سیاسەتی هەردوو ئیمپراتۆرەکە بەدەست هێنا؟ چۆن دوژمنەکانی بۆ پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" سوودیان لە خاڵە لاوازەکان کورد وەرگرت؟ ڕوداوەکانی ئەو سەردەمە ئەم پرسیارانەو زۆرێك پرسیاری دی دەوروژێنێ.

لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، لە ئاکامی ئەو شەڕانە لە نێوان وڵاتی فارس و ڕوسیای قەیسەریدا ڕویدا کوردستانی نێو سنوری وڵاتی فارس کرایە دو بەشەوە و ڕوسیای قەیسەر بەشێکی گرنگی لە باکوری ڕۆژئاوای کوردستان داگیر کرد. کورد بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم خەباتی لە دژی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی کردوە، بۆیە ڕوداوەکانی ئەم سەدەیە بایەخێکی تایبەتی لە مێژوی کورد هەیە. ئەو سەردەمانەی بە کورتی باسم لە خاسێتە بنەڕەتیەکانی کردوە زۆر گرنگ بون بەڵام ئەو ڕووداوە یەکلاکەرەوەکانی بوونە هۆی چەسپاندنی بارودۆخی ئێستای کوردستان لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە هاتنە ئاراوە. ئەگینا ئەمڕۆ شتێك بەناوی مەسەلەی کوردەوە نەدەبو چونکە ڕوداوەکانی ساڵانی ١٩١٥-١٩٢٥ ئەم مەسەلەیەی تا ئەمڕۆ بە زیندوێتی هێشتۆتەوە. لەم ماوەیە شەڕی ئیمپریالی لەسەر دابەشکردنی کوردستان هەڵایسا. ئەو مەسەلەیەی کوردستان لەو سەردەمەدا دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەبوە یانا هیچ دەورێکی نیە بۆیە قسەکردن لەسەر ئەوەی "کوردستان لەو سەردەمەدا دەوڵەتی سەربەخۆیی نەبوە" یا "کورد بە درێژایی مێژو دەوڵەتی سەربەخۆی نەبوە" وتەیەکی بێمانایە. ئیمپریالیزمی ئوروپی ساڵی ١٨٨٥ دوای ئەوەی ئەفریقیای دابەشکرد ئنجا سیستمی کۆلۆنی دامەزراند نەك لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتە سەربەخۆکانی ئەفریقیا. کاتێك ئیمپریالیزم پەلاماری کۆمەڵگە کلاسیکییەکانی ئەفریقیاییداو بە ڕاستەو قەڵەم سنوری بۆ کێشان هێشتا نەگەیشتبونە قۆناغی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ، هەر بەمشێوەیەش کۆلۆنیالیستەکان بست بە بست ئەفریقیایان دابەشکرد.

لەم حاڵەتەدا پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدرێتەوە: ئەو هۆیانەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هێندە بێرەحمانە کوردی کرد بە قوربانی سیاسەتی دابەشکردنی ئیمپریالی چی بون؟ کام دەوڵەت بیری لە پیادەکردنی ئەو سیاسەتە کردووەتەوە؟ ئەم سیاسەتە چۆن پیادەکرا؟ پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" لە کوردستان خزمەتی چ بەرژەوەندییەك دەکات؟ بۆچی کوردستان وەك عراق و ئەردەن‌و سوریا نەبوو بە کۆڵۆنی؟ بۆچی کوردستان لە نێوان عراق و سوریای کۆڵۆنی و تورکیای پاشماوەی عوسمانی‌و ئێران دابەشکرا؟ چ لایەنێکی لاواز کوردی کردوە بە نێچیری سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە؟" لەسەرەوە باسمان کردوە کە عەرەبیش بە پێی لۆجیکی ئەم سیاسەتە دابەشکراوە بەڵام دابەشکردنی عەرەب شکلێکی دی وەرگرت و ئەو هۆ سەرەکیانەی کوردی کردوە بە قوربانی سیاسەتی دابەشکردن و پارچە پارچەکردن پەیوەندی نییە بەو لایەنە لاوازییانەوە بەڵکو پەیوەندی بە بنەمای کۆمەڵایەتی و هاوسەنگی ناوەکی و دەرەکی ئەو سەردەمەوە هەیە.

نابێ ئەوەشمان لەبیربچێتەوە کە عەرەبیش بەردەوام هەوڵیدەدا دەوڵەت یا دەوڵەتی ئینتداب دروست بکات. ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم لە لێواری داروخان دا بو. نەتەوەکانی ناو سنوری ئیمپراتۆرێتی عوسمانی وەك عەرەب‌و ئەلبان‌و بولگارو ئە رمەن و کورد خۆیان ئامادە دەکرد تا سەربەخۆیی نەتەوەیی بە دەست بهێنن. ئیپمریالیزمی بریتانی و فەرەنسی هەوڵیاندەدا بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە هەرێمەکە بپارێزن. ئەڵمانیاو ئیتالیاش دەیانویست بەشێکیان بەربکەوێ. روسیای قەیسەری لە ململانێی بەرژەوەندیەکان دەورێکی مەزنی بینی و بە سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ فاکتەرێکی نوێی جیهانی گۆرانکاریی بەسەراهات.

بەمشێوەیە پێویستە مەسەلەی کوردستان لە چوارچێوەی هاوسەنگی لە رۆژهەڵاتی نزیك و لەسەر ئاستی جیهان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ: ئیمپراتۆرێتی عوسمانی داروخا، سەرەتا کێشەی یۆنانییەکان و ئەرمەن و جولەکەو بولگارو عەرەب قوتبونەوە ئنجا ململانێی نێوان ئیمپریالیزمی بریتانی فەرەنسی و ئەڵمانی‌و روسیای قەیسەری و شۆرشی ئۆکتۆبەرو پارتی ئیتحادوتەرەقی و مستەفا کەمال.. هتد، کەواتە پێگەی

(موقـع) مەسـەلەی كـورد لـە چوارچێـوەی ئـەم تـاقم و پەیوەندییـە ناوخۆییـەكانیان دەكەوێتە كوێوە؟ بۆ ئەوەی لەسەر فراوانترین ئاست ئـەو پەیوەندییـە ناوخۆیانـە ڕاڤـە بكرێ پێویستە پشت بـە زۆرتریـن ژمـارەی فاكتـە فیعلیـەكان ببەسـترێت چونكـە تەنـها بەس نیە پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی كەمالی و ئینگلیز و فەرەنسا یا بولشەفیك بخەینە ڕوو بەڵكو لە هەمان كاتدا پێویستە پەیوەندی نێوان بولشەفیك و ئینگلیز و كاریگـەری ئەو پەیوەندییانەش ئاشكرا بكەین.

لە توركیا بلاونامە (بیانات) ڕەسمییـەكان و نوسـەرو ڕۆژنامـە و بلاوكـراوەی پارتـە سیاسییەكان و ئەوانی دی.. هەرگیز وشەی كورد بـەكارناهێنن. یـا ڕاسـتتر بلێـین قسـە لەسـەر جوداییخوازەكـان دەكـەن. ئـەم هەڵوێسـت و ڕەفتـارە بـۆ شـاردنەوەی سیاسـەتی "پەرتكـە- زاڵبـە" و ئەنجامـەكانێتی كـە لـە چارەكی یەكـەمی سـەدەی بیسـتەمەوە دژی میللـەتی كـورد پیـادە دەكـرێ. لەبەرئـەوەی كـوردو كوردسـتان دابـەش و پارچـە پارچـە كراوە بۆیە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی و كەمالی و شان ئـێران جودایـی خـوازن، جودایـی خـواز ئـەو عەرەبانەیـە كـە بـە شـێوەیەكی توندوتـۆڵ هاوكـاری و هاوپـەیمانی لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئینگلـیزی و فەرەنسـی دەكـەن. پێشـتریش باسـی ئـەوەم كـردوە كـە ڕوسیای قەیسەری لە سەدەی نۆزدەهەم لە ئەنجامی شەڕی نێـوان ڕوسـیاو وڵاتـی فـارس بەشێكی لە باكوری ڕۆژئاوای كوردستان داگیركرد.

سەرانی دەوڵەت و حكومەت و پارتـەكانی توركیـا لـە ئاهـەنگی بۆنـە جیاوازەكـان دا ئـەم وشـانە دوبـارە دەكەنـەوە: ".. ئەوانـە دەیانـەوێت توركیـا دابـەش و پارچـە پارچـە بكەن و نە تەوەی توركیش لەسەر ڕووی زەمین و لە مێژو بسڕنەوە، ئەوانـە دەیانـەوێت نەتـەوەی تـورك بكـەن بـە كۆیلـە كـە چـەندین سـەدەیە بـە ئـازادی دەژیـت" بـەڵام شاردنەوەی سیاسەتی "پەرتكە- زاڵبـە و وێـران بكـە" لـە دژی كـورد تاكـە ئامـانجی ئـەم وتارانەیە، هەروەها شتێكی ئاشكرایە یەكێك لـە ئامانجـە سـەرەكییەكانی ئـەم سیاسـەتە چەواشـەكردنی میللـەتی كـوردە بـۆ ئـەوەی لـە ئامـانج و دەرئەنجامـەكانی ئەم سیاسەتە تێنەگات.

هەروەها دروشمی (یــەکێتی و یــەکرپزی نەتــەوەی تــورك و یەکپارچــەیی دەوڵـەت و سنوری نیشتمانی تورکیا) کـە ئـەو نێوەندانــە دوبـارەی دەکەنــەوە هــەمان شـتی لەسـەر پیـادە بێـت چونکـە چەسـپاندن و دابەشـکردن و پارچـە پارچـەکردنی نەتــەوەی کـورد دوائامـانجی ئـەم دروشمانەیـە. بەمشـێوەیە دەیانـەوێ پیـادەکردنی سیاسـەتی "پەرتکـە-زاڵبەو لەناوبەرە" و ئەنجامــەکانی بشـارنەوە. ئیمـپراتۆرێتی عوسمـانی لەبەرئـەوە پێـی دەوترا "ئیمپراتۆرێتی جیهانی" چونکە لـە نەتـەوە جیاوازەکـانی وەك تـورك، عـەرەب، یۆنانی، ئەرمەن، سرب، کـراوت، ڕۆمـان، بولگـار، کـورد، قۆقـاز و لاس و هتـد، پێکـهاتبو، کەواتە چۆن دەکـرێ کۆمـاری تورکیـا بـە کۆمـارێکی "نەتـەوەیی" وەسـف بکـرێ کـە بـە لایەنی کەمەوە دوو نەتەوە لە چوارچێوەی سنورەکەی دەژی؟ چۆن دەوتــرێ تورکێـك و کوردێك دەکاتە دوو تورك؟ ئایا تورکێك و کوردێك ناکاتە تورکێك و کوردێك؟

کوردستان لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دابەش و پارچە پارچە کرا، واتە لە دوای داڕوخـانی ئیمـپراتۆرێتی عوسمـانی و لـەماوەی شـەڕی تورکیـا- یۆنـان و شـەڕی تورکیـا- ئەرمـەن و لـە مـاوەی شـەڕی تورکیـا- کـورد لـە (کوکجـری) و لـە مـاوەی شـەڕی کـورد و ئینگلیز لە کوردستانی باشور. بەمشێوەیە تورکیا و ئێران و بریتانیا لە جیاتی عـراق و فرەنسا لە جیاتی سوریا بوون بە خاوەنی هەمو کوردسـتان. لـە سـەرەوە باسمـان کـردوە کە هێندێك لەو دەوڵەتانە، لەژێر دەسەڵاتی ئینتدابدا بون، واتە کۆڵۆنی بون.

بۆچی کوردستانیان دابەش و پارچە پارچە کرد؟ بۆچی سیاسـەتی ئیمپریـالیزم لـە کوردستان پیادە دەکــەن و ئەنجامـەکانی ئـەو سیاسـەتە چیـە؟ ئـەو ڕوداوە مێژووییانـەی بایەخی سەرەکییان هەیە پێویستیان بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە هەیــە بۆیـە پێویسـتە ئەم بابەتە گەشەی پێبدرێ تا گشت ڕەهەندو وردەکارییــەکانی بگرێتـەوە. هـەروەك لـە پێشەکی ئەم کتێبەدا هاتوە مەبەستی ئەم کتێبـە شـیکردنەوەو لێکۆڵینـەوە نیـە بـەڵکو ئامــانجی ئــەم نووســینە گرنگــی بــە هێندێــك لایــەنی ئــەم مەســەلەیە دەداو چــەند پرسیارێکیش گەڵاڵە دەکات.

## گەوهەری مەسەلەی کورد: پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە و لەناوبەرە" لە دژی میللەتی کورد.

کوردستان دەکەوێتە ناوجەرگەی ڕۆژهەلاتی نزیکەوە. ئەمەش مانایەکی گرنگی هەیە کاتێك میللەتێك لەناوجەرگەی ڕۆژهەلاتی نزیك دابەش و پەرتەوازە دەکرێ، بۆچی دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی کوردستان و پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" لە دژی نەتەوەی کورد بوە بەرازێك. پێم وایە هۆی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی نەوتی کوردستان، هەروەها لە پرۆسەی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە" تێدەگەین، بۆیە دەبینین سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" کە سیاسەتێکی کۆلۆنیالیزمی کلاسیکیە لە کوردستان بووە بە سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە". بە پێی ئەم سیاسەتە یەکەمجار تایبەتمەندییە نەتەوایەتییەکانی کورد لەناو دەبرێت: واتە (مافی ئەوەی کۆ مەڵگایەکی کوردی یان هەبێ، واتە ئەوەی کە وێران کرا ناسنامەی کوردی و کوردستان بوو، کە ئەو دوانە خاسیەت و بەها نەتەوایەتێکانی کوردن. کاتێك ترس و تۆقاندن ناتوانێت کورد بکات بە کۆیلە یا سەرەڕای هەمو جۆرە چەوسانەوەو تیرۆرێکی دەوڵەت هێشتا واز لە مافە نەتەوایەتییەکانی خۆیان ناهێنن، ئیتر لەو حاڵەتەدا پێویستە قەلاچۆ بکرێن و کۆتایی بە بوونیان بهێنرێ، واتە هەمو شێوازێك بە تیرۆری دەوڵەتیشەوە بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی خەبات لە پێناوی داواکارییەکانی کورد دەکەن پاکتاوی جەستەیی بکرێن.

هەرچەندە سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" سیاسەتێکی ئیمپریالیە، بەلام سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە" سیاسەتێکی ئیمپریالی نیە، بەڵکو سیاسەتی هاوکارەکانی ئیمپریالیزمە لە هەرێمەکەدا. ئیمپریالیزم میللەت و کولتوری وڵاتە داگیرکراوەکە لەناو نابات، تەنانەت کاتێك ئیمپریالیز م بە مەبەستی فراوانکردنی پشتێنەی ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی بۆ ئەوەی بازاڕێکی نوێ بۆ بەروبومەکانی بدۆزێتەوە نەك هەر ڕێگە لە گەشەکردنی کۆمەلایەتی و کولتوری وڵاتانی ژێر دەستەلاتی ناگرێت بەڵکو زۆر جاران هانیاندەداو بەشداری لاوەکیش لە چالاکییە کولتورییەکانیان دەکات. بۆ نمونە،

ئینگلیزەکـان قوتابخانـەیان بـۆ فـێربونی زمـانی کـوردی لـە عـراق دروسـت دەکـرد و فرەنسـییەکانیش لـە سـوریا ڕێگـەیان لـە بڵاوبونـەوەی ئـەلفبای کـوردی و دەرکردنـی کتێب و گۆڤار بە زمانی کوردی نەئەگرت، هەروەها ئیمپریالیزم ڕێگر نـەبو لـە بـەردەم ئـەو هەوڵانـەی بـۆ گەشـەپێدانی زمـان و ئـەدەبی کـوردی دەدرا. سـەرباری ئـەوەش لـەناوبردنی دانیشـتوان بـە چـەکی کیمیـایی و بـایۆلۆجی بەشـێك نیـە لـە سیاسـەتی ئیمپریالیزم بەڵکو سیاسەتی دەستوپێوەندەکانی ئیمپریالیزمە لە هەرێمەکەدا.

مستەفا کەمال لە ساڵانی سییەکان لـە بـەردەم ئـەندامانی کۆمەڵـەی مێـژوی تورکیـا گوتـارێکی خوێنـدەوەو تێیـدا دەربـارەی شـەڕی ڕزگاریخوازانـەی نەتـەوەکانی بـەلکان لـە دژی ئیمـپراتۆرێتی عوسمـانی بـاس لـە دیـدو سـەرنجەکانی خـۆی دەکـات و لـەوێدا دەپرسێت: "بۆچی گەلانیبەلکانمان لە دەست دا"، مسـتەفا کـەمال هـەر خـۆی وەڵامـی پرسـیارەکەی دەداتـەوە چونکـە گـەلانی بـەلکان بەیمانگـەی توێژینـەوەی سـلاڤیان دامـەزراندو بـە تێروتەسـەلی لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر زمـان و ئـەدەب و مێـژوو کولتـوری خۆیـان دەکـرد. مسـتەفا کـەمال بـە ئاشـکرا دەڵێـت بـا ئـەو کـردەوەو گفتوگۆیانـەی لـەم بارەیەوە ئەنجامدرا وشیاری نەتەوایەتی لەنێو ئەو میللەتانەدا خولقاند کە دواتـر بـوە هەوێنی شۆڕشی ئەو میللەتانە لە دژی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی

**(utkan Kocaturk: Ata turk un fikin ve dusun celeri' Turhan Kitapevi, Ankara, 1984, p. 149).**

پێویستە بیروڕاکانی مستەفا کەمال ئـەتاتورك لـە بـارەی زمـان و کولتـورو وشـیاری نەتەوایەتی و مێژوو.. هتد، بە هەند وەربگرین. دەکرێ لەو بیروبۆچونانەی بە کورتـی لە سەرەوە باس کراوە دوو ئەنجام دەربهێنین: ئەنجامی یەکەم پەیوەندی بە توانای ئەو کەسـانەوە هەیـە کـە ژێردەسـتەی بێگانـە قبـوڵ ناکـەن بـەڵکو ئـەوانیش وەك هـەمو میللەتانی دی دەیانەوێت بـە ئـازادی و بەسـەربەرزی بژیـن و ئـەو میللەتانـە لەسـەریان پێویستە شارەزای مێژوو زمان و شارستانییەت و هونەری خۆیان بن. مستەفا کەمال لە دوای دامـەزراندنی کۆمـار دەسـتیکرد بـە پرۆسـەیەکی تایبـەت بـە نەتـەوەی تـورك کـە هاوتای پرۆسەی گەلانی بەلکان بو چونکە ئەلفبای نوێی داناو پەیمانگەی زانستی وەك کۆمەڵەی زمانی تورکی و کۆمەڵەی مێژوی تورکیا-ی دامەزراند. زانکـۆو پـەیمانگاو ئـەو

بەشانەی لەو بوارەدا کاردەکەن دەستیان کرد بە توێژینەوە لەسەر زمان و مێژوو هونەرو شارستانییەتی تورك. لە سایەی سیاسەتی پەروەردەیی و بۆ دروستکردنی کولتورێك توانرا نەوەیەکی نوێ بەم ئاراستەیە ئامادە بکرێ. دەوڵەت خوێندکاری بۆ دەرەوەی وڵات ڕەوانە دەکرد بۆ ئەوەی لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەی ئەنجام بدەن. ڕۆژنامەو ئیدارە حکومیەکان زانیارییان پێدەدرا بۆ ئەوەی چالاکانە لەم بوارەدا کاربکەن.

هەروەها لەو بیروڕایانە ئەنجامی دوەمیش دەردەهێنین: ئەگەر بمانەوێت نەتەوەیەك سەرشۆڕ و کۆیلەو بێناسنامە بێ‌و ئەگەر بمانەوێت کۆلۆنیالیزم لە ناوچەیەك بە باڵادەستی بمێنێتەوە پێویستە ئەلفبای ئەو نەتەوەیە لەناوبەرین و ڕێگە نەدەین ئەو نەتەوەیە بە زمانی خۆی قسە بکات و ببێتە ڕێگر لە نێوان خۆی و کولتورەکەیدا. ئەمەش بە کورتی مانای ئەوە دەگەیەنێت ڕێگە نەدەین وشیاری نەتەوایەتی ئەو میللەتە گەشە بکات. هەرکاتێك میللەتێك وشیاری نەتەوایەتی پەیدا بکات ئیتر لە ژیانی خۆی دەڕوانێ و مێژوی خۆی دروستدەکات و لە دوایشدا لە دژی چەوسێنەرەکانی شۆڕش هەڵدەگیرسێنێ. ئەو میللەتەی لە قەدەغەکردنی زمانەکەی تێنەگات، میللەتێکی ترساو، و بێهەست و کۆیلەیە. هەر وڵاتێك ئەمجۆرە میللەتەی هەبێت هەرگیز ناتوانێ سەربەخۆیی ئابوری و سیاسی بە دەست بهێنێ.

ئەگەر ڕێگە لە بەکارهێنانی زمانی نەتەوایەتی بگیرێت لەسەر ئاستی تاکە کەس دەرئەنجامی دەرونی ئەوتۆی لێدەکەوێتەوە وەك ئەوەی بە زۆر زمانی کەسێك لە بنا بڕیت. هەروەها قەدەغەکردنی زمانی نەتەوایەتی دەبێتە هۆی وێرانکردنی یەکێتی کۆمەڵایەتی و دەرونی تاکەکان چونکە ئەم حاڵەتە کەسانی ناساغ و نەخۆش دەخاتەوە کە بە دەستی تێکچونی هاوسەنگی سروشتی و دەرونی و باوەڕ بە خۆنەبون دەناڵێنن و قێزیان لە خۆیان دەبێتەوە و بێئەندازەش زیادەڕەویی لە توانای فەرمانبەرانی دەوڵەت و سەرکردەکانی دەکەن. کۆمەڵگەیەك لەو کەسانە دروست بێت کۆمەڵگەیەکی گەندەڵ و نەخۆشی لێدەردەچێت بۆیە زۆر زەحمەتە سەرکردایەتی و ڕێنوێنی ئەو جۆرە کەسانە بکرێ. ئەم کۆمەڵگە تەنها بە دەرکردنی فرمانێك کە شێوازیتوندوتیژی و دڵڕەقی و هەڕەشەی پێوە دیار بێت هەمو شتێك جێبەجێ دەکات و زۆر بە ئاسانی دەتوانرێ بە هەمو لایەکدا بڕەتێنرێ.

تاکە ڕێگە بۆ چاککردنەوەی ئەم کۆمەڵگەیە هاوکاری کردنێتی بۆ ئەوەی لە هۆیەکانی ئەو قەدەغەکردنە تێبگات و لەسەر ناسنامەو ڕەسەنایەتی پرسیاری لێبکرێت چونکە تا ڕاستی زیاتری بۆ ئاشکرا بکرێت سیستمی کۆڵۆنیالیزمیش زیاتر لە ڕەگەوە دەردەهێنرێت.

پێویستە هەر لەم چوارچێوەیە تەماشای هۆیەکانی حەرام کردنی زمانی کوردی و قەدەغەکردنی توێژینەوە لەسەر زمان و ئەدەب و کولتورو مێژوی کورد و ڕێگەگرتن لە پیادەکردنی دابونەریتی شارستانییان بکرێ چونکە ئامانجی ئەو ڕێوشوێنانە ئەوەیە ڕێگە لە وشیاری نەتەوایەتی کورد بگیرێت و هەمو ئامادەکاری و ئامرازێکیش بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی ئاسەواری زمان و ئەدەب و کولتورو شێوەی ژیانی کورد نەمێنێ.

بێگومان سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" سیاسەتێکی ئیمپریالی بەسودە. ئەم سیاسەتە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم دەکات و کەشوهەوایەك دەخولقێنێ لە سایەیدا بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم بە شێوەیەکی باشتر گەشە دەکات. حکومەتی تورکیاو ئێران و حکومەتە عەرەبیەکان لە کاتی دابەشکردنی کوردستاندا هاوکاری ئیمپریالیزمی ئەنگلوفرەنسیان دەکرد. لە ئەنجامی ئەو هاوکارییەشدا بە لایەنی کەمەوە گۆڕانکاری لە بونیادی ئابوری و سیاسی و سەربازی لەناو چوار دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی نزیك بە جۆرێك بوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم دەگونجا. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت ئەو بیروڕا نوێیانەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ لەگەڵ خۆیدا هێنای سنوری ڕوسیای قەیسەری نەبەزاند. هەمو ئەوانەش دەبەسترێتەوە بە پاراستنی هیندستان و ڕێگەکانی کە کۆڵۆنیەکی گرنگی بریتانیا بو.

کوردستان لەو کاتەدا کە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنوسینی گەلان هەستێکی گشتی پڕ جۆش و خرۆشی لە ڕۆژهەڵاتی نزیك وروژاند بو. کوردستان بووە قوربانی دابەشکردنی وڵاتە ئیمپریالییەکان. کوردستان بە هۆی سیاسەتی هاوبەشی دەوڵەتە جیاوازەکان ناچار کرا مل بۆ دەستەڵاتی بیگانە کەچ بکات. تێنەگەیشتن لە بارودۆخەکە یا تێگەیشتن و هیچ نەکردن بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکان یەکێك بو لە لایەنە لاوازە ترسناکەکانی بولشەفیزم. ئەمەش

جیاوازی نێوان تیۆری مافی چارەی خۆنوسینی گەلان و پیادەکردنی ڕاستەقینەی سوسیالیزم ئاشکرا دەکات چونکە هەوڵەکانی ئایدولوجیای ڕەسمی سۆڤێتی بۆ پیادەکردنی ئەم تیۆرەیە لە واقیعی عەمەلیدا سیستمی سوسیالیستی گەیاندە ڕێگەیەکی داخراو، و بەشێك لە متمانەی (مصداقیە) خۆی لە دەست دا. بۆیە پێویستە دژایەتی نێوان تیۆرەو پراکتیك و شێوازەکانی زاڵبوون بەسەر ئەو دژایەتیانە ڕاڤەبکرێت، هەروەها پێویستە ڕەخنە لەو پراکتیکەش بگیرێت.

لەبەرئەوە نابێ شەڕەکانی تورکیا-یۆنان و تورکیا-ئەرمەن و کورد-ئینگلیز و کورد-تورکیا لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم بە تەنها کورت بکرێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندی نێوان کەمالی و ئینگلیز یا کەمالییەکان و بولشەفیك بەڵکو لەپاڵ ئەوەشدا پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندی نێوان بولشەفیك و ئینگلیز و فرەنسیەکان بکرێ.

## کوردستان کۆڵۆنییەکی نێودەوڵەتییە

لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە تاکو ئێستا گەورەترین ڕوداوی تراجیدی مێژوی ڕۆژهەڵاتی نزیك و دونیا بریتیە لە نەهامەتی میللەتێك کە ڕازی نیە بەو چارەنوسەی سیستمی سیاسی کۆڵۆنیالیزمی دەوڵەتی لە کوردستان پیادە دەکات. کورد لە چارەکی یە کەمی سەدەی بیستەمەوە شێلگیرانە دژی چارەنوسێك خەبات دەکات کە دەوڵەتە ئیمپریالییە گەورەکان و هاوکارەکانی لە هەرێمەکە بە سەریا سەپاندویانە. لە واقیعدا جگە لە وشەی "تراجیدیا" وشەیەکی دی شکنابەین خەباتی سەرکێشانەی کورد لە دژی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی وەسف بکات، بۆیە هەر دەبێت خەباتی درێژخایەن و لێنەبڕاوانەی کورد ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە مایەی چارەسەرکردنی کێشەکە.

لەمڕۆوە هاندەرێکی گرنگی دی لە کۆڵۆنیکردنی کورد ئاشکرا دەبێت کە پەیوەندی بە لایەنی ئیستراتیجییەوە هەیە. کارێکی لۆژیکییە پرۆسەی دابەشکردنی کوردستان ببێتە مایەی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئەو چوار دەوڵەتەو بەرژەوەندییەکانی

ئیمپریالیزم، هەروەك دەزانرێ كورد لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆی درێژە بە خەباتی خۆی دەداو هەر دەرفەتێكی بۆ هەڵكەوتبێ شۆڕشی هەڵایساندوە. هەمو میللەتێك دژی چەوسانەوەی بەرگری لە مانەوەی خۆی دەكات بەڵام حكومەتەكانی هەرێمەكە بۆ ئەوەی شۆڕشەكانی كورد سەركوت بكەن نەك هەر ئاواتەخوازن دەوڵەتە ئیمپریالیەكان یارمەتییان بدەن بەڵكو داوای یارمەتییان لێدەكەن لەبەرئەوە ئیمپریالیزم لە چوارچێوەی دەستەڵاتی خۆیدا دەیانهێڵێتەوە. بەمشێوەیە لە چارەكی یەكەمی سەدەی بیستەم بە هاوكاری بریتانیا هەمو ڕاپەڕینەكانی كوردستانی باشورو ڕۆژهەڵات سەركوتكران، بۆیە بە هەڵەدا دەچین گەر پێمان وا بێت ئینگلیز لە باكوری كوردستان یارمەتی شۆڕشەكەی شێخ سەعیدی داوە چونكە ڕێك لەو ماوەیە شەڕێكی خوێناویی بەسەر باشوری كوردستاندا سەپاندبو. سەرەڕای ئەوەش توركیا بەبێ كۆمەكی فرەنسیەكان نەیدەتوانی سوپاكەی بە خاكی سوریا بە شەمەندەفەر لە ئەنقەرەوە بۆ دیاربەكر بگوێزێتەوە چونكە لەوكاتەدا سوریا كۆڵۆنیەكی فرەنسی بو، بۆیە ئەگەر فرەنسا ڕێگەی بە تێپەڕبونی سوپای توركیا نەدایە ڕەنگە شۆڕشەكەی شێخ سەعید سەركەوتنی بە دەست بهێنایە، یا لەوانە بو بە لایەنی كەمەوە دەرفەتی تۆماركردنی سەركەوتنێكی بۆ بڕەخسایە.

لە لایەك كوردستان هۆیەكی سەرەكی ململانێ و جیاوازی نێوان هێزە ئیمپریالی و هاوپەیمانەكانی بوو لە ڕۆژهەڵاتی نزیكدا چونكە هەر یەكێك لەو هێزانە دەیویست دەست بەسەر گەورەترین بەشی كوردستاندا بگرێت. چەسپاندن و جێگیربونی كۆڵەكەكانی سیستمی كۆڵۆنیالیزمی نێودەوڵەتی لە كوردستان سەرەتا بە ڕێكەوتن و پاشان لە ڕێگەی هاوكاریكردن ململانێی نێوانیان یەكلایی كرایەوە. لە لایەكی دی ئەم هاوكاریكردنە بوە هۆی چەسپاندنی و پاڵپشتی كردنی كۆڵۆنیالیزمی نێودەوڵەتی لە كوردستاندا.

## دروشمەکانی کەمالیزم

سەرەڕای ئەوەی لە کاتی پرۆسەی پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان هاوکاری نێوان کەمالی و ئیمپریالییەکان زۆر توندوتۆڵ بو کەچی کەمالیەکان هەمیشە ئەو دروشمەیان دوبارە دەکردەوە کە ئەوان یەکەم میللەت بون دژایەتی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمیان کردوەو میللەتانی چەوساوەو کۆلۆنیکراویان بۆ شۆڕش هانداوە بەڵام نەك هەر رەتیان دەکردەوە قسە لەسەر کوردو بەشداری ئەو گفتوگۆیانە بکەن کە لەسەر کورد دەکرا نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەو شۆڕشگێڕە کوردانەش کە خەباتیان لە دژی کۆلۆنیالیستەکان دەکرد تەسلیم بە پۆلیس دەکردەوە، ئەمە لە کاتێکدا بە شێوەیەکی زۆر جارزکەرانە دوبارەیان دەکردەوە کە ئەوان یەکەم کەسبون دژایەتی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمیان کردوە. هەروەها سخورییان بەسەر کوردەکانەوە دەکردو هەواڵی چالاکی تێکۆشەرە کوردەکانیان بۆ پۆلیس دەبرد بۆ ئەوەی زیندان و بێدەنگ بکرێن. ئەو سیخورانە لە رۆژنامە و تەلەفزیۆن و رادیۆو دەزگا پەروەردەیی و سەربازگەو مزگەوتەکاندا بڵاوبونەتەوە، بۆیە ریسواو شەرمەزار دەبین ئەگەر بەراوردێك لە نێوان نوسین و گوتەکانی مستەفا کەمال لە ساڵانی بیستەکاندا.

کەمالییەکان رێگایەکی تریان گرتووەتە بەر بۆ پەردەپۆشکردنی کردەوەکانیان بەرانبەر بە کورد ئەویش ئەوەیە کە کورد بە رەگەزپەرست وەسفدەکەن، بەڵام قەدەغەکردنی زمان و کولتوری کورد و سەپاندنی زمانی تورکی و ملپێدانی کورد بۆ پرۆسەی توانەوەو تەتریك کردن و گۆڕینی ناو و شوێنە کوردییەکان بە ناوی تورکی و سزادانی ئەو کەسانەی بە زمانی کوردی قسەدەکەن و لەناوبردنی کورد و کولتوری نەتەوایەتیان ئەمانە هەمووی لە دیدی کەمالیەکانەوە شێوازی دیموکراسی و شۆڕشگێڕانەیە، کەچی کاتێك کورد داوای مافی نەتەوایەتی دەکات و خۆی بۆ بە دەستهێنانی مافەکانی رێکدەخات، رێبازێکی شۆفینییانە دەگرنە بەر بەڵام کاتێك تورکەکانی بولگارستان هەمان رێگای کوردەکان دەگرنە بەر بە پێشکەوتوخواز لە قەڵەم یان دەدەن و کردەوە نامرۆڤانەکانی بولگارستان ریسوا دەکەن.

دەزگاکـانی مـافی مـرۆڤ لـــە کۆمەڵگەیـــەکی پارچـــە پارچـــەکراو دابەشـــکراوی وەك کوردستان چۆن دەتوانێت کاربکات کە ناوچەکانی لەژێر دەستەڵاتی چەند دەوڵەتێکەو دۆخێکـی کۆڵۆنـی نێودەوڵـەتی هەیـە؟ چـۆن مـافی مـرۆڤ لـە کۆمەڵگەیـەك ئیسـتیعاب دەکـرێ کـە سیاسـەتی "پەرتکـە- زاڵبـەو لەناوبـەرە" لـــە دژی بـــەکاردێت و لـــە ڕێگـــەی بـــەکارهێنانی کێڵگـــەی مـــین و تـــەلی دڕکـــاوی و قوڵلـــەی چـــاودێری لـــــە یـــــەکتری جیادەکرێنەوە؟

## مافەکانی مرۆڤ و کورد

لە تورکیا کورد بە مەرجێك چێژ لە ئازادییە گشتیەکان و یەکسانی وەردەگرێت کـە نکۆڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆی بکات لەبەرئەوەی لە تورکیا پرەنسیپی یەکسانی کە پرەنسیپێکی بنەڕەتی و دیموکراسی و مافـەکانی مـرۆڤ و ئـازادی و مـافی ئـابوری و کۆمەڵایەتیە لەسەر کورد پیادە نـاکرێت ئەگـەر نکۆڵـی لـە ناسـنامەی کوردایـەتی خـۆی نەکا ت. بێگومان ئەو کارە بە زۆر ئەنجامدەدرێ. ئەم زۆرە ملێیە بە گوشارو ئەشـکەنجە لە بنکەکانی جەندرمەو پۆلیس و بنکەی پاسەوان و لە زیندانەکان پیادە دەکرێ و ئـەم زۆرەملێیـە لـە بەڵگەنامـەو بڕیارەکـانی دادگـاش ڕوندەبێتـەوە. وەك چـۆن ئـــەم زەبـــرو زەنگە لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی تورکیا لە پاڵ ئیدارە حکومیـەکاندا دەردەکـەوێت. بـە هەمان شێوە لەسەر دەزگا زانستی و ئاینیەکانیش.

ئەگـەر کوردێـك نکۆڵـی لـە نەتـەوەی خـۆی بکـات و ببێـت بـە تـورك و بڵێـت بـە تورکبونـی بەختـەوەرە، هـەمو شـتێکی دەسـتدەکەوێ، واتـە دەتوانـێ ببێتـە کرێکـار، پاسـەوان، پارلـەمانتار، خوێندکـار، وەرزشـــەوان، قایمـــەقام، والی، ســـەرمایەدار، ســـەرباز، فێرکارو وەزیر یا مامۆستای زانکۆ. بەڵام ئەگەر سوربێ لەسەر کوردبونـی خـۆیو داوای مافـە نەتەوایەتییـەکانی بکـات تەنـها دەرفـەتێکی بـــۆ دەمێنێتـــەوە ئـــەویش: یـــا دەبـــێ هەڵهاتوو بێ یا زیندانی بێ.

واتە ئـەو کەسـەی نکۆڵـی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خـۆی دەکـات و بـە کۆیلـەیی و بێکەسـایەتی خـۆی ڕازی دەبـێ. کۆیلـەو کەسـی بێشەخسـیەت بونـــەوەرێکی ترسـنۆك و

شەڕخوازی لێدەردەچێت بـەڵام ئـەو کەسـەی مـل بـۆ چەوسـانەوەو سـتەمی دەسـتەڵاتی کۆڵۆنیـــالیزم کـــەچ دەکـــات، دەســـتدرێژی دەکاتـــە ســـەر چ کەســـێك؟ بێگومـــان شەڕخوازییەکەی ئاراسـتەی خـێزان و هاوڕێکـانی خـۆی دەکـات بـەوەی بێقیمـەت تریـن بیـانو دەقۆزێتـەوە بـۆ ئـەوەی زێدەڕەویـی بـە تورەبونەکەیـەوە بکـات و پاسـاو بـۆ شەڕخوازییەکەی بهێنێتەوە.

## دووفاقی هەڵوێست لە ڕاڤەکردنی پرەنسیپی "یەکسانی"دا

پیادەکرد نی پرەنسیپی دادپەروەری و مافـەکانی مـرۆڤ و ئـازادی و مافـە ئـابوری و کۆمەڵایەتییـەکان دەبێتـــە ڕەفتـــارێکی ڕەگەزپەرســـت و کۆنـــەپارێزو ئامـــانجی دەبێتـــە لەناوبردنی ڕەگەزی مرۆڤ کاتێك دەبەسـترێتەوە بـەوەی مـرۆڤ بـەبێ خوایشـتی خـۆی نکۆڵـی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی بکـات. ئەمـەش بـارودۆخی کوردسـتانی لـە کۆڵۆنـی خراپتر کردوە. ئـەم ڕەفتـارە دژایـەتی سیاسـەتی ئـەو بـەهاو چەمکانـە دەکـات کـە یاسـا نێودەوڵەتێکان پشتی پێدەبەستێ بـۆ فراوانکردنـی ئاسـتی مافـەکانی مـرۆڤ و بـەرگری لێکردنـی لەگـەڵ هـەردوو پرەنسـیپی یاسـاو دادپـەروەری و جاڕنامـەی نێونەتـەوەیی مافەکانی مرۆڤ و ڕێکەوتننامەی ئوروپـا بـۆ مـافی مـرۆڤ لـە دواییشـدا ئـەم سیاسـەتە دژایەتی کۆنوسی کۆتایی کۆنگرەی هێلسینکی دەکات. سـەرکردەکانی تـورك و ڕۆژنامـەو زانکۆکانی تورکیا، ئەوانەی سیاسەتی توانەوەوقەلاچۆکردن دەرهـەق بـە میللـەتی کـورد پیادە دەکەن بەردەوام ئەو بەهاو چەمکانە بەکاردەهێنن کەچی سیاسـییەکانی تـورك و پیاوانی دەوڵەت و ڕۆژنامـەو زانکۆکـانی تورکیـا بـەبێ دوودڵـی چەوسـانەوەی کەمینـەی تورکـەکانی بولگارسـتانی بـەو بـەهاو چەمکانـە ڕیسـوا دەکـەن. هـەروەها سیاســییەکانی تورك و ڕۆژنامەو مامۆستایانی زانکۆ بەو بەهاو چەمکانە بەرگری لە مافـەکانی مـرۆڤ دەکـات دژی چەوسـانەوەی تورکـەکان و سـکالانامە بـۆ ڕێکخـراوە نێودەوڵتییـەکان بەرز دەکەنەوە.

کەواتە ئـەم کـارە پـەیوەندی بـە دووفـاقیی هەڵوێسـت لـە وتـارو کـرداردا هەیـە: لـە لایەك سیاسەتی توانەوەو قەلاچۆکردن لە بولگارستان شەرمەزار دەکەن، لـە لایـەکی دی

چەندین ساڵە بە چەکێکی تر سیاسەتێکی ترسناکترو بە دیسپلینتر دژی کورد لە زێدو نیشتمانی خۆی پیادە دەکەن. ئەو کەسانە سیاسەتی توانەوەی تورکەکانی بولگارستان شەرمەزار دەکەن بەڵام پشتگیری و لایەنگیری لە هەمان سیاسەت و تیرۆر دەکەن کە دەوڵەت و حکومەتە کانی تورکیا لە دژی کورد پیادەی دەکەن.

"لە تورکیا هەمو کەسێك بە یەکسانی و بەبێ جیاوازی زمان و ڕەگەز مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ" پیاوانی دەوڵەت و سیاسیەکان زۆر جاران ئەم وتەیە دەڵێنەوەو مامۆستایانی زانکۆ و ڕۆژنامەنوس و نوسەرە تورکەکانیش بەردەوام دەیجوونەوە بەڵام بە ڕاڤەکردنی ئەم وتانە دوفاقیی هەڵوێستیان ئاشکرا دەبێت. ئەو ڕستەیەی کە دەڵێت: "لە تورکیا هەمو کەسێك ئازادە بەبێ جیاوازیی ڕێوڕەسمی ئاینی جێبەجێ بکات" بەمشێوەیە ڕاڤە دەکرێ: لە تورکیا مەسیحی و موسڵمانەکان ئازادن ڕێوڕەسمی ئاینی پیادە بکەن و یۆنانی و ئەرمەنیەکان کنیسەی خۆیان هەیەو یەهودییەکانیش کینستی خۆیان هەیە. هەمو کەسێك ئازادە خواپەرستی بکات بەڵام لە ئازادی خواپەرستیدا پێویستە یەکەمجار ژمارەی ئایینەکان ئامار بکەین ئنجا قسە لەسەر یەکسانی نێوانیان بکەین چونکە هەمو کەسێك بەبێ جیاوازی زمان و ڕەگەز لە تورکیا یەکسانە بەم مانایە ڕاڤە ناکرێ لەبەرئەوەی لە تورکیا هەمو کەسێك بە تورك دادەنرێ و تورکیش هەموویان یەکسانن بۆیە سورن لەسەر ئەوەی کە جیاوازی زمان لە نێوانیاندا ناکرێ چونکە خۆیان لە جیاوازی و ژمارەی زمانەکانی تورکیا گێلدەکەن. ئەم یەکسانیە جگە لە ملدان بۆ پرۆسەی تەتریك کردن هیچ مانایەکی دی نابەخشێت. کاتێك دەڵێن هەمو کەس ئازادە بە زمانی زگماکی خۆی قسە بکات مەبەستیان لە زمانی تورکییە لەبەرئەوەی تەنها بەم ڕێگەیە دادپەروەری بۆ هەمو کەسێك دەستەبەر دەکرێ.

هەروەها دەوترێ ئەو کەسەی تە تریك قبوڵ بکات بە تورك حیساب دەکرێ. سەرەتا ئەم بیرۆکەیە سیمای لێبوردنی پێوە دیارە. ئێستا وا دابنێین کەسانێك هەیە هەست بە تورکبونی خۆیان ناکەن، واتە ئەوانەی بە خۆیان دەڵێن کورد، ئایا هەر بە گیانی لێبوردن مامەڵەیان لە تەکدا دەکرێ، بەڵام ئەم گریمانەیە هەڵەیەکی گەورەیە چونکە لە تورکیا لێبوردنی لەو جۆرە نیە و بە پێی ئایدۆلوجیای ڕەسمی هەمو کەسێك

تورکەو کوردبـون قەدەغەیـە. بـۆ نمونـە، لـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ١٩٨١-١٩٨٤ تەنــها لــە گرتوخانـەی دیاربـەکر زیـاتر لـە (٤٠) شۆڕشـگێڕی کـورد لـەژێر ئەشـکەنجە گیانیـان لەدەست دا لەبەرئەوەی سـوربون لەسـەر ناسـنامەی کوردایـەتیان و قبوڵیـان نـەکرد بـە دەنگێکی بەرز بڵێین "من تورکم و بەختەوەرم بـەوەی کـە تورکـم"، ئـەو شۆڕشـگێڕانە گیانی خۆیان بەخت کرد بۆ ئەوەی پەیامەکەیان بگەیەنن بە ڕای گشتی. بـە وشـەیەکی دی، ئـەو شۆڕشـگێڕانە بەرامبــەر بــە ڕەتکردنــەوەی تــیرۆری دەوڵــەت گیــانی خۆیــان بەختکرد. هەروەها ئەو کەسانەی ژیانیان لە پێناوی کوردایـەتی بـەخت کـرد ژمارەیـان زۆر لە (٤٠) کەس زیاتر بو.

## دروشمی "یەکێتی و هاوکاریکردن"

لە تورکیا ئـەو دروشـمەی لـە هـەمو دروشـمـەکانی دی زیـاتر دەوترێتـەوە لـە دەوری چەمکی تە مومژاوی یەکێتی و هاوکاریکردن تەوەرە دەبەستێ. سەرانی دەوڵەت و پارتـە سیاسییەکان بەردەوام ئەو وتەیـە دووبـارە دەکەنـەوە: "تـورك و کـورد بـران، دولایـەنی یەکێتیەکن قابیلی جیابونەوە نیە هەروەك چـۆن گۆشـت و ئێسـقان قـابیلی جیابونـەوە نیە. تورك و کورد دوو میللەتی یەکگرتو ن و یەك ئاینیان هەیەو بەبێ جیاوازی ماوەی هەزاران ساڵە لە وڵاتێکدا پێکـەوە دەژیـن و پێکـەوە حوکمڕانـی ئـەم وڵاتـەش دەکـەن". بێگومان دەوڵەتی تورکیا هەرگیز بە ڕەسمی پشـتگیری لـەم دروشـم و قسـەلۆکانە ناکـات بەڵام ڕێگە بە سیاسییە ناوخۆیی و ڕۆژنامـەکان دەدات بـە پێـی پێویسـت ئـەم دروشـمە بڵێنەوە. ئەم دروشمە جگە لـە پـارتی گـەلی کۆمـاری و پـارتی گـەل سوسـیال دیموکـرات، هەمو ڕێکخسـتنە سیاسـیەکان بـە پـارتی بزوتنـەوەی نیشتمانیشـەوە (MHP – پـارتێکی شۆڤینیە) قسە لەسەر برایەتی تـورك-کـورد دەکـەن بۆیـە لـەم حاڵەتـەدا پێویسـتە ئـەم پرسـیارانە بکـەین: چـۆن ئــەم یەکێتیــە پتــەو و تۆکمەیــە لـــە ســـاڵانی بیســـتەکان هەڵوەشایەوە؟ چۆن ئەم یەکێتیە لە سەدەی حەڤدەهەم داڕوخا؟ بۆچی ئێران بەشـێکی لە کوردستان داگیرکردوە؟ چۆن عـراق بـوە بـە خـاوەنی بەشـێك لـە کوردسـتان؟ بۆچـی تورکیا بەشێکی لە کوردستان داگیرکردووە؟ کوردستانی سوریا چ مانایـەك دەگەیـەنێت؟

بۆچی کەمالیەکان لەسەر پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان و لە پێناوی جێبەجێکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" دژ بە خواستی خەڵکی کورد هاوکاری ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فرەنسییان دەکرد؟ ئەگەر بە قوڵی بڕوانینە ئەم پرسیارانە د ەبینین ئەم دروشمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە حەقیقەتەوە نیەو دووبارە کردنەوەی ئەم دروشمانەش تەنها بۆ مەبەستی شاردنەوەی مۆرکی داگیرکردن و تیرۆر و بەربەرییەت و توندوتیژی و تیرۆری دەوڵەتە کە ڕووبەڕوی نەتەوەی کورد دەبێتەوە.

دەوترێت ئێمە پێکەوە هەست بە غەمویەژارەو خۆشی و شانازی دەکەین. ئەم هەستە هاوبەشەمان بەڵگەی هاوپشکیمانە. هەروەها دەوترێ پێکەوە لە قوبرس شەڕی یۆنانیەکانمان کردوە. تەنها حەقیقەت ساختەیی ئەم دروشمانە ئاشکرا دەکات. لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری ١٩٨٨ حکومەتی کۆلۆنیالیزمی و ڕەگەزپەرستی عراق لە پرۆسەیەکی جینۆساید زیاتر لە (٥٠٠٠ ) ژن و منالْ و پیاو و پیری ئەم شارەی بە چەکی کیمیایی کوشت. ئایا حکومەتی تورکیاو سیاسیەکانی تورك لە بەرامبەر ئەم قەتلوعامە بە لایەنی کەمەوە ڕاچڵەکین؟ سەرۆکی دەوڵەتی تورکیا لە کاتی ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە شاری کویت بەشدا ری کۆنگرەی باڵای ئیسلامی دەکرد، ئایا لە بەردەم کۆنگرەی باڵای ئیسلامی ئەو تاوانەی وروژاند کە دەرهەق بە کورد ئەنجامدرابو؟ ئایا ڕەفتارمان بەمشێوەیە دەبێت ئەگەر ئێمە یەکگرتوین و پێکەوە هەست بە غەمویەژارەی یەکتری بکەین؟ کەچی ڕێك پێچەوانەکەی ڕویدا چونکە دوو هەفتە لە دوای ئەو تاوانەو لە سەرەتای مانگی نیسان تورگوت ئۆزالی سەرەك وەزیری تورکیا سەردانی بەغدای کردو لەکاتی سەردانەکەیدا بە شێوەیەك ڕەفتاری دەکرد وەك ئەوەی پیرۆزبایی لە کۆلۆنیالیستە عراقییەکان بکات. لە لایەکی دی ئێمە زۆر باش دەزانین بەرپرسە حکومەییەکانی دەوڵەتی تورکیا چۆن لەسەر خەمی فەلەستینیەکان قسەدەکەن بەڵام تورکیا لە بارەی کوردەکانی کوردستانی باشور شتێکی ئەوەندە ناچیزی دەربڕی کە نەئەگەیشتە یەك لەسەر هەزاری ئەو بایەخەی بە خەمی فەلەستینیەکانی دەدا بەڵکو هێندێك جار بە دەستی ئەنقەست هێرشی ئاسمانی دەبردە سەر کوردەکان تا بەرەو سنوری تورکیا نەچن. ئەو بایەخەی تورکیا بە تورکەکانی قوبرس و بولگارستان و

هـەرێمی تراکیـای ڕۆژئـاوای یۆنـانی دەدا هـەرگیز لەگـەڵ ئـەو بایەخـەی لـە مەسـەلەی کوردی دەدا بەراورد ناکرێ. تورکیا لە لایەك ئاوارە ئەفغانیەکان لە ناوچە بە پیتەکانی کوردستان نیشتەجێ دەکات، لە لایەکی دی بە هـەمو شـێوازێك هـەوڵدەدا کوردەکـان لـە ناوچە کشتوکاڵییە بە پیتەکان دەربکات. لەگەڵ ئەوەشدا، جەخت لەسـەر هاوپشـکی لـە غەمو پەژارە و خۆشـی و شـانازی دەکەنـەوە بۆیـە بێمانـایی ئـەو دروشمانـە بـە جوانـی دەردەکـەوێت. سـەرکەوتنی کوردەکـانی باشـوری کوردسـتان بەسـەر کۆلۆنیالیزمـە عراقیـەکان دا بـە خۆشـی و بـە شـانازی لـەنێو کوردەکـانی کوردسـتانی بـاکوور دەنگدەداتـەوە، ئەمـە لـە کـاتێکدا ئـەو سـەرکەوتنانە سـەرانی دەوڵـەت و حکومەتـەکانی تورکیـا زیـاتر نارەحـەت دەکـات بـەڵام بـۆ ئـەوەی سـەرکەوتنی کوردەکـانی کوردسـتانی باشـوور بـەردەوام نـەبێت و هەلومـەرجی لـەبار بـۆ سـەرکەوتنی یـەکجارەکی فەراهـەم نـەبێت تورکیـا بـە بیـانوی ڕاوەدونـانی "چەتـەکان" هێرشـی ئاسمـانی دەباتـە سـەر کوردستانی باشور، هەروەها تورکیا لە ڕێگـەی هاوکارییـەکی چڕوپـڕ لەگـەڵ حکومـەتی کۆلۆنیالیزمی عراق پێکەو ە هەوڵدەدەن سەرکەوتنەکانی کورد بێناوەرۆك بکەن.

هەڵوێستی ڕۆژنامەو پارتە سیاسی و سەندیکا کرێکاری و زانکۆ و نوسـەرەکان.. هتـد، جیاوازی لەگەڵ ڕەفتاری بەرپرسەکانی دەوڵەت نیە. بەم شێوەیە ئـەو لایەنانـە گرنگییـان بـە قـەتلۆعامی خـەڵکی هەڵەبجـە نـەداو بێدەنگییـان لێ کـرد. بـەڵام بـۆ نمونـە هـەمومان دەزانین ئەو لایەنانـە بەرامبـەر بـە تورکـەکانی بولگارسـتان چـۆن ڕەفتاریـان دەکـرد. ئـەم هەڵوێستانە ڕونیدەکەنەوە ئەو دروشمەی قسە لەسەر هاوپشکی لە غەمو پـەژارەو خۆشـی و شـانازی دەکـەن چـەند پـوچ و بێناوەرۆکـە. بـەڵام دروشمـی "ئێمـە جیـاوازی پێکـەوە لـە قوبرس شەڕی یۆنانیەکانمان کردوە" جگە لـە دوڕویـی و درۆزنـی هیچـی دی نیـە چونکـە کوردیان بە شەڕێکی بێ دەسکەوتەوە تێوەگلاند بۆ ئەوەی خزمەتی ئامانجەکانی تورکیـای کۆلۆنیالیزم و ڕەگەزپەرست بکات. کورد و یۆنانی دوژمنایـەتی و ململانێیـان لـە نێـوان دا نیە لەبەرئەوەی کوردستان لە لایەن یۆنانیەکانەوە داگیرنەکراوە بۆیـە بـە قسـەی بێسـەرو بـەرو خۆهەڵکێشـان بـە شـەڕی هاوبـەش دژی یۆنانیـەکان ڕویـەکی دی کۆلۆنیـالیزم و ڕەگەزپەرست ئاشکرا دەبێت. ئەگەر یۆنانیـەکان لەسـەر دابەشـکردنی کوردسـتان هاوکـاری

ئیمپریـالیزمی بریتانییـان بکردایــەو بەشــێکی کوردســتانیان داگــیر بکردایــە تەنــها لــەو حاڵەتەدا بەشداریکردنی کورد لە شەڕی یۆنانیـەکان مانـای دەبـو، بۆیـە جێگـەی خۆیـەتی بپرسـین: ئایـا تـورك لـە کوردســتانی باشــوور دژی کۆلۆنیــالیزمی عــراق بەشــداری شــەڕ دەکات؟، نەخێر نەك هـەر بەشـداری ناکـەن بـەڵکو لـە دژی کـورد هاوکـاری عـراق دەکـەن، بەمـەش دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی کـە دروشمـی "هاوپشکی لـە غــەمو پــەژارەو خۆشــی و شانازی" جگە لە شـاردنەوەی سیاسـەتی پـەیمانی تـەمومژاوی و فریـودەر کـە مۆرکـی دوو هەڵوێستی و دوڕوویی پێوەیە هیچی دی نیە.

ئێمە زۆر باش دەزانین تورکە دەرکراوەکانی بـولگارستان چۆن لە تورکیا پێشوازییان لێدەکرا: "١٠٣ هاووڵاتی گەیشتنە تورکیـا"و "ئێمـە ئامـادەین پێشـوازی لـە هاووڵاتیـانی خۆمـان بکـەین" و "ژمـارەی هاووڵاتیـە گەیشـتوەکان لـە (٣٥٠٠٠) کـەس تێپـەڕی کــرد" پێشوازییەکی گەرم و پڕ لە دلۆڤانی.. هەرگیز بیرمان ناچێتەوە دەستەڵاتدارانی تورکیـا چۆن پێشوازییان لە کوردەکانی باشور دەکرد کە لە ترسی بۆردومانی چەکی کیمیـایی و بـایۆلۆجی سـەدام حوسـەین لــە ناوچــەی هــەکاری بــۆ پەناگەیــەك دەگــەڕان. تورکیـا ماوەیەکی دورو درێژ سنوری لێیان داخست بەڵام ئەوانـەی سـنوریان بـەزاندبو تەسـلیم بە عراق کرانەوەو حکومەتی عراقیش یەکسەر لە سێدارەی دان. پاشـان ڕایاندەگـەیاند: "ئەوانەی لە باکوری عراقەوە هاتون بودجەی دەوڵەت شەکەت دەدەن" و "ئەوانەی لە بــاکوری عراقــەوە هــاتون کێشــە دروســتدەکەن" و "پێشــمەرگە سەرئێشــەمان بــۆ دروستدەکات" و "دەبێ بە زووترین کات پێشمەرگە دەربکرێـت". ڕۆژنامـەکانی تورکیـا بەردەوام ئەو وتانەیان بڵاودەکردەوە. ئەم شین و شەپۆڕە لە دوای گەیشـتنی کوردەکـان دەستی پێکرد. ژن و گەنج و پیرو منداڵیان لـە ئوردوگـای زۆرەملـێ دەسـت بەسـەر کـردو ڕێو شوێنی تایبەتیان گرتـە بـەر بـۆ ئـەوەی لـە سـادەترین پێداویسـتی ژیـان بێبەشـیان بکەن و هاوکـاری و بایـەخدان بـە کـورد قەدەغـە کـرا. کوردەکـانی باشـووری کوردسـتان مامەڵەی زیندانی و دەستەبەسەریان لەگەڵدا دەکرا بۆیە لەبەر دەرگـای چونـە ژورەوەی کامپـەکان بنکـەی پۆلیسـیان دروسـتکرد و بـەوەش تەلبـەند کردنـی کەمپـەکان گرنگــی زیاتری پەیداکرد.

فەرمانبەرەکانی دەوڵەت و لێپرسراوانی تورکیا بە درێژایی چەند مانگ ڕۆژانە قسەیان لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەشێکی گەورەی تێچوونی (تکالیف) داڵدەدانی (٤٠٠٠٠- ٥٠٠٠٠) پەنابەری باشوری کوردستان لە ئەستۆ بگرن. بچوکترین دەرفەتیان دەقۆزتەوە بۆ ئەوەی ئەم وتانە لە بەردەم نوێنەرانی وڵاتانی ڕۆژئاوا دوبارە بکەنەوە. بەڵام دەربارەی تورکە دەرکراوەکانی بولگارستان دەیانوت: "دەتوانین (٢) ملیۆن هاوڵاتی لە تورکەکانی بولگارستان داڵدەبدەین" و "تورکیا وڵاتێکی گەورەو دەوڵەمەندە".

حکومەتی تورکیا کوردەکانی باشوری لە ئۆردوگای زۆرەملێ دەست بەسەر دەکردو ڕێگەی پێنەئەدان لە باکوری کوردستان پەیوەندی بە کەسوکاری خۆیانەوە بکەن کەچی تورکەکانی بولگارستانی ڕەوانەی لای کەسوکارەکانیان دەکرد ئەگەر کەسێکیان لە تورکیا هەبوایە. کەواتە کاتێك جیاوازییەکە هێندە ئاشکرا بێت ئیتر چۆن قسە لەسەر چەمکی هاوپشکی لە غەمو پەژارەو خۆشی و شانازی دەکرێت؟ ئەو ئیدعایانە چ کەسێك باوەڕی پێدەکات؟ تەنها ئایدولوجیای ڕەسمی دەیەوێت بڕوا بەو ئیدعایانە بکەین و هەر کەسێکیش بڕوای پێنەکات یا ڕەخنەی لێبگرێ سزادەدرێ.

پێویستە کورد هەرگیز ئەو ڕاستیانەی بیر نەچێتەوە کە بە کورتی لە سەرەوە باسمان کردوە. کورد لە ئەیلولی ١٩٨٨ بە ناچاری پەنای بۆ تورکیا برد بەڵام لە حوزەیرانی ١٩٨٩ تورکەکانی بولگارستان بە پاسپۆرتەوە ڕەوانەی تورکیا کران.

دەڵێن لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم کورد و تورك پێکەوە لە ڕۆژئاوا دژی یۆنانیو لە ڕۆژهەڵات و باشور دژی ئەرمەنەکان شەڕیان کردوە. هەروەها دەڵێن: پێکەوە لە دژی دوژمنی هاوبەش بەرگریمان لە نیشتمان و وڵات کردوە. بەڵام دوژمنی هاوبەش کێیە؟ بۆچی یۆنانی و ئەرمەنەکان دوژمنی کوردن؟

ئەگەر وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بخەینە لاوەو زۆر بە سادەیی لە خۆمان بپرسین، کورد لە دوای ئەو شەڕانەی لە دژی "دوژمنی هاوبەش" کردی چ دەسکەوتێکی هەبو؟

"لەم ولاتە هیچ جۆرە نایەکسانیەك نیەو تورکیا ولاتی ئەو کەسانەیە کە هەست بە تورکبونی خۆیان دەکەن"، کاتێك بیر لەم وتانە دەکەینەوە ئنجا بەم ئەنجامە دەگەین: ئەگەر کورد واز لە ناسنامەی تایبەتی خۆی بهێنێ، واتە ئەگەر نکوڵی لە ناسنامەی کوردایەتی بکات و بە ئاشکرا بڵێت من تورکم و بەختەوەرم بەوەی کە تورکم دەتوانێ بەشداری لە هەمو چالاکییەکی سیاسی و ئابوری و کاریگێڕی و کولتوری بکات.

بێگومان ئەو کەسانە لە هەمو شوێنێك کاریان دەستدەکەوێت، بەڵام ئەگەر کەسێك دەستبەرداری ناسنامەی کوردایەتی نەبێ و بەرگری لێبکات و داوای مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی کورد بکات هەرگیز کاری دەستناکەوێ چونکە لە تورکیا ئەو کەسانە یا ڕاکردو یا زیندانی دەبن. هەمو کوردێك بۆی هەیە بەشداری لە چالاکی و توێژینەوەی زمانی تورکی بکات و بە هەمو شێوەیەکیش پشتگیری دەکرێ و هان دەدرێ مادام هاوبەشی ئەکا لە پاراستنی کولتوری تورکی لە ئیمپریالیزمی کولتوری کە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وە ڕووی کردووەتە تورکیا، بەڵام ئەگەر هەمان کورد هەوڵبدات فەرهەنگێکی کوردی دابنێت یا بۆ پاراستنی کولتوری کوردی لە ئیمپریالیزمی کولتوری وەك عراق و ئێران و سوریاو تورکی پێشنیازێك پێشکەش بکات ئەوا توشی سزای یاسایی دەبێ. هەڵبەتە هەمو کوردێك دەتوانێ دژی کردەوەکانی بولگارستان و ناوچەی تراکیای ڕۆژئاوای یۆنان بەرامبەر بە کەمایەتی تورك بەشداری چالاکی سیاسی و دیبلۆماسی بکات و بە هەمو شێوەیەکیش پشتگیری لە بەشداریکردنەکەی دەکرێ، بەڵام ئەگەر قەدەغەکردنی زمان و کولتوری کوردی لە تورکیا شەرمەزار بکات یا ڕەخنەی لێبگرێ ئەوا ڕوبەڕوی دادگاییکردن دەبێتەوە. لە تورکیا بە تورك بونی کورد مەرجێکی زەروورییە بۆ ئەوەی بەشداری لە ژیانی سیاسی و دیبلۆماسی بکات.

پێویستە کورد زمان و کولتورو نیشتیمان و مێژوی کۆلۆنیالیزمە تورك و ئێرانی و عەرەبەکانی خۆش بوێت وەك ئەو دایکەی شیری پێداوە. کورد تا لەسەر ئەو خۆشەویستیەی بمێنێتەوە "هاوڵاتیەکی باش و ڕەگەزێکی دڵسۆزە" بەڵام کاتێك کورد

زمـانی کـوردی و کوردسـتان و ناسـنامەی کوردایـەتی خـۆی خـۆش بوێـت ئیـتر وەك "ڕێگر"و "دز" و "خائین" و "نەفس نزم" مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

سەرەڕای ڕاوەدوونان و دادگاییکردن لەم مـاوەی دواییـدا دیـاردەی هاوبەشـی کردنـی کوردەکان لە داکۆکی کردن لە مـافی نەتەوایـەتی و سیاسـی و کولتوریـەکانیان ڕوو لـە زیاد بوونە.

کەسـانێك هـەن بـاوك و دایکیـان کـوردە بـەڵام وازیـان لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی و کوردایـەتی هێنـاوە و وەك تـورك بیردەکەنـەوە. ئـەو کەسـانە ئەگـەر لوتـی تورکێـك لـە بولگارسـتان خوێنـی لێبێـت ئـەوا بـە خۆیـان و پڕۆژەکانیانـەوە بـە هەڵـەداوان بـۆ دەربڕینـی بێزاری لەو ڕوداوە بەرەو پارلەمانی ئوروپا ڕادەکەن و هەوڵدەدەن پارلـەمانی ئوروپـا بهێننـە لـەرزە. ئـەو کەسـانە مەسـەلەی تورکـەکانی تراکیـای ڕۆژئـاواو قوبـرس و ناوچـەکانی دەوروبـەری کـەرکوك جـۆش و خرۆشـێکی بـەگڕیان دەوروژێنێـت، کـەچی بەرامبـەر بـە ئەشـکەنجەدانی (٤٠) گـەنجی کورد تـا مـردن لـە گرتوخانـەی دیاربـەکر تەنـها لەبەرئـەوەی ڕەتیان کردەوە بە دەنگێکی بڵند بڵێن: "ئێمـە تورکین و بەختـەوەرین بـەوەی کـە تورکین" بێدەنگیـان لێکـرد. ئـەو کەسـانە لـە ئاسـت ئـەو جـۆرە ڕوداوانـە کوێـرو کـەڕوالڵ دەبـن بـەڵام کاتێك ڕووبەڕووی ڕاستی ئەو ڕوداوانەش دەکرێنەوە دەڵێن ئەوە شتێکی گرنگ نیە.

لە کاتی شەڕی کەنداوی یەکەمدا ئەو کەسانە زۆر ناڕەحەت و قەڵس دەبـون ئەگـەر ئێران ناوچە کوردنشینەکانی داگیربکردایەو عەقڵیان لەسەردا نەئەما ئەگەر پێشمەرگە کوردەکان سەرکەوتنێکی لەبەرچاویان بەدەست بهێنایە. لە ئاست ئەو پرسیارەی تـورك بەرامبەر کەرکوك دەیەوێت چ بکات؟ نیگەرانی خۆیان دەردەبڕی و داوایان لە دەوڵـەتی تورکیـا دەکـرد ئەرکـەکانی سەرشـانی بـەجێ بـهێنێ. بـەڵام کـاتێك بـە چـەکی کیمیـایی قەسـابخانەیەك بـۆ زیـاتر لـە (٥٠٠٠) کـورد سـاز دەکـرێ هیـچ پەرچـەکردارێك نـابێت. کۆلۆنیـالیزمی تورکـی زۆر مەنتیقیانـە لاوازی ئـەو کەسـانە دەقۆزێتـەوەو بـە ئـەرکی تایبەت ڕەوانـەی ڕێکخـراوە نێـو دەوڵەتییـەکانیان دەکـات و چارەسـەرکردنی بـارودۆخی تورکـەکانی بولگارسـتان و تراکیـای ڕۆژئاوایـان پێدەسـپێرێ. ئـەم بارودۆخـە تراجیدیەکانی ئەم چەرخە دەنوێنێ!!

زۆر ئاساییە کۆلۆنیالیستەکان سود لەو کەسانە وەربگرن چونکە کاتێك کەسایەتی و ڕوناکبیرانی دیموکراتخواز و شۆڕشگێڕ ئەو ڕوداوانـە ڕیسوا ناکـەن و لاوازییـەکانی ئـەو کەسـانە ناقۆزنـەوە ئیـتر ئـەو کـارە زۆر بــە سـاکاری دەگاتــە ئاسـتی ئــابڕوچون. ئــەو ئابڕوچونـەش لەوەدایـە کـە دەڵێـن: "سـەرەڕای ئـەوەی ئـەم کەسـە کـوردە کـەچی داوای مافەکانی خۆی ناکات و نکوڵی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی دەکـات و وە ك هـەر تورکێـك دەربەستە بەرگری لە مافەکانی تورك بکات"، ئایا هـەمان شـت بـۆ نمونـە لەسـەر ئـەو فەلەستینانە دەڵێن کە پاڵپشتی لـە سیاسـەتی دەوڵـەتی ئیسـرائیل دەکـەن؟ ئایـا هـەمان شـت بـەو تورکانــە دەڵێــن کــە بــون بــە بولگــاری و خزمــەتی ئامانجــەکانی دەوڵــەتی بولگارستان دەکەن یا ئەو تورکانەی لە تراکیای ڕۆژئاوا بون بە یۆنانی؟

حکومـەت و لێپرسـراوانی دەوڵـەت و ڕۆژنامــەکانی تورکیـا ئــەو کــەس و ڕێبــەرە ئاینیانـەی وازیـان لـە تورکایـەتی خۆیـان هێنـاوەو لـە بولگارسـتان بـون بـە بولگـاری و ئەوانەی پاساو بۆ ئامانجەکانی دەوڵەت و حکومەتی بولگاریا دەهێننەوەو دەسـتبەرداری ناسنامەی تورکایەتی بون بە خائین وەسف دەکەن، هەروەها ئەو تورکانــەی لـە تراکیـای ڕۆژئـاوا بـون بـە یۆنـانی و وازیـان لـە ناسـنامەی تورکایـەتی هێنـاوە بـە "کرێگـیراو" و "خائنی نەتەوە" وەسف دەکرێن. وەك چۆن فەلەسـتینییەکان، دەسـت لەگـەڵ دەوڵـەتی ئیسـرائیل تێکـەڵ دەکـەن، بـە خـائین دادەنێـن. کـەچی لێپرسـراوانی دەوڵــەت و دەزگــا ڕەسمییەکانی ڕاگەیاندن، بە شانو باڵی ئەو کوردانـەدا هـەڵ ئـەدەن و ستایشـیان دەکـەن کـە بـون بـە تـورك و وازیـان لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆیـان هێنــاوەو بــەرگری لــە ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی تورکیـا دەکـەن و ئـەم پیاهـەڵدان و ستایشـە هـەر کۆتـایی نـایێت، بــەڵام ئێســتا هــەموو دنیــا بــەم دووڕوویــی و دوو هەڵوێســتییەی زانیــوەو بــوە بە جێگەی پرسیار.

## مەسەلەی ناسنامە لەلای "ڕوناکبیرانی کورد"

لێرەدا پێویستە شتێك لە بارەی "ڕوناکبیرانی کورد" بڵێین. ڕوناکبیرانی تورك بە شێوەیەکی بەردەوام لە کۆڕە نیشتمانی و دەولییەکان وەك ڕوناکبیرانی تورك شانازی بە تورك بونی خۆیانەوە دەکەن. ئایا دەتوانین هەمان شت لەسەر ڕوناکبیرانی کورد بڵێین؟ بۆچی ڕوناکبیرانی کورد ناتوانن ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان ئاشکرا بکەن، ئەمە لە کاتێکدا ڕوناکبیرە تورکەکانی هاوڕێیان لە تەنیشتیانەوە بە ئاشکرا شانازی بە تورکایەتی خۆیانەوە دەکەن؟ ئایا هەمان شت لەسەر ڕۆژنامەنوس و سترانبێژو شانۆکارو سینەماکاران و ئەوانی دی پیادە نابێت؟ ئایا ئەم بارودۆخە لانێکی تراجیدی نیە؟

## نەتەوە یەکگرتوەکان و کورد

مەسەلەی کورد یەکێکە لە مەسەلە گرنگەکان لە بەردەم نەتەوە یەکگرتوەکاندا، نەتەوە یەکگرتوەکان لە دوای جەنگی جیهانی دوەم دەوری سەرەکی لە لابردنی سیستمی کۆلۆنیالیزم هەبو، هەروەها نەتەوە یەکگرتوەکان دەوری سەرەکی هەبو لە خەباتی کۆلۆنیەکان دژی هێزەکانی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمی بریتانیاو فرەنساو بەلجیکاو زەوییە نەوییەکان (هۆڵەندا) و ئیسپانیاو پورتوگال. بەڵام بە هۆی پارچە پارچە کردن و دابەشکردنی کوردستان نەتوانرا کێشەی کورد بخرێتە بەردەم کۆمەڵگەی گەلان و نەتەوە یەکگرتوەکان. بە هەوڵ و کۆششی بەردەوام و هاوبەشی ئەو هێزانەی کوردستانیان دابەش و پارچە پارچە کردوە واتە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی (عراق) و ئیپمریالیزمی فرەنسی (سوریا) و تورکیا و ئێران مەسەلەی کورد لە بەردەم کۆمەڵەی گەلان و نەتەوە یەکگرتوەکان چارەسەر نەکرا. کاتێك عراق و سوریا سەربەخۆییان لە ئیمپریالیزمی بریتانی و فرەنسی وەرگرت بە هەمان ئاراستە درێژەیان بە هەوڵەکانی خۆیان دەدا. لە ساڵانی شەستەکان هەوڵەکانی عراق بۆ گەشەپێدان و پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت گۆڕانێکی ئەوتۆی لە

چارەنوسی کوردستانی باشور نەهێنایەدی بەڵکو بە پێچەوانەوە پیادەکردنی سیاسەتی سەرکوتکردن و قەتلوعام و قەلاچۆکردن و ڕاگواستنی حزبی بەعس بە سەرکردایەتی سەدام حوسەین گوژم و تینێکی زۆر زیاتری پەیدا کرد. ئەو کوردانەی ڕوبەڕووی سەدان پرۆسەی قەتلوعام و ڕاگواستن و خیانەت و پیلان بوونەوە، نەیانتوانی کۆت و زنجیری گەردنیان بشکێنن و هاوارو ناڵەیان بگەیەننە ڕێکخراوە نێودەوڵەتێکان.

لە شوباتی ساڵی ١٩٦٣ حزبی بەعس لە عیراق بە کودەتایەکی سەربازی کۆتایی بە حوکمی عەبدولکەریم قاسم هێنا. دوا بەدوای کودەتاکە شالاوێکی سەرکوتکەرانەی بەرفراوان دەستیپێکردو بە هەزاران ئەندام و سەرکردەی حزبی شیوعی لەژێر ئەشکەنجە گیانیان لە دەست دا و بە تەنها ئەو کەسانەی بۆ کوردستان ڕایانکرد بە سەلامەتی دەرچون و ئیجرائاتی سەرکوتکەرانەش لە دژی کورد چڕتر بویەوە. لەو هەلومەرجەدا یەکێتی سۆڤێت بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی عیراق ویستی لە ڕێگەی مەنگۆلیاوە مەسەلەی کورد بخاتە بەردەم نەتەوە یەکگرتوەکان. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ بەعسیەکان بە کودەتایەکی سەربازی نوێ لە دەستەڵات دورخرانەوەو ئەمەش بوە هۆی باشبوونی پەیوەندی نێوان حکومەت و شیوعیەکان و وردە وردەش لەگەڵ یەکیەتی سۆڤێتدا، لە بەرامبەر ئەوەشدا یەکێتی سۆڤێت داواکارییەکەی خۆی کێشایەوە بەوەی مەسەلەی کورد بخاتە بە ردەم نەتەوە یەکگرتوەکان و بەمشێوەیە ئەم فایلە داخرا.

لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم و لە چوارچێوەی کۆمەڵەی گەلان لێکۆڵینەوە لەسەر دروستکردنی دەوڵەتێکی یەهود دەکرا. لە دوای جەنگی جیهانی دوەم لە سایەی هەوڵە چڕەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان دەوڵەتێکی یەهودی لە فەلەستین دروستکرا. بەڵام نە لە چوارچێوەی کۆمەڵەی گەلان و نە لە چوارچێوەی نەتەوە یەکگرتوەکان هیچ هەوڵێك بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد نەدرا، بەڵکو بە پێچەوانەوە لایەنگیری و پشتگیریان لە پارچە پارچە کردنی کوردستان و پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" دەکرد.

بە ڕاستی ئابڕووچوونە نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیار دژی سیاسەتی ئاپارتاید (التمییز العنصری) لە باشوری ئەفریقیا دەربکات بەڵام لە ئاست سیاسەتی

ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی لە کوردستان چاوپۆشی بکات. کارێکی ئاساییە ڕەگەزپەرستی لە دوو وڵاتدا جیاوازی هەبێت. لە باشوری ئەفریقیا بە پێی ڕەگەز شوێنە خزمەتگوزارییەکان دابەش دەکرێ و بەشێکی زۆر کەمیان بۆ ڕەشپێستەکان تەرخاندەکرێ. بەڵام لە تورکیا ڕێگە بە کورد نادرێت سود لە خزمەتگوزارییە گشتیەکان وەربگرێت ئەگەر نکوڵی لە ناسنامەی کوردایەتی و ئیدعای تورکبونی خۆی نەکات. ناچارکردنی کورد بۆ ئەوەی نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی بکات و ناسنامەی نەتەوەی سەردەست هەڵبگرێ، ترسناکترین جۆری ڕەگەزپەرستیە ئەمەیان ڕەگەزپەرستییەکە لەسەر شێوازی تورکی.

دەوڵەتی تورکیا پشتگیری لە تورکەکانی بولگارستان و قوبرس و تراکیای ڕۆژئاوای یۆنان دەکات. هەروەها ئامادەیە بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی تورك و ڕێگەگرتن لە چەوسانەوەیان بکەوێتە شەڕەوە، بۆ نمونە وەك ئەوەی لە قوبرس ڕویدا. دەوڵەتی تورکیا هەوڵدەدا دەزگا نێودەوڵەتییەکان لە چەوسانەوەی تورکەکانی بولگارستان ئاگادار بکاتەوە. ئە م مەسەلەیە لە پەیوەندییە دووقۆڵی و نێودەوڵەتییەکان بناغەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری تورکیا پێکدەهێنێ، بەڵام چەوسانەوەی کورد ناخرێتە بەردەم دەزگا نێودەوڵەتییەکان. چ کەسێك دەتوانێت ئەو کارە بکات؟ کورد نەتەوەیەکی بێدەوڵەتە. سیستمی کۆلۆنیالیزمی نێودەوڵەتی بە مەبەستی تاڵانکردنی سەرچاوەی سروشتی و نەوت و ئاو و کانزاکانی دی و بێدەنگ کردنی کورد نایەوێت دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستان دروست بێت، بۆیە تەنها بزوتنەوەو دەزگا دیموکراتیەکانی چەند و لاتێکی دونیا گرنگی بە مەسەلەی کورد دەدەن.

لە سەرەتای مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨ هەزاران کورد لە کوردستانی باشور بە ناچاری لە ترسی چەکی کیمیایی پەنایان بۆ باکوور هێنا. کاتێك بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بوو بە شتێکی ڕاست و نەتەوە یەکگرتوەکان لەبەر ڕۆشنایی سکاڵانامەی بریندارەکان بڕیاریدا تیمێکی پسپۆڕ بە مەبەستی لێکۆڵینەوە ڕەوانەی ناوچەکە بکات. عیراق ڕێگەی نەدا پسپۆڕەکان لێکۆڵینەوە لەسەر خاکی عیراق بکەن، بۆیە نەتەوە یەکگرتوەکان هەوڵیدا بریندارە کوردەکانی ناو پەنابەرەکانی تورکیا ئازمایش بکات

کەچی تورکیاش ڕێگەی نەدا تیمە پسپۆڕەکە لێکۆڵینەوە لەسەر خاکی تورکیا بکات. لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩ دەستەڵاتدارانی بولگارستان تورکەکانی بە پاسپۆرتەوە ڕەوانەی تورکیا کردەوەو هەر خودی تورکیا ڕایگەیاند ئەو تورکانەی لە بولگارستان ماونەتەوە بە زۆر کوتراون و گومان لە سروشتی سیرەمی (لقاح) کوتانەکەش دەکات لەبەرئەوە تورکیا بۆ ئازمایشکردنی کوتراوەکان بە تایبەتی منداڵان داوای لە نەتەوە یەکگرتوەکان کرد تیمێك ڕەوانەی بولگارستان بکات. ئەو تورکیایەی ڕێگەی نەدا تیمێکی پسپۆڕ لێکۆڵینەوە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بکات داوا لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەکات تیمێکی پسپۆڕ بە مەبەستی لێکۆڵینەوەیەکی لەو شێوەیە ڕەوانەی بولگارستان بکات. تورکیا لە هەردو حاڵەتەکە وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ داوای ماف و ئیمتیازەکانی خۆی دەکرد، بۆیە لەسەر نەتەوە یەکگرتوەکان و دەزگا نێودەوڵەتیەکانی دی پێویستە بایەخی زیاتر بە ڕۆڵی سیستمی کۆلۆنیالیزمی جیهانی بدەن کە ئێستا لە کوردستاندا پیادە دەکرێ.

پێشتر ڕونمان کردەوە تورکیا چۆن کوردەکانی باشوری کوردستان لە ئۆردوگای تەلبەندکراودا دەست بەسەر کرد و وەك زیندانی سەودای لەگەڵ پەنابەرە کوردەکان دەکرد. هەروەها لەو نارەحەتیانەش تێگەیشتین کە ڕوبەڕوی ڕۆژنامەنوس و دیپلۆماتە بیانی و نوێنەرانی دەزگا دیموکراتیەکان و خەڵکانی دی دەبووە کاتێك دەیانویست لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئۆردوگایانە بکەن بۆیە زۆرێك لە نوێنەرانی ئەو دەزگایانە ڕێگەیان پێنەدرا سەردانی ئۆردوگاکان بکەن. ئەو تورکیایەی دیپلۆماتە بیانی و نوێنەرانی ئاژانسی هەواڵ و ڕۆژنامەنوسەکانی لە ئەنقەرەوە بۆ سنوری بولگارستان دەگوێزایەوە تا بیرۆکەیەکیان لەسەر چۆنیەتی ڕەوانەکردنی پەنابەرە تورکەکانی بولگارستان لەلا دروست بێت هەر ئەو تورکیایە ڕازی نەبو لەسەر هەلومەرجی داڵدەدانی کوردەکان لێکۆڵینەوە لە ئۆردوگاکانیدا بکرێ.

نوێنەرانی حکومەت و دەوڵەتی تورکیا دەیانەوێ ئەوە دوپات بکەنەوە کە تورکە دەرکراوەکانی بولگارستان بە باشی مامەڵەیان لەتەکدا کراوەو بە باشترین شێوەش پێداویستیە سەرەکییەکانیان بۆ دابین کراوە چونکە لەوە دەترسان بولگارستان لەسەر

بارودۆخی ژیـانی نالـەباری کوردەکـان پڕوپاگـەندە لـە دژی تورکیـا بکـات. بـەڵام بۆچـی کەس گرنگی بە چارەنوسی کوردەکانی باشور نادات کە بـە خراپـترین شـێوە مامەڵـەیان لەگەڵدا دەکرێ؟ شتێکی ئاشکرایە هیـچ دەوڵـەتێك نـاڕەزایی لـە دژی تورکیـا دەرنـابڕێ. بۆچی تورکیا پێشبینی ناکات نەتەوە یـەکگرتوەکان و ڕێکخـراوە نێودەوڵـەتێکان لەسـەر خراپی مامەڵەکردنی کورد ناڕەزایی لە دژی دەربڕن؟

یـەکێك لـەو مامەڵـە خراپـەی دەرهـەق بـە کـورد کـرا دەرمـانخواردکردنی پەنابـەرە کوردەکان بو. لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩دا لە ئۆردوگای قزلتەپەی Kizil Tepe تورکیـا زیـاتر لـە ٥٠٠ کـورد لـە ڕێگـەی نانـــەوە دەرمـانخوارد کـران. سـەرەڕای ئـەوەی لێپرسراوانی تورك و ڕۆژنامەکانی تورکیا حاشایان لە حەقیقەتی ڕوداوەکە کرد کـەچی دواتـر ئاشـکرابو کـە سـیخوڕەکانی تورکیـاو عـراق دەسـتیان لـە ژەهـراوی کردنـی نـانی پەنابەرە کوردەکاندا هەبوە (2000 e Dogru, 18/6/1989, p. 24).

تورکیـا بـە ئـەرکی سەرشـانی خـۆی دەزانـی جیـهان لـە سـەرکوتکردنی تورکـەکانی بولگارسـتان ئاگـادار بکاتـەوە، هـەروەها بـە ئـەرکی سەرشـانی خۆیشـی دەزانـی کـورد سەرکوت بکات.

دوورخستنەوەو ڕاگواستن لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکـی دی یەکێکـە لـەو ڕوداوانـەی کـە دەلالەتی زۆر نیگەتیڤی هەیە؟ بەڵام مـرۆڤ لەسـەر دورخسـتنەوەی نـاو نیشـتمانەکەی خۆی چ بڵێت. کاتێك تورکە دورخراوەکـانی بولگارسـتان دەگەنـە تورکیـا برادەرەکانیـان پێشوازیان لێدەکەن یا بە لایـەنی کەمـەوە دورخراوەکـان دڵنیـان لـەو شـوێنەی کـە لێـی دەمێننەوە. ئایا دەتوانـرێ ئـەم حاڵەتـە لەگـەڵ حاڵـەتی کوردەکـان بـەراورد بکـرێ؟ بـۆ نمونـە چـۆن حاڵـەتی ئـەو خەڵکانـە وەسف بکـەین، کـە لـە باشـوری کوردسـتانەوە بـۆ ناوجەرگـەی بیابانـەکانی باشـوری عـراق گوێزرانـەوە. عـراق بـە ڕێگەیـەکی ڕون و دیـاریکراو بـەردەوام سیاسـەتی ڕەگەزپەرسـتی و کۆڵۆنیـالیزمی پیـادە دەکـات بۆیـە پێویستە لەسەر نەتەوە یەکگرتوەکان ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکات.

## كوردستانی ئەمڕۆ، كوردستانی جاران نیە

ئەمرۆ زۆر شت گۆرانی بەسەرا هاتوەو كوردستانیش بە پرۆسەی گۆرانێكی گەورەدا تێپەڕ دەبێت كە تێیدا ئاستی كاری سیاسی پیّ بە پێی ئەو گۆڕانە گەشـە دەكات. كورد بە تایبەتی لە هەشتاكانەوە پرسیاری دیاریكراو لەسەر ناسنامەی نەتەوایەتی و مێژوی خۆی دەكات و دەپرسێت بۆچی توركیا بەشێكی كوردستانی داگیركردوە؟ بۆچی ئێران و عراق و سوریا بەشەكانی دی كوردستان داگیر دەكەن؟ كەی ئەو دەوڵەتانە كوردستانیان دابـەش و پارچـە پارچـە كــرد؟ چـۆن سیاســەتی "پەرتكـە- زاڵبــە" پیــادە كــرا؟ كـام هەڵوێستی لاوازی كورد كارئاسانی كردوە بۆ ئەوەی ئەم سیاسەتە لە دژی بەكاربهێنرێ؟ كـورد كـام شــەڕی لــە دژی سیاســەتی "پەرتكـە- زاڵبــەو لەناوبــەرە" كــردوە؟ بۆچــی شۆڕشەكانی كورد ئامانجی خۆیان نەپێكاوە؟، بە پیـادەكردنی ئایدیۆلۆجیایـەكی ڕەسمـی چەقبەستوی نەگۆڕ كە تەنها خزمەتی تیرۆری دەوڵەت دەكات و هیـچ نەرمییـەكی تێـدا نـەبێ. ئەسـتەمە سـەركردایەتی كردنــی كۆمەڵگەیــەك كــە بــەم خێراییــە دەگــۆڕێ و ڕۆڵـەكانی ئـەو پرسـیارانە لـە ڕابـردو و ئێسـتای خۆیـان دەكـەن. دەتوانــین بــارودۆخی كوردستان لەم فۆرمەدا كورت بكەینەوە: كوردستان وەك جـاران نەماوەتـەوەو نەتـەوەی كوردیـش ئـەو وزە خامۆشـە نیـە بـە ئاسـانی بـە درۆی ئەفسـانەكانی گـەورەیی تـورك و بـەوەی بـەهای تاكـە توركێـك هاوتـای بـەهای هـەموو دونیایـەو بـە ئیدعـای زەبــەلاحی سوپاو پۆلیس و جەندرمەی تورك دەستەمۆ بكرێ.

كورد وەك جاران لاواز نیە چونكە ئەم سـەردەمە سـەردەمی ڕابوونـی بـیرو وشـیاری نەتەوایەتی كوردە. لە دایك بوونی وشیاری سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابوری پابەندە بـە لە دایك بونــی وشـیاری نەتەوایەتییـەوە. وشـیاری میللـەتی كـورد لـە مۆركـی سـاكاری و نەزانی و تەوەزەلی ڕزگاری بوە.

گۆڕانكارییـەكانی كوردسـتان كاریگـەری لەسـەر چـەپی تـورك و ڕوناكبـیرانی تـورك هەیەو خەریكە بیروڕایان لەسـەر مەسـەلەی كـورد دەگـۆڕێ و كاریگـەری ئایدیۆلۆجیـای ڕەسمیش زۆر بە هێواشی لەسەر هێندێك كەس و چەند دەزگایەك ئەمســەرو ئـەو سـەر

دەكات. بێگومان ئەو گۆڕانكارییانە بە شێوەیەكی كتوپڕو لە ماوەیەكی كورت ڕویان نەداوە. پێویستە گرنگی كەڵەكەبونی ئەزمونەكانی ڕابردو، و كاریگەرییان لەسەر ئێستا بە هەند وەربگرین، لەوانەش ڕوداوەكانی سەردەمی حوكمی ئیمپراتۆریتی عوسمانی، دابەشكردن و پارچە پارچەكردنی كوردستان و بزوتنەوەو شۆڕشە زۆرەكانی هەمو پارچەكانی كوردستان بۆ نمونە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی لە باشوری كوردستان بە سەركردایەتی شێخ مەحمود بەرزنجی و مەلا مستەفای بارزانی، ڕاپەڕینی ڕۆژهەڵاتی كوردستان بە سەركردایەتی سمكۆو دامەزراندن و ڕوخانی كۆماری مەهاباد، شۆڕشەكانی باكوری كوردستان دوجیری و شێخ سەعید و ئاگری و دەرسیم و.. هتد. ئەم شۆڕشانە بە درێژایی چەند ساڵ بون بە بەشێك لە ئەزمونە كەڵەكەبوەكانی كوردستان. ئەگەر لێكۆڵینەوە لەسەر سی (٣٠) ساڵی دوایی كوردستانی باكوور بكەین، جارێكی دی سەرنجی چەند ڕوداوێكی گرنگ دەدەین، لەوانە گرتنی (٤٩) تێكۆشەری كورد لە ساڵی ١٩٥٩ و گرتنی (٢٣) تێكۆشەری دی لە ساڵی ١٩٦٣ ئەمە ئەگەر ڕوداوەكانی ساڵی ١٩٤٣ لەبیر نەكەین كە لە سایەی حوكمی نائاساییدا (٣٣) تێكۆشەری كورد گوللەباران كران یا ئەوەی بە ناوی "سوپای جەنەراڵ مستەفا موغلالی" دەناسرێتەوە*.

هەروەها دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردستان لە ساڵی ١٩٦٥ و یانەی كولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٦٨ ڕوداوی مێژوی گرنگ و وەرچەرخانێكی گەورە بو لە مێژوی كوردستانی باكوردا.

دەركردنی گۆڤاری (پێشكەوتنی نیشتمان- Ileri Yurt) ساڵی ١٩٥٨ لە دیاربەكرو گۆڤاری (دەنگی سلیڤان- Silvanin Sesi) ساڵی ١٩٦٢ لە سلیڤان و گۆڤاری (دیجلە- فورات- Dicla- Firat) ساڵی ١٩٦٢ لە ئەستەنبوڵ و گۆڤاری (دەنگی ڕۆژانو- Dengy' Roja Newe) ساڵی ١٩٦٣ لە ئەستەنبوڵ و گۆڤاری (وێنەی نوێ- Yeni Akis) ساڵی ١٩٦٦ لە ئەنقەرەو پەخشنامەكانی یانەی كولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵات، لەگەڵ لێپرسینەوەو گرتن و

* بەڕێز ئاسۆس هەردی ئەم كتێبەی بە ناوی "سی و سێ گوللە" وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی.

داوانامـەکانی پۆلیسـی تورکیـا لـە دژی ئـەو گۆڤارانـە، دەوری گرنگیــان لــە پێشخســتنی وشیاری نەتەوایەتی کورد وازیدەکرد.

نابێ ناوی گۆڤارێکی تر لەبیر بکەین کە بە ناوی (Sere Siyar- سـاڵی ١٩٧٠ لـە دوگـو بایـەزید دەردەچـو). پرۆفیسـۆر والی دەدە ئۆغلـو – Veli Dade oglu بــە بیــانوی نــاوی گۆڤارەکە زنجیرە وتارێکی لە ڕۆژنامەی جمهورییەت بلاوکردەوە کە تێیدا شـالاو دەباتـە سـەر دەسـتەی نوسـەرانی گۆڤارەکـە. دەدە ئۆغلـو دەنوسـێت؛ نـاوی گۆڤارەکـە خـۆی لـە خۆیدا مانای جوداخوازی دەگەیـەنێت چونکـە تەنـها بـەکارهێنانی نـاوێکی نـاتورکی بـۆ گۆڤارەکـە خیانەتـە لـە نیشـتمان، بڕوانـە (Turkiye Halklari, Yakin Tarihini Zder (lhametlen, Cum hwriyet. 3-5/2/1970

پرۆفیسۆری ناوبراو، خەباتی شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازەکانی کورد لە دژی موڵکدارە گـەورەکان (ئەریسـتوکراتەکان) لـە پێنـاوی دیموکراتـیزم و سوسـیالیزم بـە خیانـەت لـە قەڵەم دەدا، هەروەها دەدە ئۆغلو تەنـها نـاوێکی کـوردی بەسـە بـۆ ئـەوەی گۆڤارەکـە بـە خیانەت تاوانبار بکات، کەچی تا ئێستاش نازانرێت کەسێکی شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازی وەك پرۆفیســۆر دەدە ئۆغلــو چــۆن توانــی خیانــەت لــە کێشــەی شۆڕشــگێڕو دیموکراتخوازەکـانی تـورك بکـات، بــەڵام وشـیاری نەتەوایـەتی کـورد لـە ڕێگـەی ئـەو داوانامانەی دژی گۆڤارەکەو دەستەی نوسەرانی بەرزدەکرایەوە زیـاتر بەرجەسـتە دەبـو تا لە ڕێگەی ناوەڕۆکی ئەو وتارانەی گۆڤارەکە بلاویدەکردەوە. مەسەلەی کورد سـنوری دیموکراسی تورکیاو ناوەڕۆکی چەمکی دیموکراتی لەلای ڕوناکبیرانی تورك ئاشکرا کـرد. ئەم دژایەتیە ئاسۆی تێڕوانین و فیکری کورد فراوانتر دەکات.

جارێکی دی دوپاتی دەکەمەوە لێکۆڵینەوەی ئەم کێشانە بە نیوەنــاچڵی دەمێنێتـەوە ئەگەر تەنها لە گۆشەنیگای چینە کۆمەڵایەتییــەکان تەماشـایان بکـرێ، بـەڵکو پێویسـتە لــە گۆشــەنیگای گروپــە ئەتنیەکانیشــەوە لێکۆڵینــەوە لەســەر ئــەو کێشــانە بکــرێ. تێکۆشەرێکی پێناوی دیموکراسی وەك پرۆفیسۆر والی دەدە ئۆغلو خیانەت لە کێشـەکەی خۆی دەکات کاتێك نکۆڵی لە میللەتی کورد دەکـات و مەسـەلەی نیشـتمانپەروەرێتی پـێ قبــوڵ نــاکرێ. بێگومــان پرۆفیســۆر دەدە ئۆغلــو کەســایەتییەکی نیشــتمانپەروەرو

دیموکراتخوازەو جێگەیەکی گرنگی لەلای تورك هەیە بەلام کورد وەك خائنێك تەماشای دەکات چونکە دوژمنی کوردو ڕەگەزپەرستێکی تورکەو دوژمنی مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانی کوردەو یەکێکە لە نوێنەرە لەبەرچاوەکانی ئایدولوجیای ڕەسمی تورکیا کە لە شیکردنەوەکانی دا پشت بە درۆو دەلەسە دەبەستێت.

لە تورکیا هەرزوو خەسڵەت و کەسایەتی کەسەکان ئاشکرا دەبێت کاتێك لە گۆشەنیگای گروپە ئەتنیەکانەوە لێکۆ ڵینەوە لەسەر کێشەکان دەکرێ چونکە مەسەلەی ئەتنی لە گەلای گوڵەبەڕۆژە دەچێت. لەبەرئەوەی کەسانی پرۆفیسۆر ئاسای بابەتی باسەکەمان بۆیە پێویستە توانای وێناکردنی ئەوەیان هەبێت کە کوردیش نشتمانپەروەرەو ولاتەکەی خۆی خۆشدەوێت.

لە ڕابردویەکی نزیك ڕوداوی زۆر گرنگ ڕویدا کە بووە هۆی بەرجەستەبونی وشیاری نەتەوایەتی کورد وەك دادگاییکردنەکانی ڕۆژهەلات کە ڕیژێم لە ١٩٧١/٣/١٢ دەستی پێکرد. کورد بۆ یەکەمجار لەم دادگاییکردنەدا بە ڕێکوپێکی و بە خۆڕاگری و بە وشیاری بەرامبەر بە دەوڵەتی تورکیا بەرگری لە ناسنامەی کوردایەتی لە خۆی دەکرد. ئەم هەلوێستە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر کۆمەلگەی کوردەواری هەبو. لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە گەلێك ڕێکخراو بە هۆی چاپەمەنی جۆراجۆر بە دیارکەوتن کە ڕەگوریشەیان بۆ یانەی کولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەلات دەگەڕایەوە، وەك: ڕزگاری (یانەی شۆشگێڕی کولتوری میللی) و (یانەی کولتوری شۆڕشگێڕی دیموکراسی- Devrimci Demokrat) و تێکۆشین و کاوەو ڕێکخراوی دی، ئەمە جگە لە ڕۆژنامەی خودی ڕێکخراوەکان. لەنێو گۆڤارەکان تەنها دو گۆڤار ناوبانگیان دەرکرد کە بریتین لە گۆڤاری (ڕۆژاوەلات Roja Welat) و گۆڤاری (ڕۆژانو Roja Nu). هەروەها خانەی پەخشی کۆمال Komal و ڕێگەی ئازادی Ozgurluk Yolu و کۆڕال Koral و.. هتد، نوسینی گرنگیان لەسەر مێژوو و زمان و کولتوری کوردی و بونیادی کۆمەلایەتی کۆمەلگەی کوردەواری بلاوەدەکردەوە.

لەم میانەدا پێویستە ڕۆلی پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازانی کوردستان لە یاد نەکەین. ئەو دو ڕێکخراوەو ڕۆژنامەکانیان لە ڕاڤەکردنی ئەو ڕاستیە

تازانەی پەیوەندییان بە کوردستانەوە هەبو لەگەڵ خوێندنەوەی نوێ بۆ مێژووی کورد ڕۆڵی گرنگیان وازیکرد. لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە تیژی بە کۆڵۆنیکردنی کوردستان گەشەی پێدراو هەمو ڕێکخراوە کوردستانیەکانیش بە پشت بەستن بە خودی چەمکە فیکرییەکان و لە چوارچێوەی هەمان زاراوەی زمانەوانی بڕیاریان لەسەر ئەو تێزەدا بەڵام ڕێکخراوە چەپەکانی تورکیا، جگە لە ژمارەیەکیان وەك ڕێکخراوی Kurtulus هەموویان سەرلەبەری ئەو تێزەیان ڕەتکردەوە، بەڵکو هێندێك لە تەوژمە سیاسییەکانی ئۆپۆزیسیون هەوڵیاندەدا بە هەمان چەمکی فیکری و زاراوەی زمانەوانی تێزی بە کۆڵۆنیکردنی کوردستان ڕەتبکەنەوە. ئەوانە دەوری گرنگیان لە گەشەسەندنی وشیاری نەتەوەی کورد وازیکرد.

دامەزراندنی پارتی کارگەرانی کوردستان لە کۆتایی حەفتاکان کاریگەرییەکی پڕبایەخی لەسەر بەرجەستەبونی وشیاری نەتەوایەتی کورد هەبو. هەروەها ئەو هەرایەی دانیشتنی دوەمی دادگاییکردنەکانی ڕۆژهەڵات لە دوای کودەتاکەی ١٢ ئەیلولی ١٩٨٠ وروژاندی و ڕوداوەکانی گرتوخانەی دیاربەکرو شەڕی چەکدارانەی ئیرۆو شەمدینلی لە ١٩٨٤/٨/١٥ و تێگەیشتن لە چەمکی کوردستانی کۆڵۆنی لە بەرجەستەکردنی وشیاری نەتەوایەتیدا ڕوداوی زۆر گرنگ بون، بۆیە لێرەدا دەتوانین وتەیەکی فرانس فانون بهێنینەوە کە دەڵێت: ئەو ڕوداوانە "یەکەم پزیسك" بون.

سەرباری ئەوەش پارتی کرێکارانی تورکیا لە سەرەتای حەفتاکاندا لە کۆنگرەی دوەمی خۆی، ئەم بڕیارەی خوارەوەی لەسەر کورد دەرکرد: "کورد لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەژی" لەبەر ئەم بڕیارە دادگای دەستوری چالاکییەکی ئەم پارتەی قەدەغە کرد بەڵام سەرکردایەتی ئەم پارتە نەیتوانی لە بەردەم دادگای دەستوری بەرگری لە بڕیاری کۆنگرەی دوەم بکات و تەنازولی زۆر گەورەیان بۆ ئایدۆلۆجیای ڕەسمی کرد. ئەم ڕوداوە زەرورەتی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەربەخۆیی تایبەت بە کرێکارانی هێنایە ئاراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە دەوری پارتی کرێکارانی تورکیا لە "خۆپیشاندانەکانی ڕۆژهەڵات" لەبەرچاوبگرین کە ساڵی ١٩٦٧ لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا ڕێکخرا.

ڕوناکبیرو شۆڕشگێڕو کەسایەتییە دیموکراتخوازەکانی کورد لە دوای کودەتاکەی ١٩٨٠/٩/١٢ بە کۆمەڵ بەرەو ئوروپا ڕەویان کردو دەورێکی سەرەکییان بینی لەوەی مەسەلەی کورد بخەنە بەردەم دەزگا دیموکراتیەکانی ئوروپا. ئەو کەسانە خەسڵەتی چۆنایەتی و چەندایەتی باشیان هەبو. هەروەها لە دوای ١٩٨٣/٥/٢٥ دەستتێوەردانی هێزەکانی سوپای تورکیا بۆ سەر باشوری کوردستان ڕەهەندی نێودەوڵەتی مەسەلەی کوردی ئاشکرا کرد.

ڕۆژئاوا بە درێژایی سالانی ١٩٢٥-١٩٣٨ بە هیچ جۆرێك بایەخیان بە ئۆپراسیونە سەربازییەکان و قەتلوعام و ڕاگواستنی دانیشتوانی کورد نەدەدا کە کۆلۆنیالیزمی تورکی لە کوردستان پیادەی دەکرد. ئەو ڕوداوانە بەبێ جولاندنی ڕای گشتی ئوروپا زۆر بە هێمنی و بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات و بەبێ پەرچەکردار جێبەجێ دەکران. بەلام پەلاماری سوپای تورکیا لە ڕۆژی ١٩٨٣/٥/٢٥ بۆ سەر هێزەکانی کورد لە باشوری کوردستان ئەو ڕاستیەی ئاشکرا کرد کە بارودۆخی کوردستان گۆڕاوەو وەك جاران نیە. ئێستا ڕای گشتی جیهانی بایەخی زیاتر بە کوردستان دەدا هەرچەندە ئەو بایەخە زۆر کەمە ئەگەر بەراوردبکرێ لەگەڵ ئەو بایەخەی ڕای گشتی جیهانی بە مەسەلەی فەلەستین و ئەرمەنی دەدا بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کردەوەکانی کۆلۆنیالیزمی تورکیای لە کوردستان ئاشکرا کرد.

خەباتی ڕزگاری نیشتمانی باشوری کوردستان لە دژی عراق و ڕۆژهەلاتی کوردستان لە دژی ئێران و ڕەفتاری ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان دابەشکردووەو هەلوێستی سوریا بەرامبەر بە چەند ڕێکخراوێکی دیاریکراوی کورد ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر بارودۆخی باکوری کوردستان. لە سالانی شەستەکان کورد بایەخێکی ناچیزی بە خەباتی ڕزگاری نیشتمانی باشوری کوردستان دەداو سەرکەوتن و شکستەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی وەك ئێستا هەستی نەدەجوولاندن چونکە ئەو سەردەمە گەنجانی کورد زیاتر بایەخیان بە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی ڤێتنام و ئەمریکای لاتین و ئەفریقیاو فەلەستین دەدا بەلام ئەمڕۆ زۆرێك لە جوتیارو کرێکارو پیشەوەرو گەنجانی کورد گرنگیەکی زۆر بە خەباتی ڕزگاری نیشتمانی کورد دەدەن.

بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان بە تەواوەتی جیاوازە چونکە ئـەمڕۆ هـەر ڕوداوێك پـەیوەندی بەهـەر پارچەیـەکی کوردسـتانەوە هـەبێت سـەرنجی گشـت پارچـەکانی کوردستان ڕادەکێشێ. ئێستا خەڵکی د ەیانەوێت زانیارییان لەسەر ڕوداوەکانی کوردسـتان هـەبێ و لـە نـاوەڕۆك و ڕەهـەندی ڕوداوەکـانیش تێبگـەن، بۆیـە بیسـتنی هـەواڵی سـەرکەوتنی پێشـمەرگایەتی و سیاسـی هـەر پارچەیـەك خۆشـحاڵیان دەکـات و بـە ژێرکەوتن و شکستەکانیشیان خەفەتبار دەبن.

ئەو هەستە گەرموگوڕو بە تەنگەوەچونەی کوردەکـانی بـاکور پیشـانیاندا بەرامبـەر بەو کوردانەی لە دوای کیمیابارانی باشوری کوردستان پـەنایان بـۆ تورکیـا هێنـابو، ئـەو بارودۆخە تازەیە بە جوانی دەردەخات، بەڵکو سەرەڕای قورسی باری گوزەران و تیرۆری دەوڵـەتی تورکیـا ئـەو هاوکـاری و گیـان بـەخت کردنـە ئاماژەیـەکی گرنـگ بـو لەسـەر هاوبەشی لە غەم و خۆشی و هەست بە شانازیکردن".

ئەو دەوڵەمەندەی یارمەتی مادی هاوڕێکانی دەدات بە دەسـتیاری (مساعدة) وەسـف دەکـەین، بـەڵام هـەژارێك دەست پێشـخەری لـە دەسـتیاری مـادی هاوڕێکـانی بکـات پێـی دەوتـرێ قوربـانیدان. کوردەکـانی بـاکور بـەردەوام قوربـانی دەدەن بـۆ ئـەوەی هاوکـاری کوردەکانی باشوری کوردستان بکەن.

گەشەکردنی سەرمایەداری لە کوردستان و داڕوخانی بونیادی خێڵایـەتی و کزبونـی کاریگەری سیستمی شێخایەتی بوە مایـەی هەڵوەشـاندنەوەی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیـە کلاسیکیەکان و ئیعتباراتی نیشتمانی و دیموکراتی گەشـەیان سـەند، هـەروەها بـە هـۆی زیـادبونی ژمـارەی دانیشـتوان و بەرهەمـهێنانی ئـابوری و دروسـتکردنی قوتابخانـە لـە گوندەکان و کردنەوەی ڕێگەوبان و پێشکەوتنی سیستمی پەیوەندیکردن و گەشـەکردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن میللەتی کورد زیاتر بیردەکاتەوەو ئەو ئیعتباراتانەش زیاتر گەشە دەکەن. ئەمڕۆ کورد بایەخی زیاتر بە هەواڵ و دەنگوباسـی ئـەو شۆڕشـانەی دونیـا دەدا کە لـە پێنـاوی ئـازادی دیموکراسـیدا دەکرێـت، ئەمـە سـەرباری ئـەوەی ژمـارەی ئـەو گەنجانەی لەسەر ناسنامەی نەتەوایـەتی پرسـیار لـە خـێزان و هـاوڕێ و خـەڵکانی دی دەکەن بەردەوام زیاد دەکات.

دەوڵەت پەیمانێکی توندوتۆڵ لەگەڵ هێزە کلاسیکییەکاندا بەستووە بۆ ئەوەی ئەم پرۆسە مەزنە لەناوبەرێت یا بەلایەنی کەمەوە کۆسپی بۆ دروست بکات بۆیە هەمو توانایەکی خۆیان بۆ پشتگیری کردن لە دەزگای سەرەك خێڵ و شێخ و موڵکدارە گەورەکان خستۆتە گەڕ و هەنوکە دەوڵەت لەسەر ئاستێکی بەرفراوان پشت بەم تاکتیکە دەبەستێ. و تا ئێستاش کەمالییەکان پشتگیری لە مانەوەی ئەم دەزگا کۆنەپارێزانە دەکەن. چونکە ئەم دەزگا کۆنەپارێزانە لە یەك کاتدا هەم کۆسپ لە بەردەم ڕابوونی بزوتنەوەی نەتەوایەتی میللەتی کورد دروستدەکەن و هەم پشتگیری لە دەوڵەتیش دەکەن. لەبەرئەوە کاتێك دەزگای هەوالگری دەوڵەت شێخێك یا سەرەك خێڵێك بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت ئیتر لە چاودێری کردنی هەزاران یا دەیان هەزار کەس ڕزگاریان دەبێت بۆ یەکاتێك کار لەو جۆرە کەسایەتیانە دەکەن کۆنترۆڵی جەماوەرێکی بەرفراوان زامن دەکەن.

دەوڵەت بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی بزوتنەوەی کورد وە لای (ولاء) گروپە ناکوردەکانی هەرێمەکە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، بۆ نمونە عەرەب. دەوڵەت لە دوای شۆڕشی دەرسیمی ساڵی ١٩٣٧-١٩٣٨، واتە دوای ئەوەی هەمو نێوەندەکانی شۆڕشی لە کوردستان لەناوبرد، دوو ڕێگەی خستە بەردەم "چینە دەستەڵاتدارەکانی کورد": یا لایەنگری دەوڵەت بکەن یا وەك شێخ سەعید و سەید ڕەزا لە سێدارە دەدرێن. لە بەرامبەر ئەم دو ڕێگەیە چینە دەستەڵاتدارەکانی کورد، واتە شێخ و موڵکدارە گەورەو سەرەك خێڵەکان لایەنگری و نۆکەرایەتی دەوڵەتیان هەڵبژارد. ئێستا گەلێك لەو کەسانە هاوکاری توندوتۆڵیان لەگەڵ پۆلیسی نهێنی دەوڵەت دا هەیە بۆیە دەوڵەت پەیمانێکی نهێنی لەگەڵ ئەو کەسانە بەستوە کە بە پێی ئەو پەیمانە یارمەتی مادی و مەعنەوییان دەدا. دەوڵەت بەم ڕێگەیە هەوڵدەدا بزوتنەوەی ڕابوونی نیشتیمانی کورد لەناوبەرێت. هەروەها دەوڵەت هەوڵدەدا لە ڕێگەی بانکی دڵنیایی (بنك الائتمان) و قەرزدان بۆ کرینی تۆو و تراکتۆر و مۆڵەت پێدان بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی بەکاربردن (السلع الاستهلاکیە) یا لە ڕێگەی مۆڵەتدان بە کردنەوەی وێستگەی فرۆشتنی سوتەمەنی دەستەڵاتی بەسەر ئەو کەسانەدا زیاد بکات.

پارتە سیاسیەکان لە جیاتی ئەوەی پشت بە میللەت ببەستن و شێوازی دیموکراسی بەکاربهێنن کەچی دەستەڵاتێکی تەواو بە هێندێك کەسایەتی دەستڕۆیشتو دەبەخشن و لە سەروی حزبەوە دایاندەنێن بۆ ئەوەی میللەت بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و بەمشێوەیەش مافە دیموکراتیەکانی میللەت کۆتدەکەن و دەیشێوێنن.

ناکۆکیە ناوخۆییەکانی پارتی گەلی سوسیال دیموکرات کە لە سەرەتای حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩ بووە هۆی بەستنی کۆنگرەی نائاسایی، ڕەگوڕیشەی بۆ ئەو جۆرە کێشانە دەگەڕێتەوە چونکە دەیانویست ئەو کەسانەی پەیوەندی توندوتۆڵ و بەهێزیان بە میللەتەوە هەیەو پشتگیری لە داواکارییە شۆڕشگێڕو دیموکراتیەکانی میللەت دەکەن لە حزب دوربخەنەوە – بە تایبەتی پارلەمانتارەکان- و ئەو کەسانە لە جێگەیان دابنێین کە ئایدۆلۆجیای ڕەسمیان ئیستیعاب کردوە بۆیە دەیانویست لە ڕێگەی گەشەپێدانی پەیوەندییەکانیان پاڵپشتی لەو کەسانە بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو کەسانە بسەپێنن دەستەڵاتی تەواویان پێدەبەخشین تا ڕێگە لە چالاکی ڕێکخراوە ناوچەییەکان بگرن، سەرباری ئەوەی ئەو هەقەشیان پێدەدان مافی خەڵکانی زەوتبکەن.

ت یزی تورك- ئیسلام هەمان ئامانجی هەیە چونکە ئەم تێزەش دەیەوێت بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە چوارچێوەی ئوممەی ئیسلامدا بتوێتەوە. بۆ نمونە مەلای مزگەوت بە فێرخوازەکانی خۆی دەڵێت: پێویستە هەمومان موسڵمان و مرۆڤ و برابین چونکە نیشتمانپەروەرێتی دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکات. لێرەدا مەلا بە زمانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی قسە دەکات و ئاین وەك لەمپەرێك لە بەردەم ڕابونی نیشتمانی کورد بەکاردەهێنێت بەڵام بۆ ئەوەی بەم ئامانجەی بگات هەڵوێست لە دژی عەلمانیەت وەردەگرێت. سەرباری ئەوەش، ڕۆژانە ژمارەی هێزەکانی ئاسایش زیاد دەکەن و گرتووخانەی تازە دروستدەکەن و چاودێری پۆلیس لە ڕوی چەندایەتی و چۆنایەتی زیاد دەکەن و دەزگای هەواڵگری دەوڵەت ڕێکخستنی تۆکمەی هەیە. سەرەڕای ئەوەش کوردستان بە هۆی دینەمۆی ناوەکی دەگۆڕێت کە بە کورتی خاسیەتە گشتیەکانیان خستۆتە ڕوو. کوردستان وەك جاران نەماوەتەوە.

## مەسەلەی کوردو پرۆژەی باشوری رۆژهەلاتی ئەنادۆل ( GAP )

دەولەت پرۆژەی باشوری رۆژهەلاتی ئەنادۆل بە مەبەستی توانەوەی دانیشتوانی هەرێمەکەو تێکەلکردنیان لەگەل دانیشتوانی تری ولات پیادە دەکات، بۆیە لە رێگەی بەلێندەری ئوروپی و کەمکردنەوەی باج و کارئاسانی بۆ هاوردنی مەکینەو ئامێرەکان جەخت لەسەر هەولەکانی پرۆسەی گۆرانی رۆژهەلات دەکات. دەولەت ئاواتەخوازە لە رێگەی گەشەکردنی ئابوری‌یەوە ئەم هەرێمە بە رۆژئاوای ولاتەوە بلکێنێت، ئەویش بە پشت بەستن بەو بیرۆکەیەی کە دەلێت: هەر کاتێك گەشەکردنی بازرگانی و پیشەسازی لەم هەرێمە هاتە دی ئەوا بە شێوەیەکی ئۆرگانی بە رۆژئاوای ولات دەبەسترێتەوە. هەروەها گەشەکردنی ئاستی بازرگانی و پیشەسازی رۆلێکی گرنگ دەگێرێ لە بلاوبونەوەی زمانی تورکی، لەبەر ئەوەی هەرکاتێك دانیشتوانی ئەم هەرێمە پەیوەندی بازرگانی و پیشەسازی لەگەل رۆژئاوای ولات ببەستن ئەو دەمە بە ناچاری فێری زمانی تورکی و بەکارهێنانی دەبن. زمانی تورکی زمانێکی پێشکەوتووە بەلام زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییەو هەژاری بونیادی زمانەکە رێگەی پێنادات لە بواری ئابوری و بازرگانی و پیشەسازی و کاروباری بانکیدا بەکاری بهێنێ بۆیە هێدی هێدی کورد زمانەکەی خۆی بیردەچێتەوە چونکە زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییەو بە ئاسانی بیردەچێتەوە.

بێگومان ئەم هیواو ئاواتەی دەولەت و حکومەتی تورکیا هەرگیز نایەتەدی چونکە گەشەکردنی ئابوری پێداویستیەکانی بلاوبونەوەی دیموکراسی پتەوتر دەکات و پالپشتی لە بزوتنەوەی نەتەوایەتیش دەکات لەبەر ئەوەی گەشەکردنی هەلوەشانەوەی دەزگا کلاسیکییەکان خێراتر دەکات. هەلوەشانەوەو داتەپینی دەزگا کلاسیکیەکان مانای لە دایکبونی مرۆڤی ئازاد دەگەیەنێت کە خەبات دەکات لە پێناوی ئازادیدا. ئەگەر پەیوەندی توندوتۆلی نێوان گەشەکردنی سەرمایەداری‌و بوژانەوەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی سالانی شەستەکان وەبیر بهێنینەوە دەبینین ئەو گریمانەیەی دەلێت: زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییەو ناتوانیت پەیوەندییە ئابوری و بازرگانییەکان دەربرێت بە

تەو اوەتی بە هەڵە دەردەچێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو گریمانەیە تەعبیر لە دیدێکی ڕەگەزپەرستانە دەکات چونکە ئـەو ڕۆژهەڵاتناسـانەی لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر زمانـە ڕۆژهەڵاتییەکانی وەك زمانی عەرەبی، فارسی و تورکی کردوەو شارەزایشیان لـە زمـانی کـوردی هـەبوە بـە نمونـە دەیسـەلمێنن کـە زمـانی کـوردی زمـانێکی زۆر دەوڵەمـەندە. قەدەغەکردنی ئاخاوتن و نوسین و ئەدەبیاتی زمـانێك و جـەخت کـردن لەسـەر ئـەوەی کە زمانێکی سەرەتاییە جۆرێکە لە دوڕویی ڕەگەزپەرستی.

سەرباری ئەوەش دروستکردنی یانەی کولتوری شۆڕشـگێڕ لـە ڕۆژهـەڵات لـە کۆتـایی شەستەکا ن پرۆسەی توانەوەی لە شوێنی خۆی ڕاگرت. ئەو ڕاگرتنەش بەمشێوەیە ڕاڤـە دەکرێ: کاتێك چەوساوەکان لە ڤۆناغێکی دیاریکراوی ژیانیان لە ناسنامەی نەتەوایـەتی خۆیـان تێدەگـەن و هـەوڵدەدەن بزانـن بۆچـی بـە زمـانی زگمـاکی خۆیـان قسـەناکەن و دەوڵەت و حکومەت بەرامبەر بـەم کێشـەیە چـۆن ڕەفتـار دەکـات و بـە دوای هۆیـەکانی قەدەغـەکردنی زمانەکـەیاندا دەگـەڕێن دەپرسـن و بۆچـی ئـەو کەسـەی سـەرپێچی لـەو قەدەغەکردنـە دەکـات ڕوبـەڕوی دادگـاییکردن دەبێتـەوە، بۆیـە توانـەوەی کەسـانێکی هێندە وشیار و خـاوەن ئـەزمون لـە بۆتـەی توانـەوە دەبێتـە کـارێکی نابـەجێ و گـەلێك هۆکاری دی هەیە خەڵکی بۆ پرسیارکردن هاندەدا: کەمبونەوەی ڕیژەی نـەخوێندەواری و کاریگـەری دەزگاکـانی ڕاگـەیاندن (ڕادیـۆ، تەلـەفزیۆن، ڕۆژنامـە، کتێـب و سـینەما) و چـاکبونی هۆیـــە ســـەرەکییەکانی گواســـتنەوە لـــە ڕوی چەندایـــەتی و چۆنایـــەتی و فراوانبونـی ئاسـتی بـە یەکگەیشـتنی خـەڵکی لـە بـازاڕو گـازینۆو ڕێگـەوبان و گۆڕەبانـە گشـتیەکان. بێگومـان میتـۆدی خوێنـدن و بەرنامـەی ڕادیـۆو تەلـەفزیۆن و سـینەما پرۆسـەی توانـەوە خـێراتر دەکـات بـەڵام هـەر خـودی ئـەو دەزگایانـە ئەگـەرچی بـە شێوەیەکی شێواویش بێت هەواڵی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی و یەکسانی و دیموکراسی بڵاودەکەنـەوە. فیلـم و وێنـەی تایبـەت بـە چالاکییـە جیاوازەکـانی بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشـتمانی لـە ڤێتنـام و وڵاتـانی ئـەمریکای ناوەڕاسـت و باشـور و باشـوری ئـەفریقیاو وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقیاو فەلەستین و ئەفغانستان لەسەر شاشەی تەلـەفزیۆن و لەسـەر لاپە ڕەی ڕۆژنامەکان بڵاودەکەنەوەو دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەواڵی تورکەکانی قوبـرس و

بولگارستان و تراكیای ڕۆژئاوا بڵاودەكەنەوە، ئەگەرچی ئەو هەواڵانە باسی كورد ناكەن بەڵام لای ئەوان مانایەكی زۆر دەبەخشێت چونكە كورد لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەی تیایە دەژیت ئەو شتانەی دەیبینێ و دەیبیستێ و دەیخوێنێتەوە لێی تێدەگات و لە ڕێگەی مامەڵەكردن لە دوو هەڵوێستی و زوڵم و ستەمی حكومەت تێدەگات. هەروەها گەشەكردنی وشیاری لەسەر ئەسڵ و شوێنی كورد لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەكان بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچێت.

لە هەمان كاتدا بزوتنەوەی نەتەوایەتی لە كاتی ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ درۆو دەلەسەكانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی گەشەی زیاتر دەكات، وەك "ئێوە تورك كوڕی توركن، ئێوە توركی بێگەردن" و "ئەو كەسانەی بە خۆیان دەڵێن تورك خەڵكانێكی بەختەوەرن" و "بەهای تاكە توركێك هاوتای بەهای هەمو دونیایە"، ئەی تورك، شانازی بكە بە توركایەتی خۆتەوەو كاربكەو باوەڕت بە خۆت هەبێ.

ئەگەر مرۆڤ لە پرۆسەی توانەوەی خۆی تێنەگات و لە جیاتی ئەوەی بە زمانی نەتەوایەتی قسە بكات بە زمانی نەتەوەی باڵادەست قسە بكات ئەوا پرۆسەی توانەوە سیفەتی خواكرد وەردەگرێت (القضاء و القدر) چونكە كۆلۆنیالیزم گەورەترین سەركەوتن بە دەست دەهێنێ ئەگەر میللەت تێنەگات ڕێگەی بیرچونەوەی زمانی نەتەوایەتی گرتۆتە بەر. بەڵام سەرەڕای هەمو ڕێوشوێنێكی دەوڵەت ئەگەر مرۆڤ لە سیاسەتی توانەوە تێبگات و چاودێری بكات و پرسیار لەسەر ڕوداوە دیاریكراوەكان بكات واتە ئەو میللەتە پرۆسەی توانەوەی لە شوێنی خۆی ڕاگرتوە. لە كۆتایی شەستەكان زۆرێك لە دامەزرێنەرانی یانەكانی كولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵات لە جیاتی ئەوەی بە زمانی زگماكی خۆیان قسە بكەن بە زمانی توركی قسەیان دەكرد بۆیە بە پێی پێودانگی دەوڵەت ئەو كەسانە تورك بون بەڵام ئەو كەسانە هەر زوو تێگەیشتن كە زمانی كوردی گەوهەری ناسنامەی نەتەوایەتی پێكدەهێنێ و هەستیان دەكرد دەربارەی ئەم مەسەلەیە پێویستیان بە دیالۆگی دیموكراسی هەیە، لەبەرئەوە ژمارەیەك لەو كەسانە فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی كوردی بونەوە كە بیریان چوبوەوە یا بە ناچاری لە بیریان چوبووە. هەروەها بەشێك لەو كەسانەی سالآنی ١٩٧٤-

١٩٧٥ وتاريان دەنوسی و خانـەی پەخشیان دادەمـەزراند زمـانی کوردییـان نـازانی بـەلام درکیان بە هۆیەکانی نەزانینی زمانی کوردی و گرنگی ناسنامەی نەتەوایـەتی دەکـرد. هەنوکە کوردەکان لـە کـاتی دادگـاییکردن لـە بـەردەم دادگاکـان بـە زمـانی کـوردی قسـە دەکەن هەرچەندە شارەزاییەکی زۆر باشیان لە زمانی تورکیدا هەیە. پێشـتر بـە کورتـی ئاماژەمان بە پرۆسـەی توانـەوە کـرد بـەلام ئـەنجامی ئـەو پرۆسـەیە لەسـەر هەڵوێسـتی دەوڵـەت و حکومـەتی تورکیـا چۆن دەبێت سـەبارەت بـە توانـەوەی کـورد. پێـم وایـە هـەرگیز پـرۆژەی باشـوری ڕۆژهـەلاتی ئـەنادۆل (GAP) لـە چوارچێـوەی پەیوەندییـە ناوخۆییەکان تەماشا ناکرێت.

## تیۆری "یەکەم گوللە"

فرانس فانون یەکێکە لەو کەسانەی بەشداری لە خەباتی ڕزگاری نیشتمانی جەزائیر کردوە. فانون لە (مارتنیك)ی کۆلۆنی فەرەنسی لە دایك بوەو هەر لـەوێش گـەورە بـوە، لە سەرەتای پەنجاکان کۆلیجی پزیشکی لـە پـاریس تـەواو کـردوەو هـەر لـەو سالانەشـدا گرنگـی بـە بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشـتمانی جـەزائیر داوەو وەك پزیشـکێکی حکومـەتی فەرەنسـی ڕەوانـەی جـەزائیر کـراوەو لـەوێ بـە نـهێنی پـەیوەندی بـە بـەرەی ڕزگـاری نیشتمانی جەزائیرەوە کردوە.

فرانس فانون تێزێکی پڕ بایەخی لەسەر ولاتە کۆلۆنیەکان داناوە: ڕێکخسـتنی میللـەت و هـاندانی ولاتـە کۆلۆنیـەکان لەسـەر شۆڕشـی چـەکداری زۆر زەحمەتـە لەبەرئـەوەی خـەلکانی ئەو ولاتانە چاوشکاو و ترسنۆك و هیوا بڕاون. هەروەها کۆلۆنیـالیزم دەیـەوێت میللـەت لێـی بترسێ و سەرپێچی لە فرمانەکانی نەکات چونکە تیرۆرو زەبروزەنـگ و تـەنگ پێهـەلچنین و ڕیسواکردن درزێکی قـولْ دەکاتـە ڕەوشـتی کۆمەلگـە و میللـەت بـڕوای بـە خـۆی و خـێزان و عەشیرەت و گوندو کەسوکارو بە دوارۆژ نامێنێ و هەسـتدەکات خـۆی و خـێزان و کەسـوکارو نەتەوەکـەی کەسـانێکی سـوك و پلـەنزمن کۆلۆنیـالیزمیش وەك هـێزێکی لـە ئاسـابەدەر (خـارق)و بێکۆتـا (سـرمدی) دەردەکـەوێت بۆیـە پێویسـتە مـل بـۆ چارەنووسـی خۆیـان کـەچ بکەن و هەوڵی خۆ ڕزگارکردن نەدەن.

دەسـتەڵاتدارانی کۆڵۆنیـالیزم دو شـت لـە میللـەتی کۆڵۆنـی داوا دەکـات: یەکـەم، پێویسـتە بزانـین ئێمـە حوکمتـان دەکـەین، ئەگـەر ئێمـە لـەم وڵاتـە نـەبین و فەرمانڕەوایـەتیتان نەکـەین ڕوبـەڕوی کارەسـات دەبنـەوە چونکـە ئێـوە میللـەتێکی بـێ شارسـتانی و پەککەوتـەو هیـچ لـەبار نـەبوو هـەژارن، ئێـوە مانـای دادپـەروەری نـازانن، جیـاوازی لـە نێـوان شـتی ئیـداری و شـتی ئـابوری ناکـەن و ئێـوە نـازانن تـەکنولوجیا بەکاربهێنن. دوەم، پێویستە لێمان بترسن و گوێڕایەڵی فرمانەکانی ئێمـەبن. لـە سـایەی ئـەم کەشـە کۆمەڵایـەتی و ڕەوشـتیەدا مرۆڤـی کۆڵۆنیکـراو وەك ئـەوەی دژایـەتی سـتەم بکات ئارەزوە د ەرونیەکانی دادەمرکێنێتەوە بۆیە دەبینین مرۆڤی کۆڵۆنیکـراو هەمیشـە خۆی لە ئاست کۆڵۆنیالیست دادەنێ. مرۆڤی کۆڵۆنیکراو کە لە ئاست تـەنگ پێهـەڵچنین و سـوکایەتی کۆڵۆنیـالیزم ملکـەچ و سەرشـۆڕ دەکـات بچوکـترین ڕەخنـە یـا هەڕەشـەی هاوڕێ و خێزان و هاوزمانەکانی وەك مە سەلەی شەرەف بە هەستیاری وەردەگرێت.

لـە سـایەی ئـەم ژینگـە کۆمەڵایـەتی و کەشـە دەرونیـەدا مرۆڤـی ژێـر دەسـەڵاتی کۆڵۆنیـالیزم دەیـەوێ خواسـت و ئارەزووەکـانی خـۆی دابـین بکـاو ڕوو دەکاتـە بەرەنگاربوونـەوەی سـتەم. لەبەرئـەوە ئـەو مرۆڤـە خـۆی لـە شـوێنی دەسـەڵاتی هـێزی داگیرکـەردا دادەنـێ و ئـەو کەسـەی کـە مـل کـەچی پیشان ئـەدا بەرانبـەر بـە سـتەم و تەنگەتاو کردنی هێزە داگیرکەرەکان، بە شێوەیەکی ناسك هەڵس و کەوت ئەکا بەرانبەر بچوکـترین ڕەخنـەو هەڕەشـە کـە لـە هاوەڵەکانیـەوە ئاراسـتەی دەکرێ یـا لـە خـێزان و هاووڵاتییانەوە، ئەو ڕەخنەو هەڕەشەیە بە شـتێکی گەورە دادەنێ و پێی وایە پەیوەندی بە شەرەف و سەربەرزی ئەوەوە هەیە.

دەسـتەڵاتدارانی کۆڵۆنیـالیزم ئـەم بـارە دەرونیـە بـە باشـی بـۆ بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان دەقۆزنـەوە بـەوەی ناکۆکییـەکانی نێـوان کۆمەڵگـەی کلاسـیکی زلدەکـەن و پیـادەکردنی سیاسـەتی "پەرتکـە- زاڵبـە" لەسـەر ئاسـتی وڵات چڕدەکەنـەوە و بـەناوی "تۆڵەسـەندنەوە" شـەڕو دژایـەتی نـوێ دەخوڵقێنـن و یارمـەتی مانـەوەی دەزگـا کلاسـیکیەکان دەدەن و پیـاوانی ئاسـایش لـە ناوچـە کشـتوکاڵییەکان لـە پێـش چـاوی مێردەکانیان دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنە جوتیارەکان یا بەلایەنی کەمەوە هەوڵدەدەن

دەسـتدرێژی بکەنـە سـەر ژنـەکانیان و ڕێگـە بـە کـەس نـادەن دەنگـی نـاڕەزایی بەرزبکاتەوەو بە ناوی پاراستنی شەرەف هەستی دانیشتوان دەجوڵێنن و ڕووداوی بچـوك گەورە دەکەن و دەیکەنە کێشەیەك شایانی تۆڵەسـەندنەوە بێت. دەوڵـەتی کۆلۆنیـالیزم خەڵکانی پسپۆڕ لە بواری ئەشکەنجەدان، ئەوانـەی بـە پـیر ئـەو عەقڵیەتـەوە دەچـن لـە بنکەکانی پۆلیس و ئیدارەی گرتوخانەکان دادەنێت.

ئەمەش ئـەوە دەسـەلمێنێ کۆمەڵگـەی کۆلۆنیکـراو لـە واقیعـدا کۆمەڵگەیەکـە هیچـی پێناکرێت بۆیە هەر کۆمەڵگەیـەك شـۆڕش لـە دژی سـتەمکار نـەکات و مـل بـۆ ئـیرادەی ستەمکار بدات لە ڕاستیدا کۆمەڵگەیەکە لە ناخەوە بەزیوەو هەمان شتیش لەسەر کورد پیادە دەبێ.

فرانس فانون زۆر بە جوانی ڕونیدەکاتەوە ئەو میللەتـەی لـەو باردۆخـە بژیـت زۆر زەحمەتـە دژی هێزەکـانی کۆلۆنیـالیزم بـۆ شۆڕشـی چـەکداری ئامـادە بکـرێ، بـەڵام بـە پێویستی دەزانی کاری چڕوپڕ بۆ چارەسەرکردنی ئەو دژوارییانە بکرێ. فرانـس فـانون دەڵێت: دەکرێ ئەو هەلومەرجە نائاساییە تێپەڕێنرێ و خەڵکی بۆ ڕێکخستن بانگهێشت بکرێ چونکە ئەو شۆڕشـگێڕەی یەکـەم گوللـە لـە دژی دەوڵـەتی کۆلۆنیـالیزم دەتـەقێنێ سەرلەنوێ لە دایك دەبێتەوە. فرانس پێی وایە یەکەم گوللە لە پێشدا خودی کەسایەتی کۆلۆنیکراو و چەوساوەی ئەو تێکۆشەرە دەکوژێت کە پێشـتر لـە سـایەی تـرس دا ژیـاوە ئنجا دەبێت بە کەسێك بـڕوا بـە خـۆی و خـێزان و هاوزمـان و نەتەوەکـەی بکـات و بـە چـاوێکی سـوك تەماشـای خـۆی و میللەتەکـەی نـەکات و وەك جـاران زیـادەڕەوی بـە باڵادەستی هێزەکانی کۆلۆنیالیزم نەکات و شتەکان لە شـوێنی شـیاوی خۆیـان دابنێـت و هـێزی خـۆی و دوژمـن هەڵسـەنگێنێ و لەسـەر ئـەو بنەمایـەش هەڵوێسـت و ڕەفتـاری شایستە وەربگرێت.

پێویسـتە دەسـتەواژەی "یەکـەم گوللـە" تەنـها وەك چـەك تەماشـا نـەکرێ بـەڵکو پێویسـتە ئـەم دیاردەیـە لـە چوارچێوەیـەکی زۆر فراوانـتر شـیتەڵ بکـرێ چونکـە چاپکراوەیـەك لـە کـات و شـوێنی خۆیـدا ئاراسـتەی کۆلۆنیـالیزم بکـرێ هـەمان ئـەرکی یەکەم گوللە ئەنجام دەدا،.

## تیرۆری دەوڵەت لە کوردستاندا

ئەمڕۆ نەوەیەکی نوێ لە کوردستان پێدەگات بە چاوی خۆیان هێزی سوپاو پۆلیس و جەندرمەیان دیوە چۆن بە شەق و بەدار مامەڵەیان لەگەڵ باوك و باپیرانیان دەکـرد. هـەروەها ئـەم نەوەیـە بـە چـاوی خـۆی کوشـتن و ئەشـکەنجەی بـراو مامـەکان و کونجـە تاریکەکانی زیندانی خوشـك و براکانیـان دیـوە. ئـەم نەوەیـە لـە سـەردەمێکدا دەژی بـە چاوی خۆی قژ ڕاکێشان و تێهەڵدان و ئەتك کردنی دایك و پـورو داپـیرەو براژنـەکانیان دیوە. ئەم نەوەیەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا گەورە دەبێت ڕۆژانە بە چاوی خۆی دەیبینی یا بە گوێی دەیبیست چۆن براو خوشك و خەڵکی گوندەکەیان بە "خـائین" و "ڕێگـر" و "چەتە" و "نیشتمانفرۆش" وەسف دەکرد. بۆیە کارێکی زۆر نابەجێیـە ئـەو منالانـە پرسیار لەسەر ئەو شتانە نەکەن چونکە ئەستەمە ئەو ڕوداوانەیان لە بـیر بچێتـەوە یـا لە بیریان ببرێتەوە. ئەمەش تەنـها یـەك مانـای هەیـە: بـا خـەبات لـە پێنـاوی شـکاندنی کۆتی کۆیلایەتیدا بکەین، خەبات لە پێناوی ژیانێکی شایستە بە ژیان بکـەین و خـەبات لە پێناوی ناسنامەی نەتەوایەتیان بکەین.

کۆمەڵگەی کۆلۆنیکراو کۆمەڵگەیەکی بریندارەو ئـەم برینـەش ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ لـە سایەی حوکمی کۆلۆنیالیزمدا قوڵتر و گەورەتر دەبێت تا جەستەی کۆمەڵگە دەڕزێنیت.

باشترین دەرمان بۆ چارەسەرکردنی ئەم برینە بریتیە لـە درێـژەدان بـە خـەبات لـە پێنـاوی ئـازادی و ژیـانێکی سـەربڵند لـەژێر چـەتری یەکسانی لـە مافـەکاندا، تەنانـەت ئەگەر ئەم خەباتە لە ماوەیەکی کورتیش ئامانجەکانی خۆی بە دەست نـەهێنێ لەگـەڵ ئەوەشدا بە پێشکەوتنێکی گەورە دادەنرێـت لـە خـەباتی میللـەتێك دژی کۆیلایـەتی بـۆ ئەوەی مرۆڤ سەرلەنوێ ناسنامەی خۆی وەربگرێتەوە.

ئایـا دامەزرێنـەرانی یانـەی کولتـوری شۆڕشـگێڕ لـە ڕۆژهـەلات سـالی ١٩٦٨ و گومانلێکراوەکـانی دادگاییـەکانی ڕۆژهـەلات لـە سـالی ١٩٧١، منالـە ورگ ئاوسـاو و سەرتاشراو و جل شڕ و چاو ڕیپۆقاوی و لوت چڵمنەکانی سالانی پـەنجاکان نـەبون، ئایـا ئەو گەنجانەی ئەمڕۆ لە چیاکانی کوردستان شۆڕش دەکەن هەر ئەو منالە ورگ ئاوسـاو

سەر تاشراوو چاو ڕیپۆقاوییانە کە گوێیان بە ئەفسانەکانی "تورکی مەزن" پڕ دەکرا ئایا ئەو گەریلا کوردانەی ئەمڕۆ بە ورەیەکی بەرز لە چیاو گوندو شارەکانی کوردستان شەڕ دەکەن منالآنی سالآنی کۆتایی شەستەکان نین کە جەورو ستەمی یەکەی تایبەت "کۆماندۆ"یان دەچێشت؟ ئایا ئەو گەریلانە بە منالی دایك یا خوشك یا پورێکی خۆیان نەدیوە بە قژڕاکێشان پەلکێشی بەندیخانە بکرێت؟ ئایا ئەو گەریلانە باوك و باپیری خۆیان نەدیوە بە زەکەر (کێر) لە پێش چاوی کچ و ژنەکانیان بە ناو گوندا ڕاکێشرێن؟

ڕۆژنامەنوس و ڕوناکبیرانی تورك شەیدای وێنەگرتنی منالآنی هەژاری پێپەتی ورگ ئاوساو سەرتاشراو و چلماوی بون. ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسەکان لە نێوان خۆیان دا کێبەرکێیان دەکرد بۆ ئەوەی لەسەر هەژاری خەلکی کوردستان لێکۆلینەوەی ڕۆژنامەنوسی بکەن، هەروەها بازرگانییان بە نەهامەتی و هەژاریی خەلکی کوردستان دەکردو لەسەر لێکۆلینەوەکانیان خەلات دەکران بەلام کاتێك ئەو منالآنە دوای ١٠-١٥ سال گەورە دەبن و پرسیار لەسەر ناسنامە و چەوسانەوەو کۆیلایەتی و هەلومەرجی گوزەرانی ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان دەکەن و کاتێك لە پێناوی ئازادی و لە پێناوی ژیانێکی سەربلند شۆڕش دەکەن، ڕۆژنامەکان بەمشێوەیە لە سەریان دەنوسن: "چەتەکان بۆ وەحشییەتی خۆیان گەڕانەوە" و "چەتەکان ژمارەیان زیادیکردوە" هەروەها قسە لەسەر "پلانە نهێنییەکانی خائنان" دەکەن و هەڕەشە دەکەن "ئێمە ناوی ئەو هێزە دوژمنکارانە دەزانین کە پشتگیری لە خائنان و ڕەشو ڕووتە بەرەلآکان دەکەن" و "ناوی ئەوانەمان داوە بە هێزەکانی ئاسایش و پۆلیسی نهێنی دەولەت"، بەلآم گەریلاکان هەر منالەکانی ١٠-١٥ سال لەمەوبەرن کە لەسەر هەژاری و نەهامەتی لە کوردستان وێنەیان دەگیراو لێکۆلینەوەی ڕۆژنامەنوسیان لەسەر دەکرا.

ڕۆژنامەو ڕوناکبیرانی تورکیا لەسەر هەژاری و نەهامەتی منالآنی کورد هەست بە دلەڕاوکێیەکی زۆر دەکەن. بەلآم بەرامبەر داواکاریو شۆڕشەکەیان دوژمنانە ڕەفتار دە کەن و خیانەت لە کێشەکەیان دەکەن.

لە کاتی دادگاییکردنەکانی ڕۆژهەلات لە سالی ١٩٧١ چی دەوترا؟: "ئەمڕۆ لە هۆلی دادگاکان جێگەمان نابێتەوەو سبەینێش ژمارەمان ئەوەندە زیاد دەکات لە هیچ

گۆڕەپانێکی وەرزشی جێگەمان نابێتەوەو هەر بە فیعلیش دوای ئەوەی شۆڕش گەیشتە ناوچە گوندنشینەکان و لە چیاو پێدەشتەکان دەنگی دایەوە گیراوەکان لە هۆڵ و گۆڕەپانە وەرزشیەکان جێگەیان نەدەبووە.

جاران کورد کە بە خراپی مامەڵەی لەگەڵ دەکراو دەیانکوشتن، میللەت جەللادەکانی لەبیر خۆی دەبردەوە بەڵام ئەمڕۆ کاتێك ئەو ڕوداوانەیان بیردەکەوێتەوە لە پێناوی ژیان و لە پێناوی ئەوەی نەکوژرێن شۆڕش دەکەن. کوردستان وەك جاران نەماوەتەوە بۆیە کۆمەڵگەیەك بەم خێراییە بگۆڕرێت ئەستەمە بە ئایدۆلۆجیایەکی دوگما حوکمڕانی بکرێت

## بنەما مادی و مەعنەوییەکانی زەبروزەنگی گەریلا

لە سەرەوە باسی ئەوەی نوێی کوردو بۆچونەکەیمان کردوە بەڵام پێویستە بزوتنەوەی گەریلا بە پەرچەکردارێکی تۆڵە سەندنەوە دانەنرێت بەڵکو پێم وایە ئەو ڕایە ڕاستە کە دەڵێت گەریلا بزوتنەوەیەکە باڵادەستی کۆلۆنیالیزم لەناودەبات چونکە لە ڕاستیدا کۆلۆنیالیزم تەنگ بە میللەت هەڵدەچنی و سوکایەتی پێدەکات بۆیە پێویستە بە سەریدا زاڵبین و شۆڕشی گەریلاش ئەو ئامانجە بەدی دەهێنێت و تێگەیشتن لە حەقیقەتی کۆلۆنیالیزم و کردەوەکانی دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بزوتنەوەی گەریلا. ئەو ستەمەی بە دەستیەوە دەناڵێنین بنەمای مادی و مەعنەوی ئەو جۆرە ڕێکخستنە پێکدەهێنێ لەبەرئەو دژایەتی کردنی باڵادەستی کۆلۆنیالیزم تەنها پەرچەکردارێك نیە بەڵکو ئامانج تێکشکاندنی کۆلۆنیالیزمە بۆ هەتا هەتایە، بەڵام هەروەك لە سەرەتا ڕونمکردۆتەوە نە کوردستان کۆلۆنیەو نە نەتەوەی کوردیش نەتەوەیەکی کۆلۆنیکراوە.

"ماو" دەڵێت: ئەو بیرۆکەیەی جەماوەر قبوڵی بکات و بە شێوەیەکی ئۆرگانی تەعبیر لە بەرژەوەندییەکانی بکات، دەبێت بەهێزێکی مەزن. ئەو بیرۆکەیەی جەماوەر وەریدەگرێت دەبێتە هێزێکی مادی ئەوتۆ بە زەبری چەك لەناوناچێت بۆیە پڕ بایەخە نەتەوەیەك بیربکاتەوەو پرسیار لەسەر ئێستاو ڕابردوی خۆی بکات چونکە ئەو

پرسیارکردنە دەبێتە مایەی ڕابونی وشیاری نەتەوایەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی چونکە وشیاری مێژویی و کۆمەڵایەتی لە دایك نابێت لە کۆمەڵگایەکدا نەبێت کە خۆی بپرسێت "ئێمە کێین؟" ڕاڤەکردنی ستەم و چەوسانەوەو شێوەکانی سوکایەتی و ڕیسواکردن کە ڕووبەڕووی میللەتێك دەبێتەوە پرسیاری "ئێمە کێین؟" لە قۆناغێکی دیاریکراو لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و سیاسی گەڵاڵە دەکات و ئەو میللەتەی بیر لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆی بکاتەوە ئەو جۆرە پرسیارە لە خۆی دەکات بەوەش هەنگاوێکی گەورەی لە ڕێبازی ڕزگاری نیشتمان دەبڕێت.

## کاریگەرە نێگەتیڤەکانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی

بابەتێکی دی کە پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە پەیوەندی بە بابەتی ئایدۆلۆجیاوە هەیە. چونکە ئەو کەسانەی دەبن بە ئامانجی (هدف) ئایدۆلۆجیای ڕەسمی کاردانەوەی نێگەتیڤیان لەلا دروست دەبێت چونکە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی زۆرجاران باس لە ئەفسانەی "مەزنی تورك" دەکات ئەو ئەفسانەیە ئیدعا دەکات بەهای تاکە تورکێك هاوتای بەهای هەمو دونیایە و تورکبون شەرەفێکی گەورەیە بۆ مرۆڤ و کورد هەمیشە کۆیلەو ڕێگرو خائین و دەربەدەرو دواکەوتوو بوە. سەرباری ئەوەش ئێمە کاتێك هەوڵدەدەین ئایدۆلۆجیای ڕەسمی بە زەبری هێزو توندوتیژی و لێدان و ئەشکەنجە بسەپێنین ئەوا کاریگەری نێگەتیڤی ئایدۆلۆجیا دەبێتە هۆکارێکی دی یارمەتی ڕزگاربون و تێپەڕاندنی دۆخی کۆیلایەتی دەدا.

ئەو ڕوداوانە ئاشکرای دەکەن کوردستان وەك جاران نەماوەتەوە، بۆیە پێویستە ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنییەکی هاوبەش و کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی دەچەوسێننەوە لەم ڕاستیە تێبگەن. هەروەها پێویستە دەزگا نێودەوڵەتیەکانی وەك ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەنجومەنی ئورووپاو کۆنگرەی ئاسایش و هاوکاری ئورووپا کە پاراستنی مرۆڤ و پێشخستنی کردوە بە ئامانجی خۆی لەو ڕاستیە تێبگەن. بێگومان ڕێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان لەم چوارچێوەیەدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن.

له واقیعدا پێویسته نەتەوە یەکگرتوەکان بارودۆخێك چارەسەر بکات زۆر له بارودۆخی کۆلۆنی خراپتره نەك بە ئەنقەست پشت گوێ بخات چونکه بەو هەڵوێستەی متمانەپێکردنی خەڵك له دەست دەداو ئەرکەکانی جێبەجێ ناکات. ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیش ڕوبەڕوی هەمان حاڵەت دەبێتەوە، لەبەرئەوەی لە لایەك بەرامبەر بە سەرکوتکردنی فەلەستینیەکان ڕەخنەی توند له ئیسرائیل دەگرێ و سزای بە سەرا دەسەپێنێ و له لایەکی دی هەر خودی کۆنگرەی ئیسلامی بەرامبەر ئەو سەرکوتکردنەی وڵاتە ئیسلامیەکانی وەك عراق و سوریاو ئێران و تورکیا دەرهەق بە میللەتی کورد ئەنجامی دەدەن بێدەنگ دەبێت کە زۆر لە کردەوەکانی ئیسرائیل ترسناکترە، بۆیە کارێکی زۆر نابەجێیە ئەو دوو هەڵوێستییە ئامانجەکانی بهێنێتە دی، لەبەرئەوەی کەس ئەم هەڵوێستە بە هەند وەرناگرێ چ جای خودی ئیسرائیل. ئەگەر ئیسرائیل بڵێت تورکیا نکوڵی له بونی نەتەوەی کورد دەکات و کورد له هەمو وڵاتەکانی دی قەتلوعام و کیمیاباران دەکرێ.. هتد، لەم حاڵەتە دەوڵەتە ئیسلامیەکان وەڵامیان چ دەبێ؟ هەمان دوو هەڵوێستی نەتەوە یەکگرتوەکانیش دەگرێتەوە بۆیە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان ناتوانن ئەرك و چالاکیەکانیان ئەنجام بدەن.

لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری، کۆمەڵگەیەکی موسڵمانە بۆیە ڕێکخراوە پەیوەندیدارەکانی وەك ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی هەوڵێکی زۆر دەدا بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد فەرامۆش بکرێ. بەڵام ئێستا بارودۆخەکە سەبارەت بەو ڕێکخراوانەش گۆڕاوە بۆیە زۆر زەحمەتە ئەو ڕێکخراوانە بتوانن تا سەر باڵادەستی کۆلۆنیالیزمی وڵاتە ئیسلامییەکان دەرهەق بە نەتەوەی کورد پشتگوێ بخەن چونکە دوو هەڵوێستییان له بیرکردنەوەو کارکردن زۆر بە جوانی ئاشکرا بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم مەسەلەیە بوە بە جێگەی قسەو باسی هەمو خەڵکی.

وێرانکارییەکانی تورکیا له باکوری کوردستان زۆر گەورەترە، بۆ نمونە له وێرانکارییەکانی بریتانیا له هیند یا هەر کۆلۆنییەکی دی. چونکە سیستمی ئابوری پێشکەوتوی وڵاتێکی وەك بریتانیا له ڕێگەی سیستمی دارایی و بانکی و پەیوەندی بازرگانی و پیشەسازی دەتوانێ حوکمی کۆلۆنیەکانی بکات. هەروەها سیستمی بورژوای

پێشکەوتو زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە کۆلۆنیەکانی درێژە بە دەستەڵاتی بدات. بەڵام وڵاتانی وەك تورکیاو ئێران و عراق و سوریا تەنها لە ڕێگەی تیرۆری دەوڵەت و بە هاوکاری سوپاو پۆلیس و جەندرمە دەتوانن کوردستان کۆنترۆڵ بکەن. ئێران و عراق بە ڕێگەیەکی زۆر سەرەتای کورد کیمیاباران دەکەن و میللەتی کورد قەلاچۆ دەکەن و ژینگەی کوردستان پیسدەکەن و دارستانی دەسوتێنن و خاکەکەی سوتماك و بێ پیت دەکەن و گوندەکانی وێراندەکەن. ئامانجی ئەم سیاسەتەش لەناوبردنی ورەی کوردەکانەو باوەڕ نەمانیانە بەهێزی فیکرو سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی و بە کۆیلەکردنی ئامانجی لەبەرئەوەی دەیانەوێت ترس بەسەر عەقڵ و هەستی کورددا زاڵ بێت و بە جۆرێك بێورەی بکەن، بڕوای بە خۆی و نەتەوەو دواڕۆژی نەمێنێ. ئامانجی ئەم سیاسەتە لەناوبردنی دەزگا کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانی کۆمەڵگەی کوردەوارییە، واتە بە هەمە و مانایەکی وشە کورد بکەن بە کۆیلە. هەروەها دەیانەوێت بەهاو نەریت و زمانی کوردی لەناوبەرن و بەبێ بەرگریکردن خۆیان بە دەستەوە بدەن چونکە خەڵکی کۆیلەو هیوابڕاو داوای مافە نەتەوایەتی و مەدەنیەکانی ناکات بەڵکو تەنها مل بۆ ئاغاکانی کەچ دەکات.

کۆلۆنیالیستەکان دەیانەوێ هەمیشە ئەم هەستە لە ناخی گەلانی کۆلۆنیکراو بچەسپێت: "نابێ ئەوەتان لە بیر بچێتەوە کە ئێمە حوکمتان دەکەین، بۆیە دەبێ لێمان بترسن".

ئەم پێوەرە حوکمی پەیوەندی نێوان کۆلۆنیالی و گەلانی کۆلۆنیکراو دەکات. ئەگەر لێکۆڵینەوە لەسەر سروشتی ئەو پەیوەندییانە بکەین پێویستە بە شێوەیەکی تایبەت فاکتەرە هەستی و فیکرییەکان لەبەرچاو بگرین و بەهەر نرخێك بوە چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە لەبەرئەوەی گرنگی شیکردنەوەی ئەو هۆکارانە لە شیکردنەوەی هۆکارە ئابورییەکان کەمتر نیە چونکە لە سایەی ژینگەی ملکەچ کردن و تەسلیم بون چەوسانەوەی ئابوری دێتە دی.

تورکیا بەرامبەر بە گەورەیی و خۆڕاگریی خەباتی گەریلا پشت بە سیستمی "پاسەوانانی گوندەکان" دەبەستێ و هەوڵدەدا سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە"

چڕتـر بکـات. بـە هاوکـاری "پاسـەوانی گونـد" شـێوازە جۆراجۆرەکـانی توندوتیـژی کۆمەڵگەی کۆڵۆنیالی لـە دژی گـەریلاو خـێزان و کەسـوکارو گوندەکانیـان پیـادە دەکـات، چونکـە لـە لایـەك بـەو شـێوازانە چاودێری خـەباتی گـەریلای پێدەکـەن کـە دەوڵـەتی کۆڵۆنیـالیزمی خسـتۆتە مەترسـییەوە، لـە لایـەکی دی بـە هێواشـی و بـە بـەردەوامی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە" پیادە دەکەن.

نەتەوە یەکگرتووەکان بە مەبەستی بەدی هێنانی ئارەزوی حکومەتە کۆڵۆنیالیەکانی تورکیـاو ئـێران و عـراق بـەرگری و پارێزگـاری لـەو بارودۆخـە دەکـات، ئەمـە سـەرەڕای ئەوەی کورد هەقی خۆیەتی چێژ لە مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی وەربگرێ. ئەم هەڵوێستە زیـان لـە ڕاسـتگۆیی نەتـەوە یـەکگرتووەکان دەداو نـاهێڵێت ئـەو دەزگایـە ئەرکەکان خۆی بـەجێ بـهێنێت. هـەمان شـتیش لەسـەر دەزگاکـانی دی وەك ڕێکخـراوی کۆنگرەی ئیسلامی پیادە دەبێ. بۆیە پێویستە سەرنجی ئەو تایبەتمەندییانـە بـدرێ کـە لـە سـەرەتای ئـەم لێکۆڵینەوەیـە ئاماژەمـان بـۆ کـردوە: سیاسـەتی "پەرتکـە- زاڵبـە" سیاسـەتێکی کلاسـیکی کۆڵۆنیالییـە بـەڵام لـە کوردسـتاندا بـوە بـە سیاسـەتی "پەرتکـە- زاڵبەو لەناوبەرە". هەڵبەتە لەناوبردن و پێشێل کردنـی ناسـنامەی کـوردو کوردسـتانە، واتـە لـەناوبردن و پێشـێل کردنـی بـەهاو تایبەتمەندیـەکانی نەتـەوەی کـورد. بـەڵام سەرەڕای تیرۆری دەوڵەت و هەمو جـۆرە سـتەم و ئەشـکەنجەو چەوسـانەوەیەك ئەگـەر کـورد خـەبات لـە پێنـاوی ناسـنامەی نەتەوایـەتی بکـات پێویسـتە تـا دوا کەسـیان لـەناو ببرێن و پاکتاوی جەستەیی بکرێن.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ درندەیی سوپای داگیرکەری ئـەو دەوڵەتانـە زیـاتر دەبێـت، چونکـە بـەبێ سڵ کردنـەوە هـەمو جـۆرە تـیرۆرێك پیـادە دەکـەن. گوندەکـان گـەمارۆ دەدەن و دەیـان پشـکنن و بـە کۆمـەڵ ئەشـکەنجەیان دەدەن و چێـژ لـە کوشـتنیان وەردەگـرن و گرتوخانە دروست دەکەن و ناوچە ئاوەدانەکان بـە گـازی ژەهـراوی بۆردومـان دەکـەن و ئاوی خواردنەوە پیـس دەکـەن و بـە خورتـی کـورد لـە گوندەکـانی خۆیـان ڕادەگوێـزن. سوپای کۆڵۆنیالیزم بە پێی هەلومەرجەکە لە یەك کاتدا یا گشت ئەو ئیجرائاتانە پیادە دەکات یا بەشێکی پیادە دەکات. هێندێك کەڕەت لەنێو جوتیارە گیراوەکان یا لـەنێو ژنـە

جوتیارەکان خەڵکانی خۆپەرست و سیخوڕی دەوڵەتیش دەگیرێن بەڵام ئەو کەسانە زۆر بە ئاسانی ئازاد دەکرێن.

ئەو دەوڵەتانە هەمو کاتێك دەتوانن کەلوپەل و بەرهەم و ئاژەڵ و ئالیکی ئاژەڵی جوتیاران زەوتبکەن. سەربازە چەکدارەکان دەتوانن بە ئاسانی بچنە گوندەکان و هەر ماڵێکیان بوێت لێی بمێننەوەو ز ەویوزاری جوتیارانی کورد داگیر بکەن و ناچاریان بکەن زەوییەکانیان بۆ بچێنن و بەروبومەکەیشیان بۆ کۆبکەنەوەو فرمانیان پێدەدەن ئاسایشی گوندەکە بپارێزن و دەتوانن داوا لە کەسوکاری پێشمەرگەکان بکەن کوڕەکانیان تەسلیم بکەنەوە، ئەگەر ڕازیش نەبن دەستەڵاتی گرتنی کەسوکاری پێشمەرگەکانیان هەیە، هەروەها هەمو کارێك دەکەن بۆ ئەوەی خەرجی پاسەوانی گوند بخەنە ئەستۆی جوتیاران.. هتد، بۆیە بەرامبەر بەو ڕێوشوێنانە تەنها دوو ڕێگەمان بۆ دەمێنێتەوە ئەویش یا بەرگری لە خۆمان بکەین، لەم حاڵەتەدا سەربازەکان تەقەمان لێدەکەن و ژمارەیەکمان لێدەکوژن یا دەبێ بەو ڕێوشوێنانە ڕازی بین، لەم حاڵەتەشدا پێویستە دەست پانبکەینەوەو داوای سۆزو بەزەیی بکەین. بەمشێوەیە هەست کردنی کورد بە شەرمەزاری و ترس کەسایەتییەکەی وێران دەکاو دڵی دەمرێنێ.

لە هەمو حاڵەتێکدا هێزی سوپاو پۆلیس دەگەن بە ئامانجی خۆیان، لەبەرئەوەیە دەڵێین کۆمەڵگەی کۆلۆنیکراو، کۆمەڵگەیەکی بریندارە بەڵام بارودۆخی کوردستانی لە کۆلۆنی خراپترە.

پسپۆڕە ناوخۆیی و بیانیەکان بە مەبەستی پشتگیری کردنی دەوڵەت لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پیادەکردنانە دەکەن کە بە پلەی یەکەم ئاراستەی گەریلا دەکرێ.

## نابوتی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی

تورکیا بە شێوەیەکی ئاسایی سیاسەتی تیرۆری دەوڵەت لە کوردستان پیادە دەکات چونکە دەوڵەتی تورکیا تەنها سیاسەتی تیرۆری بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد هەیە. تورکیا بۆ ئەوەی کەس نەوێرێ وشەی (کورد) بەکاربهێنێ و داوای مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی کورد بکات بەردەوام سیاسەتی سەرکوتکردن پیادە دەکات. تورکیا لۆجیکی سیستمی سزادان و تۆقاندن تەنها دژی ئەو کەسانە بەکارناهێنێ کە قسە لەسەر مەسەلەی کورد دەکەن بەڵکو خێزان و گوند و عەشیرەتەکانیشیان دەگرێتەوە لەبەرئەوەی بەمشێوەیە ناچاریان دەکەن گرنگی بە مەسەلەی کورد نەدەن، کەچی سەرەڕای هەژاری و ئەشکەنجەدان و کوشتوبڕو دەربەدەرکردن و سزادان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر کوردستان و زمان و کولتوری کوردی ئەنجام دەدرێ لەگەڵ ئاستی داواکردنی مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکان زیاترو بەرفراوانتر دەبێ و بەشکلی جۆراوجۆریش دەخرێتە ڕوو، و یانەی کولتوری شۆڕگێڕ لە ڕۆژهەڵات پرۆسەی توانەوەی ڕەگەزی لەباربرد. گەشەکردنی لەسەرخۆی سەرمایەداری و دیموکراسی چەمکی نەتەوایەتی کوردو پەرەسەندنی خێرای بزوتنەوەو بنکە جەماوەرییەکەی پێشدەخات، و لەگەڵ چڕی و گشتگیری بەکارهێنانی شێوازی تیرۆری دەوڵەت کورد هەر سورە لەسەر داواکردنی مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی خۆی و بەرهەڵستی تیرۆری دەوڵەت و مەترسیەکانی دەکات. ئەمەش مانای شکستی پیادەکردنی تیرۆری دەوڵەت دەگەیەنێ، واتە شکستی سیاسەتی تیرۆر بۆیە لەم حاڵەتەدا تیرۆری دەوڵەت ئەرکەکانی لە دەست دەدا. دەوڵەتی تورکیا تەنها ئەم سیاسەتەی بەرامبەر بە کورد هەیە.

ئەگەر چاودێری گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی ڕۆژهەڵاتی نزیک بکەین دەبینین هەر دەوڵەتێك سیاسەتێکی تایبەتی خۆی بەرامبەر بە کورد هەیە، یەکێتی سۆڤێت و ولاتە یەکگرتوەکان و ولاتانی فەرەنساو ئەڵمانیاو بریتانیا سیاسەتی تایبەتیان بەرامبەر بە کورد هەیە. هەمان شتیش لەسەر ئێران و

سـوريا و ولاَتـه عەرەبيـەكانى دى جێبـەجێ دەبێت چونكـه كـورد فاكتــەرێكى گرنگـى ئەوتۆيـە پێويسـته لەبـەرچاوبگيرێ لەبەرئـەوەى كاردەكاتـە سـەر تێكـڕاى گۆڕانكاريـيــە سياسى و سەربازييەكانى ڕۆژهەلاَتى نزيك.

ئەو بابەتانەى پێويستە لێكۆڵينــەوەيان لەسـەر بكـرێ بريتيـە لـەوەى كـام سياسـەت لەگەڵ بەرژەوەندييەكانى ميللەتى كورد دەگونجێت و كام سياسـەتيان نـاگونجێت و ئـەو سياسـەتە وەلاَمـى داواكاريـيـەكانى كـورد دەداتــەوە يــا نــا بۆيــە زۆر گرنگـە كـورد لــە ڕۆژهەلاَتى نزيك ببێتە هۆكارێكى كاريگەر لەسەر پەيوەندييە نێودەوڵەتێكان.

دەوڵەتانى وەك توركيـاو عـراق پێيـان وايـە لـە ڕێگـەى تـيرۆرى دەوڵەتـەوە دەتوانـن چارەســەرى مەســەلەى كــورد بكــەن. ئــەم دوو دەوڵەتــە سيســتمى كۆلۆنييــاليزمى نێودەوڵەتى لە كوردستاندا پيادە دەكەن.

## ئەنجامە هەست پێكراوەكانى زەبروزەنگى گەريلا

لەگەڵ دەستپێكردنى خەباتى پێشـمەرگايەتى لـە ئـيرۆو شـەمدينلى لـە ڕۆژانـى ١٤ و ١٥/ ئــاب/ ١٩٨٤ بــە ســەركردايەتى پــارتى كارگــەرانى كوردســتان دو شــت لــە بــاكورى كوردستان بە شێوەيەكى بنەڕەتى گۆڕانى بەسەرا هات: لە لايەك، خودى گەريلا گۆڕانى بەسەرا هات چونكە هەرەسى بە ترس و ڕەشـبينى هێنـاو بـو بـە يەكەيـەكى شـەڕكەرى تۆكمـە و بڕيـاردەرو وشـيار، واتـە بـووە يەكەيـەكى تێكۆشـەر، هـەروەها بـە هەڵوێســتى نەگۆڕو پتەو و وشيارى گەريلا پارتى كارگەرانى كوردسـتان لـە خـەباتدا بـووە پـارتێكى پێشڕەوى ئەوتۆ كە خودى گەريلاو تێكۆشانى ميللەتى كـرد بـە دەزگايـەكى كـامڵ بۆيـە دەبينـين ئـەمڕۆ گـەريلا هێزێكـە دۆست و دوژمـن حيسـابى بـۆ دەكـات و جـەماوەرى كوردســتانيش پــارتى كارگــەرانى كوردســتان بــەو هــێزە دەبينــێ كــە توانــاى بەرەنگاربونەوەى هێزەكانى ئاسايش و سوپاو جەندرمەى توركياى هەيە.

ئەم نمونانە بە ئاشكرا ڕونيدەكەنەوە چۆن هێزەكانى گەريلا هەرەسيان بە ترس و ڕەشبينى هێناوەو چۆن ڕەوينـەوەى تـرس لـە ژيـانى ڕۆژانـەياندا دەردەكـەوێت. گـەلێك جار ڕاديۆ و تەلەفزيۆنـەكانى ئـەم زانياريانـە بلاَودەكەنـەوە: "پيـاوانى ئاسـايش لـێرەو

لەوێ کۆمەڵێك تیرۆریستیان خستۆتە بۆسەوەو لە هەمو لایەك گەمارۆیان داون و داوایان لێکردون خۆیان بدەن بە دەستەوە بەڵام تیرۆریستەکان بە تەقە وەڵامی هێزەکانی ئاسایشیان داوەتەوە و لە ئەنجامدا شەڕ لە نێوان هەردوولا هەڵایساوە". پێم وایە ئەم نمونەیە بەڵگەیەی بەزاندنی ترس و ڕەشبینی و بەڵگەی سوربونی گەریلایە لەسەر درێژەدان بە خەبات وەك هێزێکی پێشڕەو لە تێکۆشاندا.

لە دوای ١٩٨٠/٩/١٢ زایندانیە سیاسییە دەسبەسەرەکان لە دژی ستەم و سەرکوتکردن مانیان لە خواردن گرت و داوای ژیانێکی سەرفرازیان دەکرد بۆ ئەوەی دونیا لە خراپی مامەڵەی زیندانە تایبەتەکان ئاگاداربکەنەوە. ئەفسەرە بەرپرسەکانی ئاسایشی زیندانەکان بە مانگرەکان دەڵێن: "سوپا نانتان دەداتێ و ئێوە ڕەتیدەکەنەوە و دەشڵێن بەردەوام ڕەتیدەکەنەوە، پێمان ناڵێن ئەم ئازایەتیەتان لە کوێ هێناوە؟ ئەفسەرەکان بەوپەڕی لە خۆبایی بون و لوت بەرزی و تورەییەوە ئەو قسانەیان دەکرد" "سوپاو دەوڵەتی تورکیا نان و خۆراکتان پێدەداو ئێوەش ڕەتیدەکەنەوە، وەریگرن، دەبێ وەریبگرن، خواردن و نەخواردنی هەرگیز بەلامانەوە گرنگ نیەو تەنها لەسەرپێچی کردنی فرمانەکانی سوپاو دەوڵەت خۆش نابین" لە ڕاستیدا ئەفسەرەکان هەرگیز بیریان لە تەندروستی مانگرتووەکان نەئەکردەوە چونکە بۆ ئەوان دابەشکردنی نان و خۆراك جگە لە مەسەلەی فرمان و تەعلیمات هیچی دی نەبو. ئەو ئەفسەرانە دەیانویست سەرپێچی لە فرمانەکانی سوپاو دەوڵەت نەکرێت. پێویستە لەسەر زیندانییەکان نان و خۆراکی دەوڵەت و سوپا وەربگرن، بە وشەیەکی دی پێویستە بە زەبری هێز فرمانی دەوڵەت و سوپا جێبەجێ بکرێ بۆیە تەنها وەرگرتنی خواردنەکەیان لەلا مەبەست بو بەڵام خواردنی یا نەخواردنی هەرگیز گرنگ نەبو. کاتێك پاسەوانە مەدەنیەکانی زیندان یا بەڕێوەبەری زیندان یا داواکاری گشتی "نان و خۆراك دابەش بکەن" لەم حاڵەتەدا وەرنەگرتنی ئەنجامێکی خراپی لێناکەوێتەوە. بەڵام کاتێك ئەفسەر یا پلەدار یا کەسانی پەیوەندیدار بە سوپا فرمانی وەرگرتنی خۆراك دەربکەن ئەوا لەم حاڵەتەدا وەزعەکە بە تەواوەتی جیاواز دەبێ. چۆن کەسێکی سوپا ناتوانێ فرمانەکانی بسەپێنێ؟ ئەمەیان کارێکە هەرگیز قبوڵ ناکرێ بۆیە کاتێك

مانگرەکان مان لە خواردن دەگرن تەنها  بـە سـەرپێچی کـردن لـە قانونـەکانی زینـدان و گەلاڵەنامــەی ئیــدارە تاوانبــار نــاکرێن بــەڵکو بــە تــاوانی دەســتدرێژی کردنــە ســەر شانوشەوکەتی سوپاش تاوانبار دەکرێن"

تەقـەکردن لـە دوژمــن لــە جیــاتی چــەکدانان باشــترین بەڵگەیــە لەســەر گۆڕانــی چۆنایەتی گەریلا چونکە گەریلا لە شەڕی ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن ناترسێت و  دەتوانـن بە درێژایی  چەندین ڕۆژو هەفتە توانایەکی بەرز شەڕی دوژمن بکات.

لە لایەکی دی چالاکیەکانی گەریلا گۆڕانی چۆنایەتی بەسەر دانیشتوانی ناوچەکـەدا هێنـا. ئـەو میللەتـەی لـە ترسـان بـڕوای بـە خـۆی نـەمابو، سـەرلەنوێ بـڕوای بـە ژیــان پەیداکردەوەو هەستایەوە سەرپێ و کەوتە داواکردنی  مافـەکانی خـۆی. ڕەنگـە خـەباتی گەریلا لە ماوەیەکی  کـورت سـەرکەوتن بـە دەسـت نـەهێنێ، بـەڵام کـارێکی پـڕ بایەخـە هەڵوێستی ئایدۆلۆجیای میللەتێك و بونیادی فیکری بگۆڕێت لەبەرئــەوە پێویسـتە ئـەو گۆڕانکارییانە بە  هـەند وەربگریـن. لـەم حاڵەتـەدا میللـەت هەمیشـە داوای مـافی زیـاتر دەکات لەوەی کە پێی دەدرێت. لە هێندێك  ناوچـەدا کـورد داوای یەکسـانی  دیموکراسـی دەکـات و دیموکراتیـەت دەکەنـە مـەرجێکی پێشوەخت. کـورد بـارودۆخی خـۆی لەگــەڵ گەلانی تورکیاو ڕۆژهەڵاتی نزیك و دونیا بەراورد دەکات. کـورد لەسـەر ئاسـتی سیاسـی، ئابوری، سەربازی و کۆمەڵایەتی و کولتوری بارودۆخی خۆی لەگەڵ  بـارودۆخی تـورك و عەرەب و فارس بەراورد دەکات و لە ڕێگەی ئەو بەراوردکردنەوە لە مەودای بەدبەختی و کلۆڵی هەلومەرجی ژیانی  خـۆی تێدەگـات. ئـەو گۆڕانکارییانـە بەرهـەمی شۆڕشـی بـە ورەو ئیرادەی گەریلایە. سەرباری ئەوەش پێویستە چالاکییە سیاسی و ئایدۆلۆجیەکانی نـاوەوەی تورکیـا بـە هـەند وەربگریـن، هـەروەها ئـەو لێکۆڵینەوانـەی لەسـەر مەسـەلەی کــورد دەکرێــن بــە شــێوەیەکی هەســتپێکراو بەشــداری لــە گۆڕینــی بــارودۆخی کوردستان دەکەن.

ئەگەر بیست یا سی ساڵ لەمەوبەر لە تەبلیس یا دیاربەکر یـا هـەر ناوچەیـەکی دی لەســەر مافــە نەتەوایەتییــەکانی کــورد قســەمان لەگــەڵ جوتیــارێکی کــورد بکردایــە بەمشـێوەیە وەڵامـی دەدایـنـەوە: "بـەڕێزان، ئێمـە هـەمومان موسـڵمان و بـرای ئـاینین و

قسەكردن لەسەر كورد گرنگ نیە. ئەمە سەرباری ئەوەی دەوڵـەت هـەرگیز ئـەو مافانـە بۆ كورد بە ڕەوا نابینێ چونكە كورد بێـهێزو دەوڵـەتیش زۆر بـەهێزو بەتوانایـە بۆیـە دەوڵەت لەناومان دەبات ئەگەر خۆمان بـەم كێشـانەوە سـەرقاڵ بكـەین. ئەگـەر دەوڵـەت ڕێگەمان بۆ لێبـدات و خوێندنگـە دروسـت بكـات و ئـاوی خواردنـەوەمان بـۆ ڕابكێشـێت ئـەوا هیچـی دیمـان لێـی نـاوێت، بـەڵام ئەگـەر درێژەمـان بـە قسـەكانی خۆمـان بدایـە: "لەبەرئەوەی دەوڵەت بە ئاشتی مافی كورد نادات بۆیە پێویستە بە شۆڕش ئـەو مافانـە بەدەسـت بـهێنین چونكـە نوسـین و قسـەكردن یەكێكـە لـەو مافانـەی كـەس نـاتوانێت پێشـێلی بكـات و ئـەو مافانـەش شـایانی ئەوەیـە شۆڕشـی بـۆ بكـرێ". ئـەمجارە پەرچـەكرداری جوتیارەكـە زۆر توندتـر دەبـو: "سـەیدا گوێ ڕادێـرە، خـەبات لـە دژی دەوڵەت پێویستی بە دەوڵەت هەیە بەڵام ئێمە میللەتێكی هـەژارو نـەزانین و توركیـاش دەوڵەتێكی گەورەو بـەهێزەو سـوپا، فڕۆكـە، زریپـۆش، تـۆپ، تفـەنگ، پۆلیـس، زینـدان، خوێندنگـە، ڕۆژنامـەو ڕادیـۆی هەیـە، هـەمو شـتێكی هەیـە، ئـەی ئێمـە چیمـان هەیـە؟ هیچمان نیە.. ئەو خەباتەی تۆ باسی دەكەیت هـەر زوو هـەرەس دەهێنـێ بۆیـە باشـترە بێدەنگ بین". بەڵام ئەگەر بۆ جاری سێیەم باسمـان لـە مەسـەلەی مافـە نەتەوایـەتی و دیموكراتیەكان بكردایە، ئەوا جوتیارەكە بەمشێوەیە وەڵامـی دەدایـنـەوە: "قسـەكەی تـۆ ڕاسـتە، بـەڵام ئێمـە میللـەتێكی بێدەسـتەڵاتین و كـەس یارمـەتیمان نـادات و دۆسـتمان نیـە". خـەباتی گـەریلا ئـەو بونیـادە عـەقڵیو مەعنەوییـەی هەسـت بـە بچوكـی خـۆی دەكات لەناو بردوە یا دەستیكردوە بە لەناوبردنی.

ئەو گەریلانەی سەریان بۆ هێزەكانی ئاسـایش شـۆڕنـەكردو لـە شـەڕگەكان یـا دواتـر شەهید بون دەورێكی زۆر گرنگیان بینی بۆ ئەوەی سەرلەنوێ میللەت بـڕوا بـە خـۆی و نەتەوەو گوندو كەسوكاری بهێنێتەوەو میللەتیش لەلای خۆیەوە گەیشتە ئـەو بڕوایـەی ئەو گەریلا شۆڕشگێڕانەی ئامادەگییەكی مەزنی خۆبەخت كردنیان تیایـە هـێزێكی زۆر گرنگ لە ڕووبەڕووبونەوەی هێزەكانی ئاسایشدا دروستدەكەن بۆیـە میللـەت بـڕوای بـە ڕۆڵەكانی خۆی زیاتر دەبێت كە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورە دەبن.

گرنگی دانی خەڵکی بە تەرمی ئەو گەریلانەی بە دەست هێزەکانی ئاسایش شەهید دەبن و پرسەی شۆڕشگێڕان و پرسەنامەو سەرەخۆشی کردن و بەسەرکردنەوەی کەسوکاری شەهیدان و میوانداری کردنیان کە هێندێك جار چەندین هەفتە دەخایەنێت چ مانایەك دەگەیەنێ، ئایا ئەمەش بەڵگەیەکی دی نیە لەسەر گۆڕانی عەقڵیەتی خەڵکی؟

لە ساڵانی یەکەمی دوای دەسپێکردنی شۆڕشی گەریلا میللەت لە ترسی تۆڵەسەندنەوەو ئەشکەنجەدانی پیاوانی ئاسایش زاتی نەئەکرد داوای تەرمی ڕۆڵەکانی خۆی بکات و دەترسا لەوەی پێی بڵێن: "چۆن دەبێتە باوکی پیاوێکی خۆفرۆش و گێرەشێوێن، کەواتە تۆش دەستت لەگەڵ تێکەڵ کردوە". دەترسا هەزارو یەك بیانوی بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ئەشکەنجە و مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکەن بۆیە لە کوڕو کەسوکارە کوژراوەکانی خۆیان نەئەپرسییەوە. تەرمی گەریلا شەهیدەکان لەسەر لوتکەی چیاو لە دۆڵەکان بەجێ دەهێڵران تا هێزەکانی ئاسایش تەرمەکانی کۆدەکردەوەو فڕێی دەدایە دەریاوە.

لە واقیعدا هێزەکانی سوپاو ئاسایش مەبەستیان بوو کەسوکاری گەریلاکان بایەخ بە تەرمی ڕۆڵەکانیان نەدەن بۆ ئەوەی بەمشێوەیە برەو بە بانگەشەکانی خۆیان بدەن: "ئەو کەسانە کۆمەڵێك چەتەو ڕێگرن و پەیوەندییان بە میللەتەوە نیەو تەنانەت لە لایەن کەسوکاری خۆشیان دەرکراون، هەروەها دەڵێن: "میللەت پشتگیری لەو چەتانە ناکات بەڵکو میللەت پشتگیری لە دەوڵەت دەکات و تەنانەت کەسوکاری گەریلا کوژراوەکان داوای تەرمەکانیشیان ناکەنەوە".

لەم ساڵانەی دواییدا وەزعەکە بە تەواوەتی گۆڕاوە چونکە ئێستا میللەت داوا لە هێزەکانی سوپاو ئاسایش دەکات تەرمەکانیان بداتەوە، ئەگەرچی ئەوان گەریلا بە "ڕێگر" و "خائین" وەسف دەکەن بەڵام کەسوکاری گەریلا شەهیدەکان، کوڕەکانیان بە نیشتمانپەروەر وەسف دەکەن. کاتێك تەرمی شەهیدەکانیان وەردەگرنەوە زۆر بەڕێزو شکۆمەندی بە خاکی دەسپێرن.

ئـەمڕۆ بـە زۆری تێبینـی ڕوداوی لـەمجۆرە دەكـەین: بـۆ نمونـە، كـاتێك لـە گوندێك "پاسەوانێكی گوند" دەكوژرێت بە دەگمەن كەسێك دەدۆزینەوە بچێتە ژێـر تابوتەكـەی یا سەرەخۆشی لە كەسوكاری كوژراوەكە بكات، ئەمە لە كاتێكدا خـەڵكی زۆر گرنگـی بـە ڕێوڕەسمی ناشتن و بە خاك سپاردنی گەریلا دەدەن و بەشدارییەكی گەورەی تیا دەكەن و پرسەكەیشـی ماوەیـەكی زۆر دەخایـەنێت. كـاتێك خـەڵكی قسـە لەسـەر گـەریلا كوژراوەكە دەكەن بە شەهید ناوی دەبەن.

فیلمی یۆلْ‌ڕێگە‌ی یەلماز گونەی دیمەنێكی كاریگەری تیایە. لەو فیلمە لـە ئـەنجامی پێكدادانی جەندرمەو قاچاغچیەكان زۆربەی قاچاغچیەكان دەكوژرێن و بە سـەیارەیەك تەرمی كوژراوەكان دەبەنەوە بۆ گوندەكەیان. فەرماندەی هێزی جەندرمە بە مەبەستی ناسینەوەی كوژراوەكان جوتیارەكان لە دەوری سەیارەكە كۆدەكاتەوە بـەڵام جوتیارەكـان حاشا لە ناسینەوەی كوژراوەكان دەكـەن، ئەمـە لـە كـاتێكدا كـوژراو شـاهیدەكان خـەڵكی یەك گوندو كەسوكاری یەكبوون. خەڵكی گوندەكە كە دەترسان لەوەی ئەگەر كوژراوەكان بناسـنەوە ئـەوا هێزەكـانی ئاسـایش پەیوەندییـەك لـە نێـوان تـاوانی كوژراوەكـان و دانیشـتوانی گوندەكـە دروست بكـەن، لـێرەوە دەردەكـەوێ كۆلۆنیـالیزم تـا چ ڕادەیـەك دەتوانێت مرۆڤ لە ناسنامەو كەسایەتی خۆی داماڵێت.

لەم ساڵانەی دواییەدا دیاردەی گرنگیدان بە تەرمی گەریلاو وەسفكردنی بە شەهید و دروسـتكردنی پەیكـەری شـەهیدان لـە شـارو گوندەكـان بـووە بـە بەشـێكی گرنـگ لـە گەشەسەندنی سیاسی و كۆمەڵایەتی كۆمەڵگەی كوردەواری.

شتێكی ئاشكرایە پشتگیری كردنی میللەت لە گەریلا، دەوڵەت زۆر نارەحـەت دەكـات بۆیـە دەوڵـەت تـاكتیكی خـۆی گۆڕیـوە چونكـە ئـەمڕۆ تەنـها چـاودێری هەڵسـوكەوتی ئەندامانی پارتی كارگەرانی كوردستان ناكات بەڵكو چاودێری ئـەو جـەماوەرەش دەكـات كـە پشـتگیری لـە حـزب دەكـات و پەناگـەو خـواردن بـۆ ئەندامـەكانی دابـین دەكـات، لـە بەرامبەر ئەوەشدا دەوڵەت هەوڵدەدا گەریلا لە جـەماوەر دابـبڕێت. دەوڵـەت لـە ڕێگـەی چاندنی سیخورەكانی دەزگای هەواڵگری لە نیو ڕیزەكـانی گـەریلاو ئنجا بـەكارهێنانیان وەك شـاهێدێكی سـەرەكی بـۆ گرتنـی دەیـان و هـەندێ جـار هـەزاران كـەس و گرتنیـان

هـەوڵدەدا پلەوپایـەی گـەریلا لـە نێـو جوتیـاران و بازرگانـە بچوکــەکان کــەم بکاتــەوە. سەرباری ئــەوەش هـەر بـۆ چاوشـکاندن ئەشـکەنجەیان دەدەن، هـەروەها هـەوڵدەدەن لـە ڕێگەی شێوازی ئەشکەنجەدانی دیاریکراو نەفسـیەتی مرۆڤـی کـورد بشـکێنن، بـۆ نمونـە "گوو دەرخواردی زیندانیەکان دەدرێ". ئامانجی ئـەم پرۆسـەی ئەشـکەنجەدانە بریتیـە لە ڕوخاندنی نەفسـیەتی کـوردو ژیـاندنی لـە ترسـێکی بـەردەوام و تێکشـکاندنی گیـانی بەرزی بەرگری نەتەوەی کورد.

دەستەڵاتدارانی تورکیا بۆ ئەشکەنجەدانی زیندانییەکان پشت بە "پاسەوانی گونـد" دەبەســتن و ئیمتیــازاتی تایبــەتییان پێــدەدەن لــە ئەشــکەنجەدانی ئــەندامانی پــارتی کارگەرانی کوردستان و ئەو کەسانەی گومـانی ئـەوەیان لێدەکرێ لایـەنگیری لـەو پارتـە دەکەن لـە جوتیـارو بازرگانـە بچوکـەکان. پاسـەوانی گونـد لـە بەرامبـەر ئـەو کەسـانەی دەیـانکوژن لـە پـاڵ موچەکـەی خۆیـان خـەڵاتی مـادی-یـش دەکرێـن بـەڵام بـڕی پـارەی خەڵاتەکە دەکەوێتە سەر پلەو پایەی ڕێکخر اوەیی کوژراوە کە. دەستەڵاتداران ڕێگـە بـە پاسەوانی گوند دەدەن هەمو کارێك بکەن وەك سوتاندنی خـانوی کەسوکاری گـەریلا یـا کەسـوکاری لایـەنگرانی گـەریلا و کوشــتنی مــەڕوماڵات و ســوتاندنی ئــالیك و خەڵــەو خـەرمانیان لـەپاڵ ڕفـاندنی کچـانی هـەرزەکار. زۆربـەی پاسـەوانە گوندەکان لــە کۆنــە تاوانبـارە ڕاکردووەکـان یـا حوکمدراوەکـانن. دەوڵـەت دوای ئـەوەی بـۆی دەرکـەوت ئــەو تاوانبارانـە ئامـادەن شـەڕی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان بکـەن، ڕێگـەی پێـدان چـەك هــەڵبگرن و حوکمەکــەی لەســەر لابــردن و دۆســێکەیانی داخســت. ســەرەڕای ئــەو ســەرپێچیانەش کــەچی چــالاکی گــەریلا هــەر بەردەوامــەو هێــدی هێــدی ڕەهــەندی فراوانتر وەردەگرێ.

هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردوە خەباتی گـەریلا گۆڕانێکـی گـەورەی لـە شـێوەی بیرکردنەوەی کورد هێنایە ئاراوە، هەروەها گرنگی زۆر دەدەن بەوەی بارودۆخی خۆیـان لەگەڵ بارودۆخی گەلانی دی بـەراورد بکـەن. بـۆ نمونـە ئـەو کوردانـەی لـە حوزەیرانـی سـاڵی ١٩٨٩ لـە تەلــەفزیۆنی تورکیـا تەماشـای ئەڵقـەی بەلەنــە- Belene- یــان دەکــرد، بـارودۆخی خۆیـان لەگـەڵ بـارودۆخی تورکـەکانی بولگارسـتان بـەراورد دەکـرد چونکـە

بەسەرهات و ڕوداوەکانی ئەو زنجیرەیە ڕوداوەکانی پێش ١٢/ ئەیلولی زیندانی دیاربەکری وەبیر کوردەکان دەهێنایەوە. لە یەکێك لە لقەکانی ئەو زنجیرەیەدا پۆلیسی بولگارستان ناسنامەی مامۆستای گوندێکی تورکنشین زەوتدەکەن دواتر بۆی دەگێڕنەوە بەلاّم ڕۆژانە زەوتکردنی ناسنامەی تاکە کەسێك یا گشت دانیشتوانی گوندە کوردنشینەکانی کوردستان دوبا رە دەبێتەوە. لە دیمەنێکی دی ئەو ئەلّقە تەلەفزیۆنیەدا کاتێك زیندانیەکی تورك لە ژوری زیندانیەکەی کۆمەڵێك مشك دەبینێ لە کونی زێرابەکەوە دێتە دەرەوە سەرەتا شێت دەبێ پاشان دەمرێت بەلاّم لە گرتوخانەی دیاربەکر زیندانییەکان ناچار دەکرێن مشك بخۆن. ئێستەش لە یادمانە کە هەندێك لە زیندانییەکان لە دوای ئازادبونیان هەمو دانەکانیان هەڵکێشا. هەر لەو ئەلّقە تەلەفزیۆنیەدا زۆر جاران ئەفسەرو پیاوانی هەوالگری بولگارستان پڕ بە دەمیان هاوار دەکەن "یەکێتی، یەکێتی، یەکێتی"، لە تورکیاش دروشمی "یەکێتی و هاوکاری" گرنگترین دروشمی ١٢ / ئەیلولە، هەروەها ئەم دروشمە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە سەرەکیترین دروشمی دەولەت و حکومەتی تورکیایە. لەو ئەلقانەدا منالانی تورکەکانی بولگارستان لە ترسی دەستەلاّتدارانی بولگارستان بە دزییەوە خەتەنە دەکرێن بەلاّم دەستەلاّتدارانی تورکیا لە دوای /١٢/ ئەیلول زیندانییە ئەرمەنییەکانیان لە زیندانە تایبەتەکاندا بە تۆپزی سوننەت دەکرد.

هەر لەو ئەلّقانەدا سەربازو پۆلیسی بولگارستان چەندین جار پەلاماری گوندە تورکنشینەکان دەدەن بەلاّم لە کوردستان ڕۆژانە دەسەلاّتدارانی تورکیا پەلاماری گوندە کوردنشینەکان دەدەن و سەرو سامانیان زەوت دەکەن و کاتێکیش ئابلۆقەی گوندە کوردنشینەکان دەدەن و دزێوترین ڕەفتاریان دەرهەق دەکەن و هێندێك جار گووی ئاودەستەکانیان دەرخوارد دەدەن. ئەو ئەلقانە باس لە زەوتکردنی موڵك و پارەی تورکەکانی بولگارستان دەکات بەلاّم لە تورکیا سەربازو هێزە تایبەتیەکانی تورك و پاسەوانانی گوند بەردەوام ماڵ و موڵکی جوتیارە کوردەکان بە تالاّن دەبەن. لەو زنجیرە تەلەفزیۆنیانەی تورکیا دەستەلاّتدارانی بولگارستان بە زۆر ناوی تورکی بە ناوی بولگاری دەگۆڕن بەلاّم لە تورکیا قەدەغەکردنی ناوی کوردی و تەتریك کردنی ناوی

گوندە کوردییەکان بەشێکی بنچینەیی سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا پێکدەهێنێ. هەر لەو ئەڵقانەدا تورکەکانی بولگارستان نوێژ بە نهێنی دەکەن بەڵام ئایا ڕیژێمی ١٢/ ئەیلول هاووڵاتیانی عەلەوی شیعە مەزهەبی ناچار نەئەکرد نوێژ لە مزگەوتەکانی ئەهلی سوننە بکەن؟

ئەو ئەڵقە تەلەفزیۆنیانە شتێکی دی ئاشکرا دەکەن: ئەو تورکانەی ناوی خۆیان بە ناوی بولگاری دەگۆڕن هەمو دەرگاکانیان بۆ ئاواڵە دەکرێت، واتە یەکسانی نێوان تورك و بولگار دەبەسترێتەوە بەوەی تورك نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی بکات و ملبدات بۆ پرۆسەی بە بولگاری کردن. ئەمەش خاڵی سەرەکی و گەوهەری چەمکی دیموکراسی یەکسانی دەستەڵاتدارانی تورکیایە. کورد خەریکە لەم ڕاستیە تێدەگات: پیاوانی دەوڵەت و حکومەتی تورکیاو ڕۆژنامەو پارتە سیاسی و سەندیکا کرێکارییەکانی وەك ڕێکخراوی تورکسی و دەزگا دادوەرییەکانی وەك یانەی پارێزەرانی تورکیا.. هتد، بایەخێکی زۆر بە کێشەی تورکەکانی بولگارستان دەدەن بەڵام لە ئاست کێشەکانی کورد خۆیان کەڕ دەکەن.

بەمشێوەیە ڕوندەبێتەوە خەباتی گەریلا تەنها شێوەی بیرکردنەوەی کوردی نەگۆڕی بەڵکو بونیادی عەقڵیەتی کوردی گۆڕی. سەرباری ئەوەش، کورد لەسەر ئاستێکی بەرفراوان ڕوداوە جۆراوجۆرەکان بەراورد دەکات. بێگومان ئەم گەشە فیکرییەی کورد کار لەسەر بیروڕاو هەڵوێستی نوێنەرەکانیان دەکات لە ئەنقەرە.

پارلەمانتارە بە ڕەچەڵەك کوردەکان هەوڵدەدەن لایەنگری داواکارییە دیموکراسی و نەتەوایەتییە کانی جەماوەری کورد بکەن. پارتە سیاسییەکانی وەك پارتی گەلی سوسیال دیموکرات و پارتی ڕێگەی ڕاست و پارتی نیشتمانی دایك کە پشت بە دەزگای سوپاو پۆلیسی نهێنی دەبەستن هەمو توانایەکی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی دەنگی دیموکراسی و مافە نەتەوایەتییەکان کپ بکەن بەڵام شێوازی حزبەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان زۆر ڕون و ئاشکرایە.

## هەڵسوکەوتەکانی کۆلۆنیالیزم و ڕوناکبیرانی تورك

شەڕی ڕزگاریخوازی جەزائیر یەکێکە لە خوێناویترین شەڕی ڕزگاری نیشتمانی کەتێیدا زیاد لە ملیۆنێك مرۆڤ گیانیان لە دەست دا. ڕوناکبیرانی فرەنسی بە ڕاو بیرو بۆچوون و چالاکییەکانی خۆیان بەشدارییان لە شەڕی ڕزگاری جەزائیردا کردو نمونەیەکی مەزنی ئەوتۆیان پێشکەش کرد کە سەرجەم مرۆڤایەتی سەربڵند دەکات.

شەڕی ڕزگاریخوازی جەزائیر لە ساڵی ١٩٥٤ تا ساڵی ١٩٦٠ درێژەی کێشا.

زۆربەی ڕوناکبیرانی فرەنسا بە درێژایی ئەو شەڕە پشتگیرییان لە بەرەی ڕزگاریخوازی جەزائیر دەکردو بە کۆمەڵ گوشاریان دەخستە سەر سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی و بیروبۆچون و کردەوەکانی حکومەتی فرەنسا. فرەنسیەکان دوای ئەوەی لە بیروڕاو چالاکیەکانی فرانس فانون تێگەیشتن ئاستی ڕەخنەکانیان بەرفراوانتر کرد. ئەو پێشەکییەی جان پۆڵ سارتەر بۆ کتێبەکەی فرانس فانونی نوسی "ئازار چەشتوەکانی سەرزەمین" بە تەواوەتی هەڵوێستی فرەنسیەکانی لەسەر مەسەلەی جەزائیر گۆڕی.

هەڵبەتە ئەو گۆڕانکارییە هەڵوێست و فیکری گشت فرەنسییەکانی نەگرتەوە. هەرچەندە نەیارانی فرنسا نوێنەرایەتی کەمایەتیان دەکرد بەڵام کاریگەرییەکی بەهێزیان لەسەر پەلەکردن بە جێبەجێکردنی پرۆسەی چارەسەرکردنی مەسەلەی جەزائیردا هەبو. ئۆپۆزیسیۆنی فرەنسی بۆ پشتگیری کردنی بەرەی ڕزگاریخوازی جەزائیر لە زانکۆکان چەند ڕێکخراوێکیان دروستکرد. سەرەڕای ئەوەی دامەزرێنەرانی ئەو ڕێکخراوانە بە کۆمەڵ دووچاری گێچەڵ و نارەحەتی دەبونەوەو هێندێکیشیان لە زانکۆکان دەرکران بەڵام دروستکردنی ئەو ڕێکخراوانە و ئەندامێتی ژمارەیەکی زۆری مامۆستایان تیایاندا خۆی لە خۆیدا کارێکی گرنگ بو. لەنێو ڕاگری زانکۆکان خەڵکانێك هەبو بڵێت: "هەست بە شەرمەزاری دەکەم ڕاگری (عمید)ی زانکۆی وڵاتێکم کۆلۆنیەکی بە ناوی جەزائیرەوە هەیە، بۆیە وەك نارەزاییەك لەسەر ئەم بارودۆخە جلی ڕاگری لەبەر دادەکەنم و واز لە پیشەکەم دەهێنم". ڕۆژنامەکانی فرەنسا

زۆرجاران بە وتارەکانیان هەڵوێستی پۆزەتیڤیان لەسەر بەرەی ڕزگاریخوازی جەزائیر وەردەگرت و ڕەخنەیان لە دەوڵەت و حکومەتی فەرەنسا دەگرت و ناڕەوایەتی بوونی فەرەنسایان لە جەزائیر دووپات دەکردەوە. پارتە سیاسیەکانیش پەرچەکرداری پۆزەتیڤیان هەبو.

سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی و ئیمپریالی حکومەتی فرەنساو هەڵسوکەوتەکانی لە جەزائیر بە سازکردنی خۆپیشاندان و بەستنی کۆڕو کۆبونەوەو کۆنگرەو دەرکردنی بڵاوکراوە چارەسەر دەکرا. گەلێك فرەنسی پەیوەندییان بە ڕیزەکانی بەرەی ڕزگاریخوازی جەزائیرەوە کرد.

هەروەها هەڵوێستی کنیسەی فرەنساش بەرامبەر بە خەباتی ڕزگاریخوازی جەزائیر هەڵوێستێکی ئابرومەندانە بوو، چونکە زۆرێك لە ڕەبەن و قەشەکان بە نهێنی و بە ئاشکرا پشتگیرییان لە خەباتی ڕزگاری نیشتمانی جەزائیر دەکرد.

تەنها فرەنسیەکان هەڵوێستی پۆزەتیڤیان بەرامبەر بە خەباتی ڕزگاریخوازی میللەتان وەرنەگرتووە بەڵکو لە ساڵانی شەستەکان ڕوناکبیرانی ئەمریکاش پشتگیریان لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی ڤێتنام دەکردو ڕەخنەیان لە سیاسەتی حکومەتی ئەمریکا لە ڤێتنام دەگرت و لایەنگیرییان لە خەباتی "ڤیتکۆنگ" دەکرد.

میللەتی ئیسرائیل نمونەیەکی دی ئەم بوارەیە. ئیسرائیل لە ئەنجامی هێرشەکەی بەهاری ١٩٨٢ بۆ سەر لوبنان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین لە لایەن هێندێك توێژی یەهودی ڕوبەڕوی شەپۆلێکی ناڕەزایی توند بویەوەو لە تەلئەبیب و قودس خۆپیشاندان سازکراو خەڵکێکی زۆر لە دژی سیاسەتی شاڵاوی ئیسرائیل بەشداریان لەو خۆپیشاندانە کرد. شەرەفێکی گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی جولەکەیەك ڕەخنە لە سیاسەتی حکومەتی ئیسرائیل بگرێ و پشتگیری لە بیروڕاو ڕەوایەتی خەباتی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین بکات.

ئیسرائیل قازانج دەکات کاتێك دەوڵەتی عیبری دژایەتی ئەو جولەکانە ناکات کە پشتگیری لە کێشەی فەلەستین دەکەن و بە تۆمەتی خیانەت زیندانیان بکات یا ئەشکەنجەیان بدات.

لەســـەر ئـــەو پێكدادانـــە ترســـناكەی نێـــوان هێزەكـــانی ئاسایشـــی ئیســـرائیل و فەلەستینیەكان لە ناوچە داگیركراوەكان هێندێك لە ئیسرائیلیەكان ڕەخنە لە سیاسەتی حكومەتی ئیسرائیل دەگرن بەرامبەر بە فەلەستینیەكان، بەم ڕەفتارەشـیان بـە ئاشـكرا پشتگیری لە فەلەستینیەكان دەكەن بۆیـە بەشـداری لـەو خۆپیشـاندانە دەكـەن كـە دژی حكومەتی ئیسرائیل سازدەكرێ.

شـتێكی ئاشـكرایە ئـەم ڕەفتـارو كـرداره زۆر دوره لـــە ڕەفتـــارو كـــرداری زانكۆكـــانی توركیا. زانكۆكانی توركیا لە بەرهەم هێنـان و بڵاوكردنـەوەی ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی لـە پێشەوەی ئەو دەزگایانە دێت كە پشت بـە درۆ و دەلەسـە دەبەسـتێ. زانكۆكـانی توركیـا میتۆدی زانسـتی لەسـەر مەسـەلەی كـورد بـەكارناهێنن بـەڵكو وەك هۆبەیـەكی (شعبە) سەر بە هەواڵگری توركیـا كاردەكـەن- بێگومـان لێكۆڵینـەوە لەسـەر مەسـەلەی كـورد لـە چوارچێوەی كارو ئەركی زانكۆكانی توركیا نییە، ئەگـەر یـەكێك لـە زانكۆكـانیش بڕیـار بدات لێكۆڵینەوەی لەو جۆرە بكات ئەوا یەكسەر پەیوەندی بـە زانكۆكانـەوە دەپچڕێـت، بە پێچەوانەوە زانكۆكانی توركیا بەردەوام لەسەر بـە تـورك كردنـی كـورد و سـەلماندنی نەبوونی زمانی كوردی توێژینەوە سازدەكەن و ئەو جۆرە توێژینەوانەش هاندەدەن.

هـەمان شـت لـە سـەر ڕۆژنامـەو پارتـە سیاسـیەكانی توركیـا جێبـەجێ دەكـرێ ئـەو دەزگایانـە وەك هۆبەیـەكی هـەواڵگری قســە لەســەر مەســەلەی كــورد دەكــەن. كــاتێك خوێندنگەی گوندەكان دەبنە بنكەی ئەشكەنجەدان یـا تێكـڕای دانیشـتوانی گوندێك بـە ژن و پیـاو و منـداڵ و گـەنج و پـیرەوە بـۆ ئەشـكەنجەدان لـە بینـای خوێندنگەیـەك كۆدەكرێنەوە ڕۆژنامەكانی توركیا هیچ شتێكی لەسەر بڵاوناكەنەوە. بەڵام ئەگەر پارتی كرێكارانی كوردستان پەلاماری یەكێك لەو بنكەی ئە شكەنجەدانە بدات بیسوتێنێ ئـەوا ڕۆژنامەكانی توركیا بە بیانوی سوتاندنی خوێندنگەیەك دونیا ژێرو ژور دەكەن.

لە توركیا بارەگای كۆمەڵەی مافی مرۆڤ لەناو دەزگا ڕەسمیەكان دامەزرا، بـۆ نمونـە كۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە كۆلێجی زانستە سیاسییەكان لە زانكۆی ئەنقـەرە یـا كۆمەڵـەی مـافی مـرۆڤ لـە دەزگـای ئیـدارەی گشـتی توركیـاو ڕۆژهـەڵاتی نزیـك. هەڵوێســتی ئــەم كۆمەڵانە و هەڵوێستی زانكۆ و پارتـە سیاسـی و ڕۆژنامـەكانی توركیـا لەسـەر مافـەكانی

مرۆڤـی کـورد جیاوازییـەکی زۆریـان نیـە. بـەڵام سـەبارەت بـە کۆمەڵـەی مـافی مرۆڤـی سەربەخۆ کە ژمارەیەك ڕوناکبیر دروستیان کردوە هێشـتا هەڵوێسـتی لەسـەر مافـەکانی مرۆڤـی کـورد وەرنـەگرتوە بـەڵکو زۆر بـە سـانایی خـۆی لـەم مەسـەلەیە دەدزێتـەوە. بەهەرحاڵ ناتوانین بڵێین ڕوناکبـیرانی تـورك پشـتگیری لـە خـەباتی ڕزگـاری نیشـتمانی کورد دەکەن بەڵکو بە پێچەوانـەوە سیاسـەتی ڕەگەزپەرسـتی و کۆڵۆنیـالیزمی دەوڵـەتی تورك یا لەنێو ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەدا لایەنگری بەرچاویان هەیە.

کۆمەڵەی مافی مرۆڤی تورکیا دڵسۆزی و پێزانینیان بۆ بـەها پیرۆزەکـانی دەوڵـەتی تورکیا هەیە. ئەو کۆمەڵانە بە شێوەیەك ڕەفتـار دەکـەن وەك ئـەوەی کێشـەی کوردیـان نەبێت و هەمو هەڵسوکەوت و کردارەکانیشیان گەواهی ئەو ڕاسـتیە دەدەن چونکـە ئـەو بایەخـەی بـە مەسـەلەی کـوردی دەدەن ناگاتـە دەیـەکی ئـەو بایەخـەی بـە مەسـەلەی فەلەستین و تورکەکانی بولگارستانی دەدەن بەڵام گرنگیدان بە مەسـەلەی فەلەسـتین و هاوسـۆزییان لەگـەڵ تورکـەکانی بولگارسـتان ئـەنجامێکی دیـاریکراوی ئـەوتۆی لێناکەوێتەوە شایانی ئەوە بێت باس بکرێ ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی کـە بیروڕاو کردەوەکانیان شەقڵی دووڕوویی پێوەیەو هیچ بەرچەکردارێکی پێویسـت لـەلای خـەڵکی دروسـت ناکـات، بـەڵکو بـە پێچەوانـەوە ڕووبـەڕووی تۆمـەتبارکردن دەبنـەوەو دەبنـە ئامانجی بلاوکراوەی دوژمنەکانیان.

ڕوناکبـیرانی فرەنسـا دەزانـن فرنسـا کۆڵۆنیـەکی هەیـە و لەبەرئـەوە ڕەخنـە لـە دەوڵەتەکەیان دەگرن چونکە دەزانن ڕزگارکردنی ئەو کۆڵۆنیە مانای ڕزگـاربونی خـودی فرەنسا دەگەیەنێت.

بـەڵام "ڕوناکبـیرانی تـورك"ی مرۆڤدۆسـت و ئـازادیخوازو کولتـور پـەروەر دوای تێپـەڕبونی ماوەیـەکی دورودرێـژ دەبـوا بیانزانیایـە تورکیـا کۆڵۆنیـەك یـا ناوچەیـەکی هەیـە بـارودۆخی زۆر لـە بـارودۆخی کۆڵۆنـی خراپـترەو ڕۆژانـە دەوڵـەتی تورکیـا لـەو کۆڵۆنیـە تـاوان دەرهـەق بـە میللـەتی کـورد دەکـات بـۆ ئـەوەی ڕوناکبـیرانی تورکیـا و نەتەوەی تورك چێژ لە ئازادییەکی زۆرتر وەربگرن و زمان و کولتـوری تورکیـش زیـاتر گەشە بکات.

## گرنگی لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکان

لێکۆڵینـەوەی زانسـتی بـۆ بـە دەسـت هێنـانی زانیـاری لەسـەر سروشـت و کۆمەڵگـەو مێـژو میتۆدێکـی زۆر بـە گرەنتـی و بـەربلاوە، هـەروەها یەکێکـە لـەو میتـۆدە زۆر گرنگانەی کە عەقڵی مرۆڤ بۆ تێگە یشتن و گۆڕینی دونیا گەشەی پێداوە. بابەتگـەرایی (الموضوعیـة) شـەقڵێکی سـەرەکی لێکۆڵینـەوەی زانسـتیە لەبەرئـەوەی زانسـت بـە تەنـها پشت بە فاکتی کردەیی دەبەستێ. زاناکان بەردەوام تێبینی سروشت و مێژو و کۆمەڵگە دەکەن و چاودێری فاکتە کردەیی و پەیوەندییەکانی نێوانیان دەکەن، هـەروەها تێبینـی سروشـت و مێـژو و کۆمەڵگـە دەکـەن و هـەوڵدەدەن لـە گەوهـەری ئـەو پەیوەندییانــە تێبگەن بە تایبەتی چاودێری کردنی ڕەفتاری خەڵك و پەیبردن بە لایەنـە شـاراوەکانی، ئنجا دەست بە پرۆسەی تێڕامان و بیرکردنەوە دەکەن و هەر لە سەرەتاشەوە گریمانـەی ئەو بیروڕایانەی ڕەنگە پێی بکەن لە پێـش چاوی خۆیـان دادەنێـن چونکـە گریمانـەکان پـەیوەندی نێـوان فـاکت و ڕوداوەکـان ڕاڤـە دەکـات پاشـان پـەیوەندی نێـوان هۆیــەکان و ئەنجامـەکانی دەسـت نیشـان دەکـەن. دوای ئـەوەش لەبـەر ڕۆشـنایی فاکتـەکان چـاو بــە گریمانەکانیان دەخشێننەو ە بۆ ئەوەی لە دروستی و نادروستی گریمانەکان دڵنیابن. بەم پرۆسەیە بەنرخترین و کۆنکرێترین زانیاری بە دەست دەهێنن.

ئێمە خۆمان بەرامبەر بە میتۆدێك لە بیرکردنـەوە دەبینـین بـە سـەرنجدان دەست پێدەکات و لەسەر بنەمای پشت بەستن بە پرۆســەی تێڕامـان و بیرکردنـەوەش گریمانـە دادەنێـت، ئنجـا هـەوڵدەدا لــە ڕێگــەی چــاودێریکردنی ڕوداوەکانــەوە ئەنجامــەکان هەڵهێنجێنێ. خاسیەتی بنەڕەتی ئەم میتۆدە ئەوەیە پشت بـە ڕووداوەکـان دەبەسـتێت چونکە بەبێ ئەوە وێنای چالاکی زانستی ناکرێ بۆیە پێویستە لێکۆڵەرەوەی زانستی بـە پلـەی یەکـەم ئـەو ڕوداوانـە لەبـەرچاو بگرێـت، هـەروەها پێویسـتە پرۆسـەی تێبینـی و ڕاڤەکردنی ڕوداوەکان بەوپەڕی وردبینیەوە ئەنجام بـدرێ. لێکۆڵیـاری زانسـتی هـەرگیز ڕێگە بە خۆی نادات نکۆڵی لە ڕوداوە فیعلیەکان بکات یا پشت گوێیان بخات ئـا ئیدعـای ڕونەدانیان بکات. ئەرکی لێکۆڵیاری زانستی چاودێری کردنی ڕووداوەکانـە نـەك ئـەوەی

خـەیاڵی لێدەکاتـەوە یـا حـەز بـە ڕودانـی یـەکێك لـە ڕوداوەکـان بکـات بـەڵکو پێویســتە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕاستیە بەرجەستەکان بکات نـەك ئـەو ڕاسـتیانەی لـە مێشکی خـۆی دروستی دەکات. زاناکـان هـەرگیز پشت بـە شـیکردنەوەی پڕوپاگـەندە نابەسـتن و ئـەو ڕایانـەش بـە هـەند وەرنـاگرن کـە پشت بـە بەڵگـەی ڕاسـت و پتـەو نابەسـتێ و پێشــتر لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکردبێ. لێکۆڵیاری زانستی ئەو زانیارییانـەی پێـی دەدرێ کـاری پێناکات ئەگەر لە بێژنگی نەدات و لە ڕاسـتی بابەتیانـەی دڵنیـا نـەبێ و بـە هەسـتێکی ڕەخنەیی شی نەکاتەوە.

لە تورکیـا هێندێـك بـیروڕا لەسـەر ئـەم خاڵـە دەبێتـە بابـەتی دادگـاییکردن چونکـە دەیانـەوێ ئـەو بابەتـە سـەرەکییانەی بەشـێك لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی تورکیـا پێدەهێنێ وەك بابەتی بێنرخ و سوك تەماشا بکرێـت. دەوڵـەت و ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی لێکۆڵینەوە لەسەر هێندێك بابەتی دیایکراو قەدەغە دەکەن و پێویستە هـەمو کەسـێك پابـەندبێ پێیانــەوە، تەنانــەت ئەگــەر هێندێــك لــەو بابەتانــە ڕاســتی و هــەڵقوڵاوی هەلومەرجێکی بابەتیش بێـت، ئـەوا لـەم حاڵەتـەدا بـە فرمـانێك نوسـین و لێکۆڵینـەوە لەسەر ئەو بابەتیانەی پەیوەندیان بەو ڕاستیانەوە هەیە، قەدەغە دەکرێن.

ئەم کارە تێڕمان و بیرکردنەوە لـە ڕووداوەکـان و لێکۆڵینـەوەی پـەیوەندی نێوانیـان قەدەغە دەکات، بۆیە جگە لە زانیارییەکانی دەوڵـەت هیـچ زانیارییـەکی دی دزە ناکـات، هـەروەها نابـێ بـە هیـچ شـێوەیەك ئـەو زانیاریانـە ڕەخنـەیان لێ بیگـرێ یـا گفتوگۆیـان لەسەر بکرێ یا گومان لە ڕاستییان بکرێ.

دەوڵەت دوپاتیدەکاتەوە کە زانیاری نوێی لەسەر ئەو بابەتانە لەبەردەست نیـە بۆیـە بـە ئاشـکرا دەوتـرێ هـەر کەسـێك ڕەخنـە لـە شێوازی خســتنەڕوی بابەتــەکان بگـرێ یـا جـەخت لەســەر دژەکـەی بکـات دادگـایی دەکرێـت و سـزای خـۆی وەردەگـرێ. بــە پێـی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی تورکیا ئاخاوتن لەسەر ئەو بابەتانەی مەبەستیان مەسـەلەی کـورد و کێشەی کوردستانە نەك هەر بە تاوان دادەنرێت بەڵکو یەکێکە لە تاوانە مەترسیدارەکان. بـەڵام ئـەم گوشـارانە دژی میتـۆدی زانسـتیە. ئەوانـەو دەسـتێوەردانەکانی دی بــە ئاشـکرا دەریدەخەن لە تورکیا کەشێکی لەبار نیە کە لە سایەیدا زانست پێش بکەوێت.

هەركاتێك كۆمەڵگەیەك توانی بیروبۆچون و ڕەخنەگرتن بەبێ كێشە یا ترسی گرتن پیادە بكات، مانای وایە كەشێكی لەبار بۆ گەشەكردنی زانست هەیەو پێچەوانەكەیشی ڕاستە. كاتێك دەوڵەت هەمو توانایەكی خۆی بەكاربهێنێ بۆ ئەوەی بیروبۆچونێكی دیاریكراو بەسەر جەماوەردا بسەپێنێ و ڕەخنەگرانی ئەو بیروبۆچونە سزا بدات، لەم حاڵەتەدا دەوڵەت ڕاستگۆیی لە دەست دەدا. لە سایەی ئەم هەلومەرجەدا بیروبۆچونە جیاوازەكان ململانێ ناكەن. لە توركیا تیۆری دەوڵەت لە دژی بیروڕاكان پیادە دەكرێ. ئەمەش لەو یارییە گەرم و بەهێزە دەچێت كە دەروازەو وانەكەی "گۆڵچی" بە پایەی دەروازەكەدا ببەسترێتەوە. لە توركیا ئایدۆلۆجیای ڕەسمی هەمیشە بەمشێوەیە هەڵوێست و ڕەفتار لە بەرامبەر بیروڕا جیاوازەكان وەردەگرێ. ئەمە سەرباری ئەوەی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی بەردەوام لەم چوارچێوەیە شێوازی بیركردنەوەو كاركردن دەسەپێنێ.

كاتێك جەخت لەسەر سوڕانەوەی زەوی دەكەین لەبەر ئەوەیە دەتوانین بە پێوەری زانستی سوڕانەوەی زەوی بسەلمێنین. بەڵام چ بكەین ئەگەر ئایدۆلۆجیای ڕەسمی ڕێگە نەدات جەخت لەسەر سوڕانەوەی زەوی بكەین لەبەرئەوەی: "جەخت كردن لەسەر سوڕانەوەی زەوی خیانەتێكی ترسناكە و بە دەست تێكەڵكردن لەگەڵ دوژمنی دەرەكی دادەنرێت، هەروەها سوربون لەسەر سوڕانەوەی زەوی دژایەتی بەرژەوەندی میللەت دەكات و ئەوانەی دەڵێن زەوی دەسوڕێتەوە بەختیاری میللەت و هیوای خۆشگوزەرانی بەرەو نادیار دەبەن بۆیە ئەو كەس و دەزگایانە سزای قورس دەدرێن و سەری ئەو كەسانەش دەقرتێنرێ كە دەڵێن "زەوی دەسوڕێتەوە".

لە بارودۆخێكی ئاوادا لێكۆڵیارانی بواری كۆمەڵگەو مێژو چۆن بیردەكەنەوەو چ هەڵوێستێك وەردەگرن و چۆن ڕەفتار دەكەن؟ لەم هەلومەرجەدا تەنها دوو ڕێگەمان هەیە: یا مل بۆ ڕێساكانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی كەچ بكەین و بڕوا بە خۆمان بهێنێن كە زەوی ناسوڕێتەوە یا سوربین لەسەر سوڕانەوەی زەوی و بەرگەی ئەنجامەكەیشی بگرین- كاتێك دەڵێین زەوی دەسوڕێتەوە وەهەم بەرهەم ناهێنین بەڵكو بەرگری لە تێزێك دەكەین هەمیشە دەتوانین لە ڕێگەی ڕوداوەكانەوە ڕاستی ئەو تێزە بسەلمێنین.

لە حاڵەتی یەکەمدا مەحاڵە زانست پێش بکەوێت بۆیە پێویستە زانست بتوانێت ڕەخنە لە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی بگرێت. ئەگەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان نەتوانن لە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی ڕەخنە بگرن ئەوا ڕێزی پێویستیان لێناگیرێت.

زانست لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی گەشە دەکات، بەڵام ئەگەر پشت بە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی ببەستین یا لە ژێر کاریگەری بمێنینەوە مەحاڵە زانست پێش بکەو ێت چونکە لە شەڕێك دەچێت پێشوەخت ئەنجامەکەی یەکلایی کرابێتەوە. ئەمجۆرە هەوڵانە بەردەوام ئایدۆلۆجیای ڕەسمی بەرهەم دەهێنێتەوە.

تەسلیم بون و لایەنگری کردن لە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دژایەتی هەمو بیرۆکەیەکی ژیانی مەدەنی دەکات لەبەرئەوەی تەنها لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی مەدەنیەت دێتە دی. بیرۆکەی مەدەنیەت بە مانای ڕەخساندنی دەرفەت دێت تا بەبێ ترس لە دادگاییکردن بە هەمو جۆرێك ڕەخنە لە سیاسەتی دەوڵەت بگیرێ. ئەم پرەنسیپە بناغەی "شارستانی ڕۆژئاوایە". تەنها بەم شێوازەی ژیان مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی دەستەبەر دەکرێ و زانستەکانیش لەم کەشوهەوایە گەشە دەکەن. ئەمەش پێویستی بە دامەزراندنی سیستمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوتۆیە لە سایەیدا ئایدولوجیای ڕەسمی سیفەتی دەزگای نەبێت.

## تێڕامانێك لەسەر "چینە باڵادەستەكانی كورد"

هەر كەسێك پێویستی بە زانست هەبێت، پیادەی دەكات، كوردیش پێویستیەكی زۆری بە زانیاری زانستی هەیە. ئەو دەوڵەتانەی حوكمی كورد دەكەن هەمو توانایەكی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی شتێكی دیاریكراو لەسەر كورد نەدركێنن چونكە یا بەڵگەنامەكانیان لەناوبردووە یا لە شوێنێك هەڵیانگرتوە بە زەحمەت دەستیان پێدەگات، بەڵام ئەو بەڵگەنامانەی ڕێگەی بڵاوكردنەوەیان پێدەدرێ بە شێوەیەك لە شێوەكان ساختەی تیاكراوە. بە شێوەیەكی گشتی ئەو لێكۆڵینەوانەی تورك ئەنجامی داوە بەشێكی زۆری سنوری ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەوڵەتی نەبەزاندووە لەبەرئەوە كارێكی ئاساییە كورد خۆی لێكۆڵینەوە لەسەر خۆی بكات.

هەر كۆمەڵگەیەك پێویستە لێكۆڵینەوەی تێرو تەسەل لەسەر ئێستاو ڕابردوی خۆی بكات. ئەو گۆڕانكارییانەی بەسەر دەزگا كۆمەڵایەتی و سیاسی و كولتورییەكانیدا هاتوە بە ڕەچاوكردنی هەلومەرجی مێژویی و ژینگەی دامەزراندن و پەرەسەندنیان پێویستە ببێتە بابەتی لێكۆڵینەوەیەكی قووڵ. هەروەها پێویستە لێكۆڵینەوە لەسەر ئەو دینەمۆ ناوەكی و كاریگەرە دەرەكیانەش بكرێ كە كاردەكاتە سەر پێشكەوتنی كۆمەڵ. لەم لێكۆڵینەوەیە هێندێك بیروبۆچون دادەڕێژین پەیوەندییان بە چینە باڵادەستەكانی كوردەوە هەیە.

## دروشم

لە توركیا بیروبۆچوونێكمان بەرگوێ دەكەوێ كە دەنگی داوەتەوە بە تایبەتی لە لای چەپی تورك ئەوەش بریتیە لە: چینە باڵادەستەكانی تورك و كورد حوكمڕانی توركیا دەكەن. بەرنامەی پارتی كرێكاری توركی و پارتی شۆڕشی نەتەوەیی دیموكراتی

له شەســتەكان و بەرنامــەی پارتــە سوسیالیســتەكان و بزوتنــەوە سیاســیەكان لــە ســاڵانی حــەفتاكان توێــژە كۆمەڵایەتیــە كوردەكــانی وەك موڵكــدارە گــەورەو شــێخ و ســەرەك خێڵەكان لەنێو چینە باڵادەستەكان پۆلێن دەكەن. بە بۆچونی من ئەم پۆلێنە هەڵەیـە. پێم وایە ئەم توێـژە كوردیانـە بـە چینـی باڵادەست وەسـف نـاكرێن لەگـەڵ ئـەوەدا كـە شـوێن و پایـەیان هەیــە لــەناو ئــەو چینانــەدا چونكــە كــاتێك بــیرو ڕۆڵ و ســەرجەم چالاكیەكانیان شیتەڵ دەكەین وەك توێژێكی بـە كرێگـیراو دەردەكـەون. هـەمان شـتیش لەسـەر نوێنـەرانی هـەردوو كـەرتی بازرگـانی و پیشەسـازی پیـادە دەبـێ، هـەروەها ئــەو كەسـانە لـە ژیـانی پیشــەییدا ســەركەوتنیان بــەدی هێنــاوە لەبەرئــەوەی نكۆڵیــان لــە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان كردوە و بوون بە توێژێكی بە كرێگیراو. ئــەم توێژانــە لــە بڕیـاردانی سیاســەتی ئــابوری و كۆمەڵایــەتی دەوڵــەتی توركیــا لــە كوردســتاندا هیــچ دەستەڵاتێكی دیاریكراویان نیە بەڵكو ئەركـەكانیان تەنـها برتییـە لـە جێبـەجێ كردنـی ئـەو بڕیارانـەی تـەعبیر لـە بەرژەوەندییـەكانی دەوڵـەتی توركیـا دەكـات و ڕێـو شـوێنی پێویست بگرنە بەر بۆ ئەوەی پرۆسەی جێبەجێكردنی ئەو بڕیارە ئاسان بكەن. ئەگەر ئەم توێژە لە ئەنجامدانی ئەركەكانیان دوانەكەون خەڵاتی مـادی و مەعنـەوی دەكرێـن، بەمشێوەیە ئاشكرا دەبێ كە بیرو ڕۆڵی ئەم توێژە كوردیانەو سەرجەم چالاكیـەكانی بـە هیچ شكلێك ناچێتە خانەی پێناسەی چینی باڵادەســتەوە، بـەڵكو دەكـرێ پێیـان بوتـرێ "چینی بەكرێگیراو".

چۆن "چینی باڵادەستی كـورد" بـوە چینێكـی بـەكرێگیراو، ڕۆڵـی ئـەم چینـە چـۆن گەشەی كردوەو ئەنجامەكانی ئەو گەشەكردنە چیە، ئــەم بابەتـە یەكێكـە لـە گرنگـترین بابــەتی مێــژوی ئــابوری و كۆمەڵایــەتی كوردســتان كــە پێویســتە لێكۆڵینــەوەی لەسەر بكرێ.

دابەشـكردن و پارچەپارچـە كردنـی كوردسـتان یەكێكـە لـە ڕەهـەندە بنەڕەتیـەكانی مێژوی كورد. ئەو دەوڵەتانەی حوكمڕانــی كوردسـتان دەكـەن هەمیشـە ئـەو توێژانـەیان شكاندوە كە بەرەنگاری دەستەڵاتیان بونەتەوە بۆیە بەردەوام هـەوڵدەدەن توێژێكـی بـە كرێگـیراوی كـورد دروسـت بكـەن. دەتوانــین بڵێـین بــە توانــاترین توێــژو دینــەمۆی

کۆمەڵگەی کوردەواری بە گشتی ئەو توێژانە بون کە ئـاڵای شۆڕشـیان هـەڵگرتبو. بـەڵام دامرکاندنەوەی شۆڕشە یەك لـە دوای یەکـەکانی کـورد بـووە مایـەی لاوازکردنـی هـێزی کۆمەڵایەتییان و توێژە بەکرێگیراوەکانیش لەبەر گەلێك هۆ بوون بە گەورەترین هـێزو نێوەندی تازەی بەرگرییان دروست کرد کەچی ئەو دەوڵەتانـەی حوکمڕانـی کوردسـتان دەکەن لە ڕێگـەی دابەشـکردن و لەبەریەکهەڵوەشـاندنەوەو پاشـان لێدانیـان نەیانهێشت ئـەو نێوەنــدە بەرگرییانــە زۆر بــەهێزتربن بــەوەش پرۆســەی لاوازکردنــی کۆمەڵگــە در ێژەی کێشاو بناغەیەکی لەباری بۆ دیاردەی نۆکەرایەتی دروستکرد.

لێرەدا پێویستە زاراوەی چین" ڕاڤە بکرێ. زاراوەی "چین" چەمکێکە پەیوەندی بە بەرهەمهێنان و خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەم هێنانەوە هەیە.

لەم سەردەمەدا دوو چینـی سـەرەکی بورجـوازی و پرۆلیتاریـا هەیـەو لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا کۆمەڵـەی وەك بیروکراتـەکان و ڕوناکبـیران و جوتیـاران و.. هتـد، بــە چینــی کۆمەڵایـەتی دانـانرێن بـەڵکو پێیـان دەوتـرێ "گـروپ" یـا "توێـژی کۆمەڵایـەتی"، واتـە توێــژی بــەکرێگیراو لــە کوردســتان چینێکــی کۆمەڵایــەتی پێکنــاهێنێت چونکــە بــە پێچەوانەی چن یە کۆمەڵایەتیە ڕاستەقینەکان خاوەنی بەهاو ڕەوشتی تایبـەت و جێگیر نیـە. بـەڵام نـەوەی نـوێ زۆر جـاران نـەك هـەر ڕەتیدەکاتـەوە وەك باووباپـیرانی ڕۆڵـی بـەکرێگیراو بگـێڕن بـەڵکو شـەرم دەکـەن نۆکەرایـەتی بکـەن. لــە تورکیـا قسـە لەسـەر "چینی تەکنوکرات" دەکەن و لەوەشـدا مەبەسـتیان توێژێکـی کۆمەڵایـەتی دیـاریکراوە. بــەڵام لەبەرئــەوەی "چینــی بــەکرێگیراو توێــژو گروپــە کۆمەڵایەتیــە جیاوازەکــان دەگرێتەوە بۆ نمونــە موڵکدارە گـەورەو شـێخ و سـەرەك خێـڵ و بازرگـان و ئـەندازیارو بیرۆکراتـە گـەورەو فەرمانبـەرو خوێندکـارو نوسـەرو ڕۆژنامـەوان و.. هتـد، لەبەرئــەوە نـاکرێ ئـەو توێـژو گروپانـە لـە تاکە توێژێکـی کۆمەڵایـەتی کۆبکرێتـەوە بۆیـە ناچـارم پێیان بڵێم "چینی بەکرێگیراو" چونکە هیچ دەروازەیـەکی دی شـك نابـەم. ئـەم چینـە هەمو ئەو کەسانە دەگرێتە کە ئامادەن دەوری بەکرێگیراو ببینن.

لە لایەکی دی تا ئێستا شـێوەی بەرهەمـهێنانی پێـش سـەرمایەداری لـە کوردسـتاندا برەوی هەیە. ئەگەرچی دینەمۆی گەشەکردنی سـەرمایەداری لـە کوردسـتان ڕێگـەنادات

قسە لەسەر چینی دەرەبەگایەتی (فیودال) بکرێ، بەڵام دەکرێ قسە لەسەر "پاشماوەی دەرەبەگایەتی" بکرێ. هەروەها پێویستە جەخت بکرێت لەسەر ئەوەی: سەرهەڵدانی دیاردەی نۆکەرایەتی نابەستڕێتەوە بە هەڵوەشانەوەی پەیوەندی دەرەبەگایەتی یا بە گەشەکردنی پەیوەندی سەرمایەدارییەوە بەڵام گەشەکردن و پەرەسەندنی لە قۆناغی بەرجەستە بونی پەیوەندی سەرمایەداریدا بووە. لە کوردستان قسەکردن لەسەر گەشەکردنی سەرمایەداری تەنها پەیوەندی بە دیاردەی سەرهەڵدانی "چینی بەکرێگیراو" هەیە.

جوگرافیای کوردستان لایەنێکی بنەڕەتی مێژوی کورد پێکدەهێنێ چونکە کوردستان دەکەوێتە ناوچەیەکی گرنگ لەسەر ڕێگەی هاتوچۆی دگیرکەران. تێپەڕبونی یەك لە دوای یەکی داگیرکەران بە خاکی کوردستانداو دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی بووە هۆی ئەوەی دەسەتەڵاتێکی نێوەندی بەهێزو جێگیر دروست نەبێ. هەروەها سامانی سروشتی کوردستان بە تایبەتی نەوت فاکتەرێکی کاریگەر بو لە دیاریکردنی چەخەری (معالم) مێژوی نوێی کوردستان.

دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەستیکرد بە گرنگیدان بە سامانی سروشتی کوردستان بەڵام ئەو گرنگیدانەی دەوڵەتی عوسمانی بە تایبەتی لە کاتی دەرکەوتنی بزوتنەوەی تورکیای گەنج (ترکیا الفتاة) بە شێوەیەکی دیاریکراو پەرەیسەند. ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بە تەواوەتی تێگەیشت کە ناتوانێ لە ناوچەی بەلقان پارێزگاری لە پێگەکانی خۆی بکات، بۆیە بڕیاریدا هێدی هێدی لە ناوچەی بەلقان بکشێتەوە. فیکری شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩) و کاریگەری لەسەر گەلانی ئوروپا کشانەوەی عوسمانیەکانی لە ناوچەی بەلقان خێراتر کرد. بەڵام ئیمپراتۆرێتی عوسمانی سەبارەت بە دەست هەلگرتن لە کوردستان و ئەرمینیاو وڵاتە عەرەبیەکان هەمان نەرمی پیشان نەدا. بەڵکو پلان و بەرنامەی دادەڕشت بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانە لە قەوارەی دەوڵەتێکدا کۆبکاتەوە، بۆیە لەو سەردەمەدا ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە قۆناغی جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەکانی خۆی بو.

له دوای جەنگی جیهانی یەکەم ململانێی ئیمپریالیزم لەسەر کوردستان توندتر بووە. ئەم ململانیەش بووە هۆی ئەوەی سەرلەنوێ کوردستان دابەش و پارچە پارچە بکرێتەوە. ئیپمریالیزمی بریتانی و کەمالیستە تورکەکان وەك دوو ململانێکاری بە توانا لەسەر دابەشکردنی کوردستان بەدیارکەوتن. ئەمجارەیان سێ لایەن بەشداری شەڕیان دەکرد، ئیمپریالیزمی بریتانی و کەمالییەکان لە لایەك، کوردیش لە لایەکی دی. هەڵبەتە هاوپەیمانی ئیمپریالیزمی بریتانی و کەمالییەکان بەهێزتر بو. پڕوپاگەندەی سیاسی و ئایدۆلۆجی سروشتی پەیوەندی ڕاستەقینەی ئەو هاوپەیمانیەی شاردبووە. لە نێوان هێندێك ڕوداوی دەستکردو هێندێك پاڵنەری ڕاستەقینە کە پەیوەندی نێوان ئەو لایەنانەی کۆنترۆڵ دەکرد جۆرە تێکەڵ کردنێك دەکرا. بەڵام داواکارییەکانی کورد لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادی نوقمی خوێن کرا. ململانێی نێوان بریتانیاو کەمالیەکان کە لەسەر گەورەترین پشکی کوردستان بو وەك ململانێ دژ بە ئیمپریالیزم وەسف دەکرا. لە ململانێی ئیمپریالیدا، ئیمپریالیزمی فرەنسی لە پاڵ دەوڵەتە ئیمپریالییەکانی دی و کۆلۆنیالیزمی عەرەب و فارس دەورێکی لاوەکی لە دابەشکردنی کوردستان وازید ەکرد. کوردستان لە ماوەیەکدا دابەش و پارچە پارچە کرا کە دروشمی مافی چارەی خۆنوسینی گەلان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی نزیك و لە باکوری ئەفریقیا خۆی سەپاندبو. بەڵام بولشەفیکی ڕوسیای سۆڤێتی نەك هەر لە پرۆسەی دابەشکردنی کوردستان هەڵوێستی تەماشاکاری هەبو بەڵکو لە لایەکی دی پشتگیریان لە کەمالیستە تورکەکان دەکرد.

ململانێ لەسەر کوردستان گرنگترین دیاردەی ڕۆژهەڵاتی نزیك بو لە ماوەی ساڵانی ١٩١٥-١٩٢٢ . لەم ماوەیەدا کەمالییەکان بۆ ئەوەی لە شەڕی دژی ئەرمەن و یۆنانیەکان لە ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٢دا پاڵپشتی کورد مسۆگەر بکەن نەرمییان بەرامبەر بە کورد دەنواندو بەڵێنیان بە کورد دەدا دوای ئەوەی سەردەکەون بەسەر کافراندا مافە نەتەوایەتییەکانیان دەدرێتێ. بە بۆچونی من ئەو بەڵێنانە ئیجرائاتێکی تاکتیکی بو چونکە دوای ئەوەی شەڕەکەیان بردەوە لە بەڵێنەکانی خۆیان پاشگەز بونەوە.

لێکۆڵینەوە لەسەر ئـەو هۆیانـەی لـە پشت پیـادەکردنی سیاسـەتی "پەرتکـە-زاڵبـە" بەرامبەر بە میللەتی کورد لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەچێتە دەرەوە. بەڵام لـە دیدی چینە باڵادەسـتەکان و لـە چوارچێـوەی دەرکـەوتنی بـیری نەتەوایـەتی و بنـەمای چینایـەتی بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی کـورد هـەوڵدەدەم ئـەوە ئاشـکرا بکـەم کـە لایەنـە پەیوەندیدارەکانی پەیوەندییە دیاریکراوەکان بوە مایەی پیادەکردنی ئەم سیاسەتە.

یـەکێك لـە ئامانجـە بنچینەییـەکانی کۆمـاری تورکیـای تـازە دروسـت بـوو، دەسـت بەسـەراگرتن و لکـاندنی کوردسـتانی بـاکور بـوو. ئەمـەش مانـای ئـەوە دەگەیـەنێ کـە کۆمـاری تـازە هێنانـەدی فیکـرو بەرنامــەی ڕێکخـراوی تورکیـای گـەنج و بزوتنـەوەی ئیتحادو تەرەقی لە سەروی کارنامەی خۆیەوە دانابو، بۆیە لە ناوەڕاستی بیستەکانەوە داواکارییــەکانی نەتــەوەی کــورد یــان نوقمــی خوێــن دەکــرد ئەگــەر لــە ڕوداوەکــانی کۆجیرییەوە دەست پێبکەین دەتوانین ئەم مێژووە بە کۆتایی سـاڵی ١٩٢٠ دەسـت نیشـان بکەین. دەستەڵاتدارانی تورکیا لە دوای شەڕەوە بە مەبەسـتی لاوازکـردن و لـەناوبردنی هێزی ئەو شۆڕشگێڕە کوردانەی داوای مافی نەتەوایەتی خۆیان دەکرد دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی پرۆسەی لـە سـێدارەکان و ڕاگواسـتنی نـاوەکی و دەرەکـی و قـەتڵوعام و لـەناوبردن بـەڵام هـەروەك دەزانـرێ ڕاپەڕینـەکانی میللـەتی کـورد و کـاتی بـەرپابونیان هاوزمان نەبون. شۆڕشەکەی شێخ سەعید لە ساڵی ١٩٢٥ بە سەرەتای بـەرگری نەتـەوەی کورد دادەنرێ و دوابەدوای ئەویش لە ساڵانی ١٩٢٧ و ١٩٣٠ تـا ١٩٣٢ و لـە ١٩٣٢ و ١٩٣٥ لـە زۆر شـوێنی کوردسـتان ڕاپـەڕین بـەرپابوو، شۆڕشـی دەرسـیمیش دوا ئەڵقـەی ئـەو ڕاپەڕینانە بوو. دەسـتەڵاتداری تورکیـا بـۆ خـامۆش کردنـی شۆڕشـی دەرسـیم پرۆسـەی قەڵاچۆکردنێکی هەمەگیریان ئەنجامدا. هەروەها ساڵانی ١٩٢٩ و ١٩٣٠ تا ١٩٣٢ لـە "زیـلان د ەرەسی" هەمان ڕێو شوێنیان گرتە بەر.

هـەر لـە هـەمان کـاتدا لـە ڕۆژهـەڵات و باشـوری کوردسـتان شـۆڕش لـە دژی کۆلۆنیالیزمی بریتانی و عەرەب و فارسی بەرپابوو.

## كوردو ڕێوشوێنی سەركوتكەرانەی دەوڵەت

لـە ســاڵانی ١٩٣٧-١٩٣٨ شۆڕشــی دەرســیمیان بــە دڕندانــەترین شــێوازی شــەڕی قـەلاچۆكردن دامركـاندەوەو هـەمو نێوەندەكـانی بـەرگری و ئـەو نێوەندانـەی ئەگــەری شۆڕشی لێدەكرا لە كوردستانی باكور لە ناویان برد. ئینجا كەوتنە ئەوەی كوردستان بە قەوارەی دەوڵەتی توركیاوە بلكێنــن. بێگومـان بـۆ هێنانـەدی ئـەم ئامانجـە ڕێگـای بـانگ كردنی كورد بۆ خزمەتی ســەربازی و بـاج وەرگرتنیـان هـەڵبژارد. بەمشـێوەیە میللـەتی كـورد لـە سەرتاسـەری كوردسـتانی بـاكور هەسـتی بـە بونــی دەوڵــەتی توركیـا دەكــرد. هــەروەها دەســتیان كــرد بــە جێبــەجێكردنی سیســتمی فــێركردنی توركــی و هــەمو شـێوازێكیان بــۆ بڵاوكردنــەوەی كولتــوری توركــی بــەكاردەهێنا و ئامــانجی ئــەو ڕێــو شـوێنانەش سـڕینەوەی ناسـنامەی كوردایـەتی و بـە تـورك كردنـی كـورد بـو. دەوڵــەتی توركیا هەر لە سەرەتای جێبەجێكردنی ئەم پرۆسەیەوە چینـە باڵادەسـتەكانی كـوردی واتە شێخ و سەرەك خێڵ و موڵكدارە گەورەكانی لە بەردەم دوڕێیانێك دانا؛ یا دەبێ بە تــەواوەتی واز لــە دابونــەریت و ناســنامەی كوردایــەتی خۆیــان بــهێنن و نكۆڵــی لــە كوردبونی خۆیان بكەن و ببنە تورك یا وەك شێخ سەعید و سەید ڕەزاو ئەوانی دی لە سێدارە دەدرێن. چینە باڵادەستەكانی كـورد ڕێگـەی سـێیەمیان لەبـەردەمدا نـەبو، بۆیـە ئەگەر بیانویستایە بە زیندوێتی بمێننەوە دەبوایە ڕێگەی تورك بون هەڵبژێرن.

دەوڵـەت تەنـها بـە شــێوازێكی نیگەتیڤانــە نكۆڵــی لــە بونــی كــورد و لــەناوبردنی ناسنامەی كوردایەتی نەئەكرد بەڵكو دەبوایە ئەو كەسانە هاوكاری دەزگاكانی هەواڵگری توركیاش بكەن و ببنە نۆكەری دەوڵــەت. تەنـها توركبـون و هەڵگەڕانـەوە لـە ناسـنامەی نەتەوایەتی بۆ كورد بەس نەبو بەڵكو پێویست بو سیخوڕیی بەسـەر ئـەو كەسانەشـەوە بكەن كە داوای مافە نەتەوایەتییەكانی كـورد دەكـەن و بـە توركبـون ڕەتدەكەنـەوە. لـە هێندێك حاڵەتدا پێویست بـوو بـە شـێوازی جۆراوجـۆر دژی "چەتـەكان" بەشـداری لـە شەڕەكانیشدا بكەن.

لەم خاڵەدا پێویستە جەخت لەسەر ڕوبەڕوبونەوەی نێوان چینە باڵادەستەکانی کوردو داواکارییەکانی دەوڵەت بکرێتەوە چونکە ئەم ڕوبەڕوبونەوەیە لە ماوەیەکدا ڕویدا کە سەرجەم نێوەندەکانی بەرگری کورد لەناوبرابوو، هەروەها نەتەوەی کوردیش بە تەواوەتی کەوتبوە ژێر بەزەیی دەوڵەتی تورکیاوە. هەڵبەتە هەڕەشەکان هەر بەدەم دەکران بۆیە ئەستەمە بەڵگەنامەیەك لەم بارەیەوە پەیدا بکرێ. یەکێك لە کارەکانی هێزەکانی ئاسایش هەڕەشەکردن بو چونکە لە لایەك بە زەبری هێز ئەنجامی دداو لایەکی دی بە هەڵڕشتنی خەڵاتی مادی و مەعنەوی بە تایبەتی لە ڕێگەی کڕینی ویژدانی کەسەکانەوە ئەنجامی دەدا ئەم شێوازە تا ئەمڕۆش پیادە دەکرێت.

لە ساڵانی چلەکاندا زۆربەی موڵکدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵەکان بوون بە نۆکەری دەوڵەت و دوژمنایەتی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردیان دەکرد.

کارێکی بە سودە جیاوازی لە نێوان توێژی شێخەکان و توێژی سەرەك خێڵ و موڵکدارە گەورەکان بکرێ. توێژی یەکەم ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کوردستان بە لایانەوە گرنگ بوو بە ئاشکرا بیروڕای خۆیان لەسەر کوردستان دەردەبڕی و هەوڵیان دەدا شتێك بۆ کوردستان بکەن، بۆیە هەمویان بەرەو پەتی سێدارە پەلکێش کران بەڵام توێژی دوەم ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە تەواوی نکۆڵیان لە کێشەی کورد کردوەو بون بە تورك. بەشداری لە ئیدعاکانی تورکیا دەکەن و ئەو کەسانە بۆ دواجار بوون بە نۆکەری دەوڵەت. ئەم پرۆسەی گۆڕانە لە ساڵانی بیستەکانەوە دەستی پێکردوە (یا لەوانەیە لە دوا ساڵەکانی تەمەنی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیەوە دەستی پێکردبێ). ئەو کەسانە لە لایەن دەوڵەتەوە بەرامبەر بە گوێڕایەڵییان و هەڵوێستی دوژمنکارانەیان لە کورد، واتە بەرامبەر بە نۆکەرایەتی کردنیان بۆ دەوڵەت خەڵات دەکران. بۆ نمونە، مستەفا کەمال کە سەرۆکی دەوڵەت و پارتی کۆماری خەلق فرقەسی بوو (ناوی پارتی گەلی کۆماری بوو لە ساڵانی ١٩٢٣-١٩٣٥ ) پلەی پارلەمانتاری بەو کەسانە دەبەخشی.

لەبەرئەوە ناتوانین شێخ سەعید بۆ نمونە لەگەڵ شێخ ئیبراهیم ئارڤاسی بەراورد بکەین. شێخ سەعید هەمو ژیانی لە پێناوی کێشەی کورد بەخت کرد و تەنانەت لە بەردەم پەتی سێدارەشدا بیری لە کوردستانێکی سەربەخۆ دەکردەوە بۆیە دوای لە

سـێدارەدانی خێزانەکـەیان دورخسـتەوە و دەسـتیان بەسـەر مـاڵ و سـامانەکەیدا گـرت. بـەڵام شـێخ ئارڤاسـی نکۆڵی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خـۆی کردبـوو، و بـرەوی بـە نـاوەرۆکی ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی دەدا بۆیـە سـەرەتا لـە لایـەن مسـتەفا کـەمال و دوای ئـەویش لـە لایـەن عیسـمەت ئینینـۆ-ەوە پاداشـتی نۆکەرایەتیەکـەی وەردەگـرت. شـێخ ئارڤاسـی لـە سـاڵانی ١٩٢٠، ١٩٢٣، ١٩٢٧، ١٩٣١، ١٩٣٥، ١٩٣٩، ١٩٤٣، ١٩٤٦ کرایـە پارلـەمانتار. لـە سە ڕوی ئەوانەشەوە ئەو کەسانە خەڵاتی دارایی جۆراوجۆر دەکران، دەوڵـەت نـەك هـەر بـواری بـەو جـۆرە شـێخانە نـەدەدا دەسـت بەسـەر خانوبـەرەی ئەرمـەن و کـوردە دورخراوەکاندا بگرن بەڵکو هانیشدەدان ئەو کارانە بکەن.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کردوە کەسانی چینە باڵادەستەکانی کورد، ئەوانـەی لـە کـاتی حکومەتی تاك حزبـی لـە تورکیـا نکۆڵییـان لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆیـان دەکـردو دەبون بە تورك و پاڵپشـتی پڕوپاگـەندەکانی دەوڵـەت و دژایـەتی نەتەوایـەتی کوردیـان دەکرد وەبون بە پارلەمانتار و بەو پلەوپایەیەش دەستەڵاتیان لـە ناوچـە ئەسـڵییەکانی خۆیان زیاتر د ەبو چونکە تا دەستەڵاتی ئەو کەسانە زیاد بکـات هێنانـەدی ئامانجـەکانی ئایدولوجیای ڕەسمی و پڕوپاگەندەکانی تەتریك کردن دەرفەتی باشتری بۆ دەڕەخسێت. تا پشتگیری مادی و مەعنەوی ئەو چالاکییانە لە لایەن دەزگاکانی هەوالگرییـەوە زیـاتر بێت پرۆسەی نکۆڵی کردن لە بونی میللەتی کـورد و تایبەتمەندییـە نەتەوایەتییـەکانی چڕتر دەبێتەوە.

جێبـەجێکردن و سەرخستنی ئـەو پرۆسـەیە گرنگـی زۆری بـۆ دەوڵـەت هەیـە. بـۆ نمونە کاتێك دەوڵەت شێخێك بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ دەیکات بە ئەندامی ڕێکخراوێکی نـهێنی ئیـتر پێویسـتی بـەوە نامێنـێ بایـەخ بـە دەیـان هـەزار کـەس بـدات لەبەرئـەوەی فرمانـەکانی شـێخ لـە ناوچەکـەی خۆیـدا حوکمـی یاسـای هەیـە. لەسـەر هـەمان شـێوازی دەوڵەت پێویستی بەوەش نامێنێ وانەی پڕەنسیپەکانی ئایدولۆجیای ڕەسمی بە خـەڵکی بڵێتـەوە چونکـە بـە پێـی پەیوەندییـە کلاسـیکییەکان شـێخ دەبێتـە چـاودێر بـە سـەر ڕەفتاری ڕەعیەتەوە هەروەها خودی شـێخ لـە ڕێگـەی وتـاری ئاینیـەوە پرەنسـیپەکانی ئایدولوجیای ڕەسمی بە خەڵکی دەڵێتـەوە. هـەر خـودی شـێخ گرەنتـی بـە دەوڵـەت دەدا

هەڵوێست و ڕەفتاری دەستوپێوەندەکانی لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی یەکانگیر بکات. هەمان شت لەسەر دەزگای سەرەك خێڵ و موڵکدارە گەورەکان پیادە دەبێت. ئەو دیاردانە بە درێژایی حوکمی کەمال ئەتاتورك لە چلەکانەوە زۆر بە وشیاری و وریای و ڕێکوپێکی جێبەجێ دەکرا.

بۆچی دەزگا کلاسیکیەکانی وەك دەزگای موڵکدارە گەورەو سەرەك خێڵ و شێخەکان تا ئێستا ماونەتەوە؟ چۆن تا ئەمڕۆ ئەو دەزگا فیودالی و کۆنەپەرست و دواکەوتووانە بەرگەی هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەیان گرتوە؟ پێم وایە مەسەلەی کورد هۆی سەرەکی مانەوەی ئەو دەزگایانەیە. کەمالییەکان یا ڕەنگە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەیانەوێ ئەو دەزگایانە بمێننەوەو هەموو هەوڵ و کۆششەکانیان لە پێناوی مانەوەی کاریگەری ئەو دەزگایانە دەخەنە گەڕو لە ڕێگەی تواناکانیانەوە کە بە پێی کات و شوێن دەگۆڕێ دەوڵەت بەردەوامبونی ئەو دەزگایانە دابین دەکات. هەڵوەشانەوەی ئەو دەزگایانەو گەشەسەندنی پرۆسەی دیموکراسی وا لە مرۆڤی کورد دەکات زووتر لە ناسنامەی نەتەوایەتی تێبگات و داوای مافە نەتەوایەتییەکانی بکات و بارودۆخی خۆی لەگەڵ بارودۆخی گەلانی دی بەراورد بکات و دواکەوتویی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی ئاشکرا بکات. بۆ ئەوەی ئەم ئاراستەیە هان نەدرێ ئایدۆلۆجیای ڕەسمی هەوڵدەدا کاری گەری بەردەوامبونی ئەو دەزگا کۆنەپەرستانەیە بپارێزێت. دەزگای پاسەوانی گوند لە ناوچەی هەکاری بەهێزترین دەزگایە لەبەرئەوەی هێشتا نەزمی خێڵەکی لەم ناوچەیە زۆر بەهێزەو سەرەك خێڵێك زۆر بە ئاسانی دەتوانێ ئەندامانی خێڵەکەی بۆ چەك هەڵگرتن و پاسەوانی گو ند ڕازی بکات بۆیە دەوڵەت سەرەك خێڵێکی بەسە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ و بیکات بە نۆکەری خۆی.

ئەگەر ئەو دیوی ئەم دیاردەیە وێنا بکەین: نەزمی خێڵەکی لەبەر یەك هەڵبوەشێتەوەو پرۆسەی دیموکراسی گەشەیەکی خێرا بکات و پەیوەندییە کلاسیکییەکانی نێوان شێخ و دەست و پێوەندەکانی لاوازبێ. پەیوەندی نێوان موڵکدارە گەورەکان و کۆیلەکانی بچڕی و هێدی هێدی کاریگەری ئەم دەزگایانەش نەمێنێ، لەم حاڵەتە خەڵکی بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بیردەکەنەوە نەك بە پێی

بەرژەوەندییەکانی سەرەك خێڵ و موڵکدارە گەورەکان و هەر لەسەر ئەو بنەمایەش هەڵوێست و ڕەفتاری تازە وەردەگرن بۆیە لەم حاڵەتەدا هەرگیز دەزگای پاسەوانی گوند بەم ئاسانیە دروست نابێت.

لە سەرەوە ئەو پرسیارەم کردوە، بۆچی تا ئێستا دەزگا فیودالەکان ماونەتەوە و ئەوەشم ڕونکردۆتەوە کە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە بە شێوەیەکی توندوتۆڵ پەیوەندی بە مەسەلەی کوردەوە هەیە، هەروەها قەدەغەکردنی زمانی کوردی هۆیەکی سەرەکی بەردەوامبونی ئەو دەزگایانەیە. چۆن مرۆڤی کورد بە قەدەغەکردنی زمانەکەی دەتوانێت پەیوەندی ڕەسمی لەگەڵ دەستەڵاتدارانی ئیداری و بنکەکانی جەندرمەو پۆلیس ببەستێ؟ ئەو پەیوەندییە تەنها لە ڕێگەی کەسی سێیەمەوە دەبەسترێت کە شارەزای لە زمانی تورکی هەبێت. بەڵام چ کەسێك لە ساڵانی یەکەمی دروستبونی کۆماری تورکیاو تەنانەت لە ساڵانی پەنجاکانیش واتە لە سەردەمی حکومەتی تاك حزبیدا زمانی تورکی دەزانی؟ جگە لە سەرەك خێڵ و شێخەکان کەسی دی زمانی تورکی نازانێ چ جای کوردە ساکارەکان. بەمشێوەیە ئەگەر کەسێك مامەڵەیەکی ڕەسمی لەگەڵ ئیدارەی تۆمارگەی زەویوزار، نوسینگەی باج، نوسینگەی تۆمارکردنی داوانامە، پۆلیس، جەندرمە، داواکاری گشتی و دادگا یا لەگەڵ دادوەرەکاندا هەبوایە پەنای بۆ ئەو کەسانە دەبرد.

شێخ و موڵکدارە گەورەکان سەرباری ئەرکە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانیان بە هۆی شارەزاییان لە زمانی تورکی لە نێوان دەوڵەت و میللەت دەوری میانەگەرییان دەبینی. "خەمت نەبێ، لەلای داواکاری گشتی باسی کێشەکەتم کردوە"، "کێشەکەت دەخەمە بەردەمی ئیدارەی تۆمارگەی زەویوزارو قسە لەگەڵ پشکنەر (مفتش) دەکەم و چارەسەرێك بۆ کێشەکەت دەدۆزمەوە"، "ئەگەر ڕۆژێك سەردانی سەرۆکی نوسینگەی تۆمارگە بکەم لە چەند چرکەیەکدا کێشەکەت جێبەجێ دەکەم و لە ئێستاوە وابزانە مەسەلەکەت چارەسەر کراوە". ئەم کارەی موڵکدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵەکان ئەنجامی لەبەرچاوی بەدەست هێنا چونکە ئەو کەسانە میللەتیان بە دەزگاکانی دەوڵەت دەبەستەوە و کێشەو ماندبونی نەزانینی زمانی تورکیشیان لە کۆڵ میللەت دەکردەوە،

هــەروەها ئـــەو دەزگایانـــە دەوری بنـــەڕەتیان لـــە بڵاوکردنـــەوەی ئایدۆلۆجیـــای ڕەسمی دەبینی.

بەڵام ئەو کەسانە هیچ کات ڕاستی کێشەی کوردە هـەژارەکانیان بـە دەسـتەڵاتدارانی تورکیـا نەدەگـەیاند چونکـە لەلایـەك شـارەزایی تـەواویان لـە زمـانی تورکـی نـەبو، لـە لایــەکی دی بــە ئەنقەســت ڕاســـتگۆیانە ڕەفتاریـــان نـــەدەکرد بـــە تایبـــەتی کـــاتێك بەرژەوەندییە تا یبەتیەکانی خۆیان لەبەرچاو دەگرت. کاتێك لە ئیدارەی جیاکردنەوەی زەویــوزارو تۆمــارکردنی دەوری دەبینـــی، بـــۆ نمونـــە دەیـــانتوانی ڕووبـــەری زەوی و خانوبـەرەکانی خۆیـــان زیادبکـەن. دەوڵـەت ئـەو جـۆرە کـارە نایاسـاییانەی پشـتگوێ دەخستو بەرهەڵستی ئەو یاریکردنەی نەدەکرد کە بە ماڵ و موڵکی خەڵکییەوە دەکرا چونکـە ئـەو کەسـانەی سـەرپێچیان دەکـرد بـە هـۆی بـەرزی پلەوپایـەی کۆمەڵایـەتییان برەویان بە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەدا. بەمشێوەیە دەوڵەت دەسـتی لەگـەڵ ئـەو کەسـانە تێکەڵ دەکرد.

مەبەسـت و ئامـانجی سـەرۆکی دەوڵـەت لـەناوبردنی بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشـتمانی کورد بوو. ئەمەش تاکـە سیاسـەتی دەوڵەتـە. حکومـەت هـەمو هـەوڵێکی خـۆی بـۆ ئـەم بابەتە دەخاتە گەڕ.

سـەبارەت بـە حکومـەت ئـەم سیاسـەتە خەسـڵەتێکی جـەبری لـە خـۆی دەگـرێ. لەبەرئەوەی دەزگای شێخەکان لە چوارچێوەی پرەنسیپی نێونەتەوەیی ئیسلامدا توانای لاوازکردنـی بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشـتمانی کـوردی هەیـە بۆیـە ئـەم دەزگایـە لـە چوارچێوەی ئایدولۆجیای ڕەسمی دەوڵەت بایـەخێکی گـەورەی پـەیداکردوە. لەبەرئـەوە دەوڵەت پارێزگاری لەم دەزگایە دەکات. هەروەها دەزگای سـەرەك خێـڵ لـە چوارچێـوەی سیسـتمێکی هـەرەمی دیـاریکراودا میکـانیزمی فرمـان دەرکـردن و بـە گـوێ کردنیـان چالاكو دەسـتەبەر دەکـات هـەروەها لـە چوارچێـوەی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی نـاوخۆی خێڵیشـدا بـە ئاسـانی ئاراسـتەیەکی دیـاریکراو بەسـەر تاکـەکان دا دەسـەپێنرێ چونکـە پـەیوەندی خزمایـەتی حوکمـی سیسـتمی خێـڵ دەکـات بۆیـە کارئاسـانی لـە هێنانەدی ئەو ئا راستەیە دەکات. ئەمە لە کاتێکدا سروشتی پـەیوەندی نێـوان موڵکدارو

دەستوپێوەندەکانی ستەمێکی ئابوری و کۆمەڵایەتی ئەوتۆی لێدەکەوێتەوە کە ڕێگـە لـە ڕەعیەت و جوتیارەکان دەگرێت بە ئازادی بیربکەنەوەو بە ئازادی کاربکەن.

دەزگاکـانی شـێخ و سـەرەك خێـڵ گرنگییـەکی سـەرەکی لـە بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشتمانی کوردا هەیە، کەواتە بۆ ئـەوەی خـەباتی ڕزگـاری نیشـتمانی کـورد سـەرکەوتن بەدەسـت بـهێنێ، پێویسـتە ئـەو دوو دەزگایـە بـەلای خۆیـدا ڕابکێشـێ یـا کـار بـۆ لەناوبردنیان بکات.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو پەیوەندییانەی لە سەرەوە باسمان کردوە دەتوانین تا ڕادەیـەکی گـەورە بـەپێی کـات و شـوێن هەڵوێستی جیـاواز وەربگریـن. پێویسـتە ئـەم هەڵوێسـتە ئاشکراو یەکلایی کەرەوە بێ. لەوانەیە ڕاکێشانی ئەو دەزگایانـە لـە ماوەیـەکی کـورت دا ئەنجامی باش بەدی بهێنێ بـەڵام دەبـێ کـاری جیـدی بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو دەزگا کۆنەپەرستی و دواکەوتوانەیە بکرێ لەبەرئەوەی دەوڵەت زۆر بە ئاسـانی دەتوانـێ کـار لـەم دەزگایانـە بکـات و بـەلای خۆیـدا ڕایبکێشـێ چونکـە دەوڵـەت هـەمو ئـامرازێکی پێویستی لـە بەردەسـتدایە. بـۆ ئـەوەی ویژدانـی ئـەو کەسـانە بکڕێـت و بیانکـات بـە دەزگایـەك لـە دەزگاکـانی دەوڵـەت. لاوازکـردن و لـەناوبردنی ئـەو دەزگایانـە گـەلێك خاسیەتی هەیە کە لە ماوەیەکی دوردا پەرەسەندنی پـەیوەندی کۆمەڵایـەتی دروسـت و ئەنجامی گرنگ بۆ فراوانکردنی ئاستی پرۆسـەی گەشەسـەندنی دیموکراسـی دەسـتەبەر دەکـات. لەبەرئـەوەی ئـەو دەزگایانـە بـەبێ دوودڵـی کۆسـپ لـە بـەردەم پرۆسـەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا دروستدەکەن.

دەرکەوتنی چینێکی بەکرێگیراوی دەوڵەمەند کـە نکوڵـی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆی دەکات و بانگی ڕزگاری نیشـتمانی کـورد بـە تـاوان دادەنـێ و خیانـەت لـە کێشـەی نەتەوایەتی دەکات دیاردەیەکی پڕ بایەخە. ئـەم دیاردەیـە بـە تەنـها کوردسـتانی بـاکور ناگرێتـەوە بـەڵکو لـە هـەمو پارچـەکانی کوردسـتان بـەدی دەکـرێ. ئـەو دیاردەیـە ڕەنگدانەوەی گۆڕانێکی مێژویی بنەڕەتییە.

# گۆڕانكارییەكانی بونیادی چینە كۆمەڵایەتییەكانی كوردستان لە سەدەی نۆزدەهەمدا

پێویستە پێكهاتەی ئابوری و كۆمەڵایەتی كوردستان لە كاتە جیاوازەكاندا شیبكرێتەوە بۆ نمونە كوردستان لە قۆناغی پێش ئیسلام و گۆڕانكارییەكانی ئەو قۆناغەو ئەو بونیادەی لە كاتی شالاوی توركە ئۆغۆزەكان دروست بو، ئەو گۆڕانكارییانەی دواتر بە سەریدا هاتووە، سەردەمی سەلجوقیەكان و ماوەی حوكمڕانی ئیمپراتۆرێتی فارسی.. هتد، دەكرێ لەسەر بنەمای كۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی لێكۆڵینەوەی سەربەخۆ بكەین.

كاتێك لێكۆڵینەوە لەسەردەمە جیاوازەكان دەكەین پێویستە هیچ خەسڵەتێك لە خەسڵەتە تایبەتییەكانی بونیادی كۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی فەرامۆش نەكەین.

دەرەبەگایەتی كلاسیكی ئوروپی و دەرەبەگایەتی ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامی بە تایبەتی دەرەبەگایەتی كورد-ئیسلام جیاوازیی لەبەرچاویان هەیە. لە حاڵەتی یەكەمدا ئەركی كنیسە جیاوازی لەگەڵ ئەركی دەرەبەگەكان یا دەزگا فیودالەكاندا هەیەو ئەركەكانی پەیوەندی بەرهەمهێنان و ئەركە ئاینیەكان لە دەستی تاكە كەسێك كۆنابێتەوە. بەڵام لە حاڵەتی دەرەبەگایەتی كورد- ئیسلام دا ئەركە ئاینیەكان و ئەركەكانی پەیوەندی بەرهەمهێنان لە دەستی تاكە كەسێك كۆدەبێتەوە. لە كوردستان میر لە ئەركە ئاینیەكانیش بەرپرسیارە بۆیە دەبینین هەردوو دەزگای شێخ و سەرەك خێڵ لە دەستی تا كە كەسێك دا كۆدەبێتەوە.

ئەو كەسانە بەناوی یەزدانەوە كاروباری ئاینی بەڕێوەدەبەن و ڕۆژانی هەینی پێشنوێژی دەكەن لە مزگەوتەكاندا یا كەسێك لە جیاتی خۆیان بۆ پێشنوێژی دادەنێن‌و لە سەر ڕووی زەمین نوێنەرایەتی یەزدان دەكەن. لەبەرئەوەی جیاوازی لە نێوان ئەركی كنیسە و ئەركی دەرەبەگەكان دا هەیە بۆیە زۆر جاران كنیسە وەك دەزگایەك پاساو بۆ پەیوەندی بەرهەمهێنان ناهێنێتەوە. لە ڕۆژئاوا لە كاتی هەڵوەشانەوەو

داڕوخانی سیستمی دەرەبەگایەتی کنیسە بە بیانوی بەردەوامبون و بەرگریکردن لە سیستمی دەرەبەگایەتی وەك باشترین سیستەم نە هەڵوێستی وەرگرت و نە داوای مانەوەی هەتا هەتایی بۆ کرد. بەڵام لەبەرئەوەی دەزگا ئاینیەکان لە سایەی سیستمی دەرەبەگایەتی ڕۆژهەلاتی و ئیسلامی ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر سەرپەرشتی میر یا گەورە فیودالەکانی دی بۆیە ئایین بەردەوام بەرامبەر گەشەسەندنی پەیوەندی بەرهەمهێنانی پێشکەوتوتر دەوری کۆنەپارێزی وازیدەکات. ئاین هەمیشە هەوڵدەدا پاساو بۆ سیستمی دەرەبەگایەتی بهێنێتەوە. لە ئوروپا جیاکردنەوەی کنیسەو دەرەبەگ گواستنەوەی سیستمی دەرەبەگایەتی خێراتر کرد، ئەمە لە کاتێکدا تێکەڵبوونی ئەو دوو سیستمە بوە هۆی درێژبونەوەی تەمەنی دەرەبەگایەتی کورد- ئیسلامدا.

لە کوردستان خێڵ یەکەیەکی سەربەخۆیە. بەڵام مێژوی ئەو خێڵانە پڕە لە ملکەچی بۆ ئەو میرەی دەکەوتنە ژێر دەستەلاتییەوەو دەبون بە بەشێك لە ناوچەی ژێردەستەلاتی (میرایەتی). میر دەستەلاتی لە ئەرکی سەرەك خێڵی یا لە ئەرکی پێشەوای ئاینی وەردەگرێت. میر بە پێی نوسراوێك (بۆ نمونە لە دەستەلاتدارانی عەباسی یا فارسی یا عوسمانی) دەستەلاتی ئەوەی پێدەدرێ سود لە ناوچەیەك وەربگرێت بەڵام ئەو سودوەرگرتنە بە مانای تەواوی وشە مافی خاوەندارێتی ناگرێتەوە بەڵکو مافی سەرپەرشتی تەواوی زەوییەکان دەگرێتەوە. ئەو مافەش بە میراتی لە دوای خۆی بۆ منالەکانی دەمێنێتەوە. ئەو میرەی مافی سەرپەرشتی کردنی زەوی نەبوایە لە ڕێگەی باج و دەیەك وەرگرتن دەستەلاتی خۆی دەسەپاند.

دەستەلاتی میر لە ناوچەکەی خۆی هاوتای دەستەلاتی حکومەتێکی سەربەخۆ بوو. میر لەبەرئەوەی ئەرکی سیاسی و ئایینی بەرفراوانی هەبو پێویستی بە زیادکردنی ڕوبەری موڵکەکانی خۆی نەبوو.

بە شێوەیەکی گشتی باروودۆخی کوردستان تا سەدەی نۆزدەهەم بەمشێوەیە بو. بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەم گۆڕانکاری گرنگ بەسەر بونیادی چینە کۆمەڵایەتیەکاندا هات. لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا شەڕێکی توند لە نێوان کوردو ئیپمراتۆرێتی عوسمانی هەڵایسا.

دەوڵـەتی عوسمـانی دوای ئـەوەی تێگەیشت ئەسـتەمە پێگـەکانی لەناوچـەی بـەلقان بپـارێزێت برپـاریدا هێـدی هێـدی بکشـێتەوە لەبەرئـەوە بـە دوای ڕێگەیـەك دەگـەڕا یارمەتی بدات شوێن پێی لە هەرێمەکانی کوردستان و ئـەرمینیاو وڵاتـە عەرەبیـەکان و ئـەنادۆڵ قـایم بکـات، هـەروەها دەیویسـت بـە شـێوەیەکی ئۆرگـانی کوردسـتان بـە ئیمپراتۆرێتی عوسمانییەوە بلکێنێت. ئیمپراتۆرێتی عوسمانی دەیویست لە ڕێگـەی بـاج وەرگرتن و سەربازگیرییەوە بەم ئاما نجەی بگات. دەوڵەت بێشومار پەلاماری کوردستانی دەداو ئەو پەلامارانەشی پەرچـەکردارێکی تونـدی لـەلای کـورد وروژانـد کـە بـووە هـۆی ئەوەی گەلێك شەڕی خوێناوی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە نێوان هەردولا هەڵگیرسێت. دەرەبەگـە کوردەکـان کـە زۆربەشـیان سـەرەك خێـڵ بـون سـەرکردایەتی شـەڕەکانیان دەکـردو چینـی ئورسـتوکراتی کـورد لـەو شـەڕانەدا پشـتگیری لـە دەرەبەگـەکان دەکـرد. سـەرکردایەتی کردنـی دەزگـای دەرەبەگایـەتی بـە مـیراتی لـە باوکـەوە بـۆ کوردەکـانی دەمایەوەو لە نێـوان دەوڵـەتی عوسمـانی و فارسـیدا نیمچـە سـەربەخۆییەکیان هـەبو، و ڕادەی سەربەخۆ ییان بە پێی سروشتی "حکومەتە کوردییەکە" و ڕوبەری ناوچـەکانی ژێر دەستەڵاتیان و ناوچەکانی سەربە حوکمڕانیەکـەیان حیسـابی بـۆ دەکـرا. بـە گشـتی سەرجەم تەشکیلاتەکانی کوردستان سەربەخۆییەکی ناوخۆییان هەبو. لەناوبردنی ئـەو تەشکیلاتە سەربەخۆیانەو لکاندنیان بە قەوارەی دە وڵەتەوە ئامانجی دەوڵەتی عوسمانی بو. شەڕو دورخستنەوەو لە سێدارەدان کە ماوەیـەکی دورو درێـژ بـەردەوام بـۆ جێگـەی بـە چینـە باڵادەسـتەکانی کـورد لـەفکرد، واتـە بـە گشـتی دەسـتەڵاتی سـەرەك خێـڵ و دەرەبەگەکانی لاوازکرد. جەنەراڵی ئەڵمانی (مۆلتکە- Molthka) کە لەو سـەردەمەدا بـۆ خزمەتکردنی سوپای عوسمانی بانگ کرابو. لە کتێبەکەیدا بـە نـاوی "چـەند نامەیـەك لە بارەی هەلومەرج و ڕوداوەکانی تورکیا لە ساڵانی ١٨٣٥-١٨٣٩" بەشێك لەو شەڕانە باس دەکات کە ڕێگەی ئەوەمان پێدەدات لێکۆڵینەوە لەسـەر هێندێك لایـەنی گرنگـی بکـەین ساڵانێکی دورودرێژ لە دورخستنەوەو زەوتکردنی ماڵ و موڵکی دەرەبەگەکان کەسانێکی تازەی دروستکرد بۆ ئەوەی بە ئەرکی میرایەتی هەستن و ئەو کەلێنەش پڕبکەنەوە کـە دەرەبەگەکان بەجێیان هێشتبو. ئەو کەسانە یـا لـەلای مـیر کاریـان دەکـرد یـا لـە کەسـە

نزیکەکانی میر بون. ئەو کەسانە سەرەتا زەویوزاری نەیارانی دەوڵەتی عوسمانییان داگیر کرد، وەك ئەو سەرەك خێڵانەی دەوڵەت دوری خستبونەوە یا ئەوانەی لە کاتی شەڕەکاندا کوژرابون یا لە سێدارە درابون- ئەوانە سودیان لە شەڕی نێوان میرو عوسمانیەکان وەرگرت. بەمشێوەیە ئەو ئاغایانە دەرکەوتن کە میانەیان لەگەڵ میر خۆش نەبو. ئەگەر میر نوێنەرایەتی چینی ئۆروستۆکراتی خانوبەرەی دەکردو ئەسڵی ئاغاکانیش بۆ کەرتی بازرگانی و کشتوکاڵی و ئاژەڵداری دەگەڕێتەوە. ئەو کەسەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ ئاغا پێشتر وەرزێرێکی میر یا بازرگانێکی بچوك بوەو لە سنوری دەست ەڵاتی میر کاری دەکرد یا ئاژەڵداریی دەکرد. مێژوی ئەو ئاغایانە لە ١٥٠-١٦٠ ساڵ تێناپەڕێت. مێژووی ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردستان پێویستی بە شیکردنەوەی کەوتنی توێژی میرو سەرهەڵدانی توێژی ئاغا هەیە.

لە ساڵی ١٨٤٨ بە مەبەستی لەناوبردنی بونیادی تەشکیلاتە نیمچە سەربەخۆکانی کوردستان لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی بیر لە دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی دەکرایەوە، واتە تەنها هەنگاوێکی ئیداری بوو تا بە ڕێگەیەکی ئاسانتر بەو ئامانجە بگەن. بە پێی بەڵگەنامەکانی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی ئەو دەوڵەتە نزیکەی (٢٠) ساڵ بەردەوام بووە. هەروەها یاسای ساڵی ١٨٥٨ی خانوبەرەی عوسمانی هەمان ئامانجی هەبوە. بۆیە پێویست بوو دوای لەناوبردنی ئەو تەشکیلاتە نیمچە سەربەخۆییانەی کوردستان سیستمی عوسمانی لە کوردستان پیادەبکرێ و هەرێمەکەش بە قەوارەی دەوڵەتی عوسمانییەوە بلکێنرێت.

تا دەستەڵاتی ئاغاکان بەهێزتر بوایە دەستەڵاتی دەرەبەگەکانیش هێدی هێدی لاوازتر دەبو. دەوڵەتی عوسمانی لە یەك کاتدا هەم لە دژی دەستەڵاتی سەرەك خێڵەکان پشتگیری لە ئاغاکان دەکردو هەم ڕێوشوێنی پێویستی دەگرتە بەر بۆ ئەوەی زیاتر ئاغاکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. کۆلۆنیالیزمی عوسمانی و فارسی لە گشت پارچەکانی کوردستان هەمان سیاسەتیان پیادە دەکرد. لە ڕێگەی شەڕو لە سێدارەدان و دورخستنەوە هێزی بەرگری کوردستانیان لەناودەبردو هەوڵیاندەدا ئەو کەسە تازانەش کۆنترۆڵ بکەن کە دەیانویست جێگەیان بگرنەوە. بەمشێوەیە جارێکی دی دەستیان

كردەوە بە پیادەكردنی سیاسەتی "پەرتكە-زاڵبە" و لە نێوان ئاغاو سەرەك خێڵەكاندا دژایەتییان دەخولقاند و هەموو توانایەكی خۆیان بۆ لەناوبردنی كاریگەری سەركردە بەهێزەكانی كوردستان دەخستەگەڕ. دروستكردنی سوارەی حەمیدی لە ساڵی ١٨٩١ یەكێكە لە خەسڵەتە دیارەكانی سیاسەتی "پەرتكە- زاڵبە"، چونكە دروستكردنی سوارەی حەمیدی لەلایەك ناكۆكی نێوان كوردو ئەرمەنی قوڵ دەكردەوەو لە لایەكی دی ناكۆكی نێوان كوردو كورد قوڵتر دەبووە. سوارەی حەمیدی بە سەركردایەتی سەرەك خێڵەكانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی و موڵكدارە گەورە تازە پێگەیشتوەكان دروست بو، ئەو كەسانەی هەنگاویان دەنا بۆ ئەوەی سەرلەنوێ شوێن پێی خۆیان قایم بكەن.

بونیادی چینەكانی كوردستان لەو ماوەیەدا بە شێوەیەكی هەست پێكراو گۆڕانكاری بەسەرا هات. لە چلەكانی سەدەی بیستەم نیشانەی لەناوچونی یەكجارەكی دەستەڵاتی چینە باڵادەستەكانی كورد بەدیاركەوت. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم موڵكدارەكان بیریان لە گێڕانەوەی دەستەڵاتی خۆیان دەكردەوەو بۆ ئەم مەبەستە خێزانی ئەو سەرەك خێڵانەی دژایەتی دەوڵەتی عوسمانیان دەكردو بە "خێزانە فەرمانڕەوا كان" ناسرابون لایەنگیرییان لە تێڕوانینی موڵكدارەكان دەكرد.

لە سەرەتای سەدەی بیست و لە ماوەی ململانێی دابەشكردنی ئیمپریالییانەی كوردستان و لە دوای ئیمزاكردنی پەیمانی لۆزان ئەو خێزانانە شۆڕشیان هەڵگیرساندو داوای مافە نەتەوایەتیەكانی كوردیان دەكرد. دامركاندنەوەی ڕاپەڕین و لەناوبردنی نێوەندەكانی بەرگری كورد بەسەرەتای قۆناغی ڕوبەڕوبونەوە دادەنرێ كە تێیدا دەوڵەتی توركیا سەركەوتنێكی گەورەی بە دەست هێناو لە هەمان كاتیشدا چینێكی بەكرێگیراوی دروست كرد بۆیە هەرگیز بە توێژێكی بەكرێگیراو ناوترێت "چینی باڵادەستی كورد" چونكە ئەم توێژە بانگەشە بۆ ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەكات و ڕێگە لە پەرەسەندنی بزوتنەوەی كورد دەگرێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە كوشتن و دورخستنەوەو ئەشكەنجەدان و قەلاچۆكردنی كوردا هاوكاری حكومەت دەكات.

## شێخ خزمەتی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەکات

شێخ سەیدا لە ساڵی ١٩٦٨ لە ناوچەی جزیرە دەژیا، ئەم شێخە هەمیشە بەمشـێوەیە ئامۆژگـاری پـەیڕەوانی خـۆی دەکـرد: گرنـگ ئەوەیـە مـرۆڤ موسـڵمان بێــت و برایانــە هەڵسـوکەوت بکـات بـەڵام ئـەوەی کوردایـەتی بکـات دژایــەتی ئــاینی ئیسـلام دەکـات و هەروەها لەبەرئەوەی ئێمە خۆمـان بـە ئومـەتی پێغەمبـەر دەزانـین پێغەمبـەری خـودا داوامان لێدەکات ئەو جۆرە کەسانە لە ڕیزەکانی خۆمان دەربکەین.

هەر لەو ماوەیەدا شەڕی چەکداری لە نێوان کوردو عراق هەڵایسا. خــەباتی ڕزگـاری نیشتمانی لە باشوری کوردستان کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر باکوری کوردستان هەبو، بە تایبەتی لە ناوچەی هەکاری و سێرت و ماردین و وان و گەنجان بە هەمو توانایـەکی خۆیان پشتگیرییان لەو شۆڕشە دەکرد، ئەمەش نۆبەرەی جوڵانەوەی کوردسـتانی بـاکور بـوو. ئامۆژگارییـەکانی شـێخ سـەیدا بایـەخێکی گـەورەی پـەیداکرد چونکـە ڕێگـەی لــە ڕابوونی وشیاری نەتەوایەتی کورد دەگرت. شێخ گرنگـی بـە ئیسلام و ئیسلامەتی دەدا بۆیە کاتێك شێخ جەختی لەسەر ئیسلام دەکرد مەسەلەی نەتەوایەتی گرنگی خـۆی لـە دەسـت دەدا لەبــەر ئــەوەی کـاتێك شـێخ جـەخت لەســەر دژایــەتی نێـوان ئینتمــای نەتەوایەتی و ئیسلام دەکات، دەیەوێت بە موریدەکانی بڵێـت خـوداو پێغەمبـەری خـودا دژی مەسەلەی کوردن بۆیە موسڵمان تاوان دەکـات ئەگـەر بـەرگری لـە مەسـەلەی کـورد بکـات و داوای مافـە نەتەوایـەتی و دیموکراتیـەکانی بکـات. لەبەرئـەوەی شــێخ ســەیداو شـێخەکانی دی بـە پێـی پرەنسـیپەکانی ئایدولۆجیـای ڕەسمـی ڕەفتـار دەکـەن بـە تەنــها دژایەتی ئینتمای نە تەوایەتی کورد دەکەن و بەرامبەر بە تورك و فارس و عەرەب هیچ ناڕەزاییەك دەرنابڕن و هەمو دیاردەیەکی نیگەتیڤی دی قبوڵ دەکرێت مادامەکی ڕێگـە لـە ڕابوونـی بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی کـورد دەگرێـت. بـەڵام ئـەو کەسـانە ورتـە ناکــەن ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی هەبێ بە ڕەخنەگرتن لە عیلمانییـەت وەك ئـەوەی بوتـرێ "پرەنسیپەکانی عەلمانیەت جێگەی گومانە".

پێویسته ئەم لایەنەش لەبەرچاو بگرین: ئەگەر لە نزیکەوە شێخ سەیدا بناسین ئنجا پەیوەندی توندوتۆڵی ئەو شێخەمان لەگەڵ دەزگای هەوالگری تورکیا بۆ دەردەکەوێت چونکە ئەو پەیوەندییە تەنها یەك مانای هەیە: بانگهێشت بۆ ئوممەی ئیسلامی لە هەمان کاتدا بانگهێشتە بۆ ئایدولوجیای ڕەسمی. شێخەکان بەم کارەیان هەوڵدەدەن ڕێگە لە ڕابونی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بگرن، لە بەرامبەر ئەوەشدا دەوڵەت خەڵاتی مادی و مەعنەوییان دەکات. دەوڵەت دەیەوێت شێخ کاریگەری ئابوری گەورەی هەبێت چونکە کاریگەری شێخەکان لەسەر جەماوەر زیاتر دەبێ بە زیادبونی دەستەڵاتی ئابوریيان بۆیە شێخ و دەستو پێوەندەکانی لە وەرگرتنی قەرزی بانك و وەرگرتنی مۆڵەتی کردنەوەی بەنزیخانە لە بێشترن لە خەڵکانی دی، هەروەها دەوڵەت چاویان لێدەپۆشێت ئەگەر بە شێوازێکی ناڕەواش دەست بەسەر زەویوزاری خەڵکانی دی بگرن و.. هتد.

لە دوای مردنی شێخ سەیدا نوروڵای (نورالله) کوڕی جێگەی گرتەوە بەڵام کوڕەکەی هەمان ڕێچکەی باوکی نەگرتەبەرو پەیوەندی لەگەڵ هەوالگری دەوڵەت نەبەست و فرمانەکانی دەوڵەت و حکومەتی جێبەجێ نەدەکرد شێخ نوروڵا دوای چەند ساڵێك بە ڕوداوێکی ئۆتۆمبیل گیانی لە دەستداو تا ئێستاش لایەنە نادیارەکانی ئەو ڕوداوە ئاشکرا نەبوە.

ئیلهان سەلجوق لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ "نادر ماتەر" لە بارەی پارلەمانتارانی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە دەڵێت: ".. لە کاتی فرە حزبیدا هاوسەنگییەك لە نێوان حکومەتی ئەنقەرەو سەرەك خێڵ و شێخەکان هەبوو. ئەو سەرەك خێڵ و شێخانەی نوێنەرایەتی ڕۆژهەڵات باشوری ڕۆژهەڵاتیان دەکرد هەر زوو خۆیان لەگەڵ پێداویستییەکانی ڕژێمی نوێ گونجاند. بەڵام لەسەر هەستی نەتەوایەتی و داواکارییە دیموکراتییەکانی میللەتی ناوچەی ڕۆژهەڵات قسەیان نەدەکرد. یەکێك لەو سەرەك خێڵانە لە پارلەمان نەیوت: "داوای مافە دیموکراتیەکانی میللەتە چەوساوەکەمان دەکەین"، بەڵام نەك لە پەنجاکان و شەستەکان بەڵکو تا ناوەڕاستی حەفتاکانیش شتێکی لەم بابەتەمان نەبیست ("Dun un ve bugunun defterleri en Turkiye sorunlari I, julio de 1988, Alan Yayin lari, p. 14)

شتێکی ئاساییە موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکان، ئەوانەی لە ماوەی تاك حزبیدا دامەزرابون یا ئەوانەی لە ماوەی فرە حزبیدا بە پارلەمانتار هەڵبژێران داوای مافە نەتەوایەتییەکانی کورد نەکەن چونکە ئەو کەسانە هەر لە بنەڕەتەوە نکۆڵیان لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان کردبوو، هەروەها ئەو بە کرێگیراوانە لە ناوچەکانی خۆیان کارئاسانییان بۆ سیاسەتی بە تورك بوون دەکرد و ئەمەش لە کاتی حوکمڕانی سەرۆکی پارتی گەلی کۆمار ی مستەفا کەمال ئەتاتورك و حوکمی عیسمەت ئینونو کاری پێدەکرا، هەروەها بە قۆناغی فرە حزبیشدا پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر هەمان شیرازەی پێشوی بەڕێوە دەچو، بۆیە قۆناغی فرە حزبی هێندەی سەرە دەرزییەك ئەو بارودۆخەی نەگۆڕی. چونکە دەستەڵاتدارانی تورکیا هەمیشە پشتگیری لەو پاڵێوراوانە دەکەن کە لە لایەك نکۆڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن، لە لایەکی دی بەرگری لە سیاسەتی تەتریك دەکەن.

بەڵام ئەو کەسانەی بەرگری لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن بە شێوازی جۆراوجۆر لەناو دەبرێن ئەمەش ڕاستیەکی بەڵگەنەویستە. کەمالیستەکان بناغەی پیادەکردنی سیاسەتێکی بە بەرنامەیان بۆ کوردستان داڕشتووە کە تا ئێستاش دەوڵەت هەمان سیاسەت پیادە دەکات. لە تورکیا هەر سیاسەتێك پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبێ بە بەشێك لە سیاسەتی دەوڵەت دادەنرێت. ئەم سیاسەتە لە هەمو سیاسەتەکانی تری حکومەت لە پێشترە. حکومەتەکانی تورکیا تەنها سیاسەتی دەوڵەت پیادە دەکەن، بۆیە زانینی تەنها هێندێك وردەکاری لەسەر ئەو پارلەمانتارە کوردانەی بەرگری لە مافە نەتەوایەتی و دیموکراتییەکانی خۆیان ناکەن، بەس نیە بەڵکو پێویستە هەڵوێست و ڕەفتارو ئەو هۆیانەش ڕاڤە بکەین کە وایان لێدەکات بەرگری لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان نەکەن.

ئەستەمە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو سیاسەتەی کەمالییەکان بۆ کوردستانیان داڕشتوە بەم تەفسیرە بکەین چونکە ڕاڤەکردنی زانستی هیچ ڕێگەیەکی بۆ نامێنێتەوە ئەگەر بمانەوێت لە لایەك گۆڕانکاری ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگەی کوردەواری بە میتۆدی زانستی ڕاڤە بکەین و لە لایەکی دی پاساو بۆ شکۆمەندی

کەمالیزم بهێنینەوە. بەڵام ئەو ڕوناکبیرە تورکانەی پڕوپاگەندەیان بۆ کەمالیزم دەکـرد زۆر زەحمەتە بتوانن لەگەڵ کـەمالیزمدا حساباتی خۆیـان یـەکلا بکەنـەوە. ئەگـەر بـە وردی سەرنج بدەینە هەڵوێستی ئـەو ڕوناکبیرانـە ئنجا تێدەگـەین بۆچـی بۆچونـەکانی ئیلهان سەلجوق و ئایدۆلۆجیای ڕەسمی لەسەر ڕاپەڕینی کوردەکان یەکدەگرنەوە[1](*).

لە ساڵانی یەکـەمی دامـەزراندنی کۆمـاری تورکیـا، واتـە لـە مـاوەی حوکمڕانـی تـاك حزبیـدا سـەرانی دەوڵـەت و حـزب و ڕۆژنامـەو نوسـەرانی تـورك بـەردەوام میللـەتی کوردیان بە خێڵی سەرەتایی و ئەو "کۆمەڵانـەی بـەها مرۆڤایەتییـەکان ڕەتدەکەنـەوە" نـاودەبرد و شـێخ و کوێخاکانیشـیان بـە خوێـن مـژی ئـەو کۆمەڵـە سـەرەتاییانە دادەنـا. بەهجەت کەمال یەکێکە لە نوسە رە ڕەسمییەکانی دەوڵەت بەم وشانە ئەو حاڵەتەی باس کـردوە هاوکـات لەگـەڵ ڕاگـەیاندنی پرۆسـەی چاکسـازی لـە لایـەن سـوڵتان عـەبدول مەجیدەوە لە ساڵی ١٨٣٩دا ڕیفۆرمـی (ڕێکخسـتن و ئـازادی) هەڵمـەتی بانگەشـەی کورد دەسـتی پێکـرد ئـەو ڕیفۆرمـە خـاکێکی بـە پیتـی بـۆ گەشـەکردنی لـەنێو میللـەت نەدۆزییەوە. ئەو گۆڕانکارییانەی سەرەتا لە ڕێگەی ڕیفۆرمی سیاسی و پاشان لە ڕێگەی ڕیفۆرمی دەستوری دەوڵەت (مەشروتیەت) بە ئەنجام گەیشت لەوانە بوو شێوەی ژیـانی کورد بگۆڕێت و کاریگەری و دەستەڵاتی ئاغاو دەرەبـەگ و شـێخ و کوێخاکـانیش لەسـەر ئەو خێڵە سەرەتاییانە لاواز بکات.

بیرۆکـەی کوردایـەتی لـەلای ئـەو کۆمەڵـە کەسـانەی هێشـتا لـە مانـای مرۆڤایـەتی تێنەگەیشـتوون و بونـی خـۆی لـە مشـتێك گەنمەشـامی یـا جـۆدا دەبینێتـەوەو نـازانێت مانای کۆمار چییەو لە پشت ئەو شاخەوە کە لە بناریدا دەژیت چی هەیەو ئەوانەی کە تەنیا پڕوپاگەندەی ئاییـنی دەیانبزوێنێت، ئەمەش ئەوە بوو کە ڕویدا.

ئەم ئاراستە لە مـاوەی ڕیفۆرمـی سیاسـی (ڕێکخسـتن- تـەنزیمات)دا بەرجەسـتە بـو، چونکـە شۆڕشـی کەمالییـەکان سـەپاندی بەسـەر حکومـەتداو بـە دەرکـەوت پێـش ڕاگەیاندنی سیستمی کۆماری و لەکاتی جەنگی ڕزگاری نیشتمانیدا پاشان ئەم ئاراستەیە بەسەر بونیادی سیاسی و کۆمەڵایەتی تورکیا باڵادەست بو.

کـاتێك ئاشـکرا بـو ئـازادی و سـەربەخۆی هێشـتا بـەدی نـەهاتوە بـە ئـازادی و سەربەخۆیی کوردیشەوە ئیتر ئەو کەسانەی یارییان بـە خوێـن و هـێزی کاری میللـەتی کورد کردبوو هەستیان بە دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکرد بە تایبـەتی دوای ئـەوەی مەترسـی لە دەستدانی میللەتی کوردیان بە ڕونی بۆ دەرکەوت!

**(Behcet Cemal, El jeque Said Isyani, Hisar Matbaasi 1955, P. 19Turkiye Cumhuriyeti'nde Ayaklanmalar, 1924- 1938, Hazirlayan: Em Kur- Alb. Resat Halli, Geneikrmay Bashanligi Yay, Ankara, 1972, P. 79).**

کـارێکی زۆر ئاشـکرایە مـافی نەتـەوەیی بـۆ بزوتنـەوەکانی کـورد ناسـەلمێنن چونکـە دەڵێن کورد بنـەمای نەتەوایـەتی نیـە، هـەروەها دەڵێـن: "ئـەو خێڵـە سـەرەتاییانەی لـە مانـای مرۆڤایـەتی حـاڵی نـابن" و "بونـی خۆیـان لـە مشـتێك گەنمەشـامی یـا جـۆدا دەبیننەوە" و "لە مانای کۆمار تێناگەن" و "نازانن لە پشت ئەو شاخەی لێی دەژیـن چ ڕوودەدا" و هێشتا ئاسـتی گەشەسـەندنیان نەگەیشـتۆتە ئـەو قۆناغـەی ڕێگـەی پێبـدات داوای مافە نیشـتمانییەکانی خۆیـان بکـەن، هـەروەها دەڵێـن، ئاغـاو شـێخ و دەرەبـەگ و کوێخاکـان خوێنـی ئـەو چینـە سـەرەتاییانە دەمـژن، سـەرباری ئـەوەش دەڵێـن پێویسـتە لێیان بدەین و لەسەر ڕووی زەمین نەیانهێڵین.

شـتێکی ئاشـکرایە مەبەسـتیان ئـەو ئاغـاو شـێخ و سـەرەك خێڵانەیـە کـە هەسـتی نەتەوایـەتیان هەیـەو هـەوڵدەدەن بـە خـەبات ئـەو هەسـتە دەربـڕن بۆیـە لـە لایـەن دەوڵەتو نوسەرو ڕۆژنامەکان ڕوبەڕوی شاڵاوێکی توند دەبونـەوە بـەڵام ئـەمڕۆ زۆرێـك لـە شـێخەکان لایـەنگیری لـە دەوڵـەت دەکـەن و نکۆڵییـان لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتییان کردوەو بون بە نۆکەری دەوڵەت لەبەرئەوە دەوڵەت بـە پاڵپشـتێکیان دەزانـێ بـۆ خـۆی. ئەگەر دید و بۆچونەکانی نێوان دەوڵـەت و نوسـەرو ڕۆژنامـەکانی ساڵانی بیسـتەکان و هەشتاکان بەراوردێك بکرێن هێمای زۆر گرنگ لە بـارەی سروشـتی سیسـتمی سیاسـی و کۆمەڵایەتی تورکیا ئاشکرا دەبێ.

## "دادگاییەکانی ڕۆژهەڵات" لە ١٩٧١دا

ئـەو ڕوداوانـەی سـاڵی ١٩٧١ لـە کـاتی دادگاییـەکانی ڕۆژهـەڵات لـە دیاربـەکر ڕویـاندا شایانی ئەوەیە یاد بکرێتەوە. بە درێژایی چەندین ساڵ هەفتانـە لـە شـوێنێکی ئاواڵـەدا سـەردانی زیندانیـەکان دەکـرا بـەڵام ڕیزێـك تـەلی دڕکـاوی زیندانیـەکانی جیـادەکردەوە لەوانەی دەچنە سەردانیان و ئەگەر ژمارەشیان زۆر نەبوایە ماوەی سەردانەکە لـە کـاتی دیاریکراوی خـۆی زیـاتر درێـژەی دەکێشـاو زیندانیـەکانیش دەرفـەتی ئـەوەیان پێـدەدرا لەگەڵیاندا قسە بکەن. جارێکیان برادەرێکم پێی وتم: "بـاوکی ئـەو کابرایـە لـە دەزگـای هەواڵگری کاردەکات (پۆلیسی نهێنی تورکیا- MIT) و مـامی ئـەم یـا ئـەو پـەیوەندی بـە دەزگـای هەواڵگرییـەوە هەیـە" و "خـاڵی فـلان کـەس زۆر دەمێکـە کـار لەگـەڵ دەزگـای هـەواڵگری دەکـات". هێندێـك دۆسـت و بـرادەرو ئـەندامی خـێزانی گیراوەکـان کـە لـە گرتوخانەی دیاربەکر سەردانیان دەکردن شتی لەو بابەتانەیان بۆ دەگێڕاینەوە.

ئەو پەیوەندییانە نە شانازییان پێـوە دەکـراو نـە مایـەی سـوکایەتی بـو بـەڵکو وەك شـتێکی ئاسـایی باسـی دەکـرا. لێکۆڵینـەوەی مێـژوی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کوردسـتان سـودێکی گـەورە لـەو جـۆرە پەیوەندییانـە وەردەگرێت. سـاڵانی شەسـتەکان زۆرێـك لـە ئەندامەکانی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی دیموکراتی لـە بـاکوری کوردسـتان سـەر بـە چینـی فیوداڵـەکان بـون. ئـەو کەسـانە زۆر بـە تونـدی پـەیوەندی بـاوك و باپیرانیـان لەگـەڵ دەوڵەت و حکومەتی تورکیا شەرمەزار دەکردو ئەو ڕەفتارەیان کێشـمە کێشـێکی تونـدی لەنێو خێزانەکانیان بەرپاکرد.

لەوکاتەی داوانامە لە دژی ڕێکخراوەکـانی یانـەی کولتـوری شۆڕشـگێڕ لـە ڕۆژهـەڵات بەرزدەکرایەوە شتێکی زۆر گرنگ ڕویدا. داواکـارە گشـتییە سـەربازییەکان لـە سـەرجەم بڕیارەکانیاندا نکۆڵییان لە بونـی نەتـەوەی کـورد دەکـردو جـەختیان لەسـەر تورکبونـی ئەسـڵی کـورد دەکـردو زمـانی کوردیـان بـە زاراوەیـەکی زمـانی تورکـی دادەنـا. داواکـارە گشـتییەکان سـوربون لەسـەر تاوانبـارکردنی زیندانیـەکان لەبەرئـەوەی وتویانـە ئێمـە کوردیـن. هـەر لەسـەر ئـەو بنچینەیـەش تاوانبارەکانیـان سـزا دەدا. بەمشـێوەیە دادگـا

بڕیاری خۆی دەرکردو لەسەر نکۆڵیکردن لە نەتەوەی کوردو بە تورککردنی کوردە حوکمدارەکان و نەبونی زمانی کوردی و کردنی بە زاراوەیەکی زمانی تورکی هەروەها ئەم بڕیارە دوای ئەوەی دادگای پیاچونەوەی سەربازی پەسەندیکرد سیفەتی یاسایی وەرگرت، بۆیە بە پێی ئەو بڕیارانە تورکبونی کورد بۆ یەکجارەکی دیاریکرا.

داواکارە گشتییە سەربازییەکان لە سەرجەم بڕیارەکانی تاوانبارکردن و بە بەکارهێنانی هەمان وشەو زاراوە جەخت لەسەر تاوانبار کردنی کورد دەکەن و هەمان شتیش لە دەقی بڕیاری دادگا مەدەنی و سەربازییەکاندا دوبارە دەبێتەوە، هەروەها هەمان بیروبۆچون بەڵام بە تیروتەسەلتر لە دژی یانەی کولتوری شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵات دەرکراوە.

هێندێك لە گەنجە گیراوەکان دەیانویست دژی ئەو بڕیارانە نارەزایی دەربڕن و ئەوەندەی هەلومەرجی ناو زیندان بواریان پێبدات کارێکی ڕێك و پێك بکەن بۆ ئەوەی ئیدیعاکانی دەستەڵاتدارانی تورکیا لەسەر نکوڵی کردن لە بونی نەتەوەی کورد و بە تورککردنی گەنجە حوکمدراوەکان بە درۆ بخەنەوە. ئەو گەنجانە لە نامەیەکدا بە ناونیشانی "وەڵامدانەوەی بڕیارەکانی تاوانبار کردن" سووربون لەسەر ئەو ڕاستییەی کە دەڵێت: میللەتی کورد پێش ئەوەی تورکەکان لە سەدەی یازدەهەم لە ناوچەی ئاسیای بچوکەوە بگەنە ئەنادۆڵ بە ماوەیەکی دورو درێژ لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و ئەنادۆڵ دەژیا. زمان و مێژوو شارستانی و نەریتی میللەتی کورد دەیسەلمێنێت کورد نەتەوەیەکی جیاوازەو لە نەتەوەی تورك ناچێت چونکە ئەسڵی تورك تۆرانییە بەڵام ئەسڵی کورد ئارییە.

گەنجەکان پەرچی ئەو درۆو دەلەسانەیان دەدایەوە کە دەڵێت زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆ نیە بەڵکو زاراوەیەکی تورکییە و ڕێژەی لە ٤٠٪ی تورکیەو لە ٣٠٪ عەرەبییە و لە ٢٨٪ی فارسییە ئەو ڕێژەی لە ٢٪ کە دەمێنێتەوە ئەسڵی وشەکانیان ئەرمەنی و جۆرجی و سریانی کۆنە. گەنجەکان دەیانوت ئەو ئیدیعاو قسەلۆکانە پشت بە بنەمای زانستی نابەستێ بۆیە پشتیان پێنابەسترێت و هەروەها باسی جیاوازی نێوان زمانی کوردی و تورکییان دەکرد لە ڕوی ڕێزمان و شێوەی ئاخاوتن و ڕستە

بەندییەوەو ئاماژەیان بەوەش دەکرد کـە زمـانی تورکـی دەچێتـە ڕیـزی کۆمەڵە زمـانی (ural- Altay )، لە کاتێکدا زمانی کوردی زمانێکی ئارییەو دەچێتە ڕیزی کۆمەڵـە زمـانی هیندی- ئورووپییەوە.

ئەو گەنجانە لە هاوینی ١٩٧١ لە زیندانی سەربازی شاری دیاربەکر بە هەستکردن بە ئەرك و بەرپرسیارێتی وەڵامەکەیان ئامـادە دەکـرد. کـاتێك وەڵامەکـەیان ئامـادە دەکـرد هەمو کەسێك هەستی بە پەرۆشی و دڵسـۆزییان دەکـرد. گەنجـەکان زۆربـەی کارەکـەیان لـە چێشـتخانەی زیندانەکـەدا ئـەنجامدەدا. ئـەو برادەرانـە هـەتا نیوەشـەوێکی درەنـگ کاریـان دەکـرد بـەڵام سـیخوڕەکانی نـاو زینـدان لـە کـن ئیـدارەی بەندیخانەکـە بۆیـان تێچـاندن: "ئەوانـــە هـــەتا نیوەشـــەوێکی درەنـــگ دادەنشـــین و کاردەکـــەن و کتێـــب دەخوێننـەوەو دەنوسـن و گفتوگۆ دەکـەن.."، ئیـدارەی بەندیخانـە هـەوڵیدەدا ڕێگـە لـە کارەکەیان بگرێ بۆیە هێنانی کتێب و ڕۆژنامـەیان لـە گیراوەکـان قەدەغـەکردو کەوتنـە پشـکنینی بەندیخانەکـەو دەسـتیان گـرت بسـەر هـەموو سـەرچاوەو ئـەو نوسـینەی گەنجەکان ئامادەیان کردبوو.

کـەچی سـەرەڕای ئـەو ڕێوشـوێنانەش گەنجـەکان بـەردەوام خۆیـان بـۆ وەڵامدانـەوە ئامـادە دەکـرد، بـەڵام دەزگـای هـەواڵگری (MIT) لـە ڕێگـەی کەسـوکاری گەنجەکانـەوە کۆسپێکی گەورەو سەرەکی دروست کرد چونکە کاتێك سـەردانی زیندانیـەکانیان دەکـرد پێیان دەوتن: "ئاگاداریی وەڵامی ناڕەزایی لە دژی بڕیاری حوکمەتەکەتان ئامادە دەکەن بۆیە د اواتان لێدەکەین لەو کارە پەشیمان ببنەوە".

گەنجـەکان دژی نـاوەڕۆکی بڕیـاری تاوانبـارکردن و بڕیارەکـانی دادگـا کـە داواکـاری گشتی سەربازی پشتی بەستبوو پێیانەوە بەرگرییان لـە ناسـنامەی کوردایـەتی و زمـانی کـوردی دەکـرد و ئەمەشـیان بـۆ کەسـوکارەکانیان شـیدەکردەوە بـەڵام کەسـوکاری زیندانیەکان هەستیان بە دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکردو سوربون لەسـەر ئـەوەی گەنجـەکان واز لەو پرۆژەیە بهێنن چونکە پێیان خۆش نەبو کوڕەکانیان بەشداری لەو کارەدا بکەن بۆیـە ئامۆژگارییـان دەکـردن بەهـەر شـێوەیەك بـووە وەڵامدانەوەکـە ئیمـزا نەکـەن.

هەڵوێست و ڕەوشتی خێزانەکان مشتومڕێکی زۆری دروست کرد بەڵام گەنجەکان بە هەستێکی بەرزو لێپرسراوانەوە درێژەیان بەکارەکانی خۆیان دەدا.

لە سەردانی دواتر باوك و کەسوکاری زیندانییەکان بە تین و تاوێکی دی دەگەڕانەوە: "نە بەرگری نامە بنوسن و نە قسە لەسەر کورد بکەن و پێیان مەڵێن کورد نەتەوەیەو زمانی کوردی جیاوازی لەگەڵ زمانی تورکی هەیەو مەڵێن کورد چەوساوەیە.."

جارێکی دی گەنجان نەك هەر بیروبۆچون و هەڵوێستی خۆیان بە گوێرەی پێویست شیکردەوە بەڵکو ڕەخنەشیان لە کەسوکارەکانیان دەگرت و پێیان دەوتن: "ئێوە هچیتان بۆ کورد نەکردوەو بە ژیانی کۆیلایەتی ڕازیبون". لە وەڵامدا باوکان پێیان دەوتن: "هەق بە ئێوەیە، لێتان تێدەگەین، بەڵام چ بکەین؟ پێویستە زۆر شت قبوڵ بکەین، هیچ دەستەڵاتێکمان نیە..". جارێکی دی ترس و دڵەڕاوکێی خۆیان بۆ کوڕەکانیان دوبارە کردەوە.

جارناجاریش هێندێك لە فەرمانبەرە گەورەو بچوکەکانی دەوڵەتی تورکیا، ئەوانەی کەسوکاری زیندانییەکان ڕێزیان دەگرت لێیان سەردانی گەنجەکانیان دەکردو هەوڵیان دەدا پاشگەزیان بکەنەوەو پێیان دەوتن: "سوپاس بۆ خوا کە هەمومانی بە موسڵمان و تورك دروستکردوە. جیاوازییەکان گرنگ نیە. کاتی خۆتان بەم شتانەوە بەفیڕۆ مەدەنو هەوڵبدەن بەبێ چەرمەسەری زیاتر لەم بارودۆخە ڕزگارتان بێو چێژ لە گەنجێتی خۆتان وەربگرن. داواکاری گشتی چ شتێکی پێخۆشە ئەوەی پێ بڵێن: "لە دوای هەر سەردانێك گوشاری کەسوکاری زیندانیەکان زیاتر دەبو بەڵکو هێندێك لە خێزانەکان هەوڵیاندەدا کوڕەکانیان دەم چەور بکەن: "ئەگەر واز لەم فیکرە بهێنی ئۆتۆمبیلێك یا خانویەکت بۆ دەکڕم.

کاتی ئەوەت هاتوە ژن بهێنی و خێزان پێکەوە بنێیت و ببیت بە باوك، پێویستە چێژ لە ژیان وەربگریت". بەڵام گەنجەکان بە شێوازێکی شیاو وەڵامیان دەدایەوە: "ئەو شتانە چارەسەرێکی گونجاوی مەسەلەکە ناکەن".

لـه سـەردانێکی دی باوکـان بـە کوڕەکانیــان دەوت: "وەڵامێکــی هاوبــەش پێشـکەش مەکەن و قسە لەسەر کورد مەکەن چونکە ئەگـەر بـەرگری سیاسـی لـە خۆتـان بکـەن و قسە لەسەر کورد بکەن، ئەوانیش گوندەکانی کوردستان بوردومان دەکـەن. ئێـوە دەڵێـن لە پێنــاوی کامـەرانی میللـەتی کـورد خەباتدەکـەین بـەڵام کردەوەکانتـان ئێشـوئازارێکی زیاتری لێدەکەوێتەوەو ئەوان لەسەر هەڵوێست و بیروڕاکـانی ئێـوە گوندەکـان تۆپبـاران دەکـەن. وەڵامێکـی هاوبـەش پێشـکەش مەکـەن.."، هـەر کەسـێك دەیچرپـاند بــە گوێــی کوڕەکـەی یـا خزمەکـەیدا، مادامـەکی لـە زینـدان دەمێنیتـەوە وەڵامەکـە ئیمـــزا مەکــە، پێویست ناکات خۆت لەو جۆرە کێشانە هەڵقورتێنیت با خــەڵکانی دی ئـەو کـارە بکـەن. کەسوکاری زیندانییەکان بە ترس و لەرزو دڵەڕاوکێ ئەو قسانەیان دەکرد.

سـەرەڕای ئـەو مەترسـییانەو گوشـاری کەسـوکاری زیندانییـەکان کــەچی گەنجــەکان وەڵامێکیــان لــە ١٦٧ لاپــەڕەدا بـــە ئیمـــزای خۆیـــان ئامـــادەکرد، لـــە دوای ئـــەوانیش زیندانییــەکانی دی لــە کــاتی دادگاییکردنــەکانی دی یانــەی کولتــوری شۆڕشـــگێڕ لـــە ڕۆژهەڵات هەمان ڕێوشوێنی ئەوانیان گرتەبەر وەڵامێکی دییان لە ٢٦ لاپەڕە بە ئیمزای خۆیان لە دژی بڕیارەکانی تاوانبارکردن پێشکەش کرد(٢).

(Devrinci Pogu Kultur Ocaklari Dava Dosyasi I, Komal Yayinevi, Ankara, 1975, PP. 113-277, 305-317).

ئامانجی من ئەوە نیە پرۆسەی ئامادەکردن و پێشکەش کردنـی وەڵامدانەوەیـەك لـە (١٦٧) پـەڕەدا بخەمـەڕوو، بـەڵکو کـاتێك ئـەم پرۆسـەیە دەخەمــە ڕوو دەمــەوێت باســی پــەیوەندی نێــوان ئیــدارەی گرتوخانــە بــە هاوکــاری دەزگاکــانی ئاســایش و بـــاوك و کەسوکاری هێندێك لە زیندانیـەکان بکـەم. بەمشـێوەیە ئیـدارەی گرتوخانـە کەسـوکاری زیندانیـەکانی بـۆ هێنانـەدی مەبەسـتەکانی بـەکاردەهێنا یـا ڕێگـە لـە هێندێـك ڕوداوی دیاریکراوی ناو زیندان بگرن. لەو کاتەوە خێزانەکان دەورێکی گرنگ وازیدەکەن.

بە هەڵە دەچین ئەگەر بڵێین گوشارو کاریگەری کەسوکاری زیندانییـەکان بـێ ئاکـام بوو چونکە لە کـاتی ئامـادەکردنی هـەردوو وەڵامەکـە هێندێـك لـە گەنجـەکان ئیمزایـان لەسەر نەکرد بەڵکو داواکاری تایبەتی خۆیان هەبوو بـەڵا م نـەیانتوانی ئـەو داواکارییـە پێشکەش بکەن و ناوەڕۆکی داواکەشیان ئاشکرا نەکرد.

## كودەتا سەربازییەكان دوو بواری گرنگ بۆ كاركردن هەڵدەبژێرن

لە ساڵانی سییەكانەوە گفتوگۆی گرنگ دەكرێ لەسەر ئەوەی ئایا پێویستە لە ڕۆژهەڵات ڕێگەوبان و خوێندنگە دروست بكەین؟ ئایا پێویستە ئاوی خواردنەوە بۆ ناوچەكە دابین بكرێ؟.. هتد. ئایا كردنەوەی ڕێگەوبان و دروستكردنی خوێندنگەو كارگەو دامەزراندنی تۆڕی ئاو و هێزی كارەبا بێداربوونەوەی نیشتمانی كوردەكان خێراتر دەكات؟ ئایا ئەم كردەوانە دەبێتە فاكتەری بە ئاگاهاتنەوەی ویژدانی "كوردە خەوتووەكان"؟ لە قۆناغی فەرمانڕەوایی تاك حزبیدا بە هۆی ئەم ترس و گومانەوە سەرمایەگوزاری (استثمارات) گرنگ لە ڕۆژهەڵاتی توركیا ئەنجام نەدرا. بەڵام ساڵانی پەنجاكان ئەو گفتوگۆیانە بە ڕادەیەكی كەم ئەنجامێكی دی لێكەوتەوە بۆیە دەستیان كرد بە دروستكردنی هێندێك شوێنی خزمەتگوزاری گشتی، بۆ نمونە لێدانی چەند ڕێگەوبان و دروستكردنی خوێندنگە بۆ ئەوەی ڕێگە لە بێداربوونەوەی كورد بگرن، ئەو كارەی هەمیشە پێشبینی دەكەن و لێی دەترسن، كەچی لە پاڵ ئەوەشدا دەستیان كرد بە پیادەكردنی سیاسەتی توانەوەو تەتریك كردن. هەرچەندە سیاسەتی توانەوەو تەتریك چ وەك پیادە كردن و چ وەك چەمك پێشتر هەر هەبوو بەڵام چڕترو ڕێكوپێكتر و گشتگیرتر كرا. ئەم سیاسەتە لە دوای هەر كودەتایەكی سەربازی بە مەبەستی پتەوكردن و بە زۆر پیادەكردنی سەرلەنوێ چاوی پێدا دەخشێنرێتەوە. لەمڕۆوە پێویستە دەزگای شێخ و موڵكدارە گەورەكان بە دەزگای پیادەكردنی تەتریك و تواندنەوە دابنرێت.

لە توركیا دوای هەر كودەتایەكی سەربازی دوو بابەت دەوروژێنرێ. لە لایەك گفتوگۆ لەسەر جێبەجێكردنی ڕیفۆرمی كشتوكاڵی دەكرێ، لە لایەكی دی پیادە كردنو چڕكردنەوەی سیاسەتی تواندنەوەو تەتریك كردنی خێراتر دەكەن. ئەو گفتوگۆیانەی تایبەتە بە ڕیفۆرمی كشتوكاڵی لە ڕوی پرەنسیپەوە پشت بە ناحاڵی بونێكی دیاریكراو دەبەستێ چونكە پێیان وایە ئاغاكان پشتگیری لە بزوتنەوەی كورد دەكەن و میللەت بۆ شۆڕش هاندەدەن بۆیە دژایەتی كردنی موڵكدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵەكان و

دوورخســتنەوەیان لــە وڵات و زەوتکردنـــی مـــاڵ و موڵکیـــان بـــە پێویســـت دەزانـــن. لەبەرئـەوەی کودەتـا چییــەکان پێیــان وایــە بــەم کارەیــان کاریگــەری ئـەو گروپانــەو بزوتنەوەی کورد لەناو دەبەن. لە دوای کودەتا سەربازییەکەی ١٩٦٠/٥/٢٧ لـە زانکۆکـانی تورکیـاو لەسـەر ئاسـتی پارتـە سیاسـیەکان و توویـژی زۆر لەسـەر مەسـەلەی ڕیفۆرمـــی کشتوکاڵی ئەنجام دەدرا.

هەر لەو ماوەیەدا پارتی دیموکراتـی کوردسـتان بـە سـەرکردایەتی مـەلا مسـتەفا لـە کوردسـتانی باشــور شۆڕشــی ڕزگــاری نیشـتمانی هەڵایســاند. ئــەم ڕوداوە ئەنجومــەنی ئاسایشـی نەتـەوەی تورکـی زۆر ناڕەحـەت کـرد (ئـەم ئەنجومەنـە لـە سـەرۆکی ئـەرکانی سوپاو سەرکردایەتی هەر چوار سوپاکە پێك دێت و لە دوای هەر کودەتایەکی سـەربازی شوێنی پارلەمان دەگرێتەوە). خـەباتی باشـوری کوردسـتان لـە لایـەن دانیشـتوانی وان و سێرت و ماردین و دیاربەکرو شوێنەکانی دی پشـتگیری گـەورەی لێدەکـراو خـەڵکی ئـەو ناوچانـە پیتاکیـان بـۆ بزوتنەوەکـەی باشـور کۆدەکـردەوە، بـەڵام کودەتـا چییـەکان وەك شێخ و موڵکدارێکی گەورە یا سەرۆکی خێڵی بارزان تەماشـای مـەلا مسـتەفای بارزانیـان دەکرد بۆیـ ە دەترسان بزوتنەوەیەکی لەو بابەتە لە باکوری کوردستانیش سـەرهەڵبدات، لەبەرئەوە (٤٨٥) کەسیان لە موڵکدار و شـێخ و سـەرەك خێڵـەکان گـرت و لـە ئۆردوگـای سـیواس زینـدانـی کـران و ژمارەیـەکی زۆریـان ڕوبـەڕوی ئەشـکەنجەیەکی زۆر دڵڕەقانــە بونەوە وەك دان شکاندن و لە گوهەڵکێشان و.. هتـد. لـەو ژمارەیـەش (٥٥) کەسـیان بـە تۆمـەتی ڕادیکـاڵی تونـدڕەو بـۆ ناوچـە تـورك نشـینەکانی ئەدرینـە، بالیقەسـر، ئـایدن، ساکاریا، قوتاهیاو چورو) دورخرانەوە.

ژیان و چالاکی و بـیری ئـەو خەڵکـە مشـەختانە (دورخراوانـە) و ئەوانـەی ڕێگـەیان پێدرا بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان لە لایەن دەوڵەتـەوە خرانـە ژێـر چاودێرییـەکی وردەوە. بەڵام موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکان خەڵکانێکی بە سام و هاندەری کورد و بزوێنەری بزوتنەوەی کوردایەتی نەبون بـەڵکو بـە پێچەوانـەوە ئـەو کەسـانە دەورێکـی زۆر گرنگیـان لـە بڵاوکردنـەوەی بـیروڕای دەوڵـەت و ڕێوشـوێن و پـلان و بەرنامــەکانی دەوڵـەت وازیدەکـرد، بۆیـە پێویسـتە بەدورخســتنەوە یـا زەوتکردنــی مـاڵ و موڵکیـان

هەڵنەخەڵەتێین مادامەکی لە جیاتی بەشداری و پشتگیری کردنی بزوتنەوەی کورد ڕێگە لە گەشەکردنی دەگرن، بەڵکو بڕیار درا پشتگیری لەو گروپانە بکرێ و ئاستی کاریگەری مادی و مەعنەوییان بەرزبکرێتەوە. و لەسەر هەمان بنچینەش پەیوەندی نێوان دەوڵەت و دەرەبەگ و شێخ و سەرەك خێڵەکان هێدی هێدی ڕەگی دادەکوتا. لە کۆتاییدا کودەتاچیەکان بۆ ئەوەی ئەو گروپانە ناڕەحەت نەکەن پێیان خۆش نەبو گفتوگۆ لەسەر ڕیفۆرمی کشتوکاڵی بکەن بەڵکو کاتێك شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵەکان دەگەڕانەوە بۆ گوندەکانیان سوپاس و پێزانینی خۆیان دەردەبڕی. بۆیە ناونیشانی "کودەتا سەربازییەکان دوو بواری گرنگ بۆ کارکردن هەڵدەبژێرن" ناونیشانێکی ڕاست نیە.

بەڵام بۆچی دروشمی ڕیفۆرمی کشتوکاڵی لە ١٩٦٠/٥/٢٧ خرایە سەر خشتەی کارەکان؟ پێشتر ڕونمکردۆتەوە بۆچی ئەم کێشەیە بە هەڵە بە مەسەلەی کوردەوە دەلکێنرێ. بێگومان بیروڕا ڕادیکاڵیەکانی فەرمانبەرە کەمالیستەکان دەوری خۆیان دەبینی کاتێك گفتوگۆ لەسەر ڕیفۆرمی کشتوکاڵی دەکرا. ئەو کەسانە بە خاتری بەرژەوەندی جوتیارە نەدارەکان سوربون لەسەر ئەوەی هێندێك گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بکەن. بەڵام دوای ئەوەی ڕۆڵی شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵەکان لەسەر مەسەلەی کورد و پشتگیری کردنی دەوڵەت ئاشکرابو ئەو دروشمەش لە خشتەی کارەکان لابرا.

بەڵام ئایا لە شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵەکان نیە پشتگیری لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بکات؟ بەڵێ، بە دڵنیاییەوە هەیە، بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە، لەبەرئەوە دەوڵەت و حکومەت لە هەمو ئانوساتێك دەتوانێت بێلایەنیان بکات و سنورێك بۆ دەستەڵاتی مادی و مەعنەوییان دابنێت. ئەو کەسانە هەمیشە ماڵ و موڵکیان لە مەترسیدایە چونکە بەردەوام ڕکەبەرایەتی دەوڵەت دەکەن.

لە دوای کودەتاکەی ١٩٧١/٣/١٢ ئەو شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵانە بە بارمتە گیران و دواتریش درانە دادگاو زیندانی کران.

لە نێو ئەو (٥٥ ) فیودالە کەسایەتی بەهێزو پاك هەبو، بۆ نمونە کەسایەتیەکی وەك سەیدا (فایەق بوچاك) لە نێو گیراوەکان بو. هەروەها ساڵانی شەستەکان کەسایەتی

دامەزرێنەرو چالاکی کورد لە ڕیـزی پـارتی کرێکـارانی تورکیـا نوێنەرایـەتی مەڵبـەند و ناوچەکانیان دەکرد کە ژمارەیەکیان لـە شـێخ و موڵکـدارو سـەرەك خێڵـەکان بـون. ئـەو کەسایەتیانە ژمارەیەکیان چالاکانە بەشدارییان لـە خۆپیشـاندانەکانی ١٩٦٧ی ڕۆژهـەڵات کردبـو. زمـان و قسـەکردن و دابونـەریت و جلوبـەرگ و شـێوەی ژیـانی ئـەو کەسـانە گـەواهی دەدەن کـە شـانازی بـە نەتـەوەی کـوردەوە دەکـەن و وە ك کوردێکـی بێگـەرد هەڵوێسـت و ڕەفتاریـان دەکـرد، هـەروەها هێندێـك لـەو کەسـایەتیانە بـە وشـیاری بـەرگرییان لـە بـەها کۆمەڵایەتییـەکانی کـورد دەکـرد. بـەڵام بـە هـۆی پەرەسـەندنی پەیوەندی سەرمایەداری لە کۆتایی شەستەکان هێندێکیان وازیان لە بەهای نەتەوایـەتی هێنـاو هێندێکـی دی بـون بـە تـورك و ئـەوانی دی بـون بـە ئـامرازێکی دڵ ڕەق لـە ئامرازەکـانی تواندنـەوەو تـەتریك کـردن. هـەرکاتێك پـەیوەندی سـەرمایەداری بـەبێ ڕوبەڕوبونـەوەی چـالاکی سیاسـی و ئـایدولۆجی نێوەنـدە بـەهێزەکانی بـەرگریکردن و پاراستنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەرفـەتێك بـۆ گەشەسـەندنی خـۆی بدۆزێتـەوە ئـەوا بـەها نەتەوایەتییـەکانیش مەترسـی لـەناوچونیان لێدەکـرێ. بـەڵام ئـەمڕۆ بارودۆخەکـە گـۆڕاوە چونکـە گەشەسـەندنی پـەیوەندی سـەرمایەداری و نێوەنـدە بـەهێزەکانی بـەرگریکردن هاوزەمـان گەشـەدەکەن، هـەروەك پێشـتر باسمـان کـردوە گەشەکردنی سەرمایەداری هەمیشە ئەنجامی وێرانکاریانە بەرهـەم ناهێنـێ. دواتـر ئـەم بابەتە بە تێرو تەسەلی باس دەکەین.

لە دوای کودەتاکەی ١٩٧١/٣/١٢ جارێکی دی بابـەتی ڕیفۆرمـی کشـتوکاڵی خزایـە نێـو خشـتەی کارەکـان بـەڵام ئـەمجارەیان وەك بابـەتێکی پـەیوەندیدار بـە مەسـەلەی کـورد خرایە ڕوو. بێگومان بۆ جاری دوەم ناحـاڵی بونێـك لـە مەسـەلەکەدا هـەبو. بـەڵام وەك جاران ماوەیەکی زۆر گفتوگۆیـان لەسـەر ڕیفۆرمـی کشـتوکاڵی نـەکرد چونکـە هـەر زوو هەڵوێسـتی شـێخ و موڵکـدار و سـەرەك خێڵـەکانیان بـۆ ئاشـکرا بـو کـە دواجـار هـەر هاوپەیمانێتی دەوڵەت دەکەن و لەسەر ئەو بنەمایەش حکومـەتی عەسـکەری پـەنای بـۆ پیادەکردنی ئیستراتیـجیەکی جیاواز برد: بەرەیەکی لە گەنجانی شۆڕشگێڕو ڕوناکبیرانی تورك و ڕۆژنامەکانی تورکیای لە دژی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کورد دروستکرد.

گـەنجانى شۆڕشـگێڕى تـورك بـە درێژايـى شەسـتەكان وتووێـژى چڕوپڕيــان لەســەر مەســەلەى كـورد دەكـردو ژمارەيـەكى زۆرى بەشـداربوان چارەسـەرى ديموكراسـييان بــۆ مەسەلەى كورد پەسەند دەكرد. لەم حاڵەتەدا كودەتاچيەكانى ١٢ى ئازار بـە پێويسـتيان دەزانى ئەم پرۆسەيە ڕابگرن و كۆسپى بۆ دروست بكەن و ڕێكخسـتنەكانيان لەناوبـەرن بۆيــە ئــەو دروشمــەى ئيدعــاى دەكـرد شـێخ و دەرەبــەگ و ســەرەك خێـڵ و چينــە كۆنەپا ڕێزەكانى دى بزوێنەرى مەسەلەى كوردن مانايـەكى نوێـى وەرگـرت چونكـە زۆر بــە ئاســانى دەيانويســت مەســەلەى كــورد دۆســت و لايــەنگر لــەنێو شۆڕشــگێڕو ديموكراتخوازەكان پەيدا نەكات. ئەمــەش كـارێكى زۆر گرنگـە ئەگـەر بزانـين مەسـەلەى كورديان بە چ ڕێگەيەك شێواندوە و چۆن بە خراپى لێى حاڵى بون بۆيە كاتێك شێخ و دەرەبەگ و سەرەك خێڵەكان بە دينەمۆى مەسـەلەى كـورد تاوانبـار دەكـەن دەيانـەوێت ڕێگـە نـەدەن گـەنجان و جوتيـارە هـەژارەكان كـە هـێزێكى زينـدوى پاشـەڕۆژن هاوكـارى مەسـەلەى كـورد بكـەن لەبەرئـەوەى بـە قوڵـى قسـە لەسـەر ئــەم مەســەلەيە دەكــەن و بايەخى زياتر بە چارەسەركردنى مەسەلەكە دەدەن.

بابــەتى ڕيفۆرمــى كشـتوكاڵى دواى كودەتاكــەى ١٩٧١/٣/١٢ پێويســتى بــە لايــەنى ئابوريش هەيە. لەبەرئەوەى بوژانەوەى پيشەسازى و كەرتى بانكى و بازرگانى زياتر لـە ڕۆژئاواى توركيا بايـەخى پێـدەدرێ بۆيـە سـاغكردنەوەى بەروبومەكـەيان پێويسـتى بـە بازارێكى گەورە هەيــە، لـەم حاڵەتەشـدا ڕۆژهـەڵات بـازارێكى گرنگـى چـاوەڕوانكراو بـو، بەڵام دانيشتوانى ڕۆژهەڵات پێويستيان بە زيادكردنى هێزى كڕين هەبو تا بتوانـن كـاڵا بەرهەمـهێنراوەكانى ڕۆژئـاوا بكــڕن و هــەر لەبەرئــەو هۆيــە بيريــان لــە پيــادەكردنى ڕيفۆرمى كشتوكاڵى دەكردەوە.

لە دواى كودەتاكەى ١٩٨٠/٩/١٢ گفتوگۆ لەسەر ڕيفۆرمى كشوكاڵى دەستى پێكرايــەوە، بەڵام پەيوەندى ڕيفۆرمــى كشـتوكاڵى بـە مەسـەلەى كـورد و موڵكدارەكـان زۆر جـەختى لەسەر نەكراو هـەر زوو لەسـەر خشـتەى كارەكـان لابـرا. هـەروەك لـە سـەرەوە ئامـاژەى پ ێكراوە گفتوگۆ لەسەر لايەنە ئابورييەكانى ڕيفۆرمى كشتوكاڵى دەكرا.

بابـەتی دوەم لـە خشـتەی کارەکـانی کودەتـا سـەربازییەکان مەسـەلەی تـەتریك و تواندنەوە بو. چ ئەلفبایەك هەڵبژێرین بۆ ئەوەی منالآن بە ئاسانی فێری زمانی تورکی ببن؟ چ شێوازو سیاسەتێکی فێرکردن پیادە بکەین بـۆ ئـەوەی دانیشـتوان فـێری زمـانی تورکی بکەین و زمانی کوردییان لەبیر بەرینەوە؟ چ شێوازێك بۆ لەناوبردنی ناسـنامەی کورد پەیڕەو بکەین بۆ ئەوەی هەمو کوردێك پـڕ بـە زاری هـاوار بکـات "مـن تورکـم و بەختەوەرم بەوەی کە تورکـم". ئـەم بابەتـە لـە مـاوەی کودەتـا سـەربازییەکان خـاڵێکی سـەرەکی گفتوگۆکـان بـو. بێگومـان گفتوگـۆ کـردن لەسـەر ئـەم بابەتـە لـە مـاوە دیاریکراوەکان و لە کودەتایەکەوە بـۆ کودەتایـەکی دی تایبەتمـەندێتی خـۆی هـەبو. بـۆ نمونە ساڵی ١٩٦٠ ئەم بابەتە زۆر بە پەرۆشەوە گفتوگـۆی لەسـەر دەکـراو لـە ڕۆژنامـەو لە زانکۆکان و لە یـەکێتی فوتابیـان بـە دورودرێـژی گفتوگـۆ لەسـەر هـەمو لایەنـەکانی تواندنەوەو تەتریك دەکرا.

ساڵی ١٩٦٠ کتێبەکەی محەمەد شەریف فورات "کەرتی ڕۆژهەڵات و مێـژوی ناوچـەی وارتـۆ" چاپکرایـەوەو لەسـەر ئاسـتێکی فـراوان بلآوکرایـەوە. ئـەم کتێبـە یەکێکـە لـەو نوسینە سەرەکیانەی نکوڵی لە بونی کـوردو زمـانی کـوردی دەکـات و کـورد بـە تـورك و زمانی کوردیش بە زاراوەیەکی ناوچەیی زمانی تورکی دادەنێ.

نوسـەر سـاڵی ١٩٤٨ ئـەم کتێبـەی دانـاوە بـەلآم وەزارەتـی ڕۆشـنبیری سـاڵی ١٩٦٠ ئـەم کتێبـەی بـە پێشـەکی جەنـەراڵ (کـەمال گورسـەل) سـەرۆکی ئـەو کاتـەی ئەنجومـەنی ئاسا یشی نەتەوەیی و سەرۆکی دەوڵەتی تورکیا بلآوکردەوە. ئەم کتێبە بە خۆڕایی و بە شـێوەیەکی بـەربلآو بەسـەر جـەماوەرو مامۆسـتایانی زانکـۆو یـەکێتی خوێندکـاران و ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان و کتێبخانـەو خوێندنگـەو سـەربازگەو خانـەی زانکۆکـاندا دابەش دەکرا.

هـەر لـە هـەمان مـاوەدا وتـارێکی زۆر لەسـەر بـە تـورك کردنـی کـورد لـە ڕۆژنامـە بلآودەکرایەوە. زمانەوانەکان هەوڵێکی زۆریان دەدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنن زمـانی کـوردی زاراوەیەکە لە زاراوەکانی زمانی تورکی. فەرمانبەران و مامۆستایانی زانکۆ لەسـەر ئـەم بابەتە کۆڕو کۆبونەوەی جەماوەرییان ساز دەکرد.

له سەرەتای شەستەکان لەسەر ئاستێکی بەرفراوان پێشوازی لەو هەوڵ و کۆششانە دەکرا چونکە خەڵکی بە تورك کردنی کوردو نکۆڵی کردن لە زمانی کوردییان بە گەورەترین هەنگاوی شۆڕشگێڕی و فیکری پێشکەوتوخواز لە قەڵەم دەدا، ئەمە لە کاتێکدا بیروباوەڕی بزو تنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردو وتنی "من کوردم" یا "زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە" بە کۆنەپارێزی دادەنرا بۆیە جارێکی دی گەڕانەوە سەر ئەو بڕوایەی کە شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵەکان بزوێنەری ئەو ڕوداوانەن بەڵام تورکەکان بۆ ئەوەی تورکبونی کورد بسەلمێنن دەبوایە بە ئەرکی نیشتمانی خۆیان هەستن بەوەی کورد لەو مەسەلەیە تێگەیەنن. لەم بارەیەوە مامۆستایانی قوتابخانەکان بە تایبەتی مامۆستایانی زمانی تورکی دەورێکی سەرەکیان دەبینی و ئەو مامۆستایانەشیان لە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات دادەمەزراند کە خۆیان بە دیموکراتخوازو شۆڕشگێڕ دەزانی.

ئەم بۆچونە هاوڕێ لەگەڵ کارێکی چڕوپڕ بۆ ماوەی سێ ساڵ (١٩٦٠-١٩٦٣) باڵادەست بو. لە کۆتایی شەستەکان بە تورك کردنی کوردو دانانی زمانی کوردی بە زاراوەیەکی زمانی تورکی کەوتە بەر ڕەخنەگرتن. ئەو ڕەخنانە سەرەتا لەناو کوردەکان سەریهەڵدا پاشان تورکە شۆڕشگێڕەکانی گرتەوە ئنجا ئاستی ڕەخنەکان فراوانتر بو تا بوە دیاردەیەکی گشتگیر. خۆپیشاندانەکانی هاوینی ١٩٦٧ زۆربەی مەڵبەندو شارە سەرەکییەکانی کوردستان و خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٦٩ی یانەی کولتوری شۆشگێڕ لە ڕۆژهەڵات ئەو دیاردەیەی چڕتر کردەوە، هەروەها دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا ساڵی ١٩٦٥ ڕوداوێکی گرنگ بوو لە بەرزکردنەوەی وورەی ناوچە گوندنشینەکان. بەمشێوەیە ئاستی گفتوگۆکان فروانتر بویەوەو هەڵوێستی شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازەکانی تورکیا بە پێچەوانەی هەڵوێستی سەرەتای شەستەکانیان بە تورککردنی کوردو دانانی زمانی کوردیان بە زاراوەیەکی ناوچەیی زمانی تورکی ڕەتدەکردەوەو لە جیاتی ئەوەش دروشمی تێکۆشانی برایانەی هەردوو میللەتیان لە دژی ئیمپریالیزم بەرزدەکردەوە. بەڵام ڕاستڕەوانی تورکە ڕادیکالە ئاینگەراکان و ڕەگەزپەرستە تورکە کان و لیبرالەکان بیروبۆچونەکانی خۆیان نەگۆڕی.

داواكـاره گشــتييه ســەربازييەكان دەربــارەی ئــەو بڕیارانــەی لــە دوای كودەتاكــەی ١٩٨٠/٩/١٢ لەسەر بە تورككردنـی كـوردو نـاڕەسمێتی زمـانی كـوردی دەریـانكردبو زیـاتر بیروبۆچونەكانی خۆیان دەردەبڕی. هـەروەها جـەختیان لەسـەر ئـەوەش دەكـردەوە كـە ڕەتكردنـەوەی ئـەو بیروبۆچونـە تاوانێكـە سـزای یاسـایی لـە سـەرە بۆیـە بـە فیعلی لــە دادگاكانەوە بڕیاری بە گوێكردنی فرمانەكانی داواكاری گشتی سەربازی دەركراو دادگای پیاچونەوەش ئەو بڕیارانەی پەسەند كرد. ڕۆژنامــەكان لـە بـارەی تواندنــەوەو تـەتریك كـردن وتاریـان بڵاودەكـردەوەو كۆنگرەیـان بـۆ هـەمان مەبەسـت دەبەسـت، بــەڵام ئــەو چالاكییانە وەك ساڵانی شەستەكان گشـتگیرو پــڕ جـۆش و خـرۆش نـەبون بـەڵكو تەنـها لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەكان مایەوە. كتێـب و چاپكراوەكـانی لەسـەر بودجـەی دەوڵـەت چاپدەكراو بەسەر قوتابخانەو كتێبخانە گشتیەكانی شارە گەورەو شـارۆچكەو گوندەكـان بـە تایبـەتی مەڵبـەندە كوردنشـینەكان دابەشـدەكرا. ئـەم بابەتــە لــە دوای كودەتاكــەی ١٩٧١/٣/١٢ گۆڕانكـاری زۆر گرنگـی بـە سـەرا هـات، ئـەویش زیندانیــەكان بــە شـێوازێكی لۆجیكییانــە ڕەخنــەیان دەگــرت لــە دیــدو بۆچونــەكانی داواكــاری گشــتی ســەربازی. زیند انییەكان بە شێوازێكی ڕێكوپێك و شێلگیرانە دژی ئەوەی سـەربازەكان بـە تاوانیـان دەزانی بەرگرییان لە خۆیان دەكرد.

ڕادیۆو ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و نێوەنـدە فێرگوزارییـەكان یـەكێك بـون لـەو ئـامرازە سەرەكیانەی بانگەشەیان بـۆ سیاسـەتی تواندنـەوەو تـەتریك كـرد و هـەمو شـێوازێكیان دەگرتە بەر تا ئەو قوتابخانەی لە كوردستان بە زمانی توركی دەیـانخوێند كاریگـەرییان زیـاتر بێـت، بۆیـە لـە شەسـتەكان بـە دواوە لــە هێندێـك شـاری كوردســتان "فێرگــەی ناوخۆیان" دروستكرد.

ئـەو فێرگـە ناوخۆییانـە بـە مەبەسـتی تواندنـەوەو تـەتریك كردنـی مرۆڤـی كــورد دروست دەكران. بە پێی سیاسەتی ئەو فێرگانە كاتێك منداڵ دەگەیشتە تەمــەنی خوێنـدن لـە خێزانەكـەی وەردەگـیراو لـە كەسـوكارو گونـدو دەوروبەرەكـەیان دادەبـڕی. دەوڵــەتی توركیا ئەو فێرگە ناوخۆیانەی وەك دەسكەلایەكی زۆر لـەبار بـۆ پیـادەكردنی پرۆسـەی تـەتریك و تواندنـەوەی كـورد بـەكاردەهێنا. ئــەو منداڵانــە لــە هۆڵـی خوێنــدن و ژوری

نوستنو له كاتى نانخواردندا لەژێر كاریگەری ئایدولۆجیای دەوڵەتی توركیا دەبون. هەروەها ئیدارەی فێرگەكان ئەو منالانەی دەخستە ژێر چاودێرییەكی وردەوەو بە درێژایی ساڵی خوێندن وانەی پرەنسیپەكانی ئایدۆلۆجیای رەسمییان پێدەوتنەوە چونكە پێیان وابو دابڕین و دورخستنەوەی منالان لە كەسوكارو دەوروبەرەكەیان باشترین ڕێگەیە بۆ تەتریك كردن.

ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە بڕوانینە فێرگەكان دەبینین ئەو فێرگانە هاوتای فێرگەكانی سەردەمی عوسمانییە، لەوانەش فێرگەی دەرچواندنی سەربازو فەرمانبەرو نێوەندەكانی دروستكردنی ئینكشارییەت*.

دەسەلاتداران منالانی مەسیحیان (بە تایبەتی منالانی ناوچەی بەلقان) لە كەسوكاریان دادەبڕی و بۆ فێرگەكانی دەربار دەیانگواستنەوەو بەمشێوەیە تورك موسڵمانیان لەو منالانە دروستدەكرد. بێگومان دواتر ئەو منالانە بە یەكجارەكی پەیوەندیان بە كەسوكاریانەوە پچڕا.

دابڕینی منالانی كورد لە خێزانەكانیان كاری سەرەكی "فێرگە ناوخۆییەكان" بوو. چونكە منالێك لەو فێرگانە تۆمار بكرێ بە تەنها بەڕێوەبەری فێرگە ناوی باوك و گوندەكەی و كۆمەڵێك زانیاری دی لەسەر ئەسڵی منالەكە دەزانێت. منالەكان زانیارییان لەسەر باوكی هاوپۆلەكانیان نیە، ڕێگەیان پێنادرێ قسە لەسەر باوك و كەسوكارو هاوڕێكانیان بكەن. تەنها ڕێگە بە باوكی منالەكە دەدرێ سەردانی كوڕەكەی بكات بەلام ڕێگە بەویش نادرێت هەواڵی كوڕەكەی لە هاوڕێی كوڕەكەی بپرسێت. بەمشێوەیە ڕەنگە فێرخوازێك داوی پێنج ساڵ واتە دوای ئەوەی خوێندنی تەواو دەكرد ئنجا دەیزانی یەكێك لە برادەرە خۆشەویستەكانی خزمی خۆی بوە. پەرتەوازەكردنی ئەندامانی خێزان و گوندو خێڵ ئامانجی ئەو دابڕینە بو چونكە پێیان وابو پەیوەندی

---

* ئینكشاریەت: واتەتازە سەرباز، سوپایەكی بەدیسپلین بو، عوسمانیەكان لە سەدەی چواردەهەم دروستیان كرد بەلام پاشان گیانی سەربازییان لە دەستداو لە دەوڵەت هەڵگەڕانەوە بۆیە سوڵتان مەحمودی دوەم لە ساڵی ١٨٢٦ لەناویبرد (منجد الاعلام ص ٨٤، الطبعة الثانية عشر".

نێوان ئـەندامانی خـێزان و گونـدو خێڵ ئەگـەر پرۆسـەی بیرچونـەوەی زمـانی كـوردی نەكاتە ئەستەم ئەوا دەبێتە مایەی خاوكردنـەوەی پرۆسـەكە. هـەروەها دەیـانزانی ئـەو پەیوەندییانـە شـێوەی ژیـانی كـورد دەپـارێزێت و كاریگـەری ئایدولوژیـای ڕەسمیـش لاواز دەكات.

لەو "فێرگە ناوخۆیانـە" منـداڵ دەخرایـە ژێـر دیسـپلینێكی وردەوە. لـە دوای هـەر دوو كودەتاكـەی ١٩٧١/٣/١٢ و ١٩٨٠/٩/١٢دا سـەربازو سـەربازە خانەنشـینەكان شـوێنی بەڕێوەبەری ئەو فێرگانـەیان دەگرتـەوە. ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی میتـۆدی فـێركردن تـا ڕادەیەكی زۆر هاوتای میتۆدی فێركردنی فێرگە سەربازییەكان بوو.

لە دوای كودەتاكەی ١٩٨٠/٩/١٢ جارێكی دی بابەتی تواندنەوەو تەتریك كردن كەوتە نێو خشتەی كاری كودەتاچییەكان، بەڵام هەوڵدەدرا لە ڕێگەی كتێـب و چاپەمـەنی بـەو ئامانجە بگـەن. بۆچی وەك جـاران چالاكانـە گفتوگۆیـان لەسـەر ئـەم بابەتـە نـەدەكرد؟ بۆچی ڕۆژنامـەكان وەك جـاران وتـاری زۆریـان لەسـەر نەدەنووسـی؟ بۆچـی زانكۆكـان لەسـەر ئـەم بابەتـە كـۆڕو كۆنگرەیـان سـاز نـەدەكرد؟ بۆچـی لەسـەر ئاسـتێكی فـراوان گفتوگۆیان لەسەر بابەتی تەتریك و توانەوە ناكرد؟ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارانە زۆر ئاسانە: لەبەرئەوەی دەیانویست جارێكی دی ئەم مەسـەلەیە نەگەڕێتـەوە بـۆ یـادەوەری ڕای گشتی چونكە ئەو كەسانەی باس و گفتوگۆیان لەسەر هـەمو لایەنـەكانی مەسـەلەی كورد دەكرد بەردەوام ژمارەیان زیادی دەكرد.

ئەو كەسانەی داوای چارەسەری دیموكراسی بۆ مەسـەلەی كـورد دەكـەن ڕۆژ بـە ڕۆژ ژمارەیان زیاتر دەبێت بۆیە دەبینین هـەمو ڕەخنـەكان ئاراسـتەی ئایدولوجیـای ڕەسمـی دەكرێت و خەڵكی گاڵتەیان بەو كەسانە دێت كە نكوڵی لە مەسـەلەی كـورد دەكـەن. لـە سایەی ئەم هەلومەرجەدا هەر گفتوگۆیەكی گشتی لـە لایـەن ڕۆژنامەكانـەوە، بـۆ نمونـە قسەكردن لەسـەر شـێوازەكانی تـەتریك و تواندنـەوەو بـە ئاشكرا داوای هێنانـەدی ئـەم ئامانجـە بكرێـت بـە تەنـها دەبێتـە مایـەی گەشـەكردنی وشـیاری ڕای گشـتی. هەنوكـە بەشـێكی گرنگـی ڕای گشـتی ڕەخنـە لـە شـێوەی ڕەفتـارو ئیجارائاتـەكانی ئایدولۆجیـای ڕەسمـی دەگـرن. بۆیـە گفتوگۆكـردن لەسـەر مەسـەلەی تـەتریك و تواندنـەوە لـە

چوارچێوەی ئـەو گروپـە بچوکـە پسـپۆڕانە سازدەکرا کـە بڕیاریـان لەســەر دەســتەبەر کردنـی شـێوازی هێنانـەدی ئـەو ئامانجـە دەدا. لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا دەوڵـەت ژمــارەی بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن و کاریگەری "فێرگە ناوخۆییەکانی" زیاد دەکرد.

ســەرەڕای هــەمو ئەوانــەش دەزگاکــانی وەك "پەیمانگــەی لێکۆڵینــەوەی کولتــوری تورك" و "ڕێکخراوی ڕۆژنامەگەری ئەنادۆل" لەسەر بـە تـورك کردنـی کـورد و لەسـەر ئەوەی زمانی کوردی زمـانێکی سـەربەخۆ نیـە بـەڵکو زاراوەیەکـە لـە زاراوەکـانی زمـانی تورکـی هێشـتا هـەر گوشـار دەخەنـە سـەر ڕای گشـتی. ئـەم دوو دەزگایــە بــە هاوکــاری دەستەڵاتە خۆجییەکان و سوپاو زانکۆکان هەوڵدەدەن بە تایبەتی لە شـارە کوردییـەکان کۆبونەوەی زانستی ببەستن و لەسەر ئاستی پەیوەندییە گشـتیەکانیش هـەوڵی چڕوپـڕ دەدەن بـۆ ئـەوەی ئـەم ئامانجـە بهێننـــە دی. هــەروەها لــە دوای کودەتاکــەی ١٩٨٠/٩/١٢ هەڵمـەتی نەهێشـتنی نـەخوێندەواری لـە سەرتاسـەری وڵات دەسـتی پێکــرد، بــەڵام لــە ڕۆژهەڵات ئومێدی هێنانەدی هەمان ئەنجامی لێدەکرێ.

## بەکارهێنانی ئایدولۆجیای ئیسلامی لە دژی مەسەلەی کورد

ئەگەر هەڵبژاردنە گشتیەکانی ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٧ی تورکیـا بـەراورد بکرێـن ئـەنجامی سەرنـج ڕاکێشەری لێدەردەهێنرێت. لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٧٣ پارتی سەلامەتی نەتەوەیی ئەم پارتە ئایدیایەکی ئاینی هەیەو ناوی پێشوی پارتی ڕەفا بو)، (٤٨) کورسی پارلـەمان و ڕێـژەی لـە ١١,٨٪ی تێکـڕای دەنگــەکانی بەدەســت هێنــا. ئــەو ڕێژەیــەی لــە هەرێمــە کوردنشـینەکان بـە دەسـتی هێنـا زۆر لـە ڕێـژەی ئـەو دەنگانـەی لـە شـوێنەکانی تـر بــە دەستی هێنابوو زیاتر بوو، لە ناوچەکانی ئادیامان، ئاگری، بنگۆڵ، دیاربـەکر، ئـەلازیخ، مالاتیا، قارەمان ماراش، ماردین، ئورفەو ئەرزرووم دوو هێندەی ئەو ڕێژەیەی شـوێنانی تــری بەدەســت هێنــا. بــەلام لــە هەڵبژاردنــەکانی ١٩٧٧ ڕێـــژەی دەنگــدان و ژمـــارەی کورسییەکانی ئەم پارتە کەم بۆیـەوەو تەنـها (٢٤) کورسـی پارلـەمانی بـە دەسـت هێنـاو ڕێژەی لە ٣,٣ ٪ی دەنگەکانیشی لە دەست دا ئەگەرچی لە هەرێمە کوردییــەکان دەنگێکی وای لە کیس نەچوو، بەڵکو ڕێژەیەکی سەدی گرنگی خستە پاڵ دەنگـە کۆنـەکانی خـۆی

له ساڵی ١٩٧٣دا چونکه له بتلیس، هەکاری، ماردین، سـێرت، وان، قـارس، مـوش، ئورفـەو مالاتیا ژمارەیەکی زۆری دەنگدەرانی کورد دەنگیان بـۆ پـاڵێوراوانی ئـەم پارتـە دا بـەڵام ڕێژەی دەنگدەرانی له ١٩٧٣ له بنگۆل و دیابەکر و ئادیامان وەك خۆی مایەوەو به تەنها لـه ئـەرزروم پـارتی بزوتنـەوەی نەتـەوەیی فاشیسـتی لەسـەر حسـابی ئـەم پارتـە سەرکەوتنی به دەست هێنا

(Ismail Beskci, Bilim Yontemi, Turkiye' deki Uygulama 3 Cum huriyet Halk Firkasi' nin Tuzugu (1927) Ve Kurt sorunu, Komal. Yayinevi, Istanbul, 1978, PP. 243- 278).

بـەڵام پـارتی گـەلی کۆمـاری لـە هەڵبژاردنـەکانی سـاڵی ١٩٧٧ بـە بـەراورد لەگـەڵ هەڵبژاردنـەکانی ١٩٧٣ ڕێـژەی ٨,١٪ی دەنگـەکانی خسـتە سـەر دەنگـە کۆنـەکانی خـۆی هەرچەندە پـاڵێوراوانی ئـەم حزبـە لـە هێندێـك ناوچـەی ڕۆژهـەڵات دەنگێکی کـەمیان بەدەست هێنا. پارتی سەلامەتی نەتـەوەیی (msp) سـاڵی ١٩٧٧ لـە چاو هـەڵبژاردنەکانی ١٩٧٣ ڕێژەی ٣,٣٪ دەنگەکانی له دەست دا لەگەڵ ئـەوەدا کـە سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا له زیادبوونی دەنگدەران له ناوچه کوردییەکاندا هەمان شتیش لەسەر پارتی ڕەفا پیادە دەبێـت کـە جێگـەی پـارتی سـەلامەتی گرتـەوە. پـارتی ڕەفـا لـە هەڵبژاردنـەکانی ١٩٨٧دا نزیکـەی ڕێـژەی لـە ٢٠٪ی کـۆی دەنگـەکانی لـە ناوچـەکانی دیاربـەکر، بنگـول، بتلیـس، ئەلازیخ، سێرت، وان، موش، ئادیامان، ئورفەو ئاگری به دەست هێنا بـەڵام تەنـها ٧,٨٪ی له کۆی گشتی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

شـتێکی ئاشـکرایه حزبێکـی وەك حزبـی ڕەفـا پشـتگیریکردنی ئایدۆلۆجیـای ڕەسمـی پێویست ە ئەگەرچی ناوبەناو لافی ڕکەبەرایەتی کەمالیزم لێبدات. بەڵام ئـەو ئیدعایـەی نابێتـە هـۆی پشـت تێکردنـی دەزگاکـانی ئاسـایش چونکـە حزبـی ڕەفـا بانگـەوازی نێونەتـەوەیی ئیسلامی دەکات. بـە گشـتی چالاکییـەکانی پـارتی سـەلامەت و ڕێکخـراوە هاوشێوەکانی له کوردستان هەرگیز به مەبەستی لاوازکردنیان ڕووبەڕوی گوشار نابنەوە.

له دوای کودەتا سەربازییەکەی ساڵی ١٩٧١ دادگای دەستوری چالاکی پارتی کرێکارانی له تورکیای قەدەغەکرد، هـەروەها مۆڵـەتی لـە (پـارتی نـیزامی نیشـتمانی)ش سـەندەوە (پارتێکی سیاسییەو ساڵی ١٩٦٩ له پێش پارتی سـەلامەتی نەتـەوەیی دامـەزراوە). بـەڵام

ئەم جۆرە حزبانە لە سەرەتای دادگاییکردنەکانی رۆژهەلات پێویست بو، لەبەرئەوەی هەر تەوژمێك ئاینی ئیسلام بکات بە پرەنسیپی سەرەکی خۆی جەماوەرێکی زۆر لە دەوری کۆدەبێتەوەو دەتوانێ ڕێگە لە گەشەسەندنی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد بگرێت بۆیە پا راستن و پشتگیری کردنی ئەو جۆرە تەوژمانە پێویست بون.

ئەفسەرەکانی سوپا بە ڕاشکاوی پشتگیری گەڕانەوەی ئەندامانی پارتی نیزامی نیشتمانییان دەکرد کە بە ناچاری بۆ دەرەوەی وڵات ڕایانکردبو، بۆیە بە پەلە گەڕانەوەو پارتێکی تازەیان بە ناوی پارتی سەلامەتی نەتەوەیی دامەزراند و بەشدارییان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٣دا کرد. کارێکی ئاساییە دەوڵەت قسە لەسەر ئەم مەسەلەیە نەکات چونکە ڕێکەوتننامەکەیان تەنیا بە دەم بوو و نەنووسرابوو.

پرۆفیسۆری ئەمریکی فرەی Frey ساڵی ١٩٦٢ لە چوارچێوەی هاوکاری نێوان ئیدارەی لێکۆڵینەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و (AID ) ئەمریکی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئاستی تورکیا ئەنجامدا. ئەم لێکۆڵینەوەیە لە وڵاتە یەکگرتوەکان بلاّوکرایەوە. بەلاّم لە تورکیا دەستەلاّتداران هەوڵیاندەدا ئەم لێکۆڵینەوەیەو ئەنجامەکانی لە جەماوەر بشارنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێندێك لایەنی پەیوەندیدار بەو لێکۆڵینەوەیە بلاّوکرایەوە (بڕوانە، ئیسماعیل بێشکچی، هەمان سەرچاوەی پێشو. ل ٢٧٥- لاپەڕەکانی دواتر). ئەو لێکۆڵینەوەیە ئاشکرای دەکات لێپرسراوانی حکومەتی ئەمریکا کارگوزاری ڕاوێژکاری (خدمات استشاریە) پێشکەش بە حکومەتی تورکیا دەکەن. باشترین خزمەتی کارگوزاریش بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەلاّیەتییەکان بە تایبەتی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد دامەزراندن و پشتگیری کردنی حزبی ئیسلامی سیاسییە. ئەم هەنگاوە بۆ کوردستان بایەخێکی سەرەکی هەیە چونکە لەو کاتەوە کەمالی و بیروکراتە سەربازیو مەدەنییە گەورەکان لە لایەك و شێخ و دەزگاکانیان لە لایەکی دی دژایەتییان لە نێواندا نەما. شتێکی ئاشکرایە ڕاوێژکارانی حکومەتی ئەمریکا لەژێر کاریگەری گروپەکانی ئاشتی ئەمریکا بون، ئەو گروپانەی چالاکی بەرفراوانیان لە تورکیا ئەنجامدەدا.

لەم میانەدا پێویستە دوو خاڵ ڕونبکەینەوە: لە لایەك حـاڵی حـازر نـاتوانین بڵێین گشت شـێخەکان دوژمنـی کـوردن، هــەروەها نــاتوانین ئیدعـای ئــەوەش بکـەین گشـت شـێخەکان هاوکـاری دەزگاکـانی ئاسایشـی تورکیـا دەکــەن چونکـە لــەنێو شێخەکانیشـدا خــەڵکانی نیشـتمانپەروەر هەیــە، واتــە خــەڵکانێك هەیــە پارێزگـاری لــە ناســنامەی نەتەوایـەتی خـۆی بکـات بـەڵام ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ کاریگــەرییان وەك شــێخ لاواز دەبــێ، لەبەرئەوەی کاریگەری شێخەکان لەسەر میللەتی کورد بە شێوەیەکی هاوتـەریب لەگـەڵ توانای ئابوری شێخ زیاد دەکات، واتــە لەگـەڵ پشـتگیری دەوڵـەت لـە شـێخەکان و لەگـەڵ وەرگرتنـی ئـامرازو ئـامێری کشـتوکاڵی کـە ئـەوەش پێویسـتی بــە زیــادبوونی ڕوبــەری زەوییەکانیان هەیەو لەگەڵ فراوانی ئاستی پەیوەندی بازرگانی و دەســتەڵاتی شـێخەکان بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کردنەوەی وێستگەی فرۆشتنی سـوتەمەنی و وەکالـەتی فرۆشـتنی مەکینـــەی کشـــتوکاڵی و توانـــای خـــەرجکردنی پـــارە بـــۆ دانـــانی کۆمپانیـــای گواستنەوەی نەوت.

شێخەکان تا دەوڵەمەندترین کاریگەرییان زیاتر دەبێ. ئەو پەیوەندییانە لە ڕێگـەی پشـتگیری دەوڵــەت و دەوڵەمــەندکردنی شـێخەکان دەســتەبەر دەکـرێ بۆیــە کــارێکی سروشـتیە ئــەو شـێخانەی شـانازی بــە ناســنامەی نەتەوایــەتی خۆیانــەوە دەکــەن کاریگەرییان کەمبێتەوە چونکە دەوڵەت بە نهێنی و بە ئاشکرا پـەلاماریان دەداو ڕێگـە لە دەوڵەمەندبونیان دەگرێت و بەردەوام هەوڵی ترساندن و جاڕزکردنیان دەدا.

لە لایەکی دی، شـێخەکان تەنـها لـە کـاتی هەڵمەتـەکانی هـەڵبژاردن پڕوپاگـەندە لـە دژی کورد ناکەن بەڵکو هەمو ساتێك و بە پێـی کـاتو شـوێن پڕوپاگـەندە لـە دژی کـورد دەکەن و بچوکترین دەرفەت دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی ڕایگەیـەنن: گرنگیـدان بـە مەسـەلەی کورد مانای بێباوەڕی و کۆمۆنیستی و خیانەتی مەزن دەگەیـەنێ. لـە پێـش کودەتاکـەی ١٩٨٠/٩/١٢ تەنها پارتی سەلامەتی نە تەوەیی ئەو بانگەشانەی نەدەکرد بەڵکو ئـەندامانی پارتەکانی وەك پارتی عەدالەت و پارتی بزوتنەوەی نەتەوەیی و پارتی گەلی کۆمـاری یـا بـە هاوکـاری پێشوەخت لەگـەڵ حزبـەکانی خۆیـان یـا بـە شــێوەیەکی سـەربەخۆ ئــەو پڕوپاگەندانەیان دەکرد. زۆرجاران ئـەو شـێخانەی لـە ڕیـزی پارتـە جیاوازەکـان کاریـان

دەكرد كەسوكاری يەكتربون. لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٧٧ ئەو دوو شێخەی لە شاری موش لە سەروی ليستی پاڵێوراوانی پارتی سەلامەتی نەتەوەيی و عەدالەت بون ئامۆزای يەكتر بون، هەروەها خزمی پاڵێوراوی يەكەمی پارتی سەلامەتی نەتەوەيی-يش بوون لە بەتليس. لە بتليس دوو شێخی برا نوێنەرايەتی بزوتنەوەی (ئيرادەی نيشتمانی)يان لەنێو خۆياندا دابەشكردبوو، يەكێكيان وەك پارلەمانتارو ئەويتريان وەك ئەندامی ئەنجومەنی پيران بەڵام خودی بزوتنەوەی (ئيرادەی نيشتمانی) لە ڕێگەی چەسپاندنی پايەكانی كۆڵۆنياليزم و هێشتنەوەی كوردستان وەك كۆڵۆنييەكی نێو دەوڵەتی وەك ئامرازێك چاودێری جەماوەری كوردستان و بنەماكانی دژايەتی كردنی بزوتنەوەی كوردايەتی دەكرد.

شتێكی ئاشكرايە ئايدۆلۆجيای كەمالی بە سودوەرگرتن لە دەستەڵاتی نێوەندی، واتە پەيوەندی ئابوری لەگەڵ توركە كۆڵۆنياليە كان دەيويست شێخەكان بكاتە سەرمايەدار.

بەڵام لە هەمان كاتدا دەيەوێت پەيوەندی نێوان شێخ و جوتيارەكان لە چوارچێوەی پەيوەندييە كلاسيكييەكان بمێنێتەوە بۆيە پشتگيری لەم ميكانيزمە دووفاقەييە بكات ئەمەش وايان لێدەكات لە جياتی ئەوەی لە پێناوی بەرژەوەندی جوتيارە هەژارەكان و خاوەن زەوييە بچوكەكان كاربكەن تيرۆری دەوڵەت بەكاردەهێنن بۆ ئەوەی داواكارييە نەتەوايەتی و ديموكراتيەكانيان سەركوت بكەن، ئەمە لە كاتێكدا باری ئابوری شێخەكان باشتر دەكەن. لەبەرئەوە تا ميللەتی كورد گيرۆدەی دەستی ئەو پەيوەندييە كلاسيكيانە بێت ئەوا ناتوانێت داوای مافە ديموكراسی و نەتەوايەتييەكانی بكات، هەروەها ئاستی وشياری ناگاتە ڕادەيەك ئەو داوايانە بسەپێنێت. بە وشەيەكی دی، پەيوەندييە كلاسيكييەكان كارئاسانی بۆ ئايدۆلۆجيای ڕەسمی دەكات تا چاودێری جەماوەری كوردستان بكات و درێژە بە تەمەنی سيستمی كۆڵۆنياليزمی بدات.

شێخەكان تەنها كاريگەرييان لەسەر مەسەلەی كورد نيە بەڵكو ئەو دەزگايە كار لە پەيوەندی كۆمەڵايەتی و ئابوری و سياسی و كولتوريش دەكات چونكە ئەو بونيادە كۆمەڵايەتی و سياسی و ئابورييە كلاسيكييە دەپارێزێت كە جموجۆڵ و گەشەكردنی كۆمەڵ كۆنترۆڵ دەكات و هەمو پێشكەوتنێك بەرەو دوارۆژێكی پرشنگدار دوادەخات

هــــەروەها ئــــەم دەزگايــــە بــــەردەوام هــــەوڵدەدا هــــەموو توانــــا شۆڕشــــگێڕو ديموكراتييەكان لەناوبەرێت.

هاوئـاينى نێـوان نەتـەوەى كۆلۆنـى كـوردو دەوڵـەتى ڕەگەزپەرسـت و كۆلۆنيـاليزمى تورك يا بۆ شاردنەوەى ململانێى ئەتنى سودى لێوەردەگـيرێت، بۆيـە شـێخەكان بـوون بـە دەزگايــەكى ئــەوتۆ كۆلۆنياليســتەكان نــاتوانن دەســتەبەر دارى بــن. هــەروەها ئــەو دەوڵەتانەى دەيانەوێت كوردستان لە ئاستى كۆلۆنييەكى نێودەوڵەتى بمێنێتـەوە هـەمان حاڵـەتيان تيـا بـەدى دەكرێت، بـەڵام ميللــەتى كـورد هێشـتا بـارودۆخى نەتەوەيــەكى كۆلۆنيكراويشى نييە، چونكە كوردستان بارودۆخێكى سياسى دياريكراوى نييە.

كاتێك قسە لەسەر شێخ دەكـەين يەكسـەر (كامـەران ئينـان)مـان دێت بـە خـەياڵدا. كامـەران هـەرگيز كـورد بوونـــى خــۆى ڕانەگــەياندووە بــەڵكو بــەردەوام بانگەشــە بــۆ سياســەتى تــەتريك دەكـات. ئينـان شـانازى بــە نوێنەرايــەتى كردنــى ئــەم سياســەتەوە دەكاتو بە پەرۆشەوە كار بۆ جێبەجێ كردنى دەكـات. ئەگـەر ئـەمڕۆ خوێنـێ لـە لوتـى توركێكـى بولگارسـتان بێـت ئـەوا سـبەينێ سـەيدا ئينـان پـرۆژەى بڕيـارێكى بـەم دەقــە پێشـكەش بـە ئەنجومـەنى ئوروپـا دەكـات: "توركــەكانى بولگارســتان دەچەوســێننەوەو بولگارسـتان مافـە مرۆڤايەتييـەكانى تــورك ڕەتدەكاتــەوە بۆيــە پێويســتە ئەنجومــەنى ئوروپــى دژى ئــەو مامەڵـە نامرۆڤانەيـە ڕێوشـوێنى پێويسـت بگرێتەبـەرو دەبـێ گوشـار بخەينـە سـەر بولگارسـتان بـۆ ئـەوەى گوێڕايـەڵى ئـەو بڕيارانـە بێـت. ئينـان بـە هــەمو توانايەكى خۆيەوە هــەوڵدەدا ئــەندامانى ئەنجومــەنى ئوروپـا بـەم ئاراسـتەيەدا بـەرێت. سـەيدا ئينـان لـە مـاوەى شـەڕى عـراق- ئـێران بەمشـێوەيە ترسـى خـۆى لـە پێشـڕەوى هێزەكانى ئێران بۆ سەر خاكى عراق دەردەبڕێـت: توركـەكانى كـەركوك چييـان بەسـەر دێت، بۆيە لە حكومەتى توركيـا دەپرسـێت سـەبارەت بـە دواڕۆژى توركـەكانى كـەركوك نيازى چى هەيە. بەرامبەر بەم كێشەيە هەستى بە دڵەڕاوكێيــەكى قـوڵ دەكـرد. كـاتێك توركەكانى تراكياى ڕۆژئاوا لە يۆنان و توركــەكانى قوبـرس و ڕوبـەڕوى سـتەم دەبنـەوە هەميشە سەيدا ئينان يەكەم قسەكەرو يەكەم كەسە نـاڕەزايى دەردەبـڕێ. بـەڵام كـاتێك كورد ڕوبەڕوى ستەم و چەوسانەوە دەبێتەوە ئەوا ئينان قڕوقەپى لێدەكـات. بـۆ نمونـە

له هەشتاكان چل گەنجی كورد له زیندانی سەربازی شاری دیاربەكر لەژێر ئەشكەنجە گیانیان لە دەست دا کەچی سەیدا ئینان بەرامبەر بەم ڕوداوە جگە لە بێدەنگی و پشتگوێ خستنی هیچی دی نەکرد. ئینان هەمان هەڵوێست دەنوێنێ ئەگەر گوندێکی کوردنشین ستەمی لێبکرێ یا ڕوبەڕوی تیرۆر ببێتەوە یا ئەشکەنجەی تیا بدرێ یا گەمارۆی بەسەرا بسەپێنرێ. کاتێك (٥٠٠٠) هەزار ژن و منداڵ و پیرەمێردی کورد لە شاری هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی گیانیان لە دەست دا شێخ ئینان دژی ڕژێمی ڕەگەزپەرست و فاشیستی کۆلۆنیالیزمی سەدام حوسەین ناڕەزایی دەرنەبڕی. بەڵام هەمو توانایەکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی مەینەتی و ئازاری تورکەکانی کەرکوك و تراکیای ڕۆژئاوا سووك بکات، کەچی کاتێك میللەتی کورد ڕوبەڕوی مەینەتیەکی زۆر ترسناکترو دڵەڕەقانەتر دەبێتەوە سەیدا ئینان فزە ناکات.

دەوڵەتی تورکیا پێویستیەکی زۆری بەو جۆرە شێخانە هەیە. ئەو جۆرە شێخانە بانگەشە بۆ ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەکەن و نکۆڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن و بەبێ هیچ کۆت و بەندێك بەرگری لە ناسنامەیەك دەکەن کە دەوڵەت و سیاسەتی ڕەگەزپەرستی کۆلۆنیالیزمی تورکیا زۆر پێویستی پێی هەیە.

دەست نیشانکردنی ئەو پارتەی (کامەران ئینان) دەچێتە ناوی بێ سودە چونکە هەمیشە له ڕیزی پارتی فەرمانڕەوایە یا لە ڕیزی ئەو پارتەیە کە بەرەو دەستەڵات دەچێت. ئینان بیرۆکراتێکی پایەبەرزە.

حکومەتی بولگارستان له سەرەتای هەفتەی یەکەمی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩ دەستی بە ڕاگواستنی تورکەکانی بولگارستان کرد. ژمارەی ڕاگوێزراوەکان لە ماوەیەکی کورتدا گەیشتە (١٠٠٠٠) هەزار تورك بەڵام لە سەرەتای مانگی ئاب ژمارەی ڕاگوێزراوەکان گەیشتە (٢٣٠٠٠) هەزا کەس و لە کۆتایی هەمان مانگ ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠٠٠٠) هەزار کەس، کارگەیشتە ئەوەی حکومەتی تورکیا ناچار بوو سنوری خۆی لەگەڵ بولگارستان دابخات. هیچ ڕێکەوتننامەیەك بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی ڕاگواستن لە نێوان حک ومەتی تورکیاو بولگارستان نەبوو تورکەکانی بولگارستان تەنها ڕێگەی بڕێك پارەو کەلوپەلێکی کەمیان پێدەدرا بۆیە ئەم حاڵەتە بووە مایەی ناڕەزاییەکی توندی

نوێنــەرانی حکومــەت و دەوڵــەتی تورکیـا. حکومــەتی تورکیـا بەرامبـەر بـــە ڕاگواســتنی زۆرەملێی بولگاریا هەوڵیدە دا پەرچەکردارێکی گونجاو لە لایەن دەزگا نێودەوڵەتیــەکانی مـافی مـرۆڤ و ڕای گشـتی ڕۆژئـاواو دەوڵەتـە ڕۆژئاواییەکانـەوە مسۆگەر بکــات، بــەڵام کـاتێك ئـەو لایەنانـە پەرچـەکردارێکی پێویسـتیان نـەنواند، پیـاوانی دەوڵـەتی تورکیـاو سیاســەتمەداران و ڕۆژنامــەو ڕادیــۆو تەلــەفزیۆن و پارتـــە سیاســـییەکان و ســـەندیکا کرێکارییـــەکانی وەك ڕێکخـراوی (تورکیـش) و دەزگـــا یاســـاییەکانی وەك ســـەندیکای پـارێزەران و زانکۆکـانی تورکیـا.. هتـد، ڕەخنەیـەکی توندیـان ئاراسـتەی دەزگاکـانی ڕای گشتی ڕۆژئاواو حکومەتە ئوروپاییەکان و پارلەمانی ئوروپا دەکرد.

وەزیـری دەوڵـەت (کامـەران ئینـان) لـە پـاریس کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەنوسـی بەسـت. ئینان لەو کۆنگرەیەدا (ڕەخنەیەکی توندوتیژی ئاراستەی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان و ڕای گشتی و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی ئوروپـا کـرد. دەوڵەتـە ڕۆژئاواییـەکان لەبەرئـەوەی فشاریان بۆ بولگاریا نەهێنابوو لەسەر ئەو سیاسـەتەی بەرامبـەر بـە تورکـەکان پیـادەی دەکرد بۆیە ئینان بە گرتنەبەری سیاسەتی دووریی تاوانباری دەکردن. هـەروەها ئینـان بولگارسـتانی وشـیارو ئاگـادارکردەوە کـە هێمنـی و ئـارامی تورکیـا بـۆ مەبەسـتی خـۆی نەقۆزێتەوە (ڕۆژنامەی Milliyet، ڕۆژی ١٩٨٩/٦/٢٧).

لە هەفتەی یەکەمی مانگی حوزەیرانی ١٩٨٩ دا هەزاران کوردی پەنابەر لە ئوردوگـای قزلتەپە دەرمانخوارد کران. ژمارەیەك لە دەرمانخواردکراوەکـان توشـی ئیفلیجـی بـون و هێندێکی دییان نیشانەی ترسناکیان لێدەرکـەوت. بـە پێـی گەواهینامـەی ژمارەیـەك لـە پەنابەرە ڕاکردوەکانی ئوردوگـای قزلتەپـە نـانی پەنابـەرەکان بـە مـادەی کیمیـایی وەك ژەهری مشك ژەهراوی کرابو. تاوانباران بۆ ئەوەی بە ئاسانی تاوانەکەیان ئـەنجام بـدەن هەویرەکـەیان بـە شـرینقە ژەهــراوی کردبـو بــەڵام خۆشــبەختانە گـەرمی تەنورەکـە کاریگەری ژەهراوەکەی لەسەر ژیانی پەنابەران کەمکردبووە.

کوردەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە پیاوانی هـەوالگری تورکیـاو عـراق ئـەو کارەیـان ئـەنجام داوە. پیـــاوانی هــەوالگری عراقــی بــە هاوکــاری ژمارەیــەك وەرزێــری گونــدی (کاباڵا)ی نزیك بە ماردین کە پەیوەندیی بازرگانییان لەگەڵ عـراق هـەبو ئـەو کارەیـان

ئــەنجام داوە (گۆڤــاری Medya Gunesi 2000 e Dogru، ژمــارەی ١٩٨٩/٨/١٨، گۆڤــاری حوزەیران و مایس ١٩٨٩، ل ٢٥).

دوای ئــەوەی ڕۆژنامــەکان ئــەم هەواڵــەیان بڵاوکــردەوە، دەســـتەڵاتدارانی تورکیــا ڕێگەیان بە کەس نەدا هاتوچۆی ئۆردوگاکە بکات، هــەروەها ڕێگــەیان بــە پەنابــەرانیش نــەدا لــە قزلتەپــەو مــاردین پێداویســتییەکانیان بکــڕن. ژمارەیــەك وتــەبێژی حکومـــەت حاشـایان لـەو ڕووداوە کــردو ئـەم وتانــەیان بڵاودەکـردەوە: "لــە دوای لێکۆڵینــەوە هیــچ ئاســەوارێکی دەرمــانخواردکردن لــە ڕیزەکــانی پێشــمەرگە بــەدی نــەکراوە" (ڕۆژنامــەی Tercuman، ڕۆژی ١٩٨٩/٦/١٠). بــاڵوێزی عــراق لــە ئەنقــەرە عــەبدول جــەبار جــەواد (عبدالجبــار جــواد) لــە وتەیــەکدا دەڵێــت: هێزەکــانی بــارزانی پەنابــەرە کوردەکــانی قزلتەپەیان دەرمانخوارد کردوەو هەر ئەوانیش هەڵەبجەیان قــەتلوعام کــرد (ڕۆژنامــەی Milliyet، ڕۆژی ١٩٨٩/٦/٢٧).

حکومەتی ڕەگەزپەرستی فاشیستی و کۆلۆنیالیزمی عراق سیاسەتی سوتماك لە دژی کوردەک انی باشوری کوردستان پیادە دەکات و بە دەیان شارو گوندی کوردنشــینی لەســەر زەوی ســڕیوەتەوەو کــورد لــە زێــدی باوباپــیرانی دەردەکــات و بــە کۆمــەڵ بــۆ ناوچــە بیابانیەکانیان دوردەخاتەوەو لە ئۆردوگای زۆرەملێ دەســت بــە ســەریان دەکات. ڕژێمــی سەدام حوسەین تاوانی ترسناکی دەرهەق بە کوردەکانی باشوری کوردستان ئەنجام داوە.

پرۆســەی دەرمــانخواردکردنی کوردەکــانی ئۆردوگــای قزلتەپــە هاوکــات بــو لەگــەڵ پرۆسەی ڕاگواستنی بە کۆمەڵی تورکەکانی بولگارستان بۆیە پــر بایەخــە ئاگــاداری ئــەو کات دیاری کردنە بین. لە تورکیــا زۆر بــە گــەرمی پێشــوازی لــە تورکــە ڕاگوێزراوەکــانی بولگارستان دەکرا. تورکیا ڕەخنەیەکی توندی ئاراستەی ڕای گشتی ڕۆژئاوا دەکرد لەبەر ئەوەی بایەخی زۆریان بە چەوسانەوەی تورکەکانی بولگارستان نەدابوو. ڕێك لە هەمان کاتدا ئەو کامەران ئینانەی بەرامبەر بــە نکولێکردنــی لــە ناســنامەی نەتەوایــەتی خــۆی پۆســتی گرنگــی لــە دەوڵــەت پێدەســپێردرێ وەك وەزیـــری دەوڵــەت دوای بەســـتنی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی دەکرد. سەیدا ئینان لــەو کۆنگــرە ڕۆژنامەنوســیەدا "ســتەمی بولگــار"ی بــۆ ڕۆژنامەنوســەکان شــیدەکردەوە بــەڵام ئینــان لەســەر چەوســاندنەوەی

کوردەکانی باشوری کوردستان و دەرمانخواردکردنی ئۆردوگای قزلتەپە قسەی نەکرد چونکە کامەران نکۆڵی لەو جۆرە کێشانە دەکرد. ئینان نوێنەرایەتی ئەو هاووڵاتیانەی رۆژهەڵاتی دەکرد کە بە هەوڵ و کۆششی ئەوان دەوڵەتی تورکیا دامەزرابوو بۆیە پێویستە هاووڵاتیانی رۆژهەڵات لە هەمو سوچێکی ئەم دونیایە لە تورك زیاتر بایەخ بە کێشەکانی تورك بدەن و کێشەی کورد پشتگوێ بخەن و مافی ئەوەیان نیە هیچ شتێك لەسەر کورد بزانن و بە شێوەیەك رەفتار بکەن وەك ئەوەی کێشەی کوردیان نەبێت. بەڵام ئەگەر لە حاڵەتێکدا ناچار بون شتێك بڵێن ئەوا پێویستە ئەمە بڵێین: ئێمە هەمومان تورك و موسڵمانین و لە سایەی یەك ئایندا ماوەی هەزار ساڵە پێکەوە دەژین.

بە دڵنیاییەوە سیاسەتی بولگاریا بەرامبەر تورکەکان شایانی ئەوەیە ریسواو شەرمەزار بکرێ و دەبێ بە شێوازێکی کاریگەر رەخنە لەو سیاسەتە بگیرێ. بەڵام ئەو راستیەی حاشای لێناکرێ ئەوەیە کاتێك تورکە راگوێزراوەکانی بولگارستان دەگەنە تورکیا لە لایەن جەماوەرێکی زۆری تورکیاوە پێشوازی گەرمیان لێدەکرێ و هەمو یارمەتیەکی پێویستیان پێشکەش دەکرێ و دەرفەتی ئەوەیان پێدەدرێ سود لە هەمو شوێنە خزمەتگوزارییەکان وەربگرن بۆ ئەوەی یەکسەرو بەبێ کۆسپ کێشەکانیان چارەسەر بکەن. ئایا دەتوانین هەمان شت لەسەر کوردەکانی باشوری کوردستان بڵێین کە بە زۆر لە نیشتمانی خۆیان وە وەدەرنران و تاڵی و سوێری دورخستنەوەی بیابانەکانیان چێشتوە؟ کوردەکان بە تۆپزی لە نیشتمانی خۆیان دەرکران و لەنێو خەڵکانی ناحەز نیشتەجێ کران و نازانین کێ پێشوازی لێکردن و چۆن لە تاراوگە پێشوازییان لێکرا. دورخستنەوەی ناوخۆی وڵات زۆر بێبەزەییانەترو بەسوێترە. هەروەها ئەگەر بپرسین ئەو کەسانەی لە ترسی چەکی کیمیایی پەنایان بۆ تورکیا هێنا چییان بەسەرهات؟ ئەو تورکانەی لە بولگارستانەوە رایانکردبوو وەك هاووڵاتی ئاسایی پێشوازییان لێدەکرا بەڵام کوردەکانی باشوری کوردستان چۆن پێشوازییان لێدەکرا؟ ئێمە زۆر باش دەزانین چۆن پێشوازییان لێکرا ئەو کوردانە لە ئوردوگای زۆرەملێی چواردەور گیراو بە تەلی دڕکاوی دەست بەسەر کران و رێگە بە دانیشتوانی ناوچەکە

نەدرا یارمەتییان بدەن و لە سادەترین پێداویستی ژیان بێبەش کران و ئەو کۆمەکانەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ بە ناوی کوردەوە ڕەوانەی کردبوو لەسەر سنور گلدرایەوەو پاشان بۆ شوێنەکەی خۆی ڕەوانە کرایەوە، زۆربەی منالآن بە هۆی سەرماو سۆڵەو لەبەر بێ شیری دەمردن، بۆیە ناتوانرێ کێشەی کوردەکانی باشوری کوردستان و کێشەی تورکەکانی بولگاریا بەراورد بکرێت. بەڵێ: تورکەکانی بولگارستان پارەو کەلوپەلێکی کەمیان لەگەڵ خۆیان بۆ تورکیا هێنا بەڵام ئەو کوردانەی لە ترسی چەکی کیمیایی کوردستانیان بەجێهێشت جگە لە ژیانی خۆیان هیچی دییان بۆ ڕزگار نەکرا چونکە هەرچی سامان و کەلوپەلیان هەبو لە شوێنەکەی خۆی سوتێنرا. لە بەرامبەر ئەم واقیعەدا "هاووڵاتیانی ڕۆژهەڵات" لە وێنەی سەیدا کامەران ئینان کاتێك ئەو کێشانە پشتگوێ دەخەن دەیسەلمێنن چ توانایەکی مەزنیان هەیە و بە هۆی ئەو توانایەشیانەوە بەرزترین پۆست بە بیرۆکراتیەتی تورکیا وەردەگرن.

## گرنگی تەبایی تورك- ئیسلام و مەسەلەی کورد

تەبایی تورك- ئیسلام یەکێکە لە فۆرمە هەنوکەییەکانی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی. ئێستا لە ناوچە کورد نشینەکان پڕوپاگەندەکانی تەتریك ڕوبەڕوی بەرگری دەبێتەوە. هەروەها بە هۆی ئەو پەرچەکردارەی بەرامبەر ئایدۆلۆجیای پارتی بزوتنەوەی نیشتمانی و چالاکییەکانی لە ئارادایە جەخت کردن لەسەر پرۆسەی تەتریك کارێکی ئاسان نیە، لەبەرئەوە پێویستیان بە دروشمێکی تازە هەبوو کە هەمان ناوەڕۆکی هەبێت بەڵام جەخت لەسەر ئیسلامەتی بکات. ئەم دروشمە بە شکڵی تەبایی نێوان تەتریك و ئیسلام کەوتەڕوو. ئەم دروشمە تەنها لە کوردستان پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێ. لە ساڵی ١٩٨٤ بە دواوە وەزارەتی کاروباری ئاینی چەندین تیمی بە ناوی "تیمەکانی چاودێری" دامەزراند (ڕێنمایی کردنی گیانی و ڕەوشتی) و لە شارەکانی ماردین، سێرت، هەکاری، وان، ئەلازیخ، بنگوڵ، ئاگری، ئادیامان، قارەمانماراش، ئورفە، دیاربەکرو تونجەلی، هەروەها لە گوندو شارۆچکەکان و گازینۆو مزگەوت و فێرگەو سەربازگەکان کۆڕی ئایینیان دەبەست. لە کاتی وتوێژەکان هەوڵدەدرا ئایدۆلۆجیای

ئـــەتاتورك و ئیســـلام لـــە یـــەکتری نزیـــك بکرێنـــەوەو کردەوەکـــانی پـــارتی کارگـــەرانی کوردستانیشیان بە دژی ئیسلام و مۆڤایەتی بـە خـەڵکی دەناسـاندو داوایـان لـە میللـەت دەکرد دژایەتی ئەو پارتە بکات.

پێویستە لەم چوارچێوەیەدا گفتوگۆ لەسەر تەبایی تورك- ئیسلام بکـەین. هـەروەها لـە زانکۆکـان لیژنـەی لـەو جۆرەیـان دروســتکردو مامۆســتایانی زانکـۆش هـەوڵیاندەدا بەرگری لەو بیروبۆچونە بکەن(٣).

هاوئاینی لە نێوان کـورد و ئـەو دەوڵەتانـەی کوردسـتان وەك کۆڵۆنییـەکی هاوبـەش دەچەوسـێننەوە هەڵـەی کوشـندەی لـە هەڵسـەنگاندن لێدەکەوێتـــەوەو دروشمـــی (بـــرای ئاینی) دەبێتە هۆی شێواندن لە شـێوازی خسـتنەرووی کێشـەو داواکـاری و ئامانجـەکانی میللـەتی کـورد. هـەروەها هێندێك جـــار ئـــەو دروشمـــە ڕێگـــە لـــە دەربڕینـــی هەســـتی نەتەوایەتی کورد دەگرێت.

دەوڵەتـــە کۆڵۆنیالیزمـــەکان بـــە پێـــی هەلومـــەرجی بـــاوی سیاســـی و کۆمەڵایـــەتی هـەوڵدەدەن دژایـەتی مێژویـی نێـوان عەلـەوی و سـوننە قـووڵ بکەنـەوە. لـە ڕێگـەی بەگژاکردنەوەی کوردە عەلەوی و سوننەکان هەوڵدەدەن سـیمای نەتەوایـەتی مەسـەلەی کورد بسڕنەوەو هەمو توانای خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد وەك شـەڕی نێوان ڕێبازە ئاینییەکان بکەوێتەڕوو.

ئایدۆلۆجیای ئاینی چـاوەڕوانی ئـەوەی لێدەکـەن گەشـەکردنی هەسـتی نەتەوایـەتی لاواز بکات و کۆسپ بۆ بزوتنەوەی نەتەوایەتی دروست بکات. تەنـها لـە کوردسـتان ئـەو کـارە پیـادە دەکـەن. ئەمـــەش مانـــای وایـــە ڕێگـــەگرتن لـــە گەشەســـەندنی بزوتنـــەوەی نەتەوایەتی کورد ئەو ئەرکە تایبەتەیە کە ئاید ۆلۆجیای ڕەسمی لە کوردستان بە ئـاینی ڕاسپاردوە. بەڵام ئەگەر لێکۆڵینەوە لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی جیهان بکـەین ئـەوا دەبینـین لـە زۆر شـوێنی دونیـا ڕێبـازی نەتەوایـەتی و هەسـتی ئـاینی تێهـەڵکێش کراوە. بەمشێوەیە بزوتنەوەی مەهدی لە سـودان لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەمدا وەك بزوتنەوەیەکی ئاینی دەهاتە بەرچاو وەك ئەوەی هەوڵ بۆ هێنانەدی ئامـانجێکی ئـاینی بـدات بـەڵام ئەگـەر لـە نزیکـەوە لێکۆڵینـەوە لەســەر ئـەم بزوتنەوەیـە بکـەین ئنجـا

ڕوندەبێتەوە لە پشت ئایدیای ئاینیەوە ڕەگەزێکی نیشتمانی هەبوە لە واقیعدا خودی ئەم بزوتنەوەیە بوە مایەی ئەوەی عەرەبی سودان شۆڕش لە دژی بریتانیا بەرپا بکات. هەمان شتیش لەسەر بزوتنەوەکەی عومەر موختاری لیبیا لە سەردەمی مۆسۆلینی پیادە دەبێ لەم حاڵەتەدا عەرەب لە ڕوانگەی ئایینەوە شۆڕشیان دەکرد دژی ئیتالییەکان.

لە لایەکی ترەوە دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کە هەموو بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی جیهان لە قۆناغێکی دیاریکراودا ئایدۆلۆجیای ئاینی بەکاردێنن. بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال لە ناوچەی ئەنادۆڵ لە دژی یۆنانی و ئەرمەنەکان باشترین نمونەیە.

بێگومان تەبایی تورك-ئیسلام پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە شۆڕشی پێشمەرگانەی خەڵکی کوردستانەوە هەیە چونکە لەگەڵ گەشەسەندنی خەباتی گەریلا دەوڵەت بە فڕۆکە جۆرە بڵاونامەیەکی بەسەر خەڵکی کوردستاندا دابەشدەکرد ناوی هیچ لایەنێکی لەسەر نەبو. دەوڵەت لە ڕێگەی ئەو بڵاونامانەوە داوای لە خەڵکی کوردستان دەکرد دژایەتی پارتی کارگەرانی کوردستان بکەن چونکە پارتی کارگەرانی کوردستان دەستدرێژی دەکاتە سەر کچ و ژنیان و شەرەفیان دەشکێنێ و بۆیە پێویستە لە سەریان سنورێکی بۆ دابنێن. بەڵام لەبەر ئەوەی دەوڵەت پارێزگاری لە ئیسلام دەکات پێویستی بە هاوکاری جەماوەر هەیە تا بتوانێت دژایەتی ئەو چەتە ڕێگرانە بکات..

یەکێك لەو ئەنجامە گرنگانەی خەباتی گەریلا لە کۆمەڵگەی کوردەواری بە دەستی هێناوە پرۆسەی بیرکردنەوەو وتووێژکردنە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قوڵترو چڕتر دەبێتەوە. بەڵام ئەو پرۆسەیە دوای ئەوەی تورکیا بە هاوکاری ڕژێمی عراق هێرشی ئاسمانی کردە سەر باشوری کوردستان بە گوڕتر بو. ئێمە کێین؟ بۆچی ئێران و عراق و سوریا و تورکیا هەریەکێکیان بەشێك لە کوردستان داگیر دەکەن؟ بۆچی کوردستان دابەش و پارچە پارچە کراوە؟ بۆچی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" دژی نەتەوەی کورد پیادە دەکرێ" کام خاڵی لا واز نەتەوەی کوردی کردوە بە ئامانجی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە"؟.. هتد. مەبەست لە تەبایی تورك-ئیسلام ئەوەیە ڕێگە لە فراوان بونی ئاستی

ئـەو گفتوگۆيانــە و قووڵبونــەوەی ناوەڕۆکەکـەی بگـرێ. لەبەرئـەوە گـەریلا بـە "چەتــە کۆمۆنیسـتەکان" و "نۆکـەری گـاوران" و "دزان" و "خائنـانی نیشـتمانی" و "ئەرمــەن کوژەکـان" و "تـۆڕی پیـاوکوژان" و "ڕێکخـراوی مافیـا" و.. هتـد، وەسـف دەکـەن. بۆیــە دەوڵـەت داوا لـە دانیشـتوان دەکـات شـان بــە شــانی هێزەکــانی حکومــەت دژی گــەریلا بەشداری جیهاد بکەن[٤].

بەڵام ناوچەی ئەنادۆڵی ناوەڕاست و ناوچەکانی هاوشانی دەریـای ئیجـە کێشـەیەکی ئـەوتۆیان نـەبوو پێویسـت بـە نـاردنی تیمــەکانی چـاودێری بکـات و بــە هەلیکۆپتــەر بڵاونامە بەسەر دانیشتوانەکەیدا بڵاوبکەنەوە.

لە بەشی پێشووی ئەم کتێبەداو لە ڕێگـەی نوسـینەکانی بەهجـەت کەمالـەوە بۆمـان دەرکەوت دەوڵەت لە مـاوەی حوکمڕانـی تـاك حزبیـدا چۆن موڵکـدارە گـەورەو سـەرەك خێڵـەکانی هەڵدەسـەنگاند. هــەروەها وەزعــی ئــەو کەســانەشمان لــەنێو ئــەو توێژانــە ڕونکردۆتەوە کە ئامادەبون لە پێناوی هێنانەدی مافە نەتەوایەتییەکاندا خەبات بکەن.

## بنـاغە کلاسیکییەکـانی بیرۆکەی نیشتمانپەروەری

### لەنـاوبردنی و ئە نجامەکانی

نۆکەرایـەتی شێخ و موڵکدارە گەورەو سـەرەك خێڵـەکانی کوردسـتان پەیوەندییـەکی تونـدوتۆڵــی هەیـــە بـــە ڕێگـــەگرتن لـــە گەشـــەکردن و بڵاوبونـــەوەی بیرۆکـــەی نیشتمانپەروەرییەوە. کاتێك چینێکی باڵادەست دەبێت بە چینێکـی بـەکرێگیراو مانـای داڕوخـانی ئـەو چینــە دەگەیـەنێت کـە ئـەرکی سەرشـانی بـوو بـەرگری و پشـتگیری لــە بیرۆکـەی نیشـتمانپەروەری بکـات. ئەگـەر کۆمەڵگـەی کـوردەواری خــۆی مێــژوی خــۆی دروسـت بکردایـەو گەشـەی بـە میکـانیزمی نـاوەکی بدایـەو کاریگـەرە دەرەکیـەکان ئـەو میکانیزمەیان لەناو نەبردایە ئەوا گەشەکردنی سەرمایەداریش سـیمای ئاشـکرای دەبـو، چونکە بورجوا زییەکی کورد دروست دەبو ناسنامەی نەتەوایـەتی خـۆی هـەبو یـا هـێزە

فیودالەکان دەبون بە توێژی بورجوازی و بــە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆیانــەوە پابـەند دەبـون. کـاتێك قسـە لەســەر بورجــوازی ئــەڵمانی و ئینگلــیزی و ڕوســی و فرەنســی و عـەرەبی و تورکـی و فارسـی دەکــەین دەبینــین دەســت نیشـانکردنی ئــەتنی هەمیشــە دەورێکـی گرنـگ وازیدەکـەن. هـەروەها ڕەگەزنامـەی بورجـوازی مانایـەکی پـڕ بایــەخی هەیــە چونکــە بورجــوازی لــە پەیوەندییــە نێودەوڵــەتێکانیدا نکۆڵــی لــە ناســـنامەی نەتەوایەتی خۆی ناکات.

کــاتێك بورجــوازی عــەرەب یــا تــورك بــۆ نمونــە چاویــان لــە نوێنــەرانی هـــێزە ئیمپریالیەکان دەکەوێت هەرگیز نکۆڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان ناکەن.

## چینی باڵادەست نیە بەڵکو چینی بەکرێگیراو هەیە

پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر سێ ڕەهەندی سەرەکی ئەو دیاردەیە بکرێ کە لە سـاڵی ١٩٤٠ بەدواوە خەریکە لە کوردستان بەرجەستە دەبێت. ڕەهـەندی یەکـەم ئـەو هەوڵانـە دەگرێتەوە کە شـێخو موڵکـدارو سـەرەك خێڵـەکان دەکاتـە بـەکرێگیراو. ڕەهـەندی دوەم پـەیوەندی بـەو سیاسـەتەوە هەیـە کـە پشـتگیری لـە مانـەوەی دەزگـاو بـەهای سیسـتمی فیوداليزم دەکات و بە هەمو شێوازێك دەیەوێت گەشەکردنی سەرمایەداری بـە شـێواوی بمێنێتە وە. هەروەها هەموو ئامادەبوونی پێویست وەردەگرن بۆ ئەوەی سەرچاوەی ئـەو سەرمایەی دەکرێ لە ڕۆژهەڵاتدا بخرێتە گەڕ بۆ ڕۆژئاوا بگوێزرێتەوە.

گرنگیەکی زۆری بۆ حکومەت و دەوڵەتی تورکیا هەیە سەرمایەگوزاری لە ڕۆژئـاوای وڵات بکرێ نەك لە ڕۆژهەڵات با سەرمایەکەش زۆر کـەم بـێو سـەرمایە لـە ڕۆژهـەڵاتدا ناخرێـتە گـەڕ تەنـها لـە لایـەن دەوڵەتـەوە نـەبێت. دەوڵـەت بــە مــەرجێك ڕێگــە دەدا سەرمایە لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات بگوێزرێتەوە کە خاوەن سەرمایەکان بــە ڕەچەڵـەك کورد نەبن. ئەمەش سێیەم ڕەهەندی دیاردەکەیەو بەشێکی گرنگ لە سیاسەتی دەوڵەت پێکدەهێنێت.

گروپـه جیاوازەكـانی چـەپی توركیـا بـە هـەمان بیروبۆچوونـەوە ئـەم بابەتــە ڕاڤــە دەكـەن و قسـە لەسـەر توركیایـەك دەكـەن كـە دوو چینــی باڵادەسـتی تـورك و كـورد بەشـداری لــە حوكمــی توركیــادا دەكــەن و دەڵێــن لەبەرئــەوەی بورجــوازی هاوكــاری ئیمپریالیزم دەكات بۆیە ئەمڕۆ بورجوازییەك بە ناوی بورجوازی نیشـتمانی نیـە. ئـەو وتانە بەدحاڵی بونێكی گەورەو زۆرێك چەمكی شێواوی تیایە. بێگومان ئەو بیرۆكەیەی دەڵێت دوو چینی باڵادەستی تورك و كورد حوكمڕانی توركیـا دەكـەن بـە هیـچ جۆرێـك ڕاست نیە چونكە موڵكدارو شێخ خێڵە كو ردەكان وەك بورجوازی كورد بەشداری حوكم ناكەن لەبەرئەوەی نكۆڵییان لە نەتــەوەی كـورد كـردوەو وازیـان لـە بـەهای نەتەوایـەتی كورد هێناوەو دژایەتی ئەو كەسانەش دەكەن بەرگری لە بەها نەتەوایەتییـەكانی كـورد دەكەن، هەروەها دەوڵەتی توركیاو بورجوازی تورك بە هەندەكی (جزئی) بــە هاوپشـكی ئەو كەسانە ڕازی دەبن بەو مەرجەی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی پەیڕەو بكەن و بە تەواوەتی لە ئایدۆلۆجیای دەوڵەتی توركیادا بتوێنەوە. ئەمە سەرەڕای ئـەوەی هاوپشـكییان قبـوڵ ناكرێ ئەگەر ئامادە نـەبن لـە كوردسـتان نۆكەرایـەتی بـۆ دەوڵـەتی توركیـا بكـەن بۆیـە ناكرێ پێ یان بوترێ چینی باڵادەست بەڵكو پێناسەی چینی بـەكرێگیراو پـڕ بـە پێسـتی ئەو كەسانەیە ئەویش لەبەرئەوەی هەرگیز بەكرێگیراو نابێت بە چینی باڵادەست.

لەوانەیـە قوڵبونـەوە لـەم بابەتـە سـودی هـەبێ. ئـەو چینانــەی بـە نـاوی چینـە باڵادەستەكانی توركیا یا بورجوازی توركیـا دەناسـرێتەوە چییـان پێدەكرێ؟ پـەیوەندی ئـابوری و سیاسـی و كولتـوری پیشـەوەرو بـانكدارو بازرگانـەكان چۆنــە؟ بــەناوبانگترین خێزانی بورجوازی توركیا لە وێنـەی ئەجزاجباشـی Eczacibasi و كـۆچ Koc و سـایانجی Sabanci ئـەوانی دی چـۆن ڕەفتـار دەكـەن؟ چ ئـەركێكیان لەسـەر ژیـانی كۆمەڵایــەتی و كولتوری هەیە؟ بۆ نمونە كاتێك یەكێك لەو بورجوازییەكانی تورك ڕۆمانێكی جـوان یـا شـیعرێكی توركـی نایـاب دەنوسـێت یــا لــە بــواری زمــان و ئــەدەبی توركــی یــەكێكیان لێهەڵدەكەوێ خەڵاتی دەكەن. ئەمە لە پاڵ ئــەو خەڵاتـە جۆراوجۆرانـەی كـە دەوڵـەت و بانك و پیشەسازو پیشەوە رەكان بۆ هەمان مەبەست تەرخانیان كردوە. لە بواری شـانۆو مۆسیقاو وەرزش و وێنەشدا خەڵاتی لەو بابەتـە هەیـە. ئەوانـە بـە مەبەسـتی هـاندانی

شیعرو ئـەدەب و وێنـە و مۆسـیقاو شـانۆو وەرزش خـەڵات دابەشـدەکەن، هـەروەها بـە پێویستی دەزانن بواری پەیوەندی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی تورکیـا لێکۆڵینـەوەی زانسـتی لەسـەر بکـرێ و پرۆسـەی پـەرەپێدانی سیسـتمی فـێرکردن و زمـان و کولتـوری تورکـی بایـەخی زیـاتری پـێ بـدرێ چونکـە بورجـوازی تورکـی ئـەو کارانـە بـە ئـەرك و مـافی سەرشانی خۆی دەزانێت. ئەو هەمو بایەخ پێدانەش بۆ ئەوەیە تورکیا لـە چوارچێوەی پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ دەوڵەتـە ئیمپریالیـەکاندا سـەربەخۆیی ناسـنامەی خـۆی بپارێزێت. گەشەپێدانی پـەیوەندی لەگـەڵ دەوڵەتـە ئیمپریالیـەکان هیـچ مـەرجێك بـۆ دەستبەرداربون لە ناسنامەی نەتەوایەتی دانـانرێ. ئـەو کەسـانەی جیـهان بـە ئـەدەب و وێنەو شانۆو کولتوری تورکیا دەناسێنن. خەڵاتی مادی و مەعنەوی دەکرێن.

بـەڵام ئـەم کـارە بـۆ کـورد بـە تـەواوەتی جیـاوازە. ئایـا دەوڵەمـەندە کوردەکـان لـە موڵکدارو شێخەکان قەت خەڵاتیان بەسەر نوسەران دابەشکردوە یا کۆمەکی دارایی ئـەو کەسانەیان کردوە کە شارەزاییان لە زمانی کوردی هەیە؟ ئایا تاکە کوردێکی بازرگـان یـا خـاوەن پیشـەیەك شـانازی بـە بـەهای نەتەوایـەتی کـوردەوە دەکـات؟ ئایـا ئـەو کەسـانە پشتگیری لە پێشکەوتنی زمـان و کولتـوری کـورد و فراوانکردنـی پانتـایی بـەکارهێنانی، دەکەن؟ ئایا بورجوازی کورد پشتگیری و کۆمەکی چالاکی مۆسیقاو وێنەو شانۆی کوردی دەکات؟.. هتد؟

کورد ئەو جۆرە بورجو ازییەی نیە. ئەگەر پشتگیریکردن و هاندانی ئـەدەبی کـوردی بەلاوە بنێین، تەنانـەت خـودی ئـەو کەسـایەتیە شۆڕشـگێڕو دیموکراتخـوازە کوردانـەش ڕوبـەڕوی ئیجارائـاتی سـەرکوتکەرانە دەبنـەوە کـە داوای مـافی ئاخـاوتن و نوسـین بـە زمـانی کـوردی دەکـەن. هەڵوێسـتی شـێخ و موڵکـدارو سـەرەك خێڵـەکان بەرامبـەر بـە پێشخستن و هاندانی زمان و کولتوری کـورد زۆر بـاش دەزانـرێ بۆیـە بـە هەڵـە دەچـین ئەگەر بـڕوا بکـەین بـەوەی شـارەزایانی زمـانی کـوردی یـا ئەوانـەی کـار بـۆ پێشخسـتنی زمانی کوردی دەکەن خەڵات دەکرێن بـەڵکو بـە پێچەوانـەوە دژایـەتی دەکرێـن و لـەلای دەستـەڵاتداران لێیان دەخوێنن و بەمـەش سـۆزی دەسـتەڵاتداران بـۆ خۆیـان ڕادەکێشـن، لەبەرئـەوە بـە چینـی باڵادەسـت دانـانرێن بـەڵکو بـە توێژێکـی بـەکرێگیراو دادەنرێـن.

لەگەڵ ئەو ڕاستیانەشدا دوپاتی دەکەنەوە دوو چینی باڵادەستی تورك و کورد پێکەوە حوکمڕانی تورکیا دەکەن. هەرچەندە موڵکدارو سەرەك خێڵەکان بە ڕەچەڵەك کوردن بەڵام لە ناخەوە هەست بە تورکبونی خۆیان دەکەن، ڕاستە لە دایك و باوکی کورد کەوتونەتەوە بەڵام بە پێی پێودانگی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی خۆیان بە تورك دەزانن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو کەسانە لە چوارچێوەی پەیوەندیەکانیان بە دەوڵەت و چینی باڵادەستی تورکیاوە نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن و هاوکاری نێوان ئەم دوو چینەش پشت بەم بنەمایە دەبەستێت.

نوسەرو هونەرمەندە تورکەکان شانازی بە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیانەوە دەکەن. ئایا نوسەر یا هونەرمەند یا سیاسەتمەدارانی کورد جەخت لەسەر ئنتمای نەتەوایەتی خۆیان دەکەن؟ باشتر وایە لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر چەمکی بورجوازی بکەین. ناوەڕۆکی ئابوری ئەم چەمکە بایەخێکی ئەوتۆی نیە مادامەکی لە هەمو بارێکدا ئەم چەمکە ناوەڕۆکێکی ئەتنی هەیە وەك "بورجوازی تورکی" و "بورجوازی ئەڵمانی" و "بورجوازی عەرەبی". پێم وایە موڵکدارو بازرگان و پیشەوەرو شێخ و بەڵێندەرە گەورەکان و.. هتد، ئەوانەی نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن و ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەوڵەتیان کردوە بە ئایدۆلۆجیای خۆیان و بەرامبەر بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی دە وری بەکرێگیراو دەبینن سیفەتی "بورجوازی کوردی"یان تیا نیە چونکە بورجوازی کوردی جگە لە هێنانەدی مافە نەتەوایەتییەکانی میللەتی کورد هیچ مانایەکی دی نیە.

شتێکی ئاشکرایە چینی باڵادەستی کورد بە مانای وشە چینێکی گەندەڵە. ئەمەش مانای وایە ئەو چینەی گەشە بە هەستی نەتەوایەتی دەداو بەردەوامی گەشەکردنی دەستەبەر دەکات و بونی دەبێتە بنەمای ئەوپرۆسەیە توشی گەندەڵی و داوەشان بووەتەوەو زۆر زەحمەتە هێنانەدی گەشەکردنێکی تەندروست بە پرۆسەیەك پشت بە بناغەی چینایەتی نەبەستێ. ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی گەشەکردنی ناتەواوی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردستان گریمان بورجوازییەت تایبەمەندییە نیشتمانییەکانی لە دەست داوەو بووە بە بورجوازی بازرگانی: ئەم گریمانەیە ناتوانێ

دیاردەی یەکگرتنی موڵکدارو سەرەك خێڵ و شێخ و بازرگان و پیشەوەرو بەڵێندەرە گەورەکان لە بواری ئاوەدانکردنەوە وە لەگەڵ چینی باڵادەستی تورکدا ڕاڤە بکات چونکە تەنها ئاماژەکردن بەوەی هاوکاری دەوڵەت دەکەن نە ئەم ڕەفتارە ڕاڤە دەکات و نە شەقڵی چینایەتییان دیاریدەکات لەبەرئەوەی لە هەردوو حاڵەتەکەدا زاراوەی نیشتمانپەروەری مانایەکی دی دەبەخشێت. کاتێك دەڵێین ئەمڕۆ بورجوازی خەسڵەتە نیشتمانییەکانی لە دەستداوە دەمانەوێت بڵێین بورجوازی نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی نەتەوە ناکات بەڵکو بۆ ئەوەی وڵات بچەوسێنێتەوە هاوکاری ئیمپریالیزم دەکات. بەڵام لەو حاڵەتەشدا بورجوازی تورکی بۆ نمونە نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی ناکات و تەنازول بۆ شتێك ناکات پەیوەندی بە ناسنامەی نەتەوایەتییەوە هەبێت.

بورجوازی تورکی وەك تورك درێژ بە پەیوەندییەکانی خۆی دەدا هەروەك چۆن بورجوازی عەرەبی و ئێرانی و یۆنانی و.. هتد، وەك خۆیان درێژە بە پەیوەندییەکانیان دەدەن. بەڵام بێگومان باوردۆخەکە لە کوردستان جیاوازە چونکە ئەم پەیوەندییە تا ڕادەیەکی زۆر بۆ کورد سروشتێکی کۆنەپەرستانەی هەیە. ئەو موڵکدارو سەرەك خێڵ و شێخانەی لە بۆتەی بورجوازی تورکیدا تواونەتەوە بایەخ بە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد نادەن. بەڵکو هەمو توانایەکی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی بورجوازی تورك هەم سامانی کوردستان بدزێ و هەم کارئاسانی لە چەوسانەوەی زیاتری خەڵکی کوردستان دەکەن. بەڵام تێزەکەی من دورتر دەڕوات. کاتێك ئەو خەڵکانە میانەیان لەگەڵ چینی باڵادەستی تورك خۆشدەکەن ئیتر نکوڵی لە ناسنامەی کوردایەتی خۆیان دەکەن و کوردبونی خۆیان ڕەتدەکەنەوەو ناسنامەی نەتەوەی سەردەست هەڵدەگرن- واتە نەتەوەی تورك- بۆیە تا ئەم پرۆسەیە بەردەوام بێت ئەو کەسانەش لە بۆتەی نەتەوەی سەردەست دا دەتوێنەوەو نکوڵی لە ناسنامەی تایبەتی خۆیان دەکەن.

پێویستە لە گرنگی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییە کەم نەکرێتەوە، چونکە ئەم دیاردەیە بونیادێکی جیاوازو شەقڵێکی تایبەتی بە کۆمەڵگەی کوردەواری دەبەخشێت.

لەوانەیە جارێکی دی لە سەرتاسەری ئەم دونیایە کۆمەڵگەیەك بە تایبەتمەندێتی کۆمەڵگەی کوردەواری نەدۆزینەوە.

سەرەڕای ئەوەش هەر جار ناجارێك هێزەکانی ئاسایشی تورکیا ڕاپۆرت بەم دەستەواژانە دەنوسن: "ئەو خێڵانەی دۆستایەتی دەوڵەت دەکەن و ئەو خێڵانەی دژایەتی دەوڵەت دەکەن" یا "ئەو موڵکدارە گەورانەی لایەنگری لە دەوڵەت دەکەن و ئەوانەشی دژایەتی دەوڵەت دەکەن". بەڵام ئەم دەستەواژانە مانایەکی ئەوتۆی تیا بەدی ناکرێت دژایەتی ئەو قسانەی سەرەوە بکات بۆیە ئەو شتانە تاکە شتێك بە ڕونی ئاشکرا دەکات: هەرچەندە ئەو کەسانە ئامادەگی نۆکەرایەتیان هەیە بەڵام دەوڵەت بەردەوام بە گومانە لێیان. لە کاتی دادگاییکردنی ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٧١ لە بڕیارەکانی تاوانبارکردنی یانەکانی کولتوری شۆڕشگێڕی لە ڕۆژهەڵات چەند بڕگەیەکی لەو ڕاپۆرتانەی تیایە کە وەزارەتی ناوخۆو سەرکردایەتی جەندرمەی تورکیا نوسیویانە. ئەو "ڕاپۆرتە نهێنیانە" وەك بەڵگەیەك لە دژی تاوانبارەکان بەکارهێنراون. گۆڤاری Eogra 2000 لە ژمارەکانی ٢٠-١٩٨٧/١٢/٢٦ یەکێك لەو ڕاپۆرتە نهێنیانەی لەسەر خێڵە خائن و خێڵە دۆستەکانی سەر بە دەوڵەتی بڵاوکردۆتەوە.

بەپێی ڕونکردنەوەکانی سەرەوە بارودۆخی شێخ و موڵکدارو سەرەك خێڵە کوردەکان بۆ دو قۆناغی جیاواز دابەشدەکرێ: قۆناغی یەکەم لە ساڵی ١٩٢٥ بۆ ساڵی ١٩٣٨ دەست پێدەکات. لەم قۆناغەدا هێندێك موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵ پشتگیریان لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کورد دەکرد بۆیە ئەو کەسانە بە شێوازی جۆراوجۆر پاکتاوکران. بەشێکیان لە کاتی شەڕەکاندا کوژران و هێندێکیان لە کاتی لێکۆڵینەوە یا لە کاتی گرتن لەژێر ئەشکە نجەدا گیانیان لە دەست دا و هێندێکی دی لە سێدارە دران و بەشێکی دییان لە تاراوگەی ناوخۆی تورکیا یا لەکاتی ڕاکردن بۆ دەرەوەی تورکیا مردن.. هتد. بەشێك لەو موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵانەی بەشدارییان لە شۆڕشەکانی کوردستاندا کردبو لە ڕێگەی بەرتیل و خۆفرۆشتن و نۆکەرایەتی کردن ژیانی خۆیان ڕزگار کرد بەڵام کاتێك تورکیا شۆڕشەکانی دامرکاندەوە ئەوانیشی لەگەڵ ئەو کەسانە دورخستەوە کە بەشدارییان لە شۆڕش دا کردبوو.

کۆمەڵگەی کوردەواری پێش دامەزراندنی کۆماری تورکیا سیمای ئاشکرای خۆی هەبوو، بۆیە دەکرێ لە ڕووی سروشتی پەیوەندییەکان و ئامرازو شێوەکانی بەرهەمهێنان کۆمەڵگەی کوردەواری لەو سەردەمەدا بە کۆمەڵگەیەکی فیودالی دابنرێ. خێڵ و گوندەکانی ئەو سەردەمە وێنەی کۆمەڵگەیەکی داخراو بوو تەنها بە بەرهەمی خۆکرد دەژیان، ئەمەش کۆمەڵگەی کوردەواری والێکرد بە ڕووی دونیای دەرەوە نەکرێتەوە. ئیمپریالیزم و کۆڵۆنیالیزم بە هۆی ئەم بونیادە داخراوەی کۆمەڵگەی کوردییەوە نەیانتوانی بە تەواوەتی کوردستان کۆنترۆڵ بکەن. زۆربەی موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکانی ئەو سەردەمە هەستی نەتەوایەتییان هەبوو بۆیە بەردەوام قسەیان لەسەر کوردایەتی دەکردو حوجرەی خوێندنیان بۆ وتنەوەی زمانی کوردی دروستدەکرد و حیکایەتخوانی شارەزای گۆرانی و چیرۆکیان لە ماڵەوە ڕادەگرت، هەروەها شێخ و سەرەك خێڵەکان دەروێش و بێدەرەتانێکی زۆریان لە ماڵەکانی خۆیان بەخێو دەکرد.

ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی مانەوەی زمان و کولتوری کوردی ڕاڤە دەکات. لە کاتی شۆڕشەکانی سەردەمی عوسمانی یا لە ماوەی ساڵانی یەکەمی دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا وموڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکان بە هۆی پلەوپایەو دەسەڵاتیانەوە سەرکردایەتی شۆڕشەکانیان دەکرد یا دەست پێشخەرییان دەکرد بۆ ئەوەی جڵەوی شۆڕش بگرنە دەست. بەڵام ساڵی ١٩٨٤ و لە دوای پەلامارەکانی هێزەکانی گەریلا لە ئیرۆو شەمدینلی بە سەرکردایەتی پارتی کارگەرانی کوردستان گۆڕانێکی بنەڕەتی لە بواری سەرکردایەتی ڕوویدا.

قۆناغی دوەم لە چلەکانەوە دەست پێدەکات کە بە قۆناغی دەرکەوتنی بورجوازی و سەرەتای سەرمایەداری دادەنرێ. لەم قۆناغەدا موڵکدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵەکان لە چوارچێوەی ئەم پرۆسەیە لە ڕووی داراییەوە بون بە نۆکەر.

لە سەرەوە باسمان کردوە چۆن مانەوەی دەزگاکانی موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکان هاوکاری قەدەغەکردنی زمانی کو ردییان کردوە بۆیە ئەگەر ئەم دیاردەیە بە "بورجوازی کورد" ببەسترێتەوە ئەنجامی قێزەونی لێدەکەوێتەوە. ئایا لە جیهاندا

بورجوازییەك هەیە نكۆڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی بكات و بانگەشە بۆ بەهاكانی نەتەوەی سەردەست بكات؟

ئێستا دەتوانین ئەم پرسیارە بكەین: دوای ئەوەی ئەو چینە كۆمەڵایەتیەی بنەماكانی بەرەو داڕوخان دەڕوات، نەیتوانی نوێنەرایەتی و بەرگری لە بەها نەتەوایەتێكان بكات، ئایا بەرگریكردن یا دەربڕینی بیرو هەستی نەتەوایەتی ناكەوێتە سەرشانی ئێمە؟

ئایا پێویست نیە دژی سەركوتكردنی زمان و كولتوری كوردی ڕاپەڕین؟ بەڵێ، پێویستە بەرگری لە زمان و كولتوری كورد بكەین و دژی ئەو كردەوانە ڕاپەڕین كە زمان و كولتوری نەتەوەی كورد ڕوبەڕوی دەبێتەوە. پێویستە لێكۆڵینەوە لەسەر ئەدەبو زمان و مێژوی كورد بكەین و كاری جیدی بكەین بۆ ئەوەی هەستی نەتەوایەتی كورد گەشە بكات. ئەمەش ئەركی سەرشانی هەمو شۆڕشگێڕو دیموكراتخوازێكە.

بەڵام لێرەدا ڕوبەڕوی جۆرێك لە شێواندن دەبینەوە. ئەم شێواندنەش ناگەڕێتەوە بۆ فیكری شۆڕشگێڕو دیموكراتخوازەكان بەڵكو ئەنجامێكی ئەنقەستی بونیادی كۆمەڵگەی كوردەوارییە. لەپاڵ ئەو دیاردە ناشرینانەش پێویستە لە نێو پرۆسەی گەشەكردنی كۆمەڵگەی كوردەواری ئەم ڕەهەندەمان بیرنەچێتەوە: هەر بزوتنەوەیەك موڵكدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵ و بازرگان و پیشەوەران بەشداری تیا نەكەن بزوتنەوەیەكی دیموكراسیە چونكە ئەو بزوتنەوەیەی لە ڕێگەی ململانێی ئەو هێزانەوە دروست بێت ڕەگەزی دیموكراسی تیا سەروەر دەبێ بۆیە تا موڵكدارو شێخ و سەرەك خێڵ و بیرۆكرات و بازرگانەكان بەرهەڵستی ئەم بزوتنەوەیە بكەن ئەوا ڕەگەزی دیموكراسی دەبێتە پێشەنگی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد.

ئەو ئەركەی دەكەوێتە سەر شانی شۆڕشگێڕانی كوردو پێویستە زۆر بابەتییانە بەجێی بهێنن بریتیە لە: پاراستن و بەرگریكردن لە زمان و كولتوری كورد دژی ئەو كەسانەی نكۆڵیان لە بەهای چینایەتی خۆیان كردوە. بەشێكی گەورەی تەوژمەكانی چەپی توركیا ئەم بیرۆكەیە جۆرێك بە شێواوی دەیبینن و دەڵێن پێویستە شۆڕشگێڕان

نێونەتەوەییانـە بیربکەنـەوەو بـە پێـی ئایدۆلۆجیـای چینـی پرۆلیتاریـا ڕەفتـار بکـەن چونکـە مەسـەلەی نەتەوایـەتی ئـەرکی شۆڕشـگێڕانی نێونەتـەوەیی نیـە. هـەرکاتێك شـۆڕش هاتـەدی و سیسـتمێکی سوسیالیسـتی دامـەزرا ئـەم مەسـەلەیەش خۆبـەخۆ چارەسەر دەبێ. لەبەرئەوە پێویستە شۆڕشگێڕان تەنازول بۆ هیچ شتێك نەکەن. چەپی تورکیـا تـا پێش سـاڵی ١٩٨٠ بـەرگری لـەم هەڵوێسـتە دەکـردو تەنانـەت تـا ئێسـتاش خـەڵکانێك هەیـە داکۆکـی لـەم هەڵوێسـتە دەکـەن وەك ئـەوەی بونـی مرۆڤـی شۆڕشـگێڕ لەسەر ئەم بیرۆکەیە بەند بێ. ئەم هەڵوێستە یەکەمجار وەك هەڵوێستێکی ڕاسـت دێتـە بەرچاو بەڵام ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی ڕاستی بارودۆخی کوردسـتان تـاوتوێی بکـەین ئـەوا نـەك هیـچ مانایـەك نابەخشـێت بـەڵکو پێمـان دەڵێـت بەرامبـەر بـەو ڕێوشـوێنە سـەرکوتکەرانەیەش دەستەوەسـتان بـین کـە زمـان و کولتـوری میللـەتێکی چەوسـاوە ڕوبەڕوی دەبێتەوە. ئەم هەڵوێستە بە تەواوەتی فیکرو ڕێو شوێنەکانی چینی باڵادەست بەهێز دەکات. هەروەها دوبارە کردنەوەی وتەکانی لینین و سـتالین سـەبارەت بـە مـافی چارەی خۆنوسینی گەلان ئەم کێشـەیە چارەسـەر ناکـات. لـە لایـەکی دی ئـەم بیرۆکەیـە مانـای قبولکردنـی دیـاردەی کۆنەپەرسـتی وەك دیـاردەی تواندنـەوەو تـەتریك کردنـی میللەتی کورد دەگەیەنێت(٥).

## بارودۆخی کوردستانی باشورو ڕۆژهەڵات

ئـەو بارودۆخـەی سـەرەوە زیـاتر پـەیوەندی بـە کوردسـتانی بـاکورەوە هەیـە. بـەڵام بـارودۆخی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان (ئـێران) و باشـوری کوردسـتان (عـراق) تـا ڕادەیـەك جیاو ازی هەیە. سیاسەتی تەعریب و تەفریس لە ئێران و عراق سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست نەهێناوە یا لەبەر ئەوەی ئەو دوو دەوڵەتە وەك پێویسـت سـور نـەبون لەسـەر جێبـەجێ کردنـی سیاسـەتی تـەعریب و تـەفریس پێش دامـەزراندنی کۆمـاری تـازەی تورکیا دەستی پێکردووەو کوردەکانی ناوچەی خوراسان و ئیدارەی شـارەکانی کوردسـتان باشترین نمونەی سیاسـەتی تـەفریس کردنـە، هـەروەها سـەرەتاکانی تـەعریب کـردن لـە تەمـەنی دەوڵـەتی عـراق کۆنـترە بـەڵام سـەردەمی حوکمڕانـی بـەعس بـە دژوارترین

قۆناغی کورد دادەنرێت چونکە بە مەبەستی پیادەکردنی تەعریب کردنی کوردو خاکەکەی سل ٭ لە سیاسەتی جینۆسایدیش نەکراوەتەوە). لە ئێران ئەگەر پێکهاتەی فرە نەتەوەیی کۆمەڵگەی ئێران لەبەرچاو بگرین کە لە ئازەرو کوردو تورکمان و بەلوچ و عەرەب پێکدێت خودی نەتەوەی فارس دەبێت بە کەمایەتی. عراق تا ساڵی ١٩٣٢ لەژێر ئینتدابی بریتانی (کۆلۆنی) بو. ئینگلیز و فرەنسی و هێزە ئیمپریالیەکانی دی سیاسەتی سڕینەوەی ناسنامەی ئەتنیان لە کۆلۆنیەکانی خۆیان پیادە نەکردوە. کاتێك عراق کۆلۆنی بریتانی بو دەرفەتی گەشەکردنی بە زمانی کوردی درابو، هەروەها تایبەتمەندییە میللیەکانی نەتەوەی کورد خۆی چەسپاند بو. بە هۆی ئەم بارودۆخە نەتوانراوە نکۆڵی لە بونی کورد بکرێ.

عراق و ئێران دەوڵەتێکی نێوەندی زۆر بەهێزیان نەبو. دەوڵەتی ساوای عراق وەك بەشێك لە نەتەوەی عەرەب تازە دروست کرابو، هەرچی ئێرانیشە نەتەوەکانی دی لەچاو فارس زۆرینە پێکدەهێنن. لەم هەلومەرجەدا کورد بۆ بەدەست هێنانی مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی پەنای بۆ چەك بردوەو هێندێك مافی دیاریکراوی بە دەست هێناوە. بۆیە لەو هەلومەرجەدا ئەستەم بوو نکۆڵی لە نەتەوەی کورد بکرێت.

پەیوەندی نێوان موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵەکان و دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان لە هەرد وو پارچەکەی کوردستان بە شێوزای جۆراوجۆر گەشەی سەندووە: لە ڕۆژهەڵات و باشوری کوردستان موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵی سەر بە دەوڵەت هەیە. ئێران و عراق بە هەمو جۆرێك پشتگیری لەو کەسانە دەکەن و دژایەتی کوردە شۆڕشگێڕەکانیان پێدەکەن. لە عراق بە گشتی ئەو کەسانە پێیان دەوترێ جاش و دەوڵەت بەرامبەر بە ئەرکە گرنگەکانیان خەڵاتیان دەکات. جاشەکان لە ڕیزی هێزەکانی حکومەت شەڕی براکانی خۆیان دەکەن و حکومەتیش بە پارە پشتگیریان لێدەکات. لە واقیعدا شەڕی نێوان هەردو پارچەکەی کوردستان شەڕی نێوان پێشمەرگەو جاشەکانە.

ئەم پەیوەندییە ڕەهەندێکی تایبەتی گرنگی هەیە: موڵکدارە گەورەو سەرەك خێڵ و شێخ و بازرگان و بیرۆکراتە کوردەکان لە عراق و ئێران پەیوەندی توندیان بە

هەردوو دەوڵەتەکەوە هەیە بەڵام دەوڵەت وەك کورد مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و ئەوانیش ئەو ڕاستییە دەزانن و وەك کورد هەڵسوکەوت دەکەن.

لەم ڕووەوە نمونەیەکی بێشومار هەیە، جیهانگیر ئاغا لە ئێران و بەشیر ئاغای هەولێری لە عراق پەیوەندییان بە ڕژێمی خومەینی و سەدام حوسەین هەیە. بەڵام نابێ ئەم دیاردەیە بە یەکێتی نێوان هێزە باڵادەستەکان تێبگەین وەك یەکێتی نێوان موڵکدارو شێخ و سەرەك خێڵ و بازرگانەکانی کورد و نێوان بورجوازی عەرەب و ئێرانی. ئەم دوو دەوڵەتە تەنانەت کاتێك ناسنامەی کورد قبوڵ دەکەن سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" چڕتر دەکەنەوە چونکە عراق و ئێران بەردەوام و چالاکانە "کوردە چاونەترسەکان" لە دژی "چەتە کوردەکان" بەکاردەهێنن بۆیە خەڵاتی مادی و مەعنەوی کوردە چاونەترسەکانیان دەکەن.

بێگومان ئەم نمونەیە هەرگیز لەسەر موڵکدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵە کوردەکانی عراق و ئێران پیادە ناکرێت لەبەرئەوەی زۆرێك لەو کەسانە پلەو پایەی بەرزیان لە شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی هەیە. بەڵام ئەو کەسانەی دژایەتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەکەن، دەوڵەت بە شێوەیەکی باشتر بەرژەوەندی چینایەتیان دەپارێزێ.

## چەپی تورك و مەسەلەی کورد

کارێکی بەسودە ئەگەر هەڵوێستی ئەم قۆناغەی چەپی تورکیا بەرامبەر بە مەسەلەی کورد ڕونبکەینەوەو لەسەر ئاستی دوو ڕەهەند دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین. لە ساڵانی شەستەکان واتە لە دوای کودەتاکەی ١٩٦٠/٥/٢٧ چەپی تورکیا لە قۆناغی گەشەکردنی وتوێژی لەسەر کۆمەڵێك مەسەلە دەکرد بە مەسەلەی کوردیشەوە. تەوژمە جۆراوجۆرەکانی چەپی تورکیا چارە سەرکردنی مەسەلەی کوردیان بە پێویست دەزانی بەڵام زۆربەی ئەو گفتوگۆو باسانە لەسەر ئاستێکی دیاریکراو ئەنجام دەدرا بۆ ئەوەی کەمالییەکان جاڕز نەکەن بۆیە پێویستە ئەم دیاردەیە بە هەوڵێکی پۆزەتیڤانە هەڵسەنگێنین بەڵام نابێ زیادەڕەوی لە هەڵسەنگانیدا بکەین. ئەم

دیاردەیە بە هەوڵی کوردەکانی – واتە ئەو کوردە شۆڕشگێڕانەی بە ڕەچەڵەك کورد بون- نێو بزوتنەوە سیاسییە جیاوازەکان بەرجەستە بو. هەڵوێستی چەپی تورك لە ساڵانی بیستەکان و سییەکان بەرامبەر بە مەسەلەی کور هەڵوێستێکی کەمالییانە بو، واتە دەتوانین بڵێ ین هەڵوێستێکی دوژمنانەی بەرامبەر بە کورد هەبوو.

ڕەهەندی دوەمی ئەم مەسەلەیە کاریگەری نێگەتیڤانەی چەپی تورکە بەرامبەر بە بزوتنەوەی کورد. ئەم کێشەیە بە تایبەتی پەیوەندی بە گرنگی و بەهای وشەی نەتەوەی "نەتەوەپەرستی" هەیە لەبەرئەوەی ئەو بیروڕایانەی پەیوەندی بە نەتەوەپەرستی تورك و کوردەوە هەیە لە ڕووی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە جیاوازی زۆریان هەیە. تورك نەتەوەیەکی سەردەستە بۆیە نوسین و قسەکردن بە زمانی تورکی کێشەیەك دروست ناکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هیچ گرفتێکی ئەوتۆی نیە تا دەزگاکانی حکومەت یا کەرتی تایبەت خەڵاتی ئەدەبی لەسەر دابەش بکەن.

دەوڵەت لە ڕێگەی دەزگا زانستیەکانی هەر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە تا زانکۆکان و لە ڕێگەی ئیدارەی گشتی و زیندان و سوپاو پۆلیس و ڕادیۆو تەلەفزیۆن، هەوڵدەدا زمانی تورکی پێشبخات. هەروەها پێشکەوتنی زمان و ئەدەبی تورکی ڕەهەندێکی پڕ بایەخی بۆ ئایدۆلۆجیای ڕەسمی هەیە.

بەڵام کورد نەتەوەیەکی بندەستەو مافی نەتەوایەتی و دیموکراسی لێزەوتکراوەو لە ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا دابەش و پارچە پارچە کراوە. هەمو ڕێوشوێنێکی پێویستیان گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی زمان و کولتوری کورد لەناوبەرن و نەتەوەی کوردیش لە بۆتەی نەتەوە دراوسێکان دا بتوێننەوە. هەروەها هەمو دەزگاکانی گوشاری ئایدۆلۆجیای دەوڵەت وەك دەزگاکانی پەروەردەو زانکۆو پارتە سیاسیەکان و ئاین و خێزان و ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن.. هتد، بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە بهێننەدی.

کاتێك ئەو دەزگایانە ئامانجە داواکراوەکان بەدی ناهێنن، پەنا بۆ دەزگاکانی هێزو زەبرو زەنگ دەبەن وەك دەزگاکانی پۆلیس، بەندیخانە، دادگا، هێزی چەکدارو جەندرمەو.. هتد، بۆ ئەوەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەناوبەرن، وەك ئەوەی

نکۆڵی کردنی چینی باڵادەست ی کورد لە ناسنامەی خۆی و بونی بە چینێکی بەکرێگیراو و توانەوەی لەناو چینی باڵادەستی تورك بەس نەبێت بۆ ئەوەی ئامانجە خوازراوەکان بەدی بهێنن. لەم هەلومەرجەدا کارێکی لۆجیکیە هێندێك کۆمەڵی دیاریکراو بەرگری لە خاسێتە نەتەوایەتییەکانی خۆیان و بەرهەڵستی ئەو ڕێوشوێنە سەرکوتکەرانەیە بکەن کە دژیان بەکاردەهێنرێ. هەڵبەتە لێرەدا پاراستنی بەها نیشتمانی و تایبەتمەندییە نەتەواییەکان دێتە ئاراوە، لەبەرئەوە ئەرکی سەرەکی هەمو شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازێکە لەو چوارچێوەی لە سەرەوە باسمان کردوە بەرگری و پارێزگاری لە بەها نیشتمانییەکان بکەن. چەپی تورکیا "نەتەوەپەرستی" و شۆڕشکردن و بەرگریکردن لە بەها نەتەوایەتییەکان یاساغ دەکات و شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازەکانی کورد بە ناشۆڕشگێڕو نەتەوەپەرستی تاوانبار دەکات. ئەو ڕەخنانەش کارێکی زۆری کردە سەر شۆڕشگێرە کوردەکان، بۆیە دەبینین لە ساڵانی شەستەکان کورد لە ترسی ئەوەی بە نەتەوەپەرست تاوانبار نەکرێن تەنانەت لە نێوان خۆشیان بە زمانی کوردی قسەیان نەدەکرد و نەیاندەوێرا بە ئاشکرا بە خۆیان بڵێن کوردو هەوڵێکی زۆریان دەدا بۆ ئەوەی بە دڵسۆزترین لایەنگری مارکسیزم و لینینیزم دەربکەون و لەوەش زیاتر هەوڵیان دەدا خەسڵەتی کوردایەتییان بشارنەوە.

لە پێش هەشتاکان تاوانبار کردنی شۆڕشگێڕانی کورد بە نامارکسی و نالینینی بە سوکایەتی دادەنرا بۆیە کوردەکان لە هەمو کەسێك زیاتر خۆیان بە مارکسی و لینینی پیشان دەدا یا بە لایەنی کەمەوە هەوڵیان دەدا لە بنەماکانی ئەم تیۆرییە شارەزایی پەیدا بکەن. بۆیە هەر کەسێك بە "نەتەوەپەرستی" تاوانبار بکرایە هەستی بە سوکایەتی دەکرد. چەپەکان بەرهەڵستی سەرکوتکردنی زمان و کولتوری کوردی و ئازادی قسەکردن بە زمانی کوردی و داواکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد بە جۆرێك لە نەتەوەپەرستی دەزانن. لە لایەکی دی بیرۆکەی نەتەوەپەرستی وەك تاوانێکی ڕووت و بێناوەڕۆك بەکاردەهێنرا چونکە جیاوازییان لە نێوان نەتەوەپەرستی نەتەوەی سەردەست و نەتەوەپەرستی نەتەوەی بندەست نەدەکرد. بەمشێوەیە ئەڵپاسلان تورکیش (سەرۆکی پارتی بزوتنەوەی نەتەوەی فاشیستی) و مەلا مستەفای

بارزانی- یان لەیەك  تویێژ پۆلێن دەكرد. ئایا كام سیاقی كۆمەڵایەتی- سیاسی لەگەڵ نەتەوەپەرستی یەكدەگرێتەوە؟ چ كەسێك بە "نەتەوەپەرست" وەسف دەكرێ؟ داواكاری نەتەوەپەرستەكان چیە؟

بۆ نمونە ئەو كەسانەیان بە نەتەوە پەرست تاوانبار دەكرد كە داوایان دەكرد چەوسانەوە لەسەر زمان و كولتوری كورد نەمێنێ و نوسین و قسەكردن بە زمانی كوردی ئازاد بكرێ. ئەركێكی سەرەكی چەپەكانە بەرامبەر بە سیاسەتی رەگەزپەرستیو كۆلۆنیالی و سیاسەتی تواندنەوەی كورد بەرگری لە زمانی كوردی بكەن، لەبەرئەوە پێویستە هێڵێكی جیاكەرەوە لە نێوان نەتەوایەتی نەتەوەی سەردەست و نەتەوایەتی نەتەوەی بندەست دابنێین. دروشمی "توركیای سەربەخۆ" بە بەڵگەی گیانی شۆڕشگێڕێتی دادەنراو دوپاتیان  دەكردەوە كە ئەم دروشمە تەعبیر لە فیكرو كرداری شۆڕشگێڕانە دەكات. بەڵام ئەوانەی قسەیان لەسەر "كوردستانێكی سەربەخۆ" دەكرد بە خەڵكانێكی نەتەوەپەرست دادەنران ئایا بەرزكردنەوەی دروشمی "توركیای سەربەخۆ" مانای ڕازی بون نیە لەسەر دابەشكردنی كوردستان كە لە سەرەتای بیستەكانی سەدەی بیستەمەوە ئیمپریالیزم بەسەر كوردستانیدا سەپاندوە؟  لە سایەی هاوكاری ئینگلیزو كەمالییەكانەوە توانرا سیاسەتی "پەرتكە- زاڵبە" پیادە بكرێ و بەشێكی گرنگی كوردستان بكەوێتە ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی توركیا. بەرزكردنەوەی دروشمی "توركیای سەربەخۆ" بە مانایەك لە ماناكان دانپیانان و پیادەكردنی سیاسەتی ئیمپریالیزم دەگەیەنێت.

ئەگەر لێكۆڵینەوە لەسەر هەڵوێست و بیروڕای چەپی توركیا بەرامبەر بە مەسەلەی كورد بكەین ئەوا پێویستە بە  شێوەیەكی تایبەت جەخت لەسەر ئەم بابەتە بكەین: كێشەكانی توركیا هەمیشە لە دیدی چینە كۆمەڵایەتییەكانەوە چارەسەر ناكرێت بەڵكو پێویستە لە گۆشەنیگای كۆمەڵە ئەتنیەكانیشەوە  لێكۆڵینەوە لەسەر كێشەكان بكەین. ئەو ماركسیستانەی سورن لەسەر ئەوەی لە گۆشەنیگای ململانێی چینایەتییەوە چارەسەری كێشەكان بكەن، لە ڕاستیدا وەك ماركسییەكی تورك مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی كورد دەكەن. ئەمە لە كاتێكدا ڕەنگە دەزگا كۆمەڵایەتی و سیاسی و

ڕێکەوتننامەو ڕوداوە مێژووییەکان مانای جیاوازیان هەبێت ئەگەر لە گۆشەنیگای کۆمەڵە ئەتنیەکانەوە تەماشایان بکەین، بیروڕاکانی (میهری بیلی) باشترین نمونەیە لەسەر ئەو تێڕوانینە.

سەیدا میهری بیلی یەکێکە لە سەرکردە مارکسیستە- لینینستەکانی چەپی تورکیا و شوێنێکی گرنگی لە مێژوی ئەم بزوتنەوەیەدا هەیە. بیلی لە سییەکانی سەدەی بیستەم وەك گەنجێك تورکیای بەجێهێشت و بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان ڕۆیشت و لە ئەمریکا زانستەکانی ئابوری خوێندووە. لە سەرەتای جەنگی جیهانی دووەم گەڕاوەتەوە بۆ تورکیاو لە سوپای تورکیا بوە بە سەرباز. بیلی لە پێش ساڵی ١٩٥٠ وەك دەزگایەکی پێشکەوتنخواز و شۆڕشگێڕ سەیری سوپای تورکیای دەکرد. بۆیە بیلی بە پێویستی دەزانی هەمو سوسیالست و کۆمۆنیستەکان وەك سەرباز لە دژی پەلامارە چاوەڕوانکراوەکەی نازییەکان بەرگری لە وڵات بکەن چونکە تورکیا ئا ئەو کاتە ئەندامی پەیمانی ناتۆ نەبو لەبەرئەوە بیلی دوپاتیدەکردەوە تورکیا سەربەخۆیی خۆی لە دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم پاراستوە. بڕوانە:

(Mihri Belli, Anilar, ed. Por Koray. Durgoren, en Milliyet, 20/6- 30/ 7/ 1989).

هەر تورکێك یا مارکسییەکی تورك هەقی خۆیەتی بەمشێوەیە تەماشای سوپای تورکیا بکات. ئایا کۆمۆنیستێکی کورد یا چەپێکی کورد یا تەنانەت مارکسیستێکی کورد ئەو کارە دەکات؟ سوپای تورکیا هەر لە کاتی دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا زۆر درندانە ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کوردی لەناوبردوە. سوپای تورکیا لە زیلان و دەرسیم تاوانی جینۆسایدی دەرهەق بە دانیشتوانی کورد کردو بە فڕۆکەو بە تۆپ هەمو گوندەکانی ناوچەی (زیلان و دێرسی)یان سوتاند و دانیشتوانی ئەو ناوچانەیان لە بنکە جیاوازەکان دەست بەسەر کردو لە دواییشدا هەموویانیان گوللەباران کرد.

خەڵکی دەرسیم چەندین کەڕەت بەمشێوەیە قەتلوعام کراوە. دەوڵەتی تورکیا هەمو جۆرە ئەشکەنجەیەك بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی داواکارییە دیموکراسی و نەتەوایەتییەکانی کورد لە خشتەی کارەکانی خۆی لابەرێت و میللەتی کورد ناچار بکات واز لە مافەکانی خۆی بهێنێ‌و ترسی لە داواکردنی هەبێت. دەوڵەتی تورکیا بۆ

ئەوەی پشتگیری کورد لە شەڕی دژی یۆنان و ئەرمەن لە ساڵی ١٩١٩-١٩٢١ مسۆگەر بکات، سوپای تورکیاو بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکیا بەڵێنیان بە کورد دەدا مافە نەتەوایەتییەکانی بسەلمێنن و سنوری ناوچە تورك نشین و کوردنشینەکان لە چوارچێوەی یەکێتی و هاوکاری دیار بکەن چونکە شانبەشانی یەکتری پێکەوە شەڕێکی هاوبەش دەکەن کەچی دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا نەك هەر مافەکانی کوردیان نەسەلماند بەڵکو نکۆڵییان لە بونی کوردیش کرد.

مێژووی دونیا بە تەنها لە ڕوداو و فاکتە نوسراوەکانی ناو کتێبەکان دروست نابیّ. بەڵکو گەلێك ڕوداو بە فیعلی ڕویداوە بەڵام لەبەرئەوەی تۆمار نەکراوە سەرنجی ئەو لێکۆڵیارانەی ڕانەکێشاوە کە بایەخ بە خوێندنەوەی مێژو دەدەن. بەرزکردنەوەو گەورەکردنی بەهای ڕوداوە لاپەڕەکان و شاردنەوەی سیمای ڕوداوەکانی دی مەسەلەیەکە بە گشتی پەیوەندی بە کاریگەری ئایدۆلۆجیاوە هەیە بە تایبەتی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی ئەو کارەش زانست ڕەتدەکاتەوە.

ئێمە زانیاری تەواومان لەسەر ئەو تاوانانە هەیە کە هیتلەر بەرامبەر جولەکەکان ئەنجامی داوە چونکە تاوانەکان تۆمارکراون و بون بە بەڵگەنامە، بۆیە دەبینین لە کاتی دادگاییکردندا بڕیاری تاوانبارکردن دەردەکران لەبەرئەوەی تاوانبارو شاهید و پارێزەرو بڕیاری دادوەر هەبو، بەڵام قەتڵوعام و قەڵاچۆکردنەکانی کورد تۆمار نەکراون بۆیە ئەگەرێکی زۆر هەیە ئەو بەڵگەنامە ڕەسمییانەی پەیوەندییان بە ڕوداوەکانەوە هەبوە لەناوبرابێت یا شاردرابێتەوە یا لە شوێنێکدا دانرابێت بە زەحمەت دەستی لێکۆڵیارانی پێدەگات.

بەڵام سەرەڕای تۆقاندن و سەرکوتکردن ڕوداوەکانی ناوەڕاستی ئازاری ١٩٨٨ی هەڵەبجە تۆمار کراو چوە مێژووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە کوشتنی بە کۆمەڵی خەڵکی هەڵەبجە پشتگوێ نەخەین. حکومەتی فەرەنسی ساڵی ١٩٨٩ کۆنگرەیەکی بۆ قەدەغەکردن و لەناوبردنی چەکی کیمیایی سازکرد. کوردەکان بە سیفەتی ئەوەی زۆرجاران لەسەر ئاستێکی فراوان کیمیاباران کراون داوایان کرد بەشداری لە کۆنگرەکە بکەن، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی ئەم چەکەیان لە دژی کورد بەکارهێنابوو ڕازی نەبوون

نوێنـەرانی کـورد بەشـداری لـە کۆنگرەکـە بکـەن. کۆنگـرە داواکـاری ئـەو دەوڵەتانـەی جێبەجێ کردو نوێنەرانی قوربانیەکانی چەکی کیمیایی لە کۆنگرەکە دورخرانەوە. بـە تەنها ئەو ڕوداوە بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین ئاشـکرای دەکات بـاری مافـەکانی مـرۆڤ و مافی میللەتان چەند فشەڵ و پڕ مەترسییە.

لەم حاڵەتەدا پێویستە کورد گەشـە بـە تواناکـانی خـۆی بـدات بـۆ ئـەوەی لـە دیـدی ئەتنیەوە چاودێری ڕوداوە مێژوییەکان بکات چونکە تورك و مارکسیستە تورکـەکانیش بە فیعلی هەر ئەو کارە دەکەن. ناوبەناو مارکسییە تورکەکان دەڵێن لەبـەر سـەرقاڵییان ناپەرژێنە سەر ئەوەی گرنگی بە هێندێـك بابـەتی دیـاریکراو بـدەن. ئـەو جـۆرە قسـانە بەشێك لە شێوازی بیرکردنەوەیان ئاشکرا دەکات کە لە سەرەوە ڕاڤەمان کردوە.

سەیدا (شەفیق حوسنو) یەکێکە لـە پیـاوە ناودارەکـانی چـەپی تورکیـاو لـە جـەنگی جیهانی دوەم بووە بە سەرباز لە سوپای تورکیـا. چـەپ و مارکسـییە تورکـەکان حوسـنو بە سەرکردەی خۆیان دەزانن و پشتی پێدەبەستن بەڵام یەکێکە لـە دوژمنـەکانی کـورد. حوسـنو هەمیشـە دژایـەتی شۆڕشـەکانی کـوردو پشـتگیری لـە کەمالییـەکان کـردوەو دەستخۆشی لە قەتلوعام و قەلاچۆکردن ەکانی کورد کردوەو ئیجرائاتی کەمالییەکانی بە "پێشـکەوتنخوازو شۆڕشـگێڕانە" لـە قەڵـەم داوە. ئایـا چ شـتێك لـەوە سـەیرترە چـەپی تورك داوا لە کورد بکات شەفیق حوسنو وەك سەرکردەیەکی مێژویی بناسێت؟

گفتوگۆکانی نێوان هەردوو گۆڤاری "میدیا گوینئیشی- Medya Gunesi" و "ئۆزگـور گەلەجەك- Ozgur Gelecek " بە دەسپێشخەری گۆڤاری یەکەم گرنگیەکی تایبەتی هەیە، ئەویش دوای ئەوەی گۆڤاری دوەم لە ژمـارەی (٣) لـە بـەرواری ١٩٨٩/٥/٣دا: "بـە بۆنـەی یادی سییەمین (٣٠) ساڵڕۆژی کۆچی دوای دکتور شـەفیق حوسـنو دیمـیر" بانگـەوازێکی بلاوکردەوە، سینان دۆغرو Sinan Dogru لـە گۆڤـاری یەکـەمدا دەڵێت: شـەفیق حوسـنو بوە بە نۆکەری بورجوازی و دوژمنی کورد بۆیە بەشداری لە ئاهەنگی ساڵڕۆژی ناکـەن. بڕوانە:

(“zorunlu Aciklama” si Uzerine Medya Gunesi, No, 10. 1989).

پەیماننامەی لۆزان بەڵگەنامەیەکە بۆ کورد و تورك مانای جیاوازی هەیە.

عوبەیدولای نەهری و عەلی شێرو شێخ سەعیدو ئیحسان نوری و سمکۆ و سەید ڕەزاو قازی محەمەدو مەلا مستەفای بارزانی و گەلێکی دی لە وڵاتپارێزە ناودارەکانی کوردن. بەڵام تورك و چەپی تورکیا بۆ ئەوەی لە پلەوپایەی ئەو کەسایەتیانە کەمبکەنەوە بە کۆنەپەرست و نۆکەری ئینگلیز و ڕێگرو دزو چەتە وەسفیان دەکەن.

## چەمکی "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی"

هێندێك لە سیاسەتمەدارو سەروتارنوسەکانی وەك تورهان فەیزی ئۆغلو Turhan Feyzi Oglu، ئالپاسلان تورکش Turkes Alpaslan، ئیسماعیل جەم Ismail Cem، چوشکون کیرجە Coskun Kirca، ڕەئوف تامور Rauf Tamer ئورغور مومجو Ugru Mumcu و ئەرگون گویزە Ergun Goze کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە ڕێبازی "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" دەگرنە بەر. ئوغور مومجو-ی نوسەر لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ خەلیل بەرکتای Halil Bazktay بۆ گۆڤاری ساجاك Sacak سێ مەرج بۆ سوسیالیزمی تورکیا دادەنێ:

١ -پێویستە سوسیالیزمی تورکیا نەبێتە ئامرازی ڕەگەزپەرستی کەمایەتی واتە بیری کوردایەتی.

٢ -پێویستە چەپی تورکیا لە هەمو بۆنەیەك بە توندی دژایەتی ئەم ڕێبازە ترسناکە بکات.

٣ -پێویستە سوسیالیزمی تورکیا سەربەخۆیی ئایدولوجیای خۆی بپارێزێ. (گۆڤاری ساجاك، ٢٥/ شوبات/ ١٩٨٦، ل ٣٠).

پێویستە بە وردی لێکۆڵینەوە لەسەر ناوەڕۆکی ئەم چاوپێکەوتنە بکرێت چونکە وێنەیەکی نمونەیی هەڵوێست و ڕەفتاری نوسەر و سەروتار نوسەکانی تورکە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد. ئەو نوسەرو سەروتار نوسانەی داواکارییەکانی کورد و بەرگریکردنی لە بون و ناسنامەی نەتەوایەتی خۆی و بەرهەڵستی کردنی تواندنەوەو کردەوەکانی کۆلۆنیالیزم بە "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" ناودەبەن و سورن لەسەر ئەوەی سوسیالیزمی تورك بە هیچ جۆرێك بایەخ بە مەسەلەی کورد نەدات. ئەو

نوسەرو سەروتار نوسانەی چەمکی "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" بەکاردەهێنن هەتا ئێستا بچوکترین ڕەخنەیان ئاراستەی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی حکومەت و دەوڵەتەکەیان نەکردوە کە لێبڕاوانە هەوڵدەدا ناسنامەی نەتەوایەتی کورد بسڕێتەوە. زۆر بە سادەیی، شەرمەزارییە داواکارییەکانی کورد لە پێناوی مافی دیموکراسی و نەتەوایەتی و خەباتی کورد بەم شێوەیە ناوبەرێت. مادامەکی ئەو نوسەرانە چەپڵە بۆ سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی دەوڵەت و حکومەت لێدەدەن و کردەوەکانی بە هەڵوێستی دیموکراسی و شۆڕشگێڕی لە قەڵەم دەدەن بە دڵنیاییەوە دژایەتی ما فە دیموکراسی و نەتەوایەتییەکانی میللەتی کورد دەکەن. چۆن خەباتی کورد لە پێناوی مانەوەو بەرهەڵستی کردنی هەزاران شکڵی سەرکوتکردن کە ئامانجی لەناوبردنی ناسنامەی نەتەوایەتی کوردە بە ڕەگەزپەرستی وەسف بکەین؟ ئایا کورد دەڵێت: "بەهای تاکە کوردێك هاوتای بەهای هەمو دونیایە"؟ ئایا کورد دەڵێت "ئەو کەسە بەختەوەرە کە بە خۆی دەڵێت من کوردم"؟ ئایا کورد دەڵێت "ئەی کورد شانازی بە خۆتەوە بکەو کاربکەو باوەڕت بە خۆت هەبێت"؟ لە چ شتێکدا کورد ڕەگەزپەرستی دەکات؟ ئایا کورد بە مەبەستی بە کوردکردنی تورك و عەرەب و فارسو بە مەبەستی لەناوبردنی ناسنامەی تورك و عەرەب و فارس دەزگای تایبەت دروستدەکات؟ ئایا کورد دەزگای پێویست بۆ بەرجەستەکردنی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی دروستدەکات؟ چ کەسێك ڕێگە بە خۆی دەدا کورد بە ڕەگەزپەرستی تاوانبار بکات؟

ڕادیۆ و ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و دەزگاکانی پەروەردەو دادگاو زانکۆو ئیدارەی گشتیو پارتە سیاسییەکان و ئاین و خێزان و سەندیکا پیشەییەکان و ئەو دەزگایانەی توندو تیژی پیادە دەکەن بەشێکە لە ئامێرەکانی سەرکوتکردنی ئایدولۆجیای دەوڵەت. شتێکی ئاشکرایە ئەو دەزگایانە پێویستن بۆ جێبەجێکردنی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی و سیاسەتی تەتریك.

بەڵام هەر خودی نوسەر دوپاتیدەکاتەوە کە پیادەکردنی ئەنقەستی تواندنەوەی ڕەگەز جۆرێکە لە جۆرەکانی "ڕەگەزپەرستی" و "ئیمپریالییەت".

نابێت ماف و ئازادییە بنەڕەتیەکان لە وڵاتێك پیادە بکرێو وڵاتێکی دی لەو مافانە بێبەش بکرێ. سەرەڕای ئەوەش کاتێك سیاسەتی ئاپارتاید پیادە دەکەن ئیتر ڕووی دزێوی "ڕەگەزپەرستی" و "ئیمپریالی" بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت، واتە کۆمەڵگەیەك کۆمەڵگەکانی دی لە خۆی بەنزمتر دەزانێ و تەنها داوای ئازادی و مافە بنەڕەتییەکان بۆ کۆمەڵگەکەی خۆی دەکات بۆیە ئەو جۆرە کۆمەڵگانە گوناهێك بەرامبەر بە مرۆڤایەتی دەکەن شایانی لێبوردن نیە.

ئێمە ناتوانین ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکان لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دی و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی بگۆڕین و لامان وانەکە بێبەشکردنی ئەم یا ئەو کۆمەڵگە لە مافەکانی زیانی نییە.

(Ugur Mumcu ڕۆژنامەی جمهورییەت، ڕۆژی ١٩٨٣/١٢/١٩).

ئەو دەقەی سەرەوە ڕەخنە لە سیاسەتی تواندنەوەی تورکەکانی تراکیای ڕۆژئاوای یۆنان دەگرێت. کەواتە ئەرکێکی مرۆیانەو دیموکراتییانەیە ڕەخنە لە سیاسەتی تواندنەوەی تورك بگیرێ و پێویستە بەرهەڵستی سیاسەتی تواندنەوە بکرێ مادامەکی لە دژی تورکەکانی یۆنان یا قوبرس یا بولگارستان یا هەر شوێنێکی دی جیهان پیادە دەکرێ. بەڵام ڕەخنەگرتن لە سیاسەتی تواندنەوەو تەتریك کردنی دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر بە کورد ئەوە ئەکرێ تا قیامەت بەردەوام بێ و ڕەخنەگرتن لەم سیاسەتە جۆرێکە لە ڕەگەزپەرستی کەمایەتییەکان. ڕەگەزپەرستی ئەوەیە داوای مافی نەتەوایەتی بۆ نەتەوەی تورك بکەین و بە نەتەوەی کوردی ڕەوا نەبینین، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو پشتگیری ئەو پلان و ڕێوشوێنانەش دەکەن کە ناسنامەی کورد و کوردستان لەناو دەبات.

ئۆغور مومجو Ugwr Mumcu لە وتارێکیدا بە ناوی "دەمامك" دەڵێت: "لە ڕابردو ڕەگەزپەرستی کەمایەتی کۆنەپارێز بە هاوکاری پەنابەران سەریهەڵدا کەچی ئەمڕۆ لەژێر دەمامکی چەپرەوی دەگەڕێتەوە بەڵام ئەگەر ئەو دەمامکە لابەرین جوداخوازیو ڕەگەزپەرستی کەمایەتی بە پاڵپشتی و هاوکاری بێگانە بە نەگۆڕاوی دەمێنێتەوە.. کۆماری تورکیا ئەو شەڕئەنگێزانە تەفرو توونا دەکات و هەمو کارێکی تیرۆریستیش لە

سـايەی كۆمەڵگەيـەكی ئـازادو ديموكـرات لـەناودەبات بۆيـە پێويسـتە نـەيارانی ڕەگەزپەرستی كەمايەتی و نەيارانی هەمو جۆرە تيرۆرێك پێكەوەو دەست لەنێو دەست خۆبەخشانە كاربكەن" (ڕۆژنامـەی جمهوريـەت، بـەراوری ١٣/١٠/١٩٨٤، ووتـارێكی ئۆغـور مومجو بە ناوی شۆڤێنزمی كەمايەتی، هەمان ڕۆژنامە ١٢/٩/١٩٨٤).

ئيسماعيل جـەم Ismail Cem دو وتـاری بڵاوكردۆتـەوە بـە نـاوی: "ئايـا سـەرەڕای شارسـتانی ڕەگەزپەرسـتی هـەر بـەردەوام دەبـێ؟" (Gunes، بـەرواری ٦/١٠/١٩٨٦) و "جوداخوازی ڕاست و جوداخوازی چەپ" (هەمان ڕۆژنامە، بەرواری ١٨/١٠/١٩٨٦)، جـەم لـە هـەردوو وتارەكـەيدا گوزارشـت لـە ديدوبۆچونـەكانی ئۆغـور دەكـات. جـەم بـيرو چالاكييـەكانی كـورد بـە ڕەگەزپەرستی ناودەبـات و پيـادەكردنی سياسـەتی حكومـەتی توركيـا لـە كوردسـتان بـە مەدەنيـەتی هاوچـەرخ دادەنـێ. ئـەو نوسـەرانە پشـتگيری توركەكانی بولگارستان دەكەن كە لە پێناوی ديموكراسی و مامەڵـەی زيـاتری مرۆڤانـەدا خەباتدەكـەن، هـەروەها لـە پێنـاوی پاراسـتنی ناسـنامەی نەتەوايـەتييان دژايـەتی نـاو گۆڕينيشيان دەكەن. لەم نوسينەدا بـە شـێوەيەكی بـەرفراوان بـاس لـە دوو هەڵوێسـتيی بزووتنـەوەی ديموكراتـی كۆمەڵايـەتی توركيـا دەكـەين ئـەو نوسـەرانەی بـەردەوام لافـی چـەپڕەوی لێـدەدەن و خۆيـان بـە بەشـێك لـە بزوتنـەوەی سوسـيال ديموكراتـی توركيـا دادەنێن چۆن چەمكێكی وەك "ڕەگەزپەرسـتی كەمايـەتی" بـەكاردەهێنن كـە سياسـەتی ڕۆژنامـەنوس و نوسـەرە ڕاسـترەوەكان هەميشـە بـەكاريدەهێنن؟ چـۆن بـە دڵنياييـەوە لەسەر بەكارهێنانی ئەم چەمكە بەردەوامن؟

پێويستە ئەو شوێن و كاتە لەبەرچاو بگرێـن كـە ئـەو وتارانـەی تيـا نوسـراوە بۆيـە لـەمرۆوە ڕەوشـی بەندیخانـەی دیاربـەكر لـە دوای كودەتاكـەی ١٢/٩/١٩٨٠ وەبـير دەهێنينەوە كە هێزەكانی ئاسايش زياتر لە (٤٠) شۆڕشگێڕو گەنجی ديموكراتخوازيان تـا مردن ئەشكەنجەدا. ئەو گەنجانەيان كوشـت چونكـە ڕازی نـەبوون بـەوەی بـە دەنگێكـی بەرز بڵێن بە توركبونيان بەختەوەرن، هەروەها لەبەرئـەوەی بـەرگرييان لـە ناسـنامەی كوردايـەتی دەكـردو كـرداری ڕەگەزپەرسـتی و كۆلۆنيـاليزمی و فاشـييانەيان شـەرمەزار دەكـرد. هـەمو كەسـێك دەزانێـت بەنديخانـەی دياربـەكر چ دۆزەخێكـە بـۆ زيندانـی و

کەسوکارەکانیان. بەڵام هاوبیچمەکانی ئۆغور مومجو و ئیسماعیل جەم بە هیچ شێوەیەك ڕەخنە لە سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی و فاشییانەی تورکیا ناگرن کە زەحمەتە لە هیچ وڵاتێکی دونیا وێنەی هەبێت. ئەو نوسەرانە لەسەر ڕەگەزپەرستی و فاشیزم و کۆلۆنیالیزمگەرایی و ئەشکەنجەدان بێدەنگ دەبن و بەو بێدەنگیەشیان پەنجەمۆر لەسەر ئەو کردەوانە دەکەن بەڵام شۆڕشی کورد بە "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" ناودەبەن. ئەو نوسەرانە مافە نەتەوایەتی و دیموکراتییەکانی کورد و پێداویستیەکانی مەدەنیەت بە ناکۆك دەزانن.

بە گشتی نوسەرو ڕۆژنامەنوسەکانی تورکیا بە بیانوی پاساو بارودۆخی باوی کوردستان و بە بیانوی ئەوەی ئایدۆلۆجیای ڕەسمی ڕێگە بە ڕەخنەگرتن نادات گرنگی بە مەسەلەی کورد نادەن و ڕەخنە ناگرن لە کردەوە نادیموکراتییەکانی دەوڵەت لە کوردستان. ئەمەش یەکێکە لە هۆ گرنگەکان بەڵام هۆیەکی نهێنی دی هەیەو ئاشکرای ناکەن. هۆی دوەم دەلالاتی زیاتری هەیە: ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسەکان بڕیاریان داوە دژایەتی کورد بکەن چونکە ملیان بۆ چەوساندنەوەو ستەم کەچ کردووە بۆیە پێم وایە ئەم هۆ گرنگە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسەکانی تورکیا وا لێدەکات بایەخ بە مەسەلەی کورد نەدەن[٦].

کاتێك قسە لەسەر "ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" دەکەن، سەرەڕای ئەو قسانەی سەرەوە پێویستە ناڕەزایی ئەوەش دەربڕین کە کورد کەمایەتی نیە، ئەمە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە بەڵام ناوەڕۆکی بابەتێکی ترە. ئەگەر کورد بە کەمایەتی دابنێین هەروەك سەروتار نوسەکان گەرەکیانە، ئایا پێش ئەوەی کورد "بە ڕەگەزپەرستی کەمایەتی" تاوانبار بکەین پێویست نیە دان بنێین بە بونی کورددا ئنجا بەرگری لە مافی کەمایەتی کورد بکەین؟ ڕۆژنامە نوسەکان لەسەر پێشێلکردنی ئەو مافانەو داواکارییە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی کورد تەنها وشەیەك نانوسن. ئەمەش لایەنی ئەخلاقیی مەسەلەکەیە. ئەو ڕۆژنامەنوسانە لەسەر داواکاری مافەکانی کورد بێدەنگ دەبن کەچی بۆ تاوانبارکردنی کورد دەبن بە کاسەی لە ئاش گەرمتر.

ئەگەر لە نزیکەوە چاوبخشێنینەوە بەو هەلومەرجەی ئەو وتارانەی تیا نوسراوەو لاپەڕەی ڕۆژنامەکان لە دوای جەنگی ئابی ١٩٨٤ هەڵدەینەوە ئەوا دەبینین خەباتی پێشمەرگانەی پارتی کارگەرانی کوردستان لە دژی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا دەبێتە جەمسەری هەموو ڕوداوەکان. ڕۆژنامەنوسەکان سەرەڕای ئەوەی زانیاری تەواویان لەسەر ڕوداوە سیاسییەکان هەیە بەڵام هیچ شتێکی لەسەر نانوسن. هێزی گەریلا لە کاتی هێرشەکانی بۆ سەر هێزەکانی ئاسایش لە ڕێگەی دابەشکردنی چاپەمەنییەوە جەختی لەسەر مافە نەتەوایەتیو دیموکراتییەکانی میللەتی کورد دەکرد، هەروەها گەریلا بە کتێب و نامیلکە لە پاڵ ژمارەیەك داواکاری دی بەرگری لەو مافانەش دەکرد کە پەیوەندی بە هەلومەرجی پێشکەوتنی خودی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە هەبو، سەرباری ئەوەی داوای دەکرد سنورێك بۆ چەوساندنەوەی ڕەگەزپەرستی و کۆڵۆنیالیزمی لەسەر زمان و کولتوری کوردی دابنرێت. ئەو نوسراوانەی کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی گەورەیان لەسەر میللەتی کورد هەبوو. بەڵام ڕۆژنامەکان ناوەڕۆکی ئەو کتێب و نامیلکانەیان بڵاونەدەکردەوە کە گەریلا کوردەکان دابەشیان دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا نوسەرو ڕۆژنامەنوسەکان زانیاری تەواویان لەسەر بڵاوکراوەکان هەبوو بە تایبەت هەندێکیان. پێم وایە پەرچەکرداری نوسەرو ڕۆژنامەنوسە تورکەکان دژی چالاکی ڕاگەیاندنی گەریلا ئاراستە دەکرا بۆیە هەرگیز قسەیان لەسەر ئەو بابەتە نەدەکرد بەڵکو تەنها ئاماژەیان بە پێکدادانی نێوان گەریلاو هێزەکانی ئاسایشی تورکیا دەکرد.

پێم باشە بەبێ درێژەپێدان لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتێکی دی بکەم. پێشتر ئەو شێوازەمان شیکردۆتەوە کە چینە دەوڵەمەندەکانی کوردستان وەك چینی موڵکدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵەکانی کردوە بە چینێکی بە کرێگیراو، و ئەم پرۆسەیە بەرەو کوێ دەڕوات و ئاکامەکانی چی دەبێ. هەروەها پێشتر ئەوەم باسکرد کە چەپ و سوسیال دیموکراتەکانی تورك بە سوکی تەماشای هەست و بیروڕاو کردەوەکانی نەتەوەی کورد دەکەن چونکە سروشی (الهام) وزەو چەمکەکانیان لە نەتەوەگەرایی تورکەوە سەرچاوە دەگرێ بۆیە سوکایەتیکردن بە هەستی نەتەوایەتی کورد و

ڕەخنــەلێگرتنیان بەڵگــەی خۆپەرســتی و دوو هەڵوێســتییانە. لــێرەوە بۆمــان ڕوون دەبێتــەوە کــە ڕۆژنامــەو نوســەرو زانکۆکــانی تورکیــا ئــەو دەزگایانــەن کــە دەرفــەتێکی باشـیان ڕەخساندوە بـۆ پێگـەیاندنی کۆمـەڵی بــەکرێگیراو کـە زیـاتر لـە هـەموان لـە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی تێگەیشتوون و هەمو توانایەکی خۆیـان بـۆ ئـەم ئامانجـە خستۆتە گـەڕ. لـە بەندیخانـەکان بێگوێدانـە هیـچ هەسـتێکی مرۆیـی، گیراوەکـان دەکـوژن و زۆر بێڕەحمانە و بە دڵڕەقانەترین شێواز گیراو ەکان ئەشکەنجە دەدەن و ئەوانەی ئەو کارانە ئـەنجام دەدەن زۆربـاش دەزانـن لەسـەر کردەوەکانیـان بـە هیـچ شـێوەیەك سـزا نـادرێن. حکومەت لە ڕەخنەو لێپرسینەوەی ڕۆژنامەکان ناترسێت ئـەگینا هێنـدە بـە دڵنیـایی و بێباڵی هەڵوێستی لەو جۆرە لە مەسەلەی کورد وەرناگرێت.

لـەوە دەچێــت ڕۆژنامــەکان و حکومــەت پــەیمانێکی ژێــر بــە ژێریــان بەســتبێت. حکومـەت درێـژە بـە ئەشـکەنجەدان دەداو ڕۆژنامــەو ڕۆژنامــە نوســەکانیش ســەرەڕای ئەوەی زانیاری تەواویان لەسەری هەیە بەڵام نـەك هـەر بێدەنـگ دەبـن و هیـچ شـتێکی لەسەر نانوسن بەڵکو ستایشی سیاسەتی حکومەت دەکەن لە کوردستاندا.

کـاتێك چـەپی تورکیـا کـورد بــە ڕەگەزپەرسـت تاوانبـار دەکـات لـە ڕاسـتیدا بـە ئەندامانی پارتی بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕەگەزپەرست بـەراوردیان دەکـات، بـەڵام ئـەوەی ئەم پارتەو ئەندامەکانی دەکات بە ڕەگەزپەرست ئەوەیە بەرگری لە تورکەکانی وڵاتانی دی دەکـەن کـەچی بـەرگری لـە مافـەکانی ئـەو میللەتـە ناکـەن کـە لـە تـەکیدا دەژیـت، هەروەها ئەو مافەی بۆ تورك بە ڕەوای دەبینن بۆ گەلانی دی بە تایبــەتی بـۆ کـورد بـە ڕەوای نابینن چونکە دەیانەوێت کورد بە ڕەهایی بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵیانەوەو پرۆسەی تواندنەوەو لەناوبردنی ناسنامەی نەتەوایەتییان خێراتر بکرێت. چەپی تورکیاو پارتی بزوتنەوەی نەتەوەیی فاشیستی و تەوژمە سیاسییەکانی دی جیاوازییەکی گـەورەیان لـە نێواندا نیە. لەوانەیە کوردێك دوای ئەوەی واز لە ناسنامەی نەتەوایەتی دەهێنێت و بە ئاشکرا بڵێت بە تورکبونی بەختــەوەرە، جێگەیـەك لـە نێـو پـارتی گـەلی کۆمـاری پـەیدا بکات بەڵام لـەنێو ڕیزەکـانی پـارتی بزوتنـەوەی نەتـەوەیی فاشیسـتی جێگـەی نابێتـەوە لەبەرئەوەی ئەم پارتە تەنها تورکی بێگەرد لە ڕیزەکانی خۆی بە ئەندام وەردەگرێت.

بەڵام ماوەیەکە هەڵوێستی ڕۆژنامەنوس و نوسەرانی تورك بەرامبەر بە مەسەلەی کورد خەریکە دەگۆڕێت و ئەم گۆڕانکارییەش بە تایبەتی لە بیروڕاو هەڵوێستی چەپەکان تێبینی دەکرێت. ئێستا چەپی تورك لە نزیکەوە ئەو سیاسەت و کردەوانەی حکومەت چاودێری دەکات کە لە دژی کورد پیادەی دەکات. ڕوداوی زیندانەکانی تورکیاو شۆڕشی پێشمەرگانەی خەڵکی ڕۆژهەڵات نوسەرو ڕۆژنامەنوسەکانی والێکردوە جدیتر بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە. بابەتی تورکەکانی بولگارستان و پەرچەکرداری ڕۆژنامەکان و هەڵوێستی حکومەت لەسەر ئەم مەسەلەیە ئیدعاکانی حکومەت بەوەی بەرگری لە بیری دیموکراتیەت دەکات چەپی تورکیای بە دوو هەڵوێستی خۆی ئاشناکردوە. هەروەها سەرنجی ئەوەشیان دەدا چۆن حکومەتی بولگارستانیان تاوانبار دەکرد لەبەرئەوەی ناوی تورکەکانی بە ناوی بولگاری دەگۆڕی و چۆن بێدەنگ دەبون کاتێك حکومەتی تورکیا هەمان سیاسەتی بەرامبەر بە کورد پیادە دەکرد. ئەو فیکرەی ئەم بەراوردکردنە بکات پێویستی بە میتۆدێکی دیموکراسی هەیە لە بیرکردنەوەدا.

کاتێك فیکرێك پرسیار لە ئایدولوجیای ڕەسمی و دروشمەکانی دەکات ئەو فیکرە ڕێگەی ڕزگاربون دەگرێتە بەر. سەرباری ئەوەش ناوەڕۆکی مەسەلەی کورد تا ڕادەیەکی زۆر ئاشکرا بوە.

## گرنگی وتووێژەکان دەربارەی شێوەی بەرهەمهێنان لە کوردستاندا

لە کاتی شیکردنەوەی گۆڕینی چینە باڵادەستەکانی کورد بۆ بەکرێگیراو و کاریگەری نیگەتیڤی ئەم پرۆسەیە لەسەر گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بابەتی وتووێژ لەسەر شێوەی بەرهەمهێنان لە کوردستان سەرنجی ڕاکێشاین و تەوەرەی وتووێژەکانیش لەسەر شێوەی بەرهەمهێنانی فیودالی یا سەرمایەداری بو. پێم وایە ئەمجۆرە وتووێژانە ناتوانێت زانستێك لە کوردستان بەرهەم بهێنێ پشت بە بنەمایەکی پتەوەوە ببەستێت و دەرگایەکی گەورە بۆ لێکۆڵینەوە ئاواڵە بکات چونکە دینەمۆی ناوەکی کۆمەڵگە هە میشە بڕیار لەسەر ئاراستەی گەشەکردنی پەیوەندی بەرهەمهێنان نادات بەڵکو لە هێندێك کات و شوێنی دیاریکراودا پەیوەندییە دەرەکییەکان بڕیار

لەسەر کۆمەڵگەی کۆلۆنی دەدەن بە  فیـودالی بمێنێتـەوە یـا بـەرەو سـەرمایەداری گەشـە بکات چونکە ئەم کۆمەڵگانە مل بۆ دەستێ وەردانە دەرەکیە گرنگەکان کەچ دەکـەن. ئـەو دەستێوەردانە دەبێتە مایەی لەناوبردنی دینەمۆی ناوەکی بـەوەش وڵات و کۆمەڵگـە لـە دۆخێکـدا دەژێـت کـە لـە سـایەیدا نـاتوانێت مێــژوی تایبــەتی خــۆی دروسـت بکـات و پایـەکانی دینـەمۆی نـاوەکیش ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ لـە بەریەکهەڵدەوەشـێتەوە. دانیشـتوان توشـی سسـتی و لاوازی دەبــێ و هێــدی هێــدی توانــای جموجوڵــی نامێنــێ و فاکتــەرە دەرەکییەکان زاڵدەبن و مێژوی کۆمەڵگە  دەبێتـە مێـژوی بـەرژەوەندی ئـەو بیانییانـەی دەست لە کاروباری وەردەدەن.

بەڵێ، ئەمە  بارودۆخەکەیـە بۆیـە پێویسـتە تێبگـەین هۆکـاری دەرەکـی و دینـەمۆی ناوەکی چۆن ئەرکەکانی خۆیان بەجێ دەهێنن. هەروەها پێویستە لەناوچونی پایەکانی دینـەمۆی نـاوەکی و لـە دەسـتدانی کاریگـەری لەســەر ژیـانی کۆمەڵایــەتی و ئـابوری و سیاسـی بـە درێژایـی ئـەم پرۆسـەیە لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بکـرێ بۆیــە لــەم حاڵەتــەدا کۆمەڵگە مێژوی خۆی دروس ت ناکات بەڵکو مێژوی ئەوانی دی دروست دەکات. ئەمشێوە پەیوەندییە سەرجەم کۆمەڵگەو وڵاتە کۆلۆنییــەکان دەگرێتـەوە بـەڵام ڕەنگدانەوەیـەکی توندتــری لەســەر کوردســتان هەیــە چونکــە ســەرەڕای ئــەو پەیوەندییانــەش چینــی باڵادەستی کوردستان بووە بە چینێکی بەکرێگیراو.

لەم بارو دۆخەدا هەمیشەو سروشتی پەیوەندی باوی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتی بە پێی دەستێوەردانی دەرەکی ئەو دەوڵەتانەی دەستێوەردانەکە  ئاراسـتە دەکەن بڕیاری لەسەر دەدرێ و ئەو  دەسـتێوەردانە دەرەکییانـە کاریگەرییـەکی یـەکلایی کەرەوەیان هەیە. بەڵام ناتوانێت کاریگەری دینەمۆی نـاوەکی کۆمەڵگـە لەناوبـەرێت بـە تایبـەتی ئەگـەر دینـەمۆی نـاوەکی بـە هـێزو زینـدو بێـت، هـەروەها نـاتوانێت بونیـادی کۆمەڵگە ئیفلیج بکات و سیاسەتی کۆمەڵایــەتی و ئـابوری و کولتـوری لـە وڵات بـە پێـی پێداویستیەکانی بەرژەوەندی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم جێبەجێ بکات چونکە ئەگـەر دینـەمۆی نــاوەکی بــەهێزبێ، پەیوەندییــەکانیش بــە ئاراســتەی بــەرژەوەندی خــودی وڵاتەکە ڕێچکە دەگرێت.  لـەمجۆرە حاڵەتـەدا تەنـها لـەم گۆشـەنیگایەوە وتوویـژ لەسـەر

پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەکرێ بۆیە لەم دۆخەدا بە شێوەیەکی باشتر تێدەگەین بۆچ ی پەیوەندی بەرهەمهێنان مۆرکی فیودالی وەردەگرێ یا بە ئاراستەی سەرمایەداری گەشە دەکات.

## دینەمۆی ناوەکی و کاریگەرە دەرەکیەکان

سەبارەت بە دینەمۆی ناوەکی و کاریگەرە دەرەکییەکان دیدو بۆچونەکانم بە سێ نمونە ڕوندەکەمەوە:

أ-کۆلۆنیالیزمی ئسپانی و پورتوگالی و لە ناوبردنی شارستانی ڕەسەنی ئەمریکا نمونەی یەکەم بریتیە لە پەلاماری کۆلۆنیالیزمی ئیسپانی و پورتوگالی بۆ سەر شارستانی ئەمریکای ناوەڕاست و ئەمریکای باشور. لە کۆتایی سەدەی پازدەهەم و سەرەتای سەدەی شازدەهەم شارستانی (ئەزتیك) لە مەکسیك و (مایا) لە گواتیمالا و ولاتانی دی ئەمریکای ناوەڕاست و شارستانی (ئەنکا) لە پیرۆ ڕوبەڕوی دەستدرێژی داگیرکارانی ئیسپان و پورتوگال بونەوە. داگیرکەرە ئەوروپییەکان بۆ یەکەمجار تفەنگ و میکرۆبی نەخۆشییە درمەکانیان لەگەڵ خۆیان بۆ ئەمریکای ناوەڕاست گواستەوە بەلام لەبەرئەوەی شارستانی ئەزتیك و ئەنکاو مایا لەسەر ئاستی بەرهەمهێنانی سەرەتایی دەژیان تفەنگیان نەدیبو. دەستدرێژی دەرەکی داگیرکەران زۆر توندوتیژ و ورە ڕوخێن بو بە ڕادەیەك گورزێکی کەمەر شکێنی ئاراستەی ئەو شارستانییانە کردو تووشی شکستی کردن و دینەمۆی ناوەکی کۆمەڵگەکانی ئەزتیك و ئەنکا و مایا توانای ئەوەیان نەما چالاکانە بەرهەڵستی کۆلۆنیەکان بکەن، هەرچەندە بەرگرییەکی بێوێنەیان لە خۆیان کرد بەلام لە دواییدا تەسلیم بون و زۆربەی دانیشتوانەکەی قەتلۆعام کران. تفەنگ و نەخۆشییە درمەکان دانیشتوانی ئەو شارستانیانەی زۆر بە کارایی لەناوبرد، هەروەها لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەو شارستانیانە تا ئەو کاتە ئەسپیان نەدیبو بۆیە داگیرکەران ئەسپەکانیشیان وەك ئامرازێکی شەڕ بەکاردەهێنا[٧].

پرۆسەی قەتلۆعام و قەلاچۆکردن ڕەهەندێکی ترسناکی بە خۆیەوە گرت چونکە لە دوای کوشتنی بە کۆمەڵی دانیشتوانی ناوچەکە کەس نەمایەوە لە کێڵگەو کانەکان

کاربکات، واتە هێزکار بە شێوەیەکی ترسناکی ئـەوتۆ کەمبویـەوە داگیرکـەران ناچـاربون بۆ بەگەڕخستنەوەی ڕەوڕەوەی بەرهەمهێنان کۆیلە لە ئەفریقیاوە بهێنن.

کۆمەڵگەی ئەمریکای ناوەڕاسـت و باشـور بـە پێـی پێداویسـتییەکانی کۆلۆنیـالیزمی پورتوگالی و ئیسپانی ڕێکخرایەوە. هەروەها بونیادی ئـابوری و پەیوەندییـە سیاسـیەکان و دەزگـا کۆمەڵایـــەتی و کولتورییـــەکانیش بـــە شـــێوەیەك ڕێکخرایـــەوە لەگـــەڵ پێداویسـتییەکانی کۆلۆنیـالیزمدا بگونجێت. ئـەو کۆمەڵگانـە لـە جیــاتی دروسـتکردنی مێـژوی خۆیـان مێـژوی پورتوگـال و ئیسـپانییەکانیان دروسـت دەکـرد، واتـە مێـژوی کۆلۆنیالیزمیان دروست دەکرد.

هیندییەکانی ئەمریکای باکوریش هەمان چارەنوسیان هـەبو. بێگومـان لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا دەستێوەردانە دەرەکییەکان ڕۆڵی یەکلایی کەرەوەیان دەبینـی، لەبەرئـەوەی دینەمۆی ناوەکی کۆمەڵگە خۆجێییەکانی لەناوبرد. دینەمۆی ناوەکی ئـەو کۆمەڵگانـە بەرامبەر هێرشی دەرەکی و ئامرازە داپڵۆسێنەرەکانی نەیتوانی بەرگری لە خـۆی بکـات و هێزی پێویستی بۆ بەرگری کردن لە قەوارەی خۆی لە دەست دا.

ئەو حاڵەتەی بەسەر کۆمەڵگە خۆجێییەکاندا سەپێنراوە پێی دەوتـرێ "پێکهاتـە- Synthese ". ئەگەر شارستانی و کۆمەڵگەکانی تەزتیك و ئەنکاو مایا بە "کێشە- These" دابنێـین، ئەوکاتـە دەتوانـین دەسـتێوەردانە دەرەکیـەکان، واتـە پورتوگـال و ئسـپان و ئوروپاییـەکانی دی بـە "دژەکێشـە- Anithese" ناوبـەرین سـەرەڕای هێرشـی دەرەکـی و دەسـتدرێژی توندوتیـژو ورە ڕوخێنـەر و داتـەپینی پەیوەندییـە ناوەکییـەکانی بـەلام جۆرێك بەرهەڵستی دیاریکراو لەنێو ئەو کۆمەڵگانە هەر مایەوە بۆیە پەیوەندی نێـوان کارو پەرچەکردار ئەو کۆمەڵانەی بەرەو دۆخێکی تازە برد. واتە پێکهاتەیەکی تازە. بـە تێپەڕبونی کات ئەم پێکهاتە یە بووە بە کێشەیەکی تازە.

تەنانـەت کۆمەڵگـەی هیندیـە سـورەکانی وەك ئـەزتیك و مایـا ئـەنکاش کـە بـە دڕندانـەترین شـێوازی چەوسـانەوەی دەرەکـی ڕوبـەڕوی لـەناوبردن بونەتـەوە هـەمان حاڵەت ڕویدا، چونکە شارسـتانی ئـەو کۆمەڵگانـە بـە نـەمری دەمێنێتـەوە لەبەرئـەوەی ئەستەمە بە چەك لەناوبرێت بۆیە لە خۆم ڕادەبینـم ئـەم دیاردەیـە بەمشـێوەیە ڕاڤـە

بکەم: پەیوەندی نێوان دینەمۆی ناوەکی و کاریگەری دەرەکی پەیوەندی نێوان کارو پەرچەکردارە، بەوەش کۆمەڵگە دەچێتە دۆخێکی تازە، واتە پێکهاتەیەکی Synthse تازە. هێزی شاڵاوبەرو داگیرکەری دەرەکی ناتوانێت هێزی بەرهەڵستکار بە تەواوەتی لەناوبەرێت، ئەمە لە کاتێکدا هێزی ناوەکی دەتوانێت کۆمەڵ لە چواردەوری ئامانجەکانی خۆی کۆبکاتەوەو هێزێکی کۆمەڵایەتی تازەی یارمەتیدەر دروست بکات بۆیە ئەگەر هەوڵەکانی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ ئەوا ئەو هێزە کۆمەڵایەتیە تازەیە پشتگیری مادی و مەعنەوی پەرەسەندنی ئەو هێزە تازەیە دەکات و کاریگەری زیاتر دەبێت. لە هەمان کاتدا ڕێگە بەو هێزە تازەیەش دەدرێ بە شێوەیەکی باشتر لە کۆمەڵگە تێبگات بەڵام زۆر زەحمەتە لە هیچ ئانوساتێکدا خەڵکانێك نەبێت هاوکاری ئەو هێزە بکات، دەشێت لەم حاڵەتەدا لەسەر ئاستی پەیوەندی کەسایەتی چەند سەرکەوتنێك بە دەست بهێنێت بەڵام پەیوەندی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەکەوێتە ژێر کاریگەری فاکتەرە دەرەکیەکان.

ب-ئیمپریالییە ئورووپییەکان و پەیوەندییان لەگەڵ ئەفریقیادا.

نمونەی دوەم بریتیە لە ئەفریقیای سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم دا. لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمی زاینی هاوکات لەگەڵ گەشەسەندنی سەرمایەداری لە ئوروپا دوو بابەتی سەرەکی گرنگی تایبەتیان پەیداکرد:

١ -چۆن کەرەستەی خاو بە دەست دەهێنرێ و بە گرەنتی بە ڕێگەی ئاو بۆ ئوروپا دەگوێزرێتەوە؟

٢-دۆزینەوەو گەشەپێدانی بازاڕی نوێ بۆ بەرهەمەکان پێویستی بە چ ئامرازێك هەیە؟ وڵاتە ئوروپاییەکان لە دەرەوەی ئوروپا بە دوای ئەو پێداویستیانەدا دەگەڕان. بەمشێوەیە پرۆسەی لەناوبردنی کیشوەری ئەفریقیا دەستی پێکرد.

لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیەدا پرسیارێکی گرنگی دی هاتە پێشەوە کە پەیوەندی بە دابین کردنی ئاسایش بۆ تەکنیککاران و کارگێڕان و موژدە بەخشەکانی (مبشرین) وڵاتە ئیمپریالیەکانەوە هەبو. ئەمەش وایکرد ئامادەکاری پێویست بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە بکرێ.

کاتێك قسە لەسەر پەیوەندی نێوان ئیپمریالیزمی ئوروپی و ئەفریقیا دەکەین پێویستە قسە لەسەر کۆیلایەتی بکەین. چۆن ڕەشپێستەکانی ئەفریقیا بون بە کۆیلە؟ ڕەشپێستەکانی ئەفریقیا لە هەرێمە جۆراوجۆرەکانی ئەمریکا چ دەورێکیان لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵدا بینی؟ پێشتر باسمان کرد ئەو قەتڵوعام و قەڵاچۆکردنەی لە دوای شاڵاوی ئیسپان و پورتوگالەکان ڕویدا چۆن بوە مایەی کەمبونەوەی بەرهەم لەبەر ئەوەش پێداویستی زیادکردنی بەرهەم بوە هۆی لە دایك بونی بیرۆکەی بەکارهێنانی ڕەشپێستەکانی ئەفریقیا. لە مرۆوە جارێکی دی وەك کێشەیەکی گرنگ ڕوبەڕوی مەسەلەی دینەمۆی ناوەکی و کاریگەرە دەرەکییەکان دەبینەوە بۆیە پرۆسەی بە کۆیلەکردنی ڕەشپێستەکانی ئەفریقیا یارمەتیان دەدا بە شێوەیەکی باشتر لەم کێشەیە تێبگەین.

بە گشتی کۆمەڵگەی ئەفریقیا لە ژیانی ڕۆژانەیدا پشتی بە ڕاوکردن و کۆکردنەوەی خواردن دەبەست و تیرەکەوانی بەکاردەهێناو لە کەنار دەریاو ڕوبارەکان ڕاویان دەکردو لە پاڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی سەرەتایی دەبینرا. هەر لەو ماوەیەدا ڕاوچییە ئوروپاییەکان بە خۆیان و چەکەکانیانەوە گەیشتنە ئەو ناوچەیەو دەستیان کرد بە ڕاوکردنی چالاکترین ڕۆڵەی ئەو کۆمەڵگانە، واتە ئەو گەنجانەی تەمەنیان لە نێوان ١٠-٢٠ ساڵ بو. ئەو گەنجانەیان وەك ئاژەڵ ڕاودەکردو بە هەمو شێوەیەك دەیانویست بە زیندویێتی بە دیل بیانگرن. پێش ئەوەی بەرەو ئەمریکا ڕەوانەیان بکەن بۆ ماوەیەك لە سەربازگەکان گلیان دەدانەوە پاشان لە ئەمریکا لە کێڵگەکانی بەرهەمهێنانی قامیشی شەکرو لۆکەو پاقلەی سودانی و بەرهەمی ناوچە گەرمەکان و لە کانەکان و لە کاری بیناسازی و پیشەسازیدا بێگارییان پێدەکردن. ژمارەی ئەو گەنجە ڕەشپێستانەی بەم ڕێگەیە لە ئەفریقیاوە بۆ ئەمریکا گوێزرانەوە بە ملیۆنان کەس دەخەملێنرێ.

بەڵام نزیکەی نیوەی ئەو کەسانەی بە شێوازی زۆر دڕندانە لە ناوجەرگەی ئەفریقیا هەڵکەندران یا لە کاتی پرۆسەی بە دیل گرتنیان یا دوای ماوەیەك گیانیان لە دەست دەدا. هەروەها زۆرێك لەو کەسانە لە کاتی گواستنەوە لەژێر ئەشکەنجەو بە نەخۆشی و بە برسێتی و بە تینوێتی دەمردن و هێندێکی دییان لەبەرئەوەی بە

شێوەیەکی کتوپڕ لە خێزان و خێڵەکانیان دادەبڕان گیانیـان لـە دەسـتدەدا خـەڵکی ئـەو کۆمەڵگـە کلاسـیکیانە لـە کـاتی گواسـتنەوەیان بـۆ ئـەمریکا لـە دڵڕەقـی سپیپێسـتەکان تێگەیشـتن. بـەڵام ئەوانـەی بـە زیندوێتـی گەیشـتنە ئـەمریکا دەمودەسـت وەك کۆیلـە فرۆشران. پرۆسەی گواستنەوەی ڕەشپێستەکانی ئەفریقیا لە سـەدەی هەڤدەهەمـەوە تـا سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهـەم درێـژەی کێشـا. ئـەم ماوەیـــە بـــە قۆنـــاغی بازرگـــانی کۆیلە دەناسرێتەوە.

دەسـتێوەردانەکانی ئیمپریـالیزم و کۆلۆنیـالیزم بـووە هـۆی لـەناوبردنی دینـەمۆی نـاوەکی کۆمەڵگـەی ئـەفریقیا. ئـەو کۆمەڵگانـە هـەوڵیان دەدا بـەرگری لـە خۆیـان و بەرهەڵستی شاڵاوی سپیپێستەکان بکەن بەڵام دینەمۆی ناوەکییان بەو هەوڵانە لاوازتـر دەبـو بۆیـە کۆمەڵگـەی ئـەفریقیا نـەیتوانی مێـژوو، و شارسـتانی خـۆی بنوسـێتەوە. لـە لایـەکی دی، ئـەو کۆمەڵگانـە لەبەرئـەوەی ڕوبـەڕوی پـەلاماری دەرەکـی دەبونـەوە وەك پێویست بەشدارییان لە پرۆسەی بەرهەمهێنان نەدەکرد چونکـە زۆربـەی تاکـەکانی بـۆ پاراستنی ژیانی خۆیان شەڕی پەلامارە دەرەکییەکانیان دەکرد بۆیە شاڵاوە دەرەکییەکان کێشەیەکی تازەی ئەوتۆی بۆ دروست کردن لە گەوهەردا جیـاوازی هـەبو لەگـەڵ شـەڕی کلاسیکی نێوان خێڵەکانی ئەفریقیا چونکە ئەمەیان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دینەمۆی خودی کۆمەڵگەی ئەفریقیاوە هەبو.

کاریگەرە دەرەکییەکانی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم سیمای کۆمەڵگەی ئـەفریقایان چـۆن دیـاریکرد. سـاڵی ١٨٨٥ وڵاتـە کۆلۆنیالیزمـەکانی وەك بریتانیـا، فەرەنسـا، بـەلجیکا، ئـەڵمانیا، ئیسـپانیا پورتوگـال و هۆڵـەندا بـە ڕەسمـی کۆمەڵگـەکانی کیشـوەری ئـەفریقیایان لـە نێـوان خۆیان دابەشکرد ئـەویش دوای ئـەوەی دینـەمۆی نـاوەکی ئـەو کۆمەڵگانـەیان بـە شـێوەیەکی ئـەوتۆ لـەناوبرد کـە نـەتوانن مێـژوی خۆیـان دروسـت بکـەن بـەڵکو مێـژوی دەوڵەتـە ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمەکانیان دروست دەکرد. تاکـە پێـوەری سـەرەکی دابەشـکردنەکەش بریتـی بـو لـەوەی "چ کەسـێك یەکـەمجار گەیشـتۆتە" ئـەو شـوێنە، واتـە تەنـها گەیشـتنی گەشـتیارێك یـا زانایـەکی ئـەنترۆپۆلۆجی یـا هـێزێکی چـەکداری وڵاتێکـی ئیمپریـالی پێـش ئەوانی دی بەس بوو تا سەرتاپای ناوچەکە بـە موڵکـی ئـەو وڵاتـە کۆلۆنیالیـە دابـنرێ. ئیـتر

هێدی هێدی ئابوری ناوچەکەش بووە پاشکۆی ئابوری وڵاتە کۆلۆنیالییەکە. کۆلۆنیالیزم بۆ ئەوەی پاساوێکی سیاسی بۆ چەوساندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکانی بە دەستەوە بێت دەوڵەتی کۆلۆنی دروستکرد. بەڵام زۆر زەحمەتە ئەو تەشکیلاتە سیاسییانە بە دەوڵەت دابنرێت لەبەرئەوەی چینی باڵادەست لە فەرمانبەرانی وڵاتی کۆلۆنیالی بوون و تەنها ئەو کەسە ئیدارییانەی کاروباری سەربازیو مەدەنییان بەڕێوە دەبرد خەڵکی ناوچەکە بون لەوانەی گۆش کرابوون بە کولتوری وڵاتە کۆلۆنیالیزمەکان. بێگومان تاقمێکی واش هەبوو کە بە کرێگیراوو گوێ لە مستی دەوڵەتە ئیمپریالی و کۆلۆنیالیزمەکان بوون و پشتگیرییان دەکرد لە تاڵانکردنی سامانی وڵاتەکەی خۆیان. وڵاتە کۆلۆنیالییەکان دەستبەجێ ئەو خەڵکانەیان لەناوبرد کە گومانیان هەبوو لە دڵسۆزییان و مەترسی ئەوەیان لێ دەکرا بەشداری یاخی بوون بکەن لە دژیان.

هەروەها لە ڕێگەی پێشکەش کردنی دیاری و پارەو بەرتیل و ڕەوشت تێکدان و شێوازی دی، ئەو کەسانەیان دەکرد بە نۆکەر کە مەترسی ئەوەیان لێدەکرا سەرپێچی لە فرمانەکانیان بکەن. بەمشێوەیە بەرهەڵستارەکانیان لەناوبرد، بەڵام ئەو کەسانەی نەچونە ژێر بارو هەڵنەخەڵەتان هەموویان کوژران. کۆلۆنیالیزمەکان بە مەبەستی خزمەتکردنی ئوروپاییەکان هەوڵیاندەدا چینێکی گوێ لە مست دروست بکەن بۆیە بە هەمو شێوەیەك یارمەتی مادی و مەعنەوی ئەو چینەیان دەدا، ڕەنگە نەتوانین بڵێین ئەو چینە بەکرێگیراوە پاشگەزبوونەوە لە ڕەگەزی خۆیان و هیچ هەوڵێکیش نەدرا بۆ بە فرەنسیکردن یا بە ئینگلیزیکردنیان و پێشیان نەدەوترا ئەگەر ناسنامەی ئسپانی یا پورتوگالی ڕەتبکەنەوە هێندێك مافی دیاریکراوتان لە کیس دەچێ، ئەمە خۆی کارێك بوو نەدەکرا لەبەر ڕەنگی پێست و جیاوازی ئاینیان کە خەڵکانێکی ڕوح پەرست (ئەنیمیست) بون ئەم جیاوازی ڕەنگ و ئایینە، (بە بۆچوونی سپی پێستەکان) بووە هۆی ئەوەی تواندنەوەیان بکا بە کارێکی نەکراو.

ئیدارەی کۆلۆنیالیزم جگە لەوەی پاڵپشتی ئابوری ئەم چینە بەکرێگیراوەی دەکرد هەوڵیشی دەدا ژمارەی تاکەکانی ئەم چینەو بڵاوبونەوەیان لەسەر ئاستی هەرێمەکە زیاد بکات.

پێكدادانی دینەمۆی ناوەكی و كاریگەرە دەرەكییەكان دۆخێكی (پێكهاتە- Synthese) تازەی دروستكرد بەڵام لەبەرئەوەی كاریگەرە دەرەكییەكان كاریگەرتر بون ئەم پێكهاتە تازەیە لە بەرژەوەندی ئیمپریالیزم و كۆڵۆنیالیەكان تەواو بو. ئەگەر بمانەوێ باسی كاریگەری دەرەكی و دینەمۆی ناوەكی و پەیوەندی نێوان ئەو دوو هێزە بكەین، لەم حاڵەتەدا پێویستە قسە لەسەر نمونەی تایبەت بە ئەفریقیا بكەین.

ج-نمونەی كوردستان

نم ونەی سێیەم پەیوەندی بە كوردستانەوە هەیە. لە بیستەكانی سەدەی بیستەمدا لە ئەنجامی پارچە پارچەكردنی و دابەشكردنی كوردستان لە لایەن ئیمپریالیزم و دەستوپێوەندەكانیەوە لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و پیادەكردنی سیاسەتی "پەرتكە-زاڵبە" مەسەلەی كورد هاتە ئاراوە. ئەگەرچی مەسەلەی كورد تا ئەمڕۆ بە زیندویی ماوەتەوە بەڵام ڕوداوی بیستەكان بنەمای مێژویی پێكدەهێنێ.

بێگومان مێژوی كوردستان ڕوداوی یەكلایی كەرەوەی دی تێدایە. بۆ نمونە بە یەك گەیشتنی كورد و ئیسلام، واتە كوردو سوپای عەرەب لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا- چ سیستمێكی ئابوری و كۆمەڵایەتی لە پێش ئیسلام لە كوردستان باڵادەست بو؟ چیان دەچاند؟ ئامرازو پەیوەندییەكی بەرهەمهێنان لەو سەردەمەدا باو بوو؟ كورد پێش ئیسلامبونی چ دەزگایەكی ئابوری و كۆمەڵایەتی و سیاسی هەبو؟ شێوازی ئاژەڵدارییان چۆن بو؟ لە كوێ ئاژەڵیان بەخێو دەكرد یا زەوییان دەچاند؟ ئایا كورد نیشتەجێ بو؟ لە كوێ دەژیا؟ كورد لە پێش ئیسلام چ بڕوایەكی ئایینی هەبوە؟ چۆن خواپەرستییان دەكرد؟ لەگەڵ چ میللەتێك بە ئاشتی دەژیا؟ لەگەڵ چ میللەتێك شەڕیان دەكرد؟ ئایا پەیوەندییان هەبو لەگەڵ ئەرمەن، عەرەب، فارس، ساسانی، ئاشوری، ئەرسۆزوكسی، سریانی، ڕوس و جۆرجی.. هتد؟ هەڵوێستیان بەرامبەر بە یەهودی و مەسیحی چۆن بو؟

سروشتی پەیوەندی نێوان خودی كوردەكان چۆن بو؟ لە سەردەمی بڵاوبونەوەی مەسیحیەت دا بارودۆخی سیاسی و ئابوری و كۆمەڵایەتی كورد چۆن بو؟ هەڵوێستی كورد بەرامبەر بە مەسیحیەت چۆن بو؟ بۆچی، بۆ نمونە كورد نەبو بە مەسیحی؟

چۆن ئیسلامبونیان لێکبدەینەوە؟ ئایا لە دوای شەڕێکی دورودرێژی خوێناوی لەگەڵ سوپای عەرەبی ئیسلامدا باوەڕیان بە ئیسلام هێناوە؟ ئایا بە تۆپزی یا بەخۆشی خۆیان بوون بە ئیسلام؟ بۆچی بون بە ئیسلام و نەبون بە مەسیحی؟ ئیسلام بە چ شێوازێك كاری لە دەزگا ئابوری و كۆمەڵایەتی و سیاسیەكانی كوردستان كرد؟ ئیسلام چ دەورێكی گێڕا لە پێشخستنی كۆمەڵگەی كوردەواریدا؟ كورد لە سەردەمی خەلیفەی دوەم عومەری كوڕی خەتاب ڕوبەڕوی سوپای ئیسلامی عەرەب بویەوە. ئەو ڕوداوانە وەرچەرخانێكی گرنگ بوو لە مێژووی كوردا.

دەركەوتنی توركە ئۆغۆزەكانی ئاسیای ناوەڕاست كە لە خورسان و وڵاتی فارسەوە گەیشتنە ناوچەی ئەنادۆڵ یەكێكە لە ڕووداوە گرنگە یەكلاییكەرەوەكان لە كوردستاندا كە لە سەدەی یازدەهەمدا ڕویدا. ساڵی ١٠٧١ شەڕی مەلازگرد كۆتایی بە حوكمی ئیمپراتۆرێتی بێزەنتی هێناو سەرەتای دەستەڵاتی سەلجوقیەكان دەستی پێكرد. كاتێك توركە ئۆغزەكان لە خوراسان و وڵاتی فارس گەیشتنە كورستان و ئەنادۆڵ سروشتی سیستمی كۆمەڵایەتی و سیاسی كوردەكان چۆن بو؟ سروشتی پەیوەندی سەربازی و سیاسی و ئابورییان لەگەڵ نەتەوە دراوسێكان چۆن بو؟ چۆن دەزگا ئاینی و كۆمەڵایەتییەكان ئەركەكانی خۆیان ئەنجامدەدا؟ ئایا كوردی ناموسڵمان هەبو؟ ئەو كەسانە پەیوەندییان لەگەڵ كوردە موسڵمانەكان و عەرەب و گەلانی دی چۆن بو؟ ئاشكرایە كە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و ڕونكردنەوەی سروشتی پەیوەندییەكان كارێكی زۆر پڕ بایەخە.

مەسەلەی گەیشتنی توركە ئۆغۆزەكان بۆ ئێران و كوردستان و ئەنادۆڵ و عراق و سوریا و شاڵاوەكانی بۆ سەر ئەو مەڵبەندانە و ئەو گۆڕانكارییانەی لەسەر ئاستی پەیوەندی و دەزگاكان ڕویاندا پێویستی بە لێكۆڵینەوە هەیە. شێوەی ململانێی نێوان توركە ئۆغۆزەكان و كورد چۆن بو؟ ئەو ململانێ و شاڵاو و داگیركردنە چەند درێژەی كێشا؟ كەی و چۆن توركە ئۆغۆزە موسڵمانەكان و كوردە موسڵمانەكان بە شەڕ هاتن و كەی پێكەوە هاوكارییان كرد؟

چۆن پەیوەندی نێوان ئەو تورکانەی هێشتا موسڵمان نەبووبوون لەگەڵ کورددا گەشەی سەند؟ شێوەی ئەو شەڕانەی تورك و کوردەکان لە دژی بیزەنتیە مەسیحیەکان بەرپایان کرد چۆن بو؟ کاریگەری ئەو ڕوداوانە لەسەر دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابورییەکان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی کوردەواری چۆن بو؟

شاڵاوی مەغۆلەکان بۆ سەر ئێران و کوردستان و ئەنادۆڵ و عراق و سوریا سەبارەت بە کوردو کوردستان قۆناغێکی مێژوی یەکلایی کەرەوە بو. سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابوری کورد تا سەرەتای شاڵاوی مەغۆلەکان چۆن بو؟ پەرچەکرداری کورد بەرامبەر بەو شاڵاوە چۆن بو؟ سروشتی پەیوەندی نێوان تورك و کورد و مەغۆل و عەرەب و ئەرمەن و فارس چۆن بو؟ کێ لە دژی کێ یەکیدەگرت؟ نوشوستی مەغۆلەکان چ ئەنجامێکی لێکەوتەوە؟ ڕەهەندی هەڵوێستی سەرەکی کورد لە دژی شاڵاوبەران و هێزی داگیرکەران چۆن بو؟ ئایا بەرەنگاری سوپای داگیرکەران بونەوە یا بۆ پاراستنی مانەوەی خۆیان ڕێگەی ملکەچ بوونیان هەڵبژارد؟ ژمارەی کوژراوەکانی شاڵاوی مەغۆلەکان و شاڵاوەکانی پێشتر چەندبو؟ ئەو شەڕانەی هاوزەمانی شاڵاوو داگیرکردنەکان بوون کاریگەرییان لەسەر بەرهەمهێنان چۆن بو؟

لەبەرئەوەی کوردستان دەکەوێتە ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی نزیك کۆمەڵگەی کوردەواری لە حاڵەتێکدا نەبوە مێژووی خۆی دروست بکات و زۆربەی کات ملکەچی کاریگەرە دەرەکییەکان بووە. بە هۆی ئەوەوە کە کەوتووەتە سەر ڕێگای داگیرکەران، سوپای ئەسکەندەری گەورە لە کوردستانەوە شاڵاوی بردۆتە سەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات و سوپای فارسیش هەر لە کوردستانەوە پەلاماری ڕۆژئاوای داوە. کوردستان لە نێوان سەدەی چوارەمی پێش زاینی و سەدەی یەکەمی زاینی ناوچەیەکی گرنگی هاتوۆچۆی داگیرکەران بوە بۆیە داگیرکردنی ئامانجی سوپای ڕۆمان و بیزەنتی و ساسانییەکان بو.

سەرباری ئەوەش دەوڵەتەکان لەسەر خاکی کوردستان حساباتی خۆیان کۆتایی پێ دەهێنا، شەڕی نێوان ساسانی و عەرەب و شەڕی تورکە ئۆغۆزەکان و بێزەنتی لە کوردستان هەڵایسا. ساڵی ١٥١٤ز سوڵتان سەلیم بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی کوردستان

شەڕی چاڵدێرانی هەڵگیرساند. هاوپەیمانی فیودالە کوردەکان و ئیدارەی عوسمانی لە ساڵی ١٥١٤ ڕ یگەی بۆ قۆناغێکی زۆر گرنگ لە مێژوی کوردستان خۆشکرد.

هەمو شەڕو ململانییەکانی نێوان ئیمپراتۆریتی عوسمانی و ئیپمراتۆرێتی فارسی لە کوردستان ڕویانداوە. ئەو دوو ئیمپراتۆرە لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم بە دابەشکردنی کوردستان حساباتی خۆیان بڕییەوە بۆیە پڕ بایەخە لێکۆڵینەوە لەسەر دەزگا ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری لە پێش ئەو دابەشکردنە بکرێ. دابەشکردنی کوردستان لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتدا چ ئاکامێکی لەسەر ئەو دەزگایانە هەبو؟ کام لایەنی لاوازی کۆمەڵگەی کوردەواری ڕێگەی بەو دوو ئیپمراتۆرییەتەدا سیاسەتی "پەرکە- زاڵبە" پیادە بکەن؟ لە دوای دابەشکردن و پارچە پارچەکردنی پەیوەندی نێوان کوردو عوسمانی و کوردو فارس چۆن گەشەی سەند؟ بۆیە زۆر گرنگە شەڕەکانی نیوەی یەکەمی سەردەمی نۆزدەهەم شیبکرێتەوە چونکە بەشێکی کوردستان لە باکوری ئێران کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ڕوسەکانەوەو لە واقیعدا ئەمەش دوەم دابەشکردنی کوردستان بو. هەروەها زۆر پێویستە لە پاڵ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر بزوتنەوەکەی شێخ عوبێدولای نەهری لە ساڵی ١٨٨١ دەکرێ، پەرەسەندنی پەیوەندی نێوان عوسمانی و کورد- فارس و کورد لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ چونکە لە ڕوداوە گرنگەکانی مێژوی کورد دادەنرێ.

د-ململانێی ئیمپریالی لەسەر دابەشکردنی کوردستان لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا

ئەو ڕوداوانەی سەرەوە ڕوداوی یەکلایی کەرەوەی مێژوویی بون، بەلأم ڕەوشی ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"ی کۆلۆنیالیزم کە لە ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە لە کوردستان پیادەی دەکات. ڕوداوەکانی ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەم بە تایبەتی ساڵانی ١٩١٥-١٩٢٥ هۆی سەرەکی چارەسەرنەکردنی مەسەلەی کورد و بە زیندوویەتی مانەوەی ئەو مەسەلەیە بوون. ئەم سیاسەتە لە سەدەی حەڤدەهەمەوە تا سەدەی نۆزدەهەم پیادەکراوە بەلأم لە بیستەکانی سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی تۆکمەتر پیادە دەکرێ و بنکەکەیشی فراوانتر

دەبێ. لە سەدەی نۆزدەهەم شەڕی گەورە لەسەر کوردستان قەوماوە. ئەم مەسەلەیە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم لە بە رژەوەندی ئیمپریالیزم تەواو بوە.

شتێکی ئاشکرایە سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" سیاسەتێکی ئیمپریالی و کۆلۆنیالییە بەڵام کێ بوو بە قوربانی پارچە پارچەکردن و دابەشکردن؟ چ کەسێك ئەم سیاسەتەی دارشتوە؟ لەگەڵ کێ هاوکاری کردوە؟ کەی ئەم سیاسەتە گەشەی سەندو پیادە کرا؟ چ لایەنێکی لاواز نەتەوەی کوردی کردوە بە ئامانجی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"؟ بۆچی نەتەوەی کورد ئەم سیاسەتەی پوچەڵ نەکردۆتەوە؟ پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبەو لەناوبەرە" چ دەرئەنجامێکی هەیە؟

## ناوەرۆکی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە"

ئەو میللەتەی دەبێت بە ئامانجی سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" ڕوبەڕوی گەورەترین کارەسات دەبێتەوە لەبەرئەوەی ئەم سیاسەتە هزری نەتەوە ئیفلیج دەکات. هەر نەتەوەیەك ئەم لێدانە بەهێزەی بەربکەوێت وای لێدێت نەتوانێت هۆشی بێنێتەوە سەر خۆی، لە کاتێکدا لە دوای جەنگی جیهانی دوەم تا ڕادەیەك هەمو کۆلۆنیەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان سەربەخۆیی خۆیان بە دەستهێنا، کەچی باری کوردستان وەك خۆی مایەوە. ساڵی ١٩٤٦ ساڵی دامەزراندن و ڕوخاندنی کۆماری مەهاباد بو، یەکێتی سۆڤێت کاریگەرییەکی تا ڕادەیەکی زۆری هەبوو لە دامەزراندن و ڕوخانی کۆماری مەهاباددا.

ترسناکی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" لە دوبارەکردنەوەیەتی. لە هەمو سوچێکی ئەم دونیایە نمونە تراجیدیەکانی پیادەکردنی ئەم سیاسەتە دەبینرێ. بۆ نمونە، ئێران لە کاتی شەڕی عراق-ئێران لە سۆنگەی جیاوازەوە پشتگیری لە پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی (مەسعود بارزانی) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی (جەلال تالەبانی) دەکرد. بەڵام هەر خودی ئێران تا سەر ئێسقان دژایەتی پارتی دیموکراتی ئێران بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان قاسملۆ دەکردو بەردەوام لە جەنگدا بووە لەگەڵی.

ئایا لەم هەلومەرجەدا دەتوانین سەرکردەکانی کورد لە دەوری مێزێك کۆبکەینەوە بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر دانانی سیاسەتێکی هاوبەش لە پێناوی کوردستاندا؟

ئەم کارە لە ڕوی بابەتییەوە دەکرێ بەڵام ئەستەمەو ئەستەمیەکەشی ئەنجامێکی جێبەجێکردنی سیاسەتی "پەرتکەو زاڵبە" ئەم سیاسەتە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە عێراق ڕۆڵێك دەگێڕێ لە یارمەتیدانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا.

نمونەی دوەم پەیوەندی بە خەباتی پارتی کارگەرانی کوردستانەوە هەیە. هێندێك سەرکردەی ڕێکخراوە کوردستانیەکانی باشوری کوردستان جارناجارێك دەڵێن: "ئێمە کێشەمان لەگەڵ تورکیا نیە بەڵکو پەیوەندی سیاسیمان لەگەڵ تورکیا هەیەو پارتی کارگەرانی کوردستان دوژمنی تورکیایەو دوژمنی تورکیا لە وڵاتی ئێمە جێگەی نابێتەوە. لەهەر شوێنێك پێشمەرگەی پارتی کارگەرانی کوردستان بەدی بکەین یا تەقەی لێدەکەین یا دەیگرین و تەسلیم بە تورکیای دەکەینەوە". پێویستە ئەم وتانە ڕوون بکرێتەوە بە تایبەتی وتەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ ئەوەی بزانین ئەوەی دەیڵێن بە کردەوەش جێبەجێی دەکەن. بەڵام تەنها بڵاوکردنەوەی ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەکانی تورکیا گرنگییەکی زۆری هەیە. ڕێکخراوە کوردستانییەکان ناکۆکی گرنگیان لەگەڵ پارتی کارگەرانی کوردستان نییە بەڵام ڕێکخراوە کوردستانیەکانی باشور بە تایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان دژایەتی ڕون و ئاشکرایان لەگەڵ تورکیا هەیە. پەلامارە ئاسمانی و زەمینیەکانی تورکیا بۆ سەر باشوری کوردستان بە ناوی ڕاوەدونانی چەتەو ڕێگرەکان بەڵگەی ئەو دژایەتیانەیە. ئەم بارودۆخە نمونەیەکی دییە لە پەرەپێدان و پشتگیری کردنی سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە".

سیاسەتی "پەرتکە-زاڵبە" لە هەمو ئانوساتێکدا پیادە دەکرێ و لە خشتەی کارەکاندا جێگەی خۆی هەیەو پیادەکردنی چڕتر دەکرێتەوە. بۆ نمونە، ژمارەیەك ڕێکخراوی کورد بە ناچاری پەنا بۆ سوریا دەبەن و سوریاش جیاکاری لە نێوانیان دەکات بەوەی پێشوازی لە هێندێکیان دەکات و داواکاری هێندێکی دییان ڕەتدەکاتەوەو تەسلیمی تورکیایان دەکاتەوە. هەروەها پشتگیریکردنی مادی عراق بۆ جاشەکان و

توركیا بۆ پاسەوانی گونـد جۆرێکـە لـە  جۆرەکـانی سیاسـەتی "پەرتکـە-زاڵبـە". کـاتێك بۆمان دەردەکەوێت کە هێندێك پاسەوانی گوند لە ناوچـەکانی هـەکاری و سـێرت و وان لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان ئەندامی  پـارتی دیموکراتـی کوردسـتان بـون ئنجا لـە مەودای پیـادەکردنی سیاسـەتی "پەرتکـە- زاڵبـە" و کاریگـەری کاولکارانـەی تێدەگـەین. دەوڵەت بە تەنها زەبروزەنـگ بـەکارناهێنێ بـەڵکو دەرامەتـە مادییـەکانی بەردەستیشی بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی ویژدانی هێندێك کەس و بنەماڵە بکڕێت و بیانکات بە دوژمنی بزوتنـەوەی ڕزگـاری نیشـتمانی کـورد. ئیـدارەی کۆلۆنیـالیزم چالاکانــە کەسـانی لاواز بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی سیاسەتەکانی خۆی پیادە بکات.

سیاسەتی "پەرتکە- زاڵبە" بە شـێوەیەکی چڕوپـڕ و لەسـەر ئاسـتێکی تەسـك پیـادە دەکرێ. ئەم سیاسەتە دوژمنایەتیەکی قوڵ لە  نێـوان خـێزان و خێڵـەکان دروسـتدەکات، بۆیـە دەبینـین ئـەو ڕوداوانـەی پێیـان دەوتـرێ "تۆڵەسـەندنەوە" لەسـەر ئاسـتێکی دی شـێوەیەکە لـە شـێوەکانی پیـادەکردنی سیاسـەتی "پەرتکـە-زاڵبـە". هـەمو ئەوانــەش دەیسـەلمێنن کاریگـەرە دەرەکییـەکان بـە تـەواوەتی گەشـەکردنی ئـابوری و کۆمەڵایــەتی کۆنترۆڵ دەکەن. هەروەها ئەو کۆمەڵگانەی لە جیاتی مێژوی  خۆیـان مێـژوی ئیمپریـالی و کۆلۆنییەکان دروستدەکەن، دینەمۆی ناوەکییان هێزێکی ڕێنماییکەرو بڕیاردەری  نیـە چونکە تەنها دینەمۆی ناوەکی بەهێز  دەتوانـێ بـەرەنگاری دەسـتدرێژییە دەرەکییـەکان ببێتەوەو لاوازی بکات و ئەرکەکانی لەبار بەرێت و  شـێوازی لـەبار بـۆ بەرهەڵستی ئـەو دەســـتێوەردانەو پـــەراوێزکردنیان بدۆزێتـــەوەو کۆمەڵگـــە وا لێبکـــات مێـــژوی خۆی دروست بکات.

بێگومان داڕوخانی سیستمی دەرەبەگایەتی لە ئوروپاو سەرهەڵدانی سـەرمایەداری و پاشـان گەشـەکردنی بـەرەو ئیمپریـالیزم پـەیوەندی بــە دینــەمۆی نــاوەکی کۆمەڵگـەی ئوروپاوە هەیە. لە ئوروپا دینەمۆی ناوەکی ئەو پرۆسەیەی ئاراستە  دەکـرد بـەڵام دوای ئەوەی لە ئوروپا سەرمایەداری پێی نایە قۆناغی  ئیمپریـالیزم و سیستمێکی سـەرمایەداری جیهانی دروست بـو ئیــتر خـودی دینــەمۆی نــاوەکی بـۆ وڵاتــە کۆلۆنییــەکان بـوە کاریگـەری دەرەکی و کۆلۆنییەکانیش ملیان بۆ کەچ کرد.

پێویستە بە وردی لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندی نێوان دینەمۆی ناوەکی و کاریگەری دەرەکی بکرێ چونکە پارچە پارچەکردن و دابەشکردن ڕەهەندێکی سەرەکی لە مێژوی کوردستان دروستکردوە. وێرانکردنی شارو شارۆچکەو گوندەکان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و پرۆسەی جینۆساید و ڕاگواستنی بە کۆمەڵی کورد لە نیشتمانی خۆیان بۆ ناوچە بیابانەکان و دەستبەسەرکردنیان لە ئۆردوگای زۆرەملێ ئاکامی کاولکارانەی ئەو پرۆسەیە دەردەخات.

ئەمڕۆ کۆمەڵگەی کوردەواری ڕوبەڕوی مەترسی گەورە دەبێتەوەو بەکارهێنانی چەکی کیمیایی گرنگترین مەترسییە. کورد بە هۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە چەندین جار ڕوبەڕوی لەناوبردنی بە کۆمەڵ بۆتەوە. چەکی کیمیایی پێویستی بە دەرامەتی مادی دیاریکراو هەیە. ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنیەکی هاوبەش دەچەوسێننەوە دەرامەتی مادی زۆریان هەیە بۆیە ئەو دەوڵەتانە دەتوانن کەرەستەی خاوی ئەم چەکە لە بازاڕی نێودەوڵەتی بکڕن و لە ڕێگەی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکانەوە کارگەی چەکی کیمیایی دروست بکەن. وڵاتێکی وەك عێراق دەتوانێت بە داهاتێکی کەمی نەوتی کورد ئەو چەکە بکڕێت و بەکاریشی بهێنێت. ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنیەکی هاوبەش دەچەوسێننەوە ئامادەن پێکەوە ئەو چەکە بە چڕی بەکاربهێنن. ئەو دەوڵەتانە لە گرنگی مافەکانی مرۆڤ تێدەگەن بەڵام لە هەمان کاتدا دەشزانن بەرژەوەندی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەبات بەڕێوە. هەروەها ڕای گشتی و ڕۆژنامەی کاریگەر و دەستەی گوشار کار لە سیاسەتی ئەو دەوڵەتانە ناکات و بچوکترین بایەخ بە ڕەخنەی دەزگا پەیوەندیدارەکانی مافی مرۆڤ نادەن.

بێگومان بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و تاوانی جینۆساید لە دژی گروپێکی ئەتنی یا نەتەوەیەك کارێکی نامرۆڤانەو فاشیستی و ڕەگەزپەرستانەیە بەڵام ئەگەر لەناوبردنی بە کۆمەڵی دانیشتوان تاکە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی کوردستان و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆلۆنیالیزم بێت ئەوا ئەو دەوڵەتانە ئامادەن ئەو تاوانە ئەنجام بدەن.

بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بە شەڕی کلاسیکی لەناوناچێت بۆیە چەکی کیمیایی وەك چەکێکی کۆکوژ کورد توشی مەترسی گەورە دەکات و هەڕەشەی

لەناوبردنی لێدەکات چونکە لە ڕوی پراکتیکەوە ئەستەمە خەڵکی مەدەنی لەم چەکە بپارێزرێت. چەکی کیمیایی بە تەنها مرۆڤ لەناو نابات بەڵکو ژینگە وێراندەکات و هاوسەنگی سروشتی لاسەنگ دەکات و ڕوەك و ئاژەڵ لەناودەبات و ئەو ناوچانەی ئەم چەکەی تیا بەکاربهێنرێ بۆ چاندن ناشێت لێرەدا جارێکی دی چەکی کیمیایی ناوەرۆکی کاریگەری دەرەکی دەخاتەڕوو.

ئەم چەکە بە مەبەستی دەربەدەرکردنی کورد لە چوارچێوەی تیرۆری دەوڵەت بەکاردەهێنرێت. ئەو دەوڵەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنییەکی هاوبەش دەچەوسێننەوە بە مەبەستی گۆڕینی دیموگرافیای کوردستان دەیان جار کوردیان دەربەدەر کردوە.

ڕاگواستن جۆری جیاوازی هەیە: ڕاگواستن لە ناوەوەو لە دەرەوەی وڵات و ڕاگواستنی دەمامکدار.. هتد. مەبەست لە ڕاگواستنی دەمامکدار ئەوەیە کە گروپێك لە دانیشتوان لەبەر چڕی و بەربلاوی تیرۆری دەوڵەت گۆشەگیر دەبێت و پاشان بە ناچاری وڵات بەجێ دەهێڵێت.

میللەتی کورد بە هۆی کیمیاباران و پرۆسەی ڕاگواستن کە بەری سیاسەتێکی چڕی تیرۆری دەوڵەتە ڕوبەڕوی مەترسییەکی گەورە دەبێتەوە. دەوڵەتە ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالیزمەکان دوای ئەوەی ئامرازەکانی نەیانتوانی کورد بتوێننەوە هەوڵدەدەن پاکتاوی جەستەییان بکەن. لە ئەنجامە گرنگەکانی کاریگەری دەرەکی بە تایبەتی لە ئەنجامی شێوازەکانی چەوساندنەوەو تیرۆرکردن مرۆڤی کورد زیاتر پرسیار لە ناسنامەی نەتەوایەتی و ناسنامەی کوردستان دەکات و ئەمەش پەرچەکرداری تیرۆری دەوڵەت و پرۆسەی لەناوبردن بوو بەڵام کۆلۆنیالیزمەکان دەیانەوێت میللەت بێ ئیرادەو ملکەچ بێت و لێیان بترسێت و داوای مافەکانی نەکات و گوێڕایەڵی هەمو فرمانێك بێت چونکە زۆر بە ئاسانی حوکمڕانی ئەو جۆرە میللەتە دەکرێت. بە ڕاستی لە کارەساتدا دەژین. کارەساتێك ڕەهەندەکانی لە قۆناغێکدا ئاشکرا دەبێت میللەت دژی چارەنوسێك خەبات بکات کە هێزە ئیمپریالی و کۆلۆنیالیزمەکان بۆیان دیاریکردوە. ئەمە لە کاتێکدا دوژمنانی کورد بە نوێترین و فڕکەترین چەك وەك چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی خۆیان تەیار کردوەو لەسەر فراوانترین ئاستیش هاوکاری دەکەن. بەڵام

نەتەوەی کورد دابەش و پارچە پارچە کـراوەو هیـچ مـافێکی نەتەوایـەتی و دیموکراتـی نیـەو لـەنێو دۆزەخـی دوژمنـاندا درێـژە بـە خــەباتی نەتەوایــەتی دەدا بــارودۆخی لــە کۆلۆنی خراپترە.

دەکرێ لەم ڕونکردنەوەیە ئەم ئەنجامە دەربهێنین:

پرەنسیپی بڕیاری مافی چارەی خۆنوسینی گەلان، پرەنسیپێکی دروستە نەك لەبەر ئەوەی سەرکردە بولشەفیکەکان سوربون لەسەر جێبەجێکردنی یا لەبەر ئـەوەی لینـین یـا ســتالین لــە نوســینەکانی خۆیــان ئاماژەیــان بــۆ کــردوەو نــەك لەبەرئــەوەی لــە جارنامەکـەی ولسـۆنی سـەرەك کۆمـاری وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکادا هـاتوە، بــەڵکو لەبەر ئەوەی هەڵەسەنگاندنێکی بابەتیانە جێبەجێ کردنی ئەم پرەنسـیپە دەسـەپێنێ. بەڵام ئەو وڵاتانەی کوردستان وە ك کۆلۆنییەکی هاوبـەش دەچەوسـێننەوە هـەوڵدەدەن ئــەو کوردانــەی وشــیاری نەتەوایــەتییان هەیــە بــە چــەکی کیمیــایی و بـــایۆلۆجی و جینۆسـاید لەناوبـەرن بۆیـە پێویسـتە کـورد خـۆی مـافی چارەی خۆنوســین بــۆ خــۆی بسەلمێنێت. ئەگەر کورد بە هەر نرخێك بیەوێت لەژێر چەتری سەدام حوسەین بژیـت ئـەوا پرەنسـیپی بڕیـاری مـافی چـارەی خۆنوسـینی گـەلان هـەتك دەکـات چونکـە ئـەو دەوڵەتانەی کوردستان دابەشدەکەن هەمیشە ئامادەن کـورد قـەتلۆعام و قـەلاچۆ بکـەن. لەبەرئەوەی وشیاری نەتەوایەتی کورد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەکات بۆیە مـافی چـارەی خۆنوسین مافێکە قابیلی دواخستن نیە.

## ڕەوشی بیروکرات و فەرمانبەرەکان

نکوڵیکردن لە ناسنامەی نەتەوایەتی دیاردەیەکە لەنێو توێژە کۆمەڵایەتییەکانی تریش دەبینرێ. پێشتر ئەو نکۆڵیکردنەمان لەنێو مولکدارو شێخ و سەرەك خێڵ و پیشەسازو بازرگان و کرێکارانی کەرتی خزمەتگوزارییە گشتیەکان و بیروکراتە پایە بڵند و فەرمانبەرە بچوکەکان باس کردوە.

تا ئێستا پۆلیس چوار جار بانگی کردوم بۆ لێکۆڵینەوەو پرسیارو وەڵام و زۆربەی ئەو پۆلیسانەی منیان گرتوەو لێپێچینەوە یان لەگەڵدا کردوم و ئەشکەنجەیان داوم بە ڕەچەڵەك کورد بون. ئەو کەسانە هەرگیز پێویستیان بەوە نەبو بڵێن "ئێمە کوردین" چونکە لە ڕوخسارو قسەکردن و ڕەفتاریانەوە بەدی دەکرا بۆیە بە هەمو مانایەکی وشە ئایدولوجیای ڕەسمییان وەرگرتوەو بانگەشەی تەتریك دەکەن.

ڕۆژێکیان یەکێك لە پۆلیسەکان بە توندی و بە تورەیی بە ڕومدا هەڵشاخاو، وتی "پێویستە بنوسیت نەماف هەیەو نە چەپ بەڵکو بە تەنها ئەتاتورك هەیەو خەڵکی ئەم وڵاتە هەمویان تورکن". ئنجا دەستیکرد بە جنێودان و سوکایەتی پێکردنم و پاشان لەگەڵ پۆلیسەکانی دی کەوتە ئەشکەنجەدانم. لە ناکاو ڕوی تێکردم بە توندی و تورەیی وتی: "من کوردێکی تەمەن بیست و حەوتساڵەم و خۆشم لەمجۆرە کێشانە هەڵناقورتێنم بەڵام تۆیەکی (چروم)ی بۆچی بایەخ بە مەلەسەی کورد دەدەیت؟" پێویستە بنوسیت "هەمویان تورکن"، هێشتا هەر لە حاڵەتی هەڵچون و تورە بوندا بو پێم وت: "تۆ خۆت دەڵێیت من کوردم" بەوەش بۆم ڕونکردەوە کارێکی نابەجێیە بوترێ خەڵکی ئەم وڵاتە هەمویان تورکن ئەو پۆلیسەی ئەشکەنجەی دەدام بە نەڕاندنەوە گەڕایەوە: بۆچی قسەکانم دوبارە دەکەیتەوە؟ مەبەستم ئەوە نەبو ئیتر لەبەرخۆیەوە کەوتە بۆڵەبۆڵ هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبو.. هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبو.."

بە درێژایی مانەوەم لە زیندان تێبینیم دەکرد زۆربەی پاسەوانەکان کورد بوون. هەروەها ئەو کەسانەی ئەشکەنجەی گیراوەکانیان دەدا بە ڕەچەڵەك کورد بون. ئەم

دیاردەیە لایەنێکی تراجیدی هەیە: خەڵکانێك لە پێناوی ژیانێکی سەربڵند خەبات بۆ کورد دەکەن بەڵام ئەوانەی خەباتیان بۆ دەکرێ بە زەبری ئەشکەنجە وا لە قوربانییەکانیان دەکەن ئیمان بە بیروڕای داگیرکەران بهێنن بۆیە ئەو کەسانە پێش هەمو کەسێك قۆڵی لێ هەڵئەکەن ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی هەبێ بە چەوساندنەوەو سوکایەتی پێکردن و ئەشکەنجەدانەوە.

زۆری ژمارەی کورد لەنێو پاسەوانی زیندانەکان گەلێك هۆی هەیە: هۆی یەکەم، ئەم پیشەیە چارەسەری کێشەی بێکارییان دەکات. هۆی دوەم هۆیەکی گرنگترە لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی لە سایەی کۆلۆنیالیزم پەروەردە دەبن کەسانێکی شەڕئەنگێزو ترسنۆکیان لێدەردەچێت. ئەو کەسانە بە باروەدۆخێکدا گەورە دەبن یارمەتییان نادات گەشە بە کەسایەتی خۆیان بدەن بۆیە لە رێگەی هەڵگرتنی ناسنامەی نەتەوەی باڵادەست و ئاراستەکردنی شەڕەنگێزی لە دژی ئەو نێوەندەی تێیدا گەورە بوون و بینینی خود لەسەر ئاستی کۆلۆنیالیست و حکومەتی کۆلۆنیالیزم کەسایەتی خۆیان دەسەلمێنن و لێرەشدا زیندانەکان بە تایبەتی زیندانە تایبەتییەکان ڕۆڵێکی زۆر گرنگ وازیدەکەن. پاسەوانی زیندانەکان لە ریزی نزمترین توێژی کۆمەڵایەتین بۆیە زیندانەکان شوێنێکە وێنای مەینەتی و نزمی ئاستی کۆمەڵایەتیان دەکات و دەرفەتی تۆڵەسەندنەوەشیان پێدەدات تا شەڕئەنگێزی و ڕقوکینەکەیان بەسەر زیندانیە سیاسییەکاندا خاڵی بکەنەوە. کاتێك پاسەوانەکان دەرفەتی ئەشکەنجەدانی کۆمۆنیست و بێباوەڕەکان بۆ دەرەخسێت بەوپەڕی درندایەتییەوە بونی خۆیان دەسەلمێنن.

زۆری پاسەوانی کورد لە بەندیخانەو زیندانە تایبەتەکان وام لێدەکات بڕوا بەم ڕاڤەکردنە بهێنم. هەر جارێك بابەتی ئەشکەنجەو زیندان و داپلۆسینی ناو زیندانەکان بوروژێنرێت شۆڕشگێڕەکانی ڕۆژئاوای تورکیا ئەو کوردانەیان بیردەکەوێتەوە کە ئەشکەنجەیان داون.

دەوڵەت زۆربەی پاسەوانی زیندانەکانی لە کوردەکان دادەنێت تا دزێوترین ڕەفتار بنوێنن لەبەرئەوەیە شۆڕشگێڕانی ڕۆژئاوا هەڵوێستێکی نێگەتیف لە مەسەلەی کورد

وەردەگرن بەڵام ئەو هۆیانەی شۆڕشگێڕانی ڕۆژئاوا لێی تێناگەن دەوڵـەت زۆر بـە باشـی سود لەو بارودۆخە وەردەگرێت.

لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس پۆلیس دەریدەخات زۆربەی پۆلیسە نهێنییەکانیش کوردن، لێرەدا قسە لەسەر ئەو مامۆستایانە دەکەین کە ئایدۆلۆجیای ڕەسمی دەوڵەتیان وەرگرتوە. ئەو مامۆستایانەی ئیدعای تورکبونـی خۆیـان و هـەمو خـەڵکی تورکیـا دەکـەن و ناوهێنـانی کـورد بـە تـاوان دادەنێـن هـەرگیز بۆیـان گرنـگ نیـە سـەر بـە چ حزبێکـن، ئـەندامی بزوتنەوەی نەتەوەیی فاشیستی بـن یـا ئـەندامی ئـەو ڕێکخراوانـەی ئیدعـای مارکسـیزم دەکـەن مادامـەکی ئایدۆلۆجیـای ڕەسمییـان وەرگرتـوە چونکـە ئـەو کەسـانە پێویسـتیان بەوە نییە بچنـە نـاو هیـچ بزوتنەوەیـەکی سیاسـی ڕاسـترەو یـا چـەپڕەوەوە، هـەروەها والی و پارێزگاو بریکاری دەوڵـەت و سـەرۆکی دادگاکـان تۆڕێکـن لـەو جـۆرە کەسـانە. لـە کۆتـایی شەسـتەکاندا کـاتێك لـە دەزگـا زانسـتییەکاندا کـارم دەکـرد زۆرم بینـی لـەو بیروکراتییانە کە بەرگرییان لە تیۆری و پراکتیکەکانی ڕەسمی دەکرد.

بەهـەرحاڵ پێویسـتە ئـەم بابەتـەش ڕونبکەینـەوە. کـورد چـۆن کـاری لـە ئیـدارە گشتییەکانی تورکیا دەستدەکەوێت؟ دەوتـرێ لـە تورکیـا هاووڵاتیـان مـافی یەکسـانییان هەیەو کەس بە خاتری زمان یا ئاین جیاوازی لە نێوانـدا نـاکرێ. هـەمو کەسـێك مـافی هەیە بە ئازادی پیشـەکەی خـۆی هـەڵبژێرێت وەك ئـەوەی ببێـت بـە والی و پارێزگـار و بریکاری گشتی و سەرۆکی دادگـاو مامۆسـتاو پارلـەمانتار.. هتـد، ئەمـەش تـورك و ئـەو کوردانەی بە خۆیان دەڵێن تورك دەگرێتەوە. هیچ کەسێك مامەڵەی جیـاوازی لەگـەڵدا ناکرێ. هەمو کەسێك ئازادی لە هەڵبژاردنی پیشـەکەی خـۆی هەیـە وەك ئـەوەی ببێـت بە دکتۆر یا پارێزەر.

ئـەو وتانـە بـە ڕوکـەش ڕاسـتە، بـەڵام پێویسـتە مـەرجێکی زۆر گرنگت تیـابێت بـۆ ئەوەی چێژ لە دادپەروەری وەربگری و هەمان مافی تورکێکـت هـەبێت، ئـەویش نکۆڵـی لە ناسنامەی کورد بکەیت و ناسنامەی نەتەوەی تورك هەڵبگرێت. مرۆڤـی کـورد هـەمو کـارێکی دەسـتدەکەوێ مادامـەکی نکۆڵـی لـە ناسـنامەی کوردایـەتی خـۆی دەکـات و بـە ئاشکرا دەڵێت بە تورکبونی بەختەوەرەو مادامـەکی بـە هـەمو شـێوەیەك دژایـەتی ئـەو

کەسانە دەکات کە نکۆڵی لەناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان ناکەن. بەڵام ئەگەر کوردایەتی بکەیت و سوربیت لەسەر ناسنامەی نەتەوایەتی کورد تەنها زیندانی دەبێت. بێگومان پرەنسیپی یەکسانی یەکێکە لە پرەنسیپە بنەڕەتیەکانی دیموکراسی بۆیە ئەگەر پرەنسیپی دادپەروەری ئەمجۆرە مەرجەی بۆ دابنرێت بێبەهاو مایە پوچ دەکرێت لەبەرئەوەی ڕێوشوێنێکی ئەنتی دیموکراسی و سروشتێکی فاشییانەی هەیە. تا ئێستا لە تورکیا پرسیار لەسەر شێوازی پیادەکردنی پرەنسیپی دادپەروەری و دوو هەڵوێستی نەکراوە. ئەمەش بێنرخ و بێبەها کردنێکی ترسناکی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤە.

کاتێك بولگارستان دانی نەدەنا بە ناسنامەی نەتەوایەتی تورکەکانی ئەوێداو دەستیکرد بە گۆڕینی ناوی تورکەکان و پیادەکردنی سیاسەتی بە بولگاریکردن ئەم دوو هەڵوێستیە بە جوانی ئاشکرا بوو، چونکە تەنها لەو حاڵەتەدا پیاوانی دەوڵەت و حکومەتی تورکیاو ڕۆژنامەو زانکۆو نوسەرو سەندیکاو دەزگا یاساییەکانی تورکیا، ئەو سیاسەتەی بولگارستان لە دژی تورکەکانی بولگاریا پیادەی دەکرد بە سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستی و فاشیستی و ئیمپریالی و کۆلۆنیالییان دادەنا، ئەو کەس و دەزگایانە دەیانوت بولگارستان ڕێوشوێنێکی کۆنەپەرستانە دەگرێتەبەر کاتێك وازهێنان لە ناسنامەی نەتەوایەتی دەکاتە مەرجێك بۆ پیادەکردنی پرەنسیپی دادپەروەری لە نێوان تورك و بولگارەکان بەڵام دەوڵەتی تورکیاش هەمان سیاسەت بەرامبەر بە کورد پیادە دەکات. بەمشێوەیە ڕوداوەکانی بولگارستان بە جوانی دوو ڕوویی فیکرو ڕەفتاری تورکی ئاشکرا کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێگە نادەن کورد هێندێك کارو پیشەی دیاریکراو بکات. بۆ نمونە ژمارەی ئەو کوردانەی لە کۆلێجی سەربازی قبوڵ دەکرێن زۆر کەمەو ئەگەر لەگەڵ کۆی ژمارەی دانیشتوان بەراورد بکرێن و ساڵ بە ساڵیش ژمارەیان کەمتر دەکات، ئەمە سەرباری ئەوەی گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ژمارەی ئەو کوردانەی لە کۆلێجی سەربازی قبوڵ دەکرێن، هەروەها زۆر بە دەگمەن بیروکراتە کوردەکان لە دەزگاو نێوەندە بڕیار بەدەست و وەبەرهێنەکانی (استثمار) وەك ئیدارەی دەوڵەت بۆ پلاندانان و بانکی پارێزگاکان دەبینین.

بە کورتی: دوای ئەوەی قسەم لەسەر گۆڕینی چینە باڵادەستەکانی کورد کرد پێویستە بوترێ کە بیروکراتە کوردەکانیش سەر بە هەمان چینی بەکرێگیراون. بەڵام لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو کەسانە لە کوردستان کارناکەن کارەکانیان وەك مولكدارە گەورەو شێخ و سەرەك خێڵ و بازرگان و پیشەوەرە کوردەکان بە جوانی دەرناکەوێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی بەسودە ئەگەر بە تێرو تەسەلی لێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی توێژە دیاریکراوەکانی نوسەران و گۆرانیبێژان و فۆلکلۆرییەکان بکەین. نوسەرانی تورك ڕۆژانەو لە هەمو بۆنەیەك تورکبوونی خۆیان دوبارە دەکەنەوە کەچی نوسەرانی کورد ناتوانن قسە لەسەر ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان بکەن و ئەگەر جەخت لەسەر کوردبونی خۆیان بکەن ئەوا سوکایەتییان پێدەکرێ و بە نەتەوەپەرست و ڕەگەزپەرست و شۆڤێنی تاوانبار دەکرێن. ئایا ئەمەش جۆرێك لە دژایەتی کردنی تیا نیە؟ کارێکی ئاسایی و سروشتیە نوسەرێکی تورك شانازی بە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیەوە بکات، لە کاتێکدا نوسەرێکی کورد ناتوانێت هەمان شت بکات یا پێی وایە پێویست ناکات ناسنامەی نەتەوایەتی خۆی ئاشکرا بکات. ئایا بە ڕاستی کارێکی خەمۆکی نیە پەیوەندی نێوان کوردو نەتەوەکەی لەسەر شەرم بونیاد نرابێت؟ ئایا جێگەی غەم و کەسەر نیە کورد بە تورکی بنوسێت و کلکایەتی بۆ ئەدەبی تورکی بکات؟

ئایا پزیشك و پاریزەرو ژمیریارو ئەندازیارانی کورد هەمان شتیان لەسەر پیادە نابیت؟ ئەی چ شتیك لەسەر گۆرانی بیژەکان بلیین؟ راستە لەم ساڵانەی دواییدا وشیاری نەتەوایەتی لەنیو تویژی پیشەوەران گەشەی سەندووە بەڵام ئەو گەشەکردنە ئاراستەیەکی گشتی وەرنەگرتوە.

## بارودۆخی پارلەمانتارەکان

لێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی پارلەمانتارەکان لە ڕوی یاساییەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم دەقانەی خوارەوە لە دیباجەی دەستوری ١٩٨٢ تورکیادا هاتوە:

"دوای ئەوەی شەڕێکی ناوخۆی توندوتیژی ئەوتۆ کە لە مێژوی کۆماری تورکیا بێوێنە بو خەریك بو هەڵدەگیرساو هەڕەشەی لەناوبردن و دابەشکردنی لە دەوڵەت دەکردو حورمەتی نیشتمانی تورك و نەتەوەی نەمری تورك و پیرۆزی دەوڵەتی تورکیای پێشێل دەکردو دوای ئەوەی هێزی سوپای تورکیا لەسەر خواستی نەتەوەی تورك بە بزوتنەوەی ١٩٨٠/٩/١٢ هەستا، و نەتەوەی تورکیش ڕەزامەندی لەسەر ئەو یاسایە دەربڕی کە ئەنجومەنی دەستوری وەك نوێنەری شەرعی نەتەوەی تورك ئامادەی کردبوو، دوای ئەوەی ئەم یاسایە لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە دانیپیانرا ئیتر بڕیار درا بخرێتە بواری پراکتیکەوە.

-بە پێی نەتەوەگەرایی و پرەنسیپەکانی ئەتاتورکی سەرکردەی نەمرو قارەمانی بێوێنەی دامەزرێنەری کۆماری تورکیا،

-بە پێی بڕیاری کۆماری تورکیا بۆ دەستەبەرکردنی ئەندامێتی هەمیشەیی دانپیانراوی تورکیا لە لایەن میللەتانەوەو هێنانەدی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری مادی و مەعنەوی لە ئاستی مەدەنی هاوچەرخدا،

-لەبەرئەوەی دەستەڵاتی دەوڵەت بەبێ هیچ کۆت و بەندێك پشت بە سەروەری ئیرادەی ڕەهای نەتەوەی تورك دەبەستێ هیچ کەسێکی دەستەڵات پێدراو یا دەزگایەکی دەستەڵات پێدراو ناتوانێ ئەو دەستەڵات پیادە بکات و دەستدرێژی بکاتە سەر ئازادی دیموکراسی و سیستمی یاسا کە تەعبیر لە بەرژەوەندی میللەت دەکات.

-نابێ جیاکردنەوەی دەستەڵاتی دەزگاکانی دەوڵەت جیاکاری لە پیادەکردنی دەستەڵات دروستبکات بۆ ئەوەی هەر دەزگایەك لە چوارچێوەیەکی ئاشکرای دابەشکردنی کاردا بە گیانێکی هاوکاری ڕێکوپێك یەکێك لە ئەرکە دیاریکراوەکانی دەوڵەت بە شێوەیەك جێبەجێ بکات تەنها دەستورو یاسا ڕەچاو کراوەکان سەروەر بێت.

-نابــێ پشــتگیری لــه بیرۆكەیــەك یــا دیدێــك بكــرێ كــه دژی بەرژەوەندییــه نیشتمانیەكانی تـورك و پرەنسـیپی یـەكێتی دەوڵـەتی توركیـاو یەكپارچـەیی خـاكی توركیــاو لــه دژی بــەها مێژوویــی و ڕەوشــتییەكانی میللــەتی تــورك و لــه دژی نەتەوەگەرایی و پرەنسیپ و ڕیفۆرم و تازەگـەری ئـەتاتورك ئاراسـتە دەكـرێ، هـەروەها پێویستە بە پێی پرەنسیپی عەلمانیەت پیرۆزی هەستی ئاینی و كاروبـاری ئـاینی تێكـەڵ بە كاروباری سیاسی نەكرێت.

-بـه پێـی ئـەم دەسـتورەو بـه مەبەسـتی دەسـتەبەركردنی دادپـەروەری كۆمەڵایـەتی هەموو هاووڵاتیەك ماف و ئازادی بنەڕەتی هەیەو هەمو كەسێك هەر لە ساتەوەختی لە دایك بونیەوە لە چوارچێوەی كولتوری نەتەوەیی و مـەدەنی و سیسـتمی یاسـادا مـاف و دەرفەتی ژیانی هەیە تا بتوانێت خۆشگوزەرانی مادی و مەعنەوی دابین بكات.

-لەبەرئـەوەی كۆمەڵگەی هاووڵاتیـانی توركیـا كۆمەڵگەیـەكی یـەكگرتوە بـه هـۆی هەستكردن بە سەربەرزیو شانازی بـەخۆكردن و بەشـداری خۆشـی و ناخۆشـی نەتـەوە دەكات و بەرامبەر بە خۆشبەختی و دژواری و یەكێتی نەتەوە ماف و ئەركی هەیەو لـه ناخـەوە هەسـتدەكات پـەیوەندی بـه هـەمو لایەنـەكانی ژیـانی میللەتـەوە هەیـەو لـه چوارچێوەی ڕێزگرتنـی بێمـەرجی مـاف و ئـازادی ئـەوانی دی مـافی ئـەوەی هەیــه بــه ئاشـتی و برایـەتی و خۆشەویسـتی بـه ئاشـتی بژیـت ئـەوەش لـه ئیمـانێكی پتـەو بـه پرەنسیپی "ئاشتی لە وڵات و ئاشتی لە جیهان" سەرچاوە دەگرێت.

ئـەم دەسـتورو بڕیارانـه بـه مەبەسـتی كتومـت پیـادەكردن و ڕاڤـەكردنی لـه لایـەن میللەتی توركەوە دەخرێتە بەردەسـتی ئـەو هاووڵاتییـە توركانـەی شـەیدای نیشـتمان و نەتەوەو دیموكراسین.

لـەم دەسـتورەدا تێبینـی بـەكارهێنانی ئـەم دەســتەواژانە دەكرێـت: "ڕێزگرتـن لـه نیشـتمانی تـورك" و "نەتـەوەی نـەمری تـورك" و "پــیرۆزی دەوڵــەتی توركیـا" و "دەستەڵاتی ئەو دەوڵەتەی.. بەبێ هیچ كۆت و مەرجێك دەستەڵاتی لە نەتەوەی تـورك سـەرچاوە دەگـرێ" و "بـەرژەوەندی نەتـەوەی تـورك" و "پرەنسـیپی یـەكێتی دەوڵـەتی توركیاو یەكپارچەیی خـاكی توركیـا" و "ئـەو هاوڵاتیـە توركانـەی شـەیدای نیشـتمان و

نەتـەوە دیموكراسـین".. هتـد. یاسـادانەرانی دەسـتوری سـالی ١٩٦١-١٩٦٢ سـوربون لەسـەر ئەوەی دینەمۆو سروشی دەستورەكە لە نەتەوەگەرایی تورك سەرچاوە دەگرێ. تەنها لە دیباجەی دەستورەكە چوار جار وشەی تورك بەكارهاتوە. هەمان شیوازیش لە مادەكانی دی ئەم دەستورە دەبینرێ.

مـادەی (٢٦) پـەیوەندی بـە "ئـازادی دەربریـن و بلاوكردنـەوەی بـیرورا" هەیـە لـەم مادەیەدا ئەم برگانە دەخوینینەوە:

٣-ئەو زمانەی بە حوكمی قانون قەدەغە كراوە بۆ دەربرین و بلاوكردنەوەی بیرورا بەكارناهینرێ.

٤-ئـەو چاپەمـەنی و قـەوان و شـریت و ڤیدیـۆو كاسـیت و وینـەو ئامرازەكـانی دی دەربرین بە پیی بریارنامەیەكی (رسوم) یاسایی دەستی بەسەرا دەگیرێ یـا لـە حالـەتی نائاساییدا بە پیی بریـاریكی دەسـتەلاتدارانی پسـپۆر دەسـتی بەسـەرا دەگیرێ، پیویستە دەسـتەلاتداری پسـپۆر لـە مـاوەی (٢٤) كـاتژمیر بریارەكـە بخاتـە بەردەسـتی دادوەری پسـپۆر و دادوەری پسپۆریش لە ماوەی (٣) رۆژ بریاری جیبەجێ كردنی دەربكات.

ئەم مادەیە بە روكـەش جگـە لـە زمـانی توركـی ریگـە بـە زمانـەكانی دی نـادات بـە زمانی كوردیشەوە چاپەمەنی بلاوبكەنەوە. بەلام سـەرتاپای ئـەم بریـارە پـەیوەندی بـە زمانی كوردییەوە هەیە چونكە چاپەمەنی بە زمانی ئینگلیزی و فرەنسـی و ئـەلمانی و عەرەبی و ئەرمەنی و ئەفریقی و فارسی و عیبری و چەندین زمانی دی بەبی گرفتیكی ئەوتۆ بلادەكریتەوە. لە یاسای "ئازادی رۆژنامەنوسی (مادەی ٢٨-٢) ئـەم دەقـە هـاتووە: "ئـەو زمانـەی بـە حوكمـی قـانون قەدەغـە كـراوە ریگـەی پینـادرێ چاپەمـەنی بلاوبكاتەوە". لە مادەی (٤٢) كە تایبەتە بە "ماف و ئەركەكانی پـەروەردەو فـیركردن" ئەم شتانە دەخوینینەوە:

٩-لـە دەزگاكـانی پـەروەردەو فـیركردن تەنـها زمـانی توركـی كـە زمـانی دایكـی هاوولاتیانی توركە بەكاردەهینرێ.

١٠-پرەنسـیپە تایبەتیـەكانی خویندن بـە زمـانی بیـانی لـە دەزگـا زانسـتی و پەروەردەییە رەسمیەكان و لەو دەزگا زانستییە تایبەتانـەی بـە زمـانی بیـانی دەخوینـن

به بڕیارنامەیەك دەست نیشان دەكرێ بەڵام ئەم بڕیارە تایبەتەكانی یاسای نێودەوڵەتی ناگرێتەوە.

لە بەرواری ١٩٨٣/١٠/١٩ یاسای تایبەت بە "بڵاوكردنەوە چاپەمەنی بە زمانە ناتوركییەكان" دەرچوەو بە پێی ئەم یاسایە قسەكردن بە زمانی كوردی قەدەغە دەكرێ، لە بڕگەی یەكەمی ژمارە (٢٩٣٢)ی ئەم یاسایە "ئامانج و ڕێو شوێنەكان" ئەم دەقە هاتوە:

"ئەم یاسایە بە ڕەچاوكردنی یەكێتی و سەروەری دەوڵەت و یەكپارچەیی خاك و نەتەوەو كۆمارو ئاسایشی نەتەوەیی و پاراستنی سیستمی گشتی ئەو پرەنسیپ و گەلاڵەنامە تایبەتیانە ڕێكدەخات كە پەیوەندی بە چاپەمەنی و بڵاوكردنەوەی بیروڕای زمانە یاساغەكان هەیە".

بڕگەی دوەمی ئەم قانونە بە ناوی "ئەو زمانانەی بۆ دەربڕین و بڵاوكردنەوەی بیروڕا بەكارناهێنرێت". ئەمەش دەقەكەیەتی:

"هیچ زمانێك ڕێگەی دەربڕینی بیروڕاو برەوپێدان و بڵاوكردنەوەی چاپەمەنی پێنادرێ ئەگەر زمانی ڕەسمی ئەو وڵاتانە نەبێت كە دەوڵەتی توركیا بە ڕەسمی دانبیپیاناوە، جگە لەو بڕیارە نێودەوڵەتیانەی دەوڵەتی توركیا مۆریكردوە و ئەو بڕیارانەی پەیوەندیان بە چاپەمەنیەكانی پەروەردەو زانست هەیە لەگەڵ چاپەمەنی پەیمانگەو دەزگا ڕەسمیەكان".

دەقی بڕگەی سێیەمی ئەو یاسایەی پەیوەندی بە "زمانی دایكی هاووڵاتیانی تورك" هەیە بریتیە لە: "زمانی توركی زمانی دایكی هەمو هاووڵاتیانی توركە،

أ-هیچ چالاكیەك بە مەبەستی بەكارهێنان و بڵاوكردنەوەی زمانە ناتوركیەكان ڕێگەی پێنادرێت.

ب-زمانە ناتوركییەكان بۆ نوسینی پۆستەرو لافیتەو دراوی بیانی و تابلۆو دابەشكردنی قەوان و كاسێت و ڤیدیۆو ئامرازەكانی دی لە كاتی كۆبونەوەو خۆپیشاندان بەكارناهێنرێت، ئەگەر پێشوەخت لە بەرزترین نوێنەری دەستەڵاتی دەوڵەت لەو شوێنە مۆڵەتی بۆ وەرنەگیرێت".

برگەی چوارو پێنج و شەشی ئەم یاسایە بۆ یاسای "سزای تاوان" تەرخانکراوە.

بە پێی مادەی (١٣٤)ی یاسای ١٩٨٢ پەیمانگەیەك بە ناوی "پەیمانگەی ئەتاتورك بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و کولتورو مێژو" دروستدەکرێ. ئەمەش دەقی مادەکەیە:

"بۆ پێناساندن و بلاوکردنەوەو پەخشکردنی بیروڕای ئەتاتورك و پرەنسیپ و ڕیفۆرمەکان لە بواری کولتورو مێژوو زمانی تورکی پەیمانگەی ئەتاتورك لەسەر شێوەی دەزگای یاسای گشتی دروست دەبێ کە لە نێوەندی لێکۆڵینەوەی ئەتاتورك و کۆمەڵەی مێژوی تورك و نێوەندی کولتوری ئەتاتورك پێکدێت. ئەم دەزگایە ڕاستەوخۆ دەبەسترێتەوە بە نوسینگەی سەرەك وەزیرو سەرەك کۆماریش سەرپەرشتی و کۆمەکی دەکات".

دینەمۆو سروشی ئەحکامەکانی دەستوری تورکیا لە نەتەوەگەرایی تورك سەرچاوە دەگرێت. هەروەها مادەی (٨١)ی ئەم یاسایە تایبەتە بە یاسای "سوێندخواردن".

ئەندامانی پارلەمانی تورکیا پیش ئەوەی دەست بەکار بن لەبەردەم ئەنجومەنی نەتەوەیی مەزنی تورکیا ئەم سوێندە دەخۆن:

"سوێند دەخۆم بە شەرەفم کە پاریزگاری لە بون و سەربەخۆیی دەولەتی تورکیا بکەم و یەکیتی نیشتمان و نەتەوە بپاریزم و بەرگری لە سەروەری بیسنورو رەهای نەتەوە بکەم و دلسۆزی کۆماری دیموکراسی و عەلمانیەت و پرەنسیپ و ریفۆرمەکانی ئەتاتورك بم و لەو پرەنسیپانەش لانەدەم کە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان و یەکیتی نیشتمانی و ئاشتی کۆمەلایەتی و خۆشگوزەرانی بۆ هەمو کەسیك دەستەبەر دەکات. سوێند دەخۆم بە دلسۆزی بۆ یاسا بمینمەوە".

لە دەستورەکەی تورکیا ئەم فۆرمە دوبارە دەبیتەوە: "یەکیتی نیوان دەولەت و یەکپارچەیی خاك و نەتەوە". دوجار لە دیباجەی دەستورو یەکجار لە مادەی (٣): "یەکیتی دەولەت و زمانی رەسمی و زانست و سرودی نیشتمانی و پایتەخت" و یەکجار لە مادەی (٥): "ئامانجە بنەرەتی و ئەرکەکانی دەولەت" و یەکجار لە مادەی (١٣): "وابەستەیی ماف و ئازادییە گشتیەکان" و یەکجار لە مادەی (١٤): "ماف و ئازادییە بنەرەتییەکان و پاراستنیان لە دەستدریژی" سێ جار لە مادەی (٢٨): "ئازادی

ڕۆژنامەنوسی" و "یەکجار لە مادەکانی ٣٠، ٣٣، ٥٨، ٦٨، ٦٩، ٨١، ١٠٣، ١١٨، ١٢٢، ١٣٠، ١٣٣، ١٣٥، ١٤٣ دوبارە دەبێتەوە.

ئەم فۆرمە (٢٢) جار لە مادە جۆراوجۆرەکانی ئەم دەستورە دوبارە بووەتەوە. ئەم فۆرمە لە فۆرمەکانی دی زیاتر نکوڵی لە بونی نەتەوەو ناسنامەی ئەتنی کورد دەکات. بە پێی ئەم بیرۆکەیە مرۆڤی کورد تا نەبێت بە تورك و واز لە ناسنامەی نەتەوایەتی کورد نەهێنێ چێژ لە ئازادییە گشتیەکان وەرناگرێت.

ئەم فۆرمە لە دەستورەکەی ساڵی ١٩٦١ تەنها یەکجار لە مادەی (٣) دوبارە بۆتەوە کە تێیدا هاتوە: "یەکپارچەیی خاك و نەتەوەو دەوڵەتی تورکیا قابلی جیابونەوە نیە".

لە مادەکانی (٧٧ و ٩٦) کە تایبەتە بە فۆرمی سوێند خواردنی پارلەمانتارو سەرەك دەوڵەتەکان ئەم دەستەواژەیەی تیا هاتووە: "سەربەخۆیی و یەکپارچەیی نیشتمان و نەتەوە"، بەڵام لە سایەی ڕژێمی کودەتاچیەکەی ١٩٧١/٣/١٢ گۆڕانکاری گەورە بەسەر یاسای ١٩٦١دا هات. لە دوای کودەتاکە تەعبیری: "یەکێتی و یەکپارچەیی خاك و نەتەوەو دەوڵەتی تورکیا قابلی جیابونەوە نیە" لە (١٣) شوێنی جیاوازی ئەم دەستورە زیادکراوە، ئەم فۆرمە یا وەك خۆی و بەبێ دەستکاری خراوەتە سەر هێندێك مادە یا دوای داڕشتنەوەی بۆ هێندێك مادەی دی زیادکراوە. بۆ نمونە: مادەی (١١) پێش ئەوەی گۆڕانکاری بەسەرا بێت بە ناوی "ناوەڕۆکی ماف و ئازادییە بنەڕەتیەکان" داڕێژرابو، بەڵام دوای ئەوەی گۆڕانکاری تیا کرا ناونیشانەکەی بو بە "ناوەڕۆك و سنوری ماف و ئازادییە بنەڕەتیەکان و پاراستنیان لە دەستدرێژی". ئەم دەستەواژەیە دوجار لەم مادەیەدا بەکارهاتووە.

ئەم فۆرمە لە دەستورەکەی ١٩٦١ سێ جار لە مادەی (٢٢)ی "ئازادی ڕۆژنامەنوسی"و یەکجار لە مادەی (٢٦)ی "بەکارهێنانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن جگە لە ڕۆژنامە" و دوجار لە ماوەی (٢٩)ی "دروستکردنی هاوبەندەکان" و یەکجار لە مادەی (٤٦)ی "دروستکردنی سەندیکاکان" و یەکجار لە مادەی (٥٧)ی "ئەو پرەنسیپانەی پێویستە لەسەر پارتە سیاسییەکان ڕەچاوی بکەن" و یەکجار لە مادەی (١٣١)ی "ئیدارەی ڕادیۆو

تەلەفزیۆن و ئاژانسی هەواڵە ڕەسمییەکان" و یەکجار لـە مـاوەی (١٣٦)ی "دروسـتکردنی دادگاکان" بەکارهێنراوە.

لە دوای کودەتا سەربازییەکان دەستورێکی نوێ دانـەنرا یـا گۆڕانکارییـەکی ڕیشـەیی بەسـەر دەسـتورەکە نـەهێنرا. لەهـەر دوو حاڵەتەکـە دژایـەتی کردنـی مەسـەلەی کـورد هـەوێنی سـەرەکی ئـەو ئیجرائاتـە سـەرکوتکەرانەیە بـو. هـەمو شـێوازێك بـەکارهێنراو پاساو بۆ هەمو ڕێو شوێنێك دەهێنرایـەوە بـۆ ئـەوەی ناسـنامە و مافـە نەتەوایـەتێکانی کـورد نەسـەلمێنن، هـەروەها بـە پلـەی یەکـەم مەسـەلەی کـورد هـۆی سـەرەکی هـەردوو کودەتا سەربازییەکە بو.

کورد لە تورکیا هەمو کارێکی دەست دەکەوێت ئەگەر واز لە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خـۆی بـهێنێ، بـۆ نمونـە کـورد دەتوانێـت ببێتـە پارلـەمانتار بـەڵام کـاتێك تەماشـای مادەکانی ئەم دەستورە دەکەین چـۆن متمانـە بـەو پارلەمانتارانـەی دەوڵـەت بدەیـن کـە خۆیان بە کورد دادەنێن. ئایا بە پێـی مادەکـانی ئـەم دەسـتورە وازهێنـان لـە ناسـنامەی کوردایەتی و بوون بە تورك ئەرکی پارلەمانتارە کوردەکان نیە؟ کەواتـە نـاوەرۆکی ئـەو سوێندخواردنە چیە؟

## بۆرجوازی بچوکی کورد

دوای ئەوەی بارودۆخی گروپە دیاریکراوەکانمان دەست نیشان کرد، ئەو پرسیارەمان کرد هەنوکە چ گروپێك هەستی نەتەوایەتی هەیەو کامیان بەرگری لەو هەستە دەکات؟ وەڵامی ئەو پرسیارەمان بەوە دایەوە کە خەڵکی شۆڕشگێڕو دیموکراتخواز بـەرگری لـەو هەستە دەکات.. بەڵام ئەو شۆڕشگێڕو دیموکراتخوازانە کێن؟

ئەو توێژە گەلێك خوێند کارو پیاوی ئاینی دەرچوی فێرگە ئاینیەکانی تیایـە. ئـەو کەسانە لە چوارچێوەیـەکی گشـتی کێشـەی کوردسـتان لـە تورکیـاو ڕۆژهـەڵاتی نزیـك و جیهان تاوتوێی دەکەن و بۆ جەماوەری شـیدەکەنەوەو چارەسـەری بـۆ پێشـنیاز دەکـەن. ئەو خوێندکارو پیاوە ئاینیانە بە هۆی پێکهاتـەی فیکرییـان لـە بـارودۆخی کوردسـتانی تورکیاو ڕۆژهەڵاتی نزیك و جیهان تێدەگەن، هەروەها لە خەڵکانی دی باشترو زوتـر لـە

بارودۆخی کوردستان وەك کۆلۆنیەکی نیودەولەتی و بارودۆخی سیاسی کورد  تیدەگەن. ئەو کەسانە سەرەتا ئەم کیشەیە لەلای کەسە نزیکەکانی خۆیان باسدەکەن، پاشان ئاستی قسەکانیان هیدی  هیدی فراوانتر دەکەن تا دەگاتە ئاستی میللەت. لە سایەی وشیاری پیشوەختی ئەو کەسانەدا وشیاری نەتەوایەتی گەشە دەکات و بلاودەبیتەوە بۆیە لە سەرەتای حەفتاکان بە تایبەتی لە دوای کودەتاکەی ١٢ی ئازار دەستەلاتداران ئەو فیرگانەیان داخست دوای ئەوەی لە مەودوای کاریگەری ئەو فیرگانە تیگەیشتن. لەبەر ئەوە دەستەلاتداران تەنها ئەو کەسانەیان دادەمەزراند کە دەرچوی فیرگە ئاینیەکانی سەر بە دەولەت بون. بەلام هۆی سەرەکی گەشەکردنی وشیاری  نەتەوایەتی پیاوە ئاینیەکانی (مەلاکان) فیرگە ئاینیە کۆنەکان دەگەریتەوە بۆ ئەوەی خویندن  لەو فیرگانە بە زمانی کوردی بو چونکە لە جیاتی زمانی عەرەبی بە زمانی کوردی قورئانیان تەفسیر دەکردو بە زمانی کوردی میژو و ئەدەب و کولتوری کوردییان دەخویند بە پیچەوانەی بنەماکانی خویندن لە فیرگە ئاینیەکانی سەر بە دەولەت.

مەلاکان سەر بە تویژیکی تایبەتی روناکبیرانی کوردن و ئەو تویژە لە ریزی ئەنتلجیتسیا ریزبەند دەکەین لە ریگەی بەراوردکردنی کیشەکانی کۆمەلگەکەی  خۆیان لەگەلٚ کیشەی کۆمەلگەکانی دی دەتوانن لە ناوەرۆکی کیشەکان  تیبگەن و تەنها ئەوان دەتوانن زانیاری و هەستی نەتەوایەتی و دیدو بۆچون و چارەسەری پیشنیازکراو بگەیەنن بە میللەتەکەیان. لیرەدا چەمکی ئەنتلجیستیا و چەمکی روناکبیران جیاوازیان هەیە. بروانە:

**(Ismail Besikci, Bilim Yontemi. Turkiye deki Uygulama I, Kurtlerun. Mecburi Iskani, Komal Yayinevi, Istanbul, 1977, P. 79 etc).**

لە تورکیا سزا توندەکانی ئیدارەی پەروەردە بۆ ئەوەیە خویندکاران لە کیشە راستەقینەکەیان -واتە مەسەلەی کورد- دوربخریتەوە. لە ریگەی ریو شوینەکانی ئایدۆلۆجیای رەسمی و پەروەردەو دەزگاکانی خویندنی بالا کە بە پیی رینماییەکانی ئەتاتورك پیی دەوترێ "یۆك- Yok" داوا  لە خویندکاران دەکرێ تیکەل بە پرۆسەی تەتریك بن و خۆیان لە کیشەی کۆمەلگەی کوردەواری و کوردستان دوربخەنەوە.

سەرەرای ئەوەش جیهان رۆژ لە دوای رۆژ بچوکتر دەبیتەوەو دەزگاکانی راگەیاندن کاریگەرییان زیاتر دەبێ و ئاستی پەیوەندی نیوان تاك و گروپەکان چرترو فراوانتر دەبیت و بزوتنەوەی نیشتمانی کورد بەردەوام گەشە دەکات و دەزگای شیخ و مولکدارەکانیش مشتومریکی زۆری دروستکردوە بۆیە خویندکاران لەم مەسەلەیە دورناخرینەوە.

پیشتر باسمان کردوە کە ئەوەی دەرەبەگەکان بەردەوام شوینیان بۆ خۆیان کردووەتەوەو لە نیو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردا بوون بە کەسانیکی گرنگ لە گۆرانکاری دیموکراتی و شۆرشگیریدا. دەتوانین هەمان بیرۆکە بە شیوازیکی دی دەربرین: ئەوەی ئەو سەرەك خیل و مولکدارە گەورانەی تا دوینێ دژایەتی شۆرشەکانی کوردیان دەکرد و لایەنگیرییان لە دەولەت دەکرد ئەوا ئەمرۆ لە ریزی شۆرشگیرو دیموکراتخوازەکانی کوردن و شوینی شایستەیان لەنیو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد هەیە.

هەر لەو ماوەیە بورجوازی بچوکی کوردیش لەنیو گروپە شۆرشگیرو دیموکراتخوازەکان شوینی خۆی گرت. هەروەها پیشەوەرەکانی وەك بەرگدرو پینەدۆزو دارتاش و کریکارانی کەرتی خزمەتگوزارییەکانی وەك شەرتاش و بۆیە کاران و شۆفیری ئۆتۆمبیل و خاوەن پیشە ئازادەکانی وەك پاریزەرو پزیشك و ئەندازیارو بیناسازو مامۆستاو فەرمانبەران تیکەل بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردبون بەلام ئەو جوتیارانەی پارچە زەوییەکی بچوکیان هەیە هەرگیز بنکەیەکی گرنگ لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی دروست ناکەن.

ئایا دەتوانین قسە لەسەر چینی کریکاری کورد بکەین کە رەوشیکی تایبەت بە خۆی هەبیت؟ پیویستە لیکۆلینەوە لەسەر ئەم بابەتە بکەین. بۆ نمونە بارودۆخی باتمان و تاتڤان چۆنە؟ ئیستا گەلیك کریکارو بەشیك لە چینی کریکاران شوینیکی شایستەیان لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد هەیە.

رونکردنەوەی ئەو پەیوەندییانە پیویستی بە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەیە: ئەو چینە کۆمەلایەتیەی لە شەستەکانەوە بەشداری لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی

کوردستان دەکەن چ بونیادیکیان هەیە؟ کۆمەلەی (٤٩) کە لە کۆتایی سالی ١٩٥٩ زیندانی کران کێ بون[٨] و کۆمەلەی (٢٣) لە چ کەسانیك پیکهاتبوو (دادگاییکردنیان سالی ١٩٦٣ دەستی پیکرد[٩]، سەر بە کام چینی کۆمەلایەتین؟ ئەندامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (لە سالی ١٩٦٥ دامەزراوە) سەر بە چ چینیکی کۆمەلایەتین؟ تەنها بە وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانە لە ماهیەتی بریارەکانی تاوانبارکردن تیدەگەین کە سالی ١٩٧١ دەرهەق بە ئەندامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەرکراوە. ئەو کەسانەی داواکاری گشتی سەربازی بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان دایان دەنیت. سەر بە چ تویژیکی کۆمەلایەتین؟ پیویستە هەمان پرسیاریش لە بارەی ئەو کەسانەوە بکریت کە سالی ١٩٦٩ بە تۆمەتی دامەزرینەری پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا تاوانبار کرابوون.

چ کەسیك لە چوارچیوەی "کۆمەلەی رۆژهەلات"ی پارتی کریکارانی تورکیا کاری دەکرد؟ سەر بە کام چینی کۆمەلایەتی بون؟ پارتی کریکارانی تورکیا چۆن لە رۆژهەلاتی تورکیاو ناوچەکانی دی کاری دەکرد؟ پارتی کریکارانی تورکیا لەناو چ چین و تویژیکی کۆمەلایەتی کۆمەلگەی کوردەواری ئەندامی هەبو؟ دواتر ئەو پەیوەندییانە سالی ١٩٧٥ لەگەلْ دامەزراندنەوەی پارتی کریکارانی تورکیا چۆن گەشەیان کرد؟ بونیادی چینایەتی خویندکاران و ئەندامانی دی یانەکانی کولتوری شۆرشگیری لە رۆژهەلات کە سەرەتای سالی ١٩٦٩ لە ئەنقەرەو ئەستەنبول و شارەکانی دیاربەکرو سیلڤان و قزلك و باتمان دامەزران چ شتیك روندەکاتەوە؟ بەهەرحالْ زۆر گرنگە لیکۆلینەوە لەسەر پەیوەندی ئەو کوردانە بکرێ کە لە سەرەتای حەفتاکانەوە لە ریزی ریکخراوە چەپەکانی تورکیاو ریکخراوە کوردستانییەکان کاردەکەن، ئەمە سەرەرای ئەوەی پیویستە لیکۆلینەوە لەسەر ئەوە بکرێ کە سەر بە چ چینیکن. رەهەندی راستەقینەی پەیوەندی نیوان چینە کۆمەلایەتیەکان چۆنە؟ ئەو شۆرشگیرو دیموکراتخوازانەی دادگای سەربازی دیاربەکر سالی حوکمی بە سەرا سەپاندن سەر بە کام چینی کۆمەلایەتی بون؟

سەرباری ئەوەش پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر پارتی کارگەرانی کوردستان بکرێ، ئەو ڕێکخراوەی مێژوی دروستبونی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی حەفتاکان چۆن توانی لە ماوەیەکی کورتدا لەسەر ئاستی هەرێمایەتی و لەسەر ئاستی چینە کۆمەڵایەتییەکان گەشەیەك بکات ڕێکخراوە کوردستانیەکانی دی نەیانتوانی ئەو سەرکەوتنە بە دەست بهێنن، بۆیە جێگەی خۆیەتی لێکۆڵینەوە لەسەر ئینتمای چینایەتی ئەندامانی پارتی کارگەرانی کوردستان بکرێ، هەروەها ئەو ڕیوشوێنانەی ساڵانی هەشتاکان لە شاری دیاربەکر دژی ئەم پارتە وەرگیرا بە سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم بابەتە دادەنرێت. بۆیە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بڕیارەکانی تاوانبار کردن و کۆنوسی و لێپێچینەوەکان و بڕیارەکانی دادگاو.. هتد. پێویستە هەمان لێکۆڵینەوە لەسەر ئینتمای چینایەتی ئەندامانی ڕێکخراوەکانی دی بکرێت کەبە تۆمەتی دی حوکم دراون. سەرباری ئەوەش پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەسەر تەمەن و شوێنی نیشتەجێ بون و پیشەی باوکان و چالاکی دایکانی ئەندامەکانی گروپە سیاسیەکان بکرێ، بۆ نمونە لێکۆڵینەوە لەسەر هەمو لایەنەکانی پێشکەوتنی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان بکرێ.

## ڕوناکبیرانی وڵاتانی کۆلۆنی و ڕوناکبیرانی وڵاتانی کۆلۆنیالیزم
## ( لێکۆڵینەوەی حالەتێك )

ڕۆژی ١٩٨٩/٦/٢٨ تەحسین سەراج- Tahsin Sarac- کۆچی دوایی کرد. لە دوای مردنەکەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تورکیا دیدو بۆچونی ژمارەیەك ڕوناکبیری تورکیان بڵاوکردەوە وەك: سەرۆکی کۆمەڵەی زمانزانی (جەواد گەرای- Cevat Geray)، شاعیرو نوسەر وەجهی تیمور ئۆغلو- Vecihi Timuroglu، شاعیر و نوسەر موزەفەر ئیلهان ئەردۆست- Muzafar ilhan Erdost، نوسەرو ڕۆژنامەنوس ئەحمەد قارەمان- Ahmet Kahvaman، نوسەر ئەحمەد سای Ahmet Say، چیرۆکنوس و زمانزان سیڤگی ئوزال Sevgi ozed، شاعیر- ئەحمەد تیلی Ahmet Telli، ژنە شاعیر و زمانزان گولتان ئاکین- Gultan Akin، شاعیرو زمانزان عەلی پۆسکولو ئۆغلو- Ali Puskullu oglu، شاعیر محەمەد ئۆزگوچلو- Mehmet Ozquclu، نوسەر ئالوك گەرگەر- Haluk Gerger، نوسەرو

رۆژنامەنوس- ئورهان توکاتلی- Orhan Tokatli، شاعیر ئەحمەد عارف Ahmet Arif، شاعیر ئوزدەمیر ئینجه- Ozdemir inca، نوسەر رەمزی ئەتانچە Ramzi Tnance، نوسەر مستەفا شەریف ئوناران Mustafa Serif Onaran، شاعیر جاهید کولەبی- Cahit Kulebi، شاعیر رەفیق دورباس Refik Durbas. هتد. (بروانە رۆژنامەی Milliyet رۆژی ١٩٨٩/٧/١، رۆژنامەی Cuhuriyet رۆژی ١٩٨٩/٧/٢، گۆڤاری 2000 e Dogru و رۆژنامەی Cumhuriyet رۆژی ١٩٧٤/٧/٤.. هتد).

روناکبیرانی تورك بەمشیوەیە بە دیدو بۆچونەکانی خۆیان دەردەبری: تەحسین سەراج بە زمانیکی پەتی دەینوسی و شارەزایی لە زمان و کولتوری تورکی هەبوەو لە سایەی شیعرەکانی ئەو شاعیرەدا زمانی تورکی بە سەرەنایەتی خۆی گەیشت. وەجهی تیمور ئۆغلو دەلیت: "ئەو شاعیرە لە وشیارییەکی قولەوە بە دوای ئەو وشە تورکیانەدا دەگەرا کە هاوماناى زاراوە بیانیەکان بون، هەروەها بە نوسین و ئاخاوتنەکانی دژایەتی ئیمپریالیزمی دەکرد". عەلی پۆسکولو ئۆغلو دەلیت: "تەحسین سەراج بە زمانیکی تورکی پەتی شیعری هۆنیوەتەوە، ئەوەش شیوازیکی جیاوازی بە شیعرەکانی بەخشیوە بۆیە لە ریگەی دارشتنەوەی وشەگەلیکی نوێ گەنجینەیەکی خستە سەر زمانی تورکی". رەفیق دوبراس دەلیت: "تەحسین سەراج شاعیریکی بیگەردی زمانی تورکییەو ماۆستایەکە بیگەردترین فۆرمی زمانی کردوە بە شیعر". لە سایەی بەرجەستەکردنی هەستە شیعرییەکانی، زمانی تورکی بو بە زمانی شیعر دوای ئەوەی تورکمانییە کۆنەکەی لیپالاوتوە.

تەحسین سەراج یەکیك بو لەو کوردانەی نکۆلی لە کوردبونی خۆی کردوە. جاریکیان وتی؛ خیزانەکەی لە ئاسیای ناوەراستەوە هاتوەو دوای بەجێ هیشتنی خوراسان لە شاری موش نیشتەجێ بوە (بروانە گۆڤاری Turkiye Yaziluri، ژمارە (١١) شوباتی/ ١٩٧٨، ل ٢٢-٢٩).

ئەم هەلویست و رەفتارە لە کن روناکبیرانی ولاتە کۆلۆنیکراوەکان هەستی پیدەکرێ چونکە مرۆڤی کۆلۆنیکراو هەمیشە خۆی لە ئاست کۆلۆنیالیستەکان دادەنیت. ئەم هەلویستە لەسەر روناکبیرەکانیشیان پیادە دەکرێ.

روناكبيرانی وڵاتـه كۆلۆنيكراوەكـان بـۆ ئـەوەی كۆمەڵگـە دانياپيـابنيت و لـەنيو روناكبيرەكانی جيگەی خۆيان دەكـەن بـە بيـانی چونكـه شـيوەی بيركردنـەوەو رەفتـاری سيستمی پەروەردەيی نەتەوەی باڵادەست كار لە ناخ و دەرونی ئەو روناكبيرانە دەكات.

ئەم رونكردنەوەيە دژايەتييەكی گـەورەی تيايـەو پيويسـتە جـەختی لەسـەر بكـریَ. تەحسين سەراج يەكيكە لەو نوسەرانەی سەردانی گەليك وڵاتی كردوەو گەليك نوسەری كولتـورە جياوازەكـانی ناسـيوە. سـەراج لـە ريگـەی بەشـداربونی لـە كۆنگـرە نيودەولەتيەكاندا ئەو بابەتانەی لەسەر ئاستی جيهان چارەسەركردوە كە پەيوەندی بە زمان و كولتور و لايەنە جياوازەكانی كولتورەوە هەبوەو هـەر لـەو كۆنگرانـەش كيشـەی زمـان و كولتـوری نەتـەوە چەوسـاوەكانی بـاس كـردوەو چارەسـەری بـۆ پيشـنياز كـردوە بـەڵام نـازانرێ چـۆن ئـەو كۆنگرانـە كاريگـەرييان لەسـەر سـەراج نـەبوەو هەسـتی نەتەوايەتييان نەبزواندوە.

ئەگەر نوسەريكی تورك بەرهەميك بە زمانی بيانی بنوسيت وەك زمانی ئينگليزی يا فرەنسی يا ئەلمانی يا عەرەبی.. هتد، روبەروی زەحمەتيكی ئەوتۆ نابيتەوە. هەرگيز ئينگليزەكان يا فرەنسيەكان يا ئەوانی دی بە لايانەوە گرنگ نيە ستايشی كەسيك بكەن لەبەرئـەوەی بـە ئينگليزييـەكی نايـاب يـا فرەنسـييەكی جـوان يـا ئەلمانيـەكی پـەتی دەنوسيت يا بە نوسەريكی وەسف بكەن "تا ئەوپەری رادە شارەزايی لە زمانی ئينگليزی هەيە". بە بۆچونی من تەنها ئەم حالەتە بيلايەنی تيايە بەڵام لە سايەی كەشوهەوای كۆمەڵايەتی و سياسی باوی ئيستای توركيا شتەكان روالەتيكی دی بە خۆيەوە دەگريت.

ئەگـەر ئـەم بارودۆخـە وينـا بكـەين: گريمـان دەولـەتی (س) توركيـای داگـيركردوەو داگيركـەران بريـاری سـرينەوەی نەتـەوەی تـورك دەردەكـەن و بـە نەتـەوەی (س)ی دادەنين و زمانی نەتەوەی تورك بە بەشيك لە زمانی نەتەوەی (س) دادەنيـن. لـە دوای ئەو بريارە زمانی (س) دەبيتە زمانی نوسين و قسەكردن بۆيە ئـەو كەسـەی سـەرپيچی لەو بريارە بكات بە توندترين شيوە سـزا دەدريـت.. هتـد. ئايـا لـەم حالەتـەدا دەتوانـين بلين ئەو نوسەرانە تورك نين و سەر بە نەتەوەی (س)ن و نكولی لە توركبونـی خۆيـان دەكەن و بە زمانی (س) دەنوسن. ئەمەش لايەنيكی مەسەلەكەيە بـەڵام لايـەنی دوەمـی

مەسەلەکە پەیوەندی بە تێگەیشتنی روناکبیرانی نەتەوەی (س) هەیە. ئایا ستایشی ئەو نوسەرە تورکانە دەکەن کە بوون بە (س) و تواونەتەوە) و پێیان دەڵین "بە زمانی پەتی (س) دەنوسن" یا "جوانترین شێوەی زمانی (س) بەکاردەهێنن؟. ئایا پڕ ماناترو پڕ بایەختر نییە روناکبیرانی (س) دژایەتی پرۆسەی تواندنەوەی نەتەوەی تورك بکەن؟

ئایا لەم حالەتەدا چاکترین جۆری نارەزایی دەربرین ئەوە نییە کە واز بهێنرێ لە نوسین و قسەکردن بە زمانی (س) و روناکبیرانی نەتەوەی (س)یش پشتگیری لەم نارەزاییە بکەن. وەجهی تیمۆر ئۆغلو بەمشێوەیە تەعبیر لە تەحسین سەراج دەکات: "نوسین و قسەکانی بە زمانی تورکی ئامرازیکی دی دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم بو". لەم هەلومەرجەدا تەنها رەتکردنەوەی قسەکردن و نوسین بە زمانی تورکی جۆریکە لە نارەزایی دەربرین لە دژی تیرۆریزم. بەڵام ئەمرۆ یاساو ئایدۆلۆجیایەك لە تورکیا نیە نوسین و قسەکردن بە زمانی تورکی قەدەغە بکات. بەلکو بە پیچەوانەوە تەماحیکی زۆر بۆ هاندانی زمانی تورکی دەخریتە بەردەست. لە بەرامبەر ئەوەشدا قسەکردن و نوسین بە زمانی کوردی لە مەودایەکی دوردا سەرکەوتوترین و چالاکترین شێوازی دژایەتی کردنی کولتورگەرایی کۆلۆنیالیزم و ئیپمریالیزمی تورکیایە. ئەمرۆ ئەو کەسانەی لە تورکیا بە زمانی کوردی دەنوسن و قسە دەکەن بە توندی سەرکوتدەکرین بۆیە لەم بوارەدا تیرۆری دەولەت بە چری پیادە دەکریت.

لە بولگارستان نکۆلی لە کەمایەتی تورك دەکرێ و ناویان دەگۆرن بە ناوی بولگاری و هەولی تواندنەوەو بە بولگاریکردنیان دەدرێ و ئاخاوتن و نوسین بە زمانی تورکی قەدەغە دەکەن.

ئەگەر لەم هەلومەرجەدا تورکیك وینا بکەین کە چیرۆکیك یا شیعریك بە زمانی بولگاری دەنوسیت. ئایا روناکبیریکی بولگاری ریگە بە خۆی دەدا ستایشی ئەو تورکە بکات و بلیت زمان و کولتوری بولگاری پیشخستوە یا بلیت ئەم نوسەرە "تورکە" باشترین کەسە بە زمانی بولگاری دەنوسیت؟ ئایا هەلویستی ئەم روناکبیرە هەلویستیکی دروستە؟ ئایا پیویست نیە هەر لە سەرەتاوە دژی پرۆسەی بە بولگاریکردن و

تواندنـەوە نـارەزایی دەربریـت؟ ئایـا نـارەزایی دەربریـن لـە دژی ئاخـاوتن و نوسـین بـە زمانی بولگاری باشترین هەلویستی تورکەکان نیە؟

ئەگەر ئیستا فەلەستینیەك لە ئیسرائیل یا لە کـەرتی غـەزە یـا لـە کـەناری رۆژئـاوا وینـا بکـەین و لـە نیـوان خـۆی و زمـانی عیـبری و زمـانی عـەرەبی پەیوەندییـەکی لـەو جۆرەی سەرەوە دروست بوە. ئـەو پەیوەندییـە شـیبکەینەوەو هـەمان ئـەو پرسـیارانەی سەرەوەش بکەین.

لە واقیعدا وەلأمدانەوەی ئەو پرسیارانە زۆر رون و ئاشکرایە. مەحالـە بـە شـیوازی چەوسـاندنەوە و سـزادان تواندنـەوە لـە بوتقـەی (س) قبـول بکریـت چونکـە سـتایش کردنـی ئـەو دەقـە ئـەدەبی و شـیعرییانەی بـە زمـانی کولتـوری (س) دەنوسـریت مانـای بـەرگریکردن لـە ئیمپریـالیزمی کولتـوری دەگەیـەنیت. ئـەم دیاردەیـە هیـچ پاسـاویك هەلناگریت چونکە نوسینی ئەو تورکە بولگارییانـەی نکۆلـی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆیان دەکەن لە لای کەس پەسـەند نیـە. هـەمان شـت لەسـەر ئـەو نوسـەرانەش پیـادە دەبیت کە ستایشی ئەو دەقانە دەکەن.

بـەلأم سـەبارەت بـە کـورد پرۆسـەی تواندنـەوەو تـەتریك کـردن و رەتکردنـەوەی ناسـنامەی کوردایـەتی نـەك هـەر بـەکاریکی سروشـتی دەزانـن بـەلکو تورکبونـی کـوردو رەتکردنەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی بە هەنگاویکی دیموکراتی و شۆرشگیری دادەنریت. ئەمـەش کاریگـەری دەزگـای ئایدۆلۆجیـای رەسمـی دەردەخـات چونکـە کاریگـەری ئایدۆلۆجیای رەسمی دەگاتە رادەی نکۆلی کردن لە بونـی کـورد، هـەروەها ئایدۆلۆجیـای رەسمی نەیهیشتوە ئەم کیشەیە بگاتە ئاستی وشیاری خەلکی.

تەحسـین سـەراج نکۆلی لـە کوردبونـی خـۆی دەکـرد و بـە ئـەرکی خـۆی نازانـێ تیرۆرکردنی کورد شەرمەزار بکات یا بەرگری لە مافەکانی کورد بکـات. سـەراج بـە پیـی چەمکەکانی ئایدۆلۆجیـای رەسمـی و لـە چوارچیوەی رایەلـەکانی ئایدۆلۆجیـای رەسمـی میژوی راڤەدەکرد. بۆ نمونـە دەنوسـیت: ".. ١٩٢٦: پیلانـەکانی ئینگلیـزو راپەرینەکـەی شیخ سـەعید لـەژیر دروشمـی "ئـاین لیمـان دور دەکەویتـەوە"، سـەراج لـەم نوسـینەیدا کورد بە مرۆڤ ناونابـات، وەك؛ "لـە ناوەراسـتی بـازاردا کوردیـك لەسـەر پـەتی سـیدارە

دەبینـم" و "ئـەو دەولەتـەی دەزانیـت چۆن بـاج کۆبکاتـەوە سـەربازگیری بکـات بـەڵام هـەرگیز بـیری نەکردۆتـەوە هاوڵاتیـانی خـۆی فـیری زمـانی تورکـی بکـات" و "ئـەو جوتیارانـەی زمـانی تورکـی نـازانن هـەرگیز دژایـەتی چینـی باڵادەسـتیان پینـاکریت". شتیکی ئاشکرایە تەحسین سەراج لە تەوقە سەرییەوە تا قولەپیی نوقمی ئایدولۆجیای رەسمی بووە. سەراج سور بو لەسەر ئەوەی دەولەت کورد فیری زمانی تورکی بکات.

سەراج بە عـەقل و بـە دل بـیری لـە ئەلتـەرناتیفیکی دی نـەدەکردەوە، واتـە ئـازادی خویندن و قسەکردن بـە زمـانی کـوردی. بۆچـی سـەراج نـەیدەتوانی بـە دەولـەت بلیـت دەسـت لـە سـەرکوتکردنی زمـانی کـورد هـەلبگرەو بـا هـەمو کوردیـك لـە نوسـین و قسەکردنی زمانەکەی خۆی ئازاد بیت، بەلکو گلەییکردنەکەی لـە دەولـەت دوورووییەکـە لە کوفر گەورەتر بو.

دەولەتی تورکیا بۆ ئەوەی کـورد فـیری زمـانی تورکـی بکـات و زمـانی کوردییـان لـە بیربەریتەوە هەمو شیوازیك بەکاردەهینێ بەڵام کاتیك سەراج مولکدارو شیخ و سەرەك خیلەکان بە چینی باڵادەستی کۆمەلگەی کوردەواری دادەنیـت لـە راسـتیدا نوینەرایـەتی دیدو بۆچونی ئایدولۆجیای رەسمی دەکات.

پیویسـتە لـە کـاتی شـیکردنەوەدا هـەمو وردەکارییـەکان لەبـەرچاوبگرین تـا بزانـین بۆچی کەسیکی وەك تەحسین سەراج کە کەسیکی پەیوەندیدارە بە مەسەلەی ئـەدەب و کولتورو بەشداری گەلیك کۆنگرەی نیودەولەتی کردوە نکۆلی لە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆی دەکات. هەروەها پیویستە لە هەمان کاتدا لیکۆلینەوە لەسەر هەلویست و رەفتاری ئـەو روناکبـیرە تورکانـە بکـەین لـە جیـاتی ئـەوەی رەخنـە لـەم دیاردەیـە بگـرن کـەچی پشتگیری لیدەکەن. سەرباری ئەوەش پیویستە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوەو بە قولی لیکۆلینـەوەی لەسـەر بکـەین: چۆن ئـەم دووفاقییـە لـە بـیروراو هەلویسـت و رەفتـاری روناکبیرانی تورك دروست بوە؟

ئەم دیاردەیە ئەوە ئاشکرا دەکات کە بیری تورك لە سروشتیدا بیریکی گشـتگیر نیـە، بەلکو لەسەر هەلویستیکی سادەی نەتەوەپەرستی دەژی. ئەم هەلویسـتە بـە پیـی وتـەی "بە تەنها تورك دۆستی تورکە" خۆی دوبـارە دەکاتـەوە. مافـەکانی مـرۆڤ لـە روانگـەی

ئایدۆلۆجیای تورکەوە بریتیە لە مافەکانی تورك. ئەگەر لە سەرتاسەری ئەم دونیایە تورکیك زیانی لیبکەویت پیویستە نارەزایی لەسەر دەربرین، هەروەها پیویستە رەخنە بگیرێ لە پیشیلکردنی مافەکانی تورك و ریکخراوە نیودەلەتیەکانیش پشتگیری لەم هەلویستە بکەن. دەبێ سوربین لەسەر وتەی تەنها تورك دۆستی تورکە تەنانەت ئەگەر ئەو دەولەتەی تورك دەچەوسینیتەوە لە لایەن ریکخراوە نیودەولەتیەکانیشەوە رەخنەی لیبیگریت و گوشاری بخریتە سەر. بەلام خودی تورك بەردەوام کورد دەچەوسینیتەوەو زمان و کولتوری یاساغ دەکات. ئەو ستەمەی تورك لە کوردی دەکات زۆر زیاترە لەو ستەمەی دەولەتەکانی دی لە تورکی دەکەن کەچی بەرامبەر بە هەمو دونیا نارەزایی لەسەر چەوسانەوەی تورك دەردەبرن. تورك لە ولاتەکانی دی زۆر ستەمکارترو زۆردارترە بەلام دەیەویت کەس قسە لەسەر زولم و چەوسانەوەی کورد نەکات، کەچی کاتیك زولم لە تورك دەکریت دەیەویت هەمو کەسیك هاوکاری و هاودەردی بیسنوری خۆی دەربریت. لەگەلّ ئەوەشدا گەرەکیانە رای گشتی جیهان زولم و چەوساندنەوەی کورد بە هەند وەرنەگریت. سیاسەتی چەوساندنەوەی کورد چاوی تورکی لە ئاست ئەو شۆرشە جیهانیە کویر کردوە کە دژی ئەشکەنجەدان و ستەم و پیشیلکارییەکانی مافی مرۆڤ بەرپا بووە. ئەم سیاسەتە لە پرەنسیپە جیهانیەکانی دورخستونەتەوەو وای لیکردون لە بازنەیەکی بەتالی بیناوەرۆکی نەتەوەپەرستیدا بخولینەوە.

پیویستە لەو مانای "هاوولاتی"یە تیبگەین کە دەزگاکانی دەولەت و رۆژنامەو پارتە سیاسیەکانی تورکیا لە هەمان چوارچیوەدا بەکاریدەهینن. تورکەکانی بولگارستان لەبەرئەوەی بە هاوولاتی دادەنران. بەو جۆرە پیشوازییان لیدەکرا نەك لەبەرئەوەی لە دەست ستەم و زۆرداری رایان کردبوو بەلام بیباکی بەرامبەر بە کورد و ریزنەگرتن لە وەزعی سیاسی پەنابەرانی کوردەکانی باشوری کوردستان، ئەوانەی لە ترسی چەکی کیمیایی پەنایان بۆ تورکیا هینابو لەبەرئەوە بو بە هاولاتی دانەئەنران بەلکو بە کۆمەلیك دوژمن دادەنران، ئەمە لە کاتیکدا پیویستە ئەوانەی بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ دەکەن نارەزایی لەسەر هەمو پیشیلکارییەك دەربرن. کاتیك ئەزدال ئینونو-ی

سەرۆکی پارتی سوسیال دیموکرات لە سەردانیکی ناوچە کوردنشینەکان لە رۆژهەلأت گەرایەوە رۆژنامەنوسەکان لییان پرسی بۆچی پەنابەرە کوردەکان لە ئۆردوگای زۆرەملی دەست بەسەر دەکریت کەچی دەرفەتی باشتر بۆ پەنابەرە ئەفغانیەکان دەرەخسینرێ. ئینونو لە وەلأمدا وتی لەبەرئەوەی ئەفغانیەکان تورك و هاوولأتین (رۆژنامەی جمهورییەت ژمارە ١٩٨٩/٨/٧).

ئەم بابەتە بەمشیوەیە کورت دەکریتەوە: روناکبیرانی ولأتیکی کۆلۆنیکراو لە بابەت تەحسین سەراج هاو بیچمەکانی لەبەرئەوەی نکۆلی لە کوردبونی خۆیان دەکەن و سورن لەسەر تورکبونیان و زمان و کولتوری کوردیان لەلا مەبەست نیە روناکبیرانی دەولەت کۆلۆنیالیزم ریزیان لیدەگرن.

## شیوازەکانی دزینی کولتوری کوردی: گۆرانیبیژەکان

لە ناوبردنی کولتوری کورد یەکیکە لە سیاسەتە گرنگەکانی ئایدۆلۆجیای رەسمی بەلأم بۆ ئەوەی بەم ئامانجە بگەن ئەم شیوازە دەگرنە بەر: سەرەتا گۆرانییە میللیە کوردییەکان وەك خۆی وەردەگرن. ئەم ئەرکە کۆمەلیك پسپۆری مۆسیقاو ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری و ژمارەیەك ئەفسەر جیبەجیی دەکەن، پاشان دوای کەمیك دەسکاری دەقی گۆرانییەکان دەکریتە تورکی و ئاوازەکەیشی لەگەڵ مۆسیقای تورکی دەسازینرێ. پرۆسەی دەستکاریکردنی گۆرانیە میللیەکان ماوەیەکی دیاریکراو دەخایەنیت و هەر لەو ماوەیەشدا پسپۆرە تورکەکانی گۆرانی میللی لە وینەی محەمەد ئۆزبەك رۆلیکی گەورە لەم پرۆسەیە وازیدەکەن. پاشان گۆرانیەکە لە بەرگە تازەکەی بلأودەکریتەوەو لە تەلەفزیۆن پیشاندەدرێ. پسپۆرەکان بۆ چرینی ئەو گۆرانیانە، گۆرانی بیژی کورد هەلدەبژیرن وەك جەلال گویزال ساس، موعەزەز تورونگ، ئیبراهیم تاتلیساس، عیزەت ئالتوغەشە، سەلاحەدین ئەلیای، حوسامەدین سوباشی، بەدری ئایسالی، کوچك ئەمرا، بورهان چاچان، جەلال یارگیجی، هولیا سوەر، عەلی رزا گویند ئۆغلو، نورای عەفیفتاش.. هتد. وتنی ئەو گۆرانیانە بە دەنگی گۆرانیبیژی کورد دوو خەسلەتی هەیە: یەکەم، دەنگی کوردەکان بۆ گۆرانیە میللیە کوردییەکان گونجاوترە، دوەم، وتنی

گۆرانی کوردی بە زمانی تورکی بە دەنگی ئەو گۆرانی بیژانە دەوریکی گرنگ لە ئەتەتریککردنی کورد وازیدەکات.

ئەوەی بەسەر گۆرانی کوردی دیت هاوتای پرۆسەی ئیمپریالیزمی کولتورییە لە کوردستاندا و ئەمەش جۆریکە لە دزینی میراتی کولتوری میللەتی کورد. بۆ نمونە پسپۆری بەناوداری تورك لە گۆرانی میللی محەمەد ئۆزبەك لەسەر دانانی گۆرانی بەیاز گول و قرمزی گول کە بە گۆرانی میللی تورکی سال دانراوە خەلات دەکریت بەلام لە راستیدا ئەم گۆرانیە یەکیکە لە گۆرانییە میللیەکانی کورد تەحسین تەها-ی شاعیرو گۆرانیبیژ وتویەتی و بە زۆری رادیۆی بەغدا پەخشی دەکات و ناوە کوردییەکەی ئەم گۆرانیە "رابە جوتیار دهلو رابە"یەو لە تورکیا قەدەغەیە. ئەم گۆرانیە لە تورکیا وەك پارچە مۆسیقایەکی تورکی پیشکەش دەکریّ. ئایا ئەمە نمونەیەکی ئاشکرا نیە لە دزیکردن!!؟

گۆڤاری Tempo لە ژمارە (١٥)دا لە بەرواری ٩-١٥/٤/١٩٨٩، ل ٢٤-٣٠، بابەتیکی سەرەکی بەم مانشیتە بلاوکردۆتەوە: زمانیکی یاساغ و مۆسیقایەکی ریگەپیدراو: گۆرانی کوردی و وشەی تورکی:

ئەمرۆ لە تورکیا گۆرانی میللی برەوی هەیە: گۆرانی "باخچەیە گیال کی گویزم" بۆ گۆرانیبیژی تورك جەلال گویزە لساس ئاوازی بۆ دانراوەو وەك پارچە مۆسیقایەکی تورکی پیشکەش دەکری، بەلام لە واقیعدا وینەیەکی دەستکاریکراوی گۆرانیەکی میللی کوردییە بەناوی )(دە رابە گول بچینین) و هونەرمەندی بەناوبانگی کورد عارف جەزراوی لە رادیۆی بەغدا تۆماری کردوە. تا ئیستاش گەلیك گۆرانیبیژی تورك ئەم گۆرانیەی وەك گۆرانیەکی میللی تورکی دەلینەوە بۆ نمونە عیزەت ئالتونمەشە، هولیا سوەر، سەلاحەدین ئالپای و ئیبراهیم تاتلیساس.

هونەرمەندی تورك سەلاحەدین ئالپای دەلیت؛ سەرەرای ئەوەی شارەزاییم لە زمانی کوردی نیە بەلام دەزانم گۆرانی "حەماملی بویندادر" و "دیاربەکر دوزدەدر" و "هەلەیار زالم یار" و "ئالتون یوزوگوم قرلدی های" لە گۆرانیە میللیەکانی خەلکی

کوردستانە. جەلال یارجی دەلیت گۆرانی "ور دەهولچی" گۆرانیەکی میللی کوردیە (گۆڤاری Tempo ژمارەی سەرەوە، ل ٢٧-٢٨).

هەروەها گۆڤاری Tempo ی لیستیکی لەو گۆرانیە میللیە کوردیانە بلاوکردۆتەوە کە وەك "مۆسیقای میللی تورك" پیشکەش دەکرێ. لیستی ناوی گۆرانیەکان بە ناوی "گۆرانیە بەناوبانگەکانی کوردۆ بیسك" بلاوکراوەتەوە.

| گۆرانیە تورکییەکان | گۆرانیە کوردییەکان |
| --- | --- |
| +بیرمومدر/ بەدری ئایسالی و ئیبراهیم تاتلیساس | +یەك مۆمیك/ ئانونیم |
| +بەن یاتم/ ئیبراهیم تاتلیساس و کوچك ئەمرا | + لی دۆنمام: محەمەد شیخۆ |
| +گولە ئویان ساباهتر/ ئاکتان چەلیك | +گولی رابە سیبەیا،/ ئانونیم |
| +ئوی فورات فورات/ عیزەت ئالتونمەشە | ئۆی فورات فورات: شیڤان |
| +هەلەیار، زالم یار/ س. ئالپای و ع. ئالتونمەشە | +ئەز کواکم لی لی/ حەسەن جەزراوی |
| +جان مەرجان/ بورهان چاچان | وەللا گۆڤەند رانابە/ ئاتونیم |
| +بەن دە گیدەم پایتەختە/ ع. ئالتونمەشە | +دیاربەکر پایتەختە/ سەیدا هەمۆ |
| +گویلزار/ ع. ئالتونمەشە | "گولزار، دەردا مەنایەك بو بویە سەد هەزار/ ئانونیم |
| +مادەن داخی دوماندر/ ع. ئالتونمەشە | +دایکامن/ ئانونیم |
| +ماردین ڤاپی شەن ئۆلور/ ئانونیم | +ئەندەڤەرە پایتەختە/ ئەنۆ دینۆ |

+مەکتــەبین باجــالاری/ موعــەزەز تورونگ    +هات کاروانه ماردینه/ فەخری بامیمه

+ڵی نازە/ عیزەت ئالتونمەشه    +ڵی نازێ ڵی نازیله/ ئانونیم

+کارانفیل ئەکـەر میســن/ جــەلال گویزەلساس    +راکا میدیاته کاشه/ ئانونیم

+ئەسمــەرم بیچــم بیچــم/ زەکــی مران، بولند ئەروسی ئەمەل ساین، عیزەت ئالتونمەشه    +بەرچەم بەرچەم دیچومه/ ئانونیم

+بەیاز گول، قرمز گــول/ ئیـبراهیم تاتلیساس، حوســامەدین ساباســی، عــــەلی رەزا گوینــــد ئوغــــدو، هولیاسوەر نورای عەفیفتاش.    +جوتیار/ تەحسین تەها

+هــایده خــانی گویرەیــم ســەنی: ئاتونیم    +ڵی ڵی خانی/ ئەنۆدینو

+هــای هــای گــدی گویــزەل یــار/ ئەتیلاکایا    +های های گدی هایرۆکی/ شڤان

+ئای دوخدو سویا دوشـتو نارینــه/ جەلال یارجی    +هاوار هاوار رابه نارینه/ ئانونیم

زاپ سویا/ جەلال یارجی    +سینەمه ئانونیم

هیندیـك نوسـەری رەگەزپەرسـت و کۆلۆنیـالی تــورك وەك جوشـکون قیرجـه چیــژ وەردەگرن کــاتیك دەلیـن زمـانی کوردی زمـانیکی سـەرەتاییەو پیویسـته لەسـەر زەمـین نەمینێ و لەناوچونی خزمەت به مرۆڤایەتی و کورد دەکات بۆیــه بـەردەوام ئـەو وتانـه دوباره دەکەنەوە

(Coskun Kirca: Bayn Mitterand, Milliyet, 3-5-1989: Olacak Gibi Degil, Milliyet 5-6-1989: Maksatlari ne?, Milliyet 21-8-1989).

لیرەدا پیویستە سەرنجی ئەم میکانیزمەی خوارەوە بدەین: سەرەتا بەرهەمی هونەری میللی کوردی و مۆسیقای کوردی دەدزن.. هتد، ئنجا بەرهەمە دزراوەکان وەك "فۆلکلۆرو مۆسیقای تورکی" پیشان دەدەن و دوای ئەوەش فۆلکلۆرو مۆسیقای کوردی قەدەغە دەکەن و بەبی ئەوەی ناوی زمانی کوردی بهینن رایدەگەیەنن "زمانیکی سەرەتاییەو پیویستە بە یەکجارەکی لەناوببریت..".

ئەگەر گۆرانییە میللیەکانی کورد لە رادیۆو تەلەفزیۆنی تورکیا دەربهینن هیچیان بۆ نامینیتەوە!

ئەگەر یەکیك رەخنەبگریت لەو بیروڕایانە و سکالآنامەیەك لە دژی ئەو کارە رەگەزپەرستانەیە بەرزبکاتەوە بە ناوی "سوکایەتی کردن بە نەتەوەو دەولەت" و "سوکایەتی کردن بە کەسایەتیە نمونەییەکانی نەتەوەو دەولەت" سزا دەدریت. بەڵام ئیمە چ شتیك لەسەر ئەو دزییانە بلیین؟ هەلبەتە هیدی هیدی وشیاری لەسەر ئەم بابەتە گەشە دەکات. کورد لە پیناوی پاراستنی میراتی هونەری و مۆسیقای میللی و ریگەگرتن لە تالآنکردنی دریژە بە خەبات دەداو دەمامك لەسەر بیروراو کردەوە ناشیرینەکانی تورکیای کۆلۆنیالیزم لادەبات.

بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد و گەشەسەندنی سەرمایەداری لە کوردستاندا بیگومان گەشەسەندنی سەرمایەداری و پەرەسەندنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردستان پەیوەندییان بە نیواندا هەیە بەلآم ئەو پەیوەندییە لە رووی پرەنسیپەوە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی بە تیۆری دەوتریت. بە کورتی دەقە تیۆرییەکەی بریتیە لە: چینی بالآدەستی گەلیکی چەوساوە بۆ ئەوەی بازاریکی تایبەت بە خۆی هەبێ سیفەتی بەرژەوەندی نەتەوەیی دەداتە پال بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆی و هەر لەسەر ئەو بناغەیەش بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی گەشەسەندوو لە دەوری ئەو چینە کۆدەبیتەوە. پیشتر باسم کردوە چۆن مولکدارەو گەورەو شیخ و سەرەك خیل و بازرگان و پیشەوەرەکانی باکوری کوردستان نکولییان لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان کردووەو بوون بە چینیکی بەکریگیراو. ئەم دیاردەیە ریگەمان لی ئەگرێ کە ئەو تیۆرییە کۆنە بە راست دابنیین لە کوردستاندا لەگەڵ ئەوەشدا، خودی چینی بە کریگیراو بەری

سروشتی گەشەکردنیکی شیواو سەرمایەداری بوون لە کوردستاندا، هـەروەها لـە هـەمان کـاتدا ئـەو گەشـەکردنە بـووە هـۆی گەشەسـەندن و پیشـکەوتنی کەسـانی شۆرشـگیرو بورجوازی بچوکی کورد و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردیش گورو تینیکی زیاتری پـەیدا کردو لە ئەنجامی فراوانبونـی ئاسـتی پـەیوەندی نیـوان خـەلکی کوردسـتان ئـەویش بـە هـۆی دروسـتکردنی ریگـەوبان و فراوانبونـی ئاسـتی دەرفـەتی خوینـدن و کۆچـی گوندنشینەکان بەرەو شارە کوردییەکان و پیشکەوتنی بەردەوامی ئاوەدانی و هتد.

شتیکی ئاشکرایە دروستکردنی تـۆری ریگـەوبان و فراوانبونـی ئاسـتی بلاوبونـەوەی دەزگاکانی راگەیاندن (تەلەفزیۆن و رادیۆو رۆژنامە) و زیادبونی دەرفـەتی خوینـدن لـە کوردسـتان مەبەسـتی سـەرەکی تواندنـەوەی کـورد بـو. بیگومـان ئـەو هەنگاوانـە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر گەشەسەندنی بزوتنەوەی نەتەوایـەتی کورد هـەبوو. بـۆ نمونە ئەو هەوالانەی پـەیوەندی بـە سـەرکوتکردنی تورکـەکانی بولگارسـتان و بـەرگری فەلەستینیەکان هەبو گفتوگۆو مشتومری ئەوەی لە نیو کوردەکـان وروژانـد کـە بـیر لـە دوارۆژی خۆیـان بکەنـەوە هـەمان شـت لەسـەر دروسـتکردنی تۆریـك ریگـەوبان پیـادە دەبیت، هەرچەندە ئامانجی سـەرەکی دروسـتکردنی ریگـەوبان بـۆ کارئاسـانی هـاتوچۆی هیزی سەربازی و گواستنەوەی ئامیرو جبەخانەکانی بوو بەلام یارمەتی زۆرینەی کورد دەدا یـەکتری ببینـن و پـەیوەندی لەگـەلْ نیوەنـدە دیاریکراوەکـان ببەسـتن. وشـیاری سیاسی کورد بە زیـادبونی دەرفـەتی خوینـدن لـە کوردسـتاندا بـەردەوام گەشـە دەکـات. سەرەرای ئەوەی بەنداو و جۆگەکانی ئاودیری سنوردارن بەلام ئەو جوتیارانـەی پارچـە زەوییـەکی بچوکیـان هەیـە دەرفـەتی ئـەوەیان بـۆ دەرەخسـیت بەروبومـەکانیان زیاد بکەن و بە مەبەستی باشترکردنی ئاستی بەرهەمـەکانیان تـەکنۆلۆجیا بەکاربـهینن و پەیوەندییـە فیوداڵییـەکان لـە ریگـەی بـەکارهینانی ئـامیری نویـوە زووتـر هەلدەوەشیتەوەو گەشەسەندنی سـەرمایەداری ئـەنجامی گرنگـی لیدەکەویتـەوە چونکـە کوردستان لە پال فراوانبونی ئاستی پراکتیزە کردنی دیموکراتیزم پیشکەوتنیکی خیراو بەربلاو بە خۆیەوە دەبینیَ.

ئەگەر قسە لەسەر بابەتی وشیاری بکەین: ئەوان قسە لەسەر چەوساندنەوەی تورکەکانی بولگارستان دەکەن و لە بەرامبەر ئەوەشدا ئیمە قسە لەسەر سەرکوتکردنی میللەتی کورد دەکەین بەلاّم ئەمە پەرچەکرداریکی گەورە دروست ناکات چونکە چارەسەرکردن و هەلسەنگاندنی هاوبەشی ئەم دوو بابەتەو ئاشکراکردنی دوو هەلویستیی لە بیرکردنەوەو رەفتاردا مەسەلەیەکە پەیوەندی بە وشیارییەوە هەیە بۆیە دەولەت بە هیچ جۆریك نایەویت ئەم وشیارییە بەرجەستە بیت لەبەرئەوە وشیاری کیشەو دەردەسەری بۆ دروستدەکات.

رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنەکان باسی ئەوە دەکەن میللەتی ئیسرائیل رەخنە دەگرێ لە سیاسەتی حکومەتەکەی بەرامبەر بە فەلەستینیەکان و لەسەر کیشەی فەلەستینیەکان لەگەڵ حکومەتەکەی ناتەبایە بۆیە وەك نارەزاییەك دەرژیتە سەرجادەکان بەلاّم لە تورکیا نابیت کەس دژی سیاسەتی سەرکوتکردنی  کورد نارەزایی دەربریت و خۆپیشاندان سازبکات. ئەگەر بە شیوەیەکی چون یەك بروانینە ئەو روداوانە بۆچی لە ئیسرائیل ئەو کارە دەکرێ و لە تورکیا ناکریت ئەوا هیچ پاساویکی بۆ نادۆزینەوە. ئەمرۆ خەلکی کوردستان لەو ناکۆکیانە تیدەگات. گەشەکردنی وشیاری کۆمەلاّیەتی گوریکی گەورە دەدات بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی.

رۆژنامەو تەلەفزیۆنەکانی تورکیا بەردەوام ئەم دەستەواژانە دوبارە دەکەنەوە: "ئەو کەسانەی لە عراقەوە رایانکردوە" و "ئەو کەسانەی لە باکوری عەراق پەریونەتەوە" و پەنابەرە عراقیەکان". بەلاّم خوینەر یا بینەر هەلەیەکی کوشندە دەکات ئەگەر بپرسیت بۆچی خەلکی باشوری کوردستان پەنایان بۆ تورکیا هیناوەو بۆچی پییان ناوتریت "کورد" یاخود "ئەو کوردانەی لە عراقەوە رایانکردوەو داوای پەنابەریتی لە تورکیا دەکەن" یا "کوردەکانی عراق" لەم  چرکەساتەدا وشیاری دەست پیدەکات و خوینەران و بینەران دەپرسن: بۆچی کورد دابەش بوە "کوردەکانی  باکوری عراق و کوردی تورکیا" و بۆچی  خیلەکانیان دابەش و پارچە پارچە کردوەو بیر لە کوردەکانی ئیران و سوریاو یەکیتی سۆڤیت دەکەنەوە. کاتیك بیر لە دابەشکردنی کوردستان دەکریتەوە پرۆسەی بەرجەستەبونی وشیارییەك دەست پیدەکات کەس

ناتوانیت ریگەی پیبگریت، لەبەرئەوە دەولەت بیهودە هەولدەدا بەهەر نرخیك بوە ریگە لەم پرۆسەیە بگریت.

گەشەکردنی سەرمایەداری رۆلیکی گەورە لە قولکردنەوەو فراوانکردنی ئاستی وشیاری دەبینیت چونکە سەرمایەداری چەند گۆرانکاری بەسەر بنەما کۆمەلایەتیە دوگماکان و پەیوەندی مرۆڤ بە خاك و دیموگرافیا دەهینیت بە هەمان ئەندازەش گۆرانکاری بەسەر بونیادی فیکری دانیشتواندا دەهینیت و لە هەمان کاتدا بە خوایشت بێ یا بە تۆپزی ئەو شتانەی یاساغ بووە لەنیو دەچیت و خەلکی گفتوگۆ لەسەر بابەتە نهینییەکان دەکەن، ئەمەش دەبیتە مایەی ریسواکردنی رژیم و بە ناچاری دەبیت دان بە لایەنە لاوازەکانی خۆیدا بنیت.

نوسەری ئینگلیزی هارۆلد پنتەر Harold Pener شانۆگەرییەکی بە ناوی "زمانی شاخ" نوسیوە. پنتەر دەلیت دوای ئەوەی بە بارودۆخی کوردەکانی تورکیا ئاشنابو سروشی نوسینی ئەم شانۆگەرییەی بۆ هاتوە (گۆڤاری Tempo ژمارە (١)، ئایاری ١٩٨٩). بابەتی ئەم شانۆگەرییە بریتیە لەوەی دایکیك سەردانی کورە زیندانیەکەی دەکات. کاتیك دایك و کورەکەی پیکەوە قسەدەکەن یەکیك لە پاسەوانەکان قسەکەیان پیدەبرێ و رویدەمی دەکاتە دایکی کورە زیندانییەکەو زۆر بە شیوەیەکی ناشیرین پیی دەلیت: یاساغە بەزمانیکی لەناوچو قسە بکەیت، لە ئیستا بەدواوە کەس بە زمانی شاخ قسە ناکات و پیویستە بە زمانی رەسمی ولات قسە بکەیت". بەمشیوەیە کۆتایی بە قسەکردنی نیوان کورو دایکەکە دەهینرێ. لە سەردانی دواتردا پۆلیسیك دەچرپینێ بە گوێی دایکی کورەکەدا: دەتوانیت بە زمانی شاخ قسە لەگەڵ کورەکەت بکەیت چونکە تا ماوەیەکی دی ریگەیان داوە بە زمانی شاخ قسە بکەن بۆیە کاتیك کورو دایکەکە یەکترێ دەبینن، کورەکەی پیی دەلیت: "ئیستا دەتوانین بە زمانی خۆمان قسە بکەین.. ریگەیان داوە بە زمانی خۆمان قسە بکەین". سەرەرای ئەوەی کورەکە زۆر لە دایکی دەپاریتەوە قسە بکات بەلام دایکی کورەکە ورتە ناکات و هەولیدەدا بە سەرنجەکانی گوزارشت لە تورەبون و رق و کینەکەی بکات. دەشیت ناوەرۆکی بیدەنگی و تورەبون بە قۆناغیك راڤە بکەین کە تییدا سەرنج لە هیندیك شتی دیاریکراو بدەین و یەکەم

تۆوی رابونی وشیاری بچینین. هەروەها گەشـەکردنی وشـیاری دەبیتـە مایـەی نـارەزایی دەربرین و دایکی کورە زیندانیەکەش هەولیدەدا بە بیدەنگی نارەزایی خۆی دەربریت.

لە سالانی پەنجاکاندا بـە مەبەسـتی گەشـەکردنی سـەرمایەداری هیندیـك دەسـتمایە لەژیرخانی کوردستان سەرمایەگوزاری کرا، ئەمە لە پال ئەوەی هەولدەدریٚ ریبازەکـانی "نەتـەوە گـەرایی" کۆنـترۆل بکـریٚ کـە ئەگـەری ئـــەوەی لیدەکـرا لــە پاشـــەرۆژدا سەرهەلبدات. ئەم سیاسەتە لـە پـەنجاکان هیندیـك سـەرکەوتنی بـە دەسـت هینـا بـەلام باوردۆخەکـە لـە سـالانی شەسـتەکان بـە تـەواوەتی ئـاوەژو بویـەوە چونکـە سـالی ١٩٦٩، دامەزراندنی یانەی کولتوری شۆرشگیری لە رۆژهەلات ریگەی لەبەردەوامبونی پرۆسەی تـەتریك و تواندنـەوە گـرت و بەرهەلسـتی کۆمەلایـەتی و سیاسـیش دەسـتی پیکـرد، لەبەرئـەوە ئـەمرۆ هیـچ ئەگـەریك بـۆ سـەرکەوتنی پرۆسـەی تـەتریك و تواندنـەوە نەماوەتەوە و بەرگری کۆمەلایەتی و سیاسی لە هەمو کاتیك بـەهیزترە. ئیستا لاوانـی کورد هەرچەندە شارەزایی تەواویان لە زمانی تورکی هەیە بەلام لە کاتی دادگاییکردندا بە زمانی کوردی بەرگری لە خۆیان دەکەن بۆیە دەبینین سەرەرای هـەمو جۆرەگرتـن و سـزادانیك ئـەم ریبـازە زیـاتر لـەنیو کوردەکـان بلاودەبیتـەوەو وشـیاری میژویـی و کۆمەلایـەتییان زۆر بـە خـیرایی گەشـە دەکـات. چـۆن ئـــەمرۆ نـــاتوانریٚ رەورەوەی گەشـەکردنی سـەرمایەداری بوەسـتینریٚ هـەر بـەو شـیوەیەش ئەسـتەمە گەشـەکردنی وشـیاری نەتەوایـەتی پـەکبخریت. ئـــەو شـــتانەی پەیوەندییـــەکی دیالیکتیـــان بـــە گەشەکردنی رۆژهەلاتەوە هەیە.

## ديدو بۆچونەكان لە بارەی گەشەكردنی "رۆژهەلات"

دەولەت و رۆژنامەو نوسەرو زانكۆو پارتە سیاسی و ریكخراوە پیشەییەكانی تورکیا "مەسەلەی كورد" بە "مەسەلەی رۆژهەلات" لـە قەلـەم دەدەن و دووپاتیدەكەنـەوە كـە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە مەسـەلەی ئابورییـەوە هەیـەو دەلیـن لەبـەر هەلومـەرجی جوگرافی و دەزگا فیودالەكان و دواكەوتویی میللەت تا ئیستا رۆژهەلات بە دواكـەوتویی ماوەتەوە. ئەم حالەتە قابیلی چارەسەر كردنە.

كاریكی زۆر بە سودە ئەو چارەسەرانەی بۆ گەشـەكردنی رۆژهـەلات پیشـنیاز كـراوە لـە نزیكـەوە لیكۆلینـەوەی لەسـەر بكریـت. ئـەو پیشـنیازانە بـە پلـەی یەكـەم پشـت بـە چـەمكی "گەشـەكردن بـە سەرپەرشـتی دەولـەت" دەبەسـتیت. چـەمكی وەك "ئـەو پرۆژانـەی دەزگاكـانی دەولـەت جیبـەجییان دەكـات" و "ئـەو پاداشـتانەی دەولـەت پیشكەشی دەكات" بەكاردەهینریَ. واتە پشت بەو قسانە دەبەسـتیت كـە دەلیـت كـەرتی تایبـەت ناتوانـیَ گەشـە بـە رۆژهـەلات بـدات. پـارتی گـەلی كۆمـاری و دەزگـا سیاسـی و كۆمەلایەتییـەكان ئـەم نەریتـە لـە سیاسـەتیاندا دەگرنەبـەر. پارتـە سیاسـیەكانی دی كەمیكیان پشتگیری لەم پركردنەوەیە دەكەن یا بـە لایـەنی كەمـەوە بـەلین بـە میللـەت دەدەن شـتیكیان بـۆ بكـەن. هەلـەی سـەرەكی لـە لۆجیكـی شـتەكان لەوەدایـە كـە زۆر زەحمەتـە ئـابوری رۆژهـەلات بـە سەرپەرشـتی دەولـەت گەشـە بكـات، ئەمـە لـە كـاتیكدا سەرمایەداری لە تیكرای ناوچەكانی دی توركیا گەشەی كردوە. لـە لایـەكی دی، خـالیكی نیوەنـدی سیاسـەتی دەولـەتی توركیـا لـە گەشـەپیدانی رۆژهـەلات زیـاتر "ئامانجـە سەربازییەكان" رەچاو دەكات لەبەرئەوەی دەولەت دەیەویت لە مەسەلەی كورد رزگـاری بیـت بۆیـە هـەولدەدا بەهـەر نرخیـك بـوە خـۆی لـە مەترسـیەكانی مەسـەلەی كـورد دوربخاتەوە چونكە دەولەت بـە ئاشكرا نكۆلی بونـی مەسـەلەی كوردو نەتـەوەی كورد دەكات كەچی بە نهینی دانیپیادەنیت. كاتیك دەولەت بیر لە سەرمایەگوزاری رۆژهـەلات دەكاتـەوە وەك لیدانـی ریگـەوبان و راكیشـانی ئـاو و كارەبـاو دروسـتكردنی بەربەسـت و كارگـەو تـۆری پـەیوەندی هەمیشـە بـیر لـەوە دەكاتـەوە چـۆن ئـەو سـەرمایەگوزارییە

یارمەتی دەدا مەسەلەی کورد چارەسەر بکات، واتە تەتریك کردن و تواندنـەوەی کـورد. دەولەت بەردەوام لە خۆی دەپرسیت تا چ رادەیەك ئـەو سـەرمایەگوزارییە یـا شـتەکانی دی کارئاسـانی لـە پرۆسـەی بـە تـورك کردنـی دەکـات بۆیـە هـەولدەدا ئـەو جـۆرە سـەرمایەگوزارییە بکات کـە تـەتریك کردنـی کـورد سـاناتر و خـیراتر بکـات، بـۆ نمونـە دەولـەت بـە مەبەسـتی گواسـتنەوەی ئـامیر و کەلوپـەلی سـەربازی وەك تـانك و تـۆپ و سـەرباز ریگـەوبان دروسـت دەکـات یـا کـاتیك خویندنگەیـەك دروسـتدەکات ئـەوەش لەبەرچاو دەگریت چۆن ئەو بینایە وەك بنکـەی سـەربازی یـا گرتووخانـە بەکاربـهینیَ، هەروەها دەولەت پیی وایە ئەستەمە کورد تـەتریك بکریـت ئەگـەر کۆچکردنـی بـەرەو رۆژئاوا ریگەی پینەگیریت ئەو سەرمایەگوزارییەی ئامـانجی سـەربازی لـە پشـتەوە بیـت زۆر زەحمەتە بتوانیت رەورەوەی گەشەکردن لە رۆژهەلات بخاتەگەر.

سـەرباری ئـەوەش سـەرمایەگوزاری دەولـەت و بنکـەکانی بەرهەمـهینانی سـەر بـە دەولـەت، بنکـەی بـەرتیل و گـەندەلی و خزمایـەتی و کۆمـەلیك دەزگـای پەککـەوتووی بیبەرهەمە.

ریگەیـەکی دی بـۆ گەشەکردنی رۆژهـەلات هەیـە کە پشت بـە چـەمکی "گەشـەکردن بـە سەرپەرشتی کەرتی تایبەت" دەبەستیت و متمانـە دەکاتـە سـەر "دەسـت پیشخەری دەزگاکـانی کەرتی تایبەت" و "ئەو پاداشتانەی دەزگاکانی کەرتی تایبەت پیشکەشیان دەکات".

هەلبژاردن و پیادەکردنی ئەم ریگەیە لـە دوای ١٩٨٠ دەسـتی پیکـرد بـە تایبـەتی لە سەردەمی حکومەتەکـەی ئـوزال. ئـەوەش لیکۆلینـەوەی کاراکتـەرەکان و پیشکەشـکردنی پاداشـت بـە دەزگاکـانی کـەرتی تایبـەتی رۆژئـاوا دەگریتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە رۆژهـەلات سـەرمایەگوزاری بکـەن، هـەروەها حکومـەت قـەرزیکی زۆری دەدا بـۆ ئـەوەی کارگـەی پیشەسـازی خشت و کارگـەی چارەسـەرکردنی لۆکەو کارگەی چیمـەنتۆو شـیرەمەنی و ئـاژەلی دابەسـتە دروسـت بکـریَ، ئەمـە لـە پـال ژمارەیـەك لـە پیشەسـازییانەی بەرهەمەکانیان دەنیرنە دەرەوە و وەرشـەی بەرهەمـهینان. سـەرباری ئـەوەی حکومـەت بـەلیندەرەکانی رۆژئـاوای ولات هـاندەدا تـا لـە بونیاتنانـەوەی رۆژهـەلات وەك دروستکردنی ریگەوبان و راکیشانی ئاو و وزەی کارەباو ئاودیری سەرمایەگوزاری بکەن.

حکومەت لە پاڵ ئەوەی قەرزێکی زۆری بە سودێکی کەم پێشکەش دەکرد، ئەم کارئاسانیانەشی دەکرد: بەڵێنی دەدا رەسمی گومرکی لەسەر ئەو ئامێرانەی لە دەرەوە دەهێنرێن هەڵگرێت و لە حاڵەتی کرینی ئامێری تورکی دەوڵەت خۆی تا رادەی لە ٢٥٪ نرخی کرینەکەی بدات و هەمو ئامێرە هێنراوەکانیش لە پارەی زیادە ببەخشێت، هەروەها حکومەت بەڵێنی دەدا بری باج بە پێی قەوارەی بری سەرمایە بێ.. هتد. ئەو کاراکتەرانە بەشێکن لە پشتگیریکردنی ئەو بەڵێندەرانەی سەرمایەگوزارییان لە رۆژهەڵات دەکرد و پشتگیری ئەو بەڵێندەرانەش دەکرێ کە سەرمایەگوزاری لە رۆژئاوا دەکەن یا ئەوانەی بە ئەسل خەلکی رۆژهەڵاتن.

بەڵێندەرە رۆژئاواییەکان سەرەرای ئەوەی کارئاسانییان بۆ دەکرێ بەڵام لە رۆژهەڵات سەرمایەگوزاری ناکەن و روداوەکانی ساڵانی هەشتاکان باشترین بەڵگەیە لەبەرئەوەی بەڵێندەرەکانی کەرتی تایبەت لە رۆژئاوا مەسەلەی کورد لەسەر سەرمایەگوزاری لە رۆژهەڵات بە مەترسی دەزانن. بۆیە گۆڤاری Dogru 2000e لە بەرواری ١٩٨٨/١١/٦ دەنوسێت: کەرتی تایبەت بە کەلکی گەشەکردنی رۆژهەڵات نایەت.

پێم وایە تەنها خەلکی رۆژهەڵات و بە تایبەتی خاوەن پیشە ئازادەکانی کەرتی بازرگانی و پیشەسازی دەتوانن رەورەوەی گەشەکردنی رۆژهەڵات بخەنەگەر. بە وشەیەکی دی، گەشەکردنی رۆژهەڵات لە رێگەی رێکخستنی هەوڵەکان لەگەڵ بورجوازی کورد دێتە دی، واتە ئەو کوردانەی وشیاری نەتەوایەتیان هەیەو بەرگری لە بونی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن. لە سەرەوە باسم کردوە دەوڵەت بە پێی توانا هەوڵدەدا رێگە بە خاوەن پیشەکانی رۆژهەڵات نەدا سەرمایەگوزاری لە ناوچەکانی خۆیان دا بکەن بەڵام ئەگەر لە رۆژئاوا سەرمایەگوزاری بکەن کۆمەکیان دەکات بۆیە ئەو جۆرە سەرمایەگوزارییە روبەروی گەلێك کۆسپ و کێشە دەبێتەوە.

لەمرووە کێشەیەکی گرنگی دی هەیە. پێشتر باسم کردوە "چینی باڵادەستی کورد" بوە بە توێژێکی بەکرێگیراو، کەواتە چۆن توێژێکی بە کرێگیراو دەتوانێ بورجوازییەکی کوردی دروست بەرهەم بهێنێ؟ ئەم کێشەیە پەیوەندی بە وشیاری نەتەوایەتییەوە هەیە. ئەمرۆ نەوەی چینی شێخ و موڵکدارە گەورەو سەرەك خێل و

بازرگانـەکان وەك بـاوك و باپـیرو پسمامەکانیان رازی نـابن نۆکەرایـەتی بکـەن چونکــە دەزانن ئەم کارە بۆ خۆیان و خیزانەکانیان کـاریکی پـر شـەرمەزارییە. هەنوکە نـەوەی نـویێ پرسـیار لـە سـەر رابـردو ئیستای کۆمەڵگەی کـوردەواری دەکـات. لەبەرئـەوەی لــە ناوەرۆکی نۆکەرایەتی ئەم قۆناغـەو سروشـتی ئـەو دەورەی لییـان داوادەکـریێ، تیدەگـات بۆیە نۆکەرایەتی رەتدەکەنەوە و بیر لـە ژیـانیکی لایـەق و سـەرفراز دەکەنـەوە. ئەگـەر هەر کوردیك بیر لە بارودۆخی کۆمەڵگەی کوردەواری لـە تورکیـا و رۆژهـەڵاتی نزیـك و جیهان بکاتەوە زۆر بـە ئاسـانی بـەم ئەنجامـە دەگـات. ئەگـەر هـەر کوردیـك بـارودۆخی کوردسـتان لەگـەڵ خـەباتی رزگـاریخوازی فەلەسـتین و باشـوری ئــەفریقیاو ئــەریتیریاو ئـەمریکای باشـور و ئەفغانسـتان و فلیپـین و بولگارسـتان بـەراورد بکـات ئەسـتەمە بـەم ئەنجامە نەگات.

لە لایەکی دی، ساڵانی هەشتاکان ئەوەی ئاشکرا کـردوە ئـەو بورجوازییـە کوردییـەی گرنگـی بـە هەسـت و بـیری نەتەوایــەتی دەدا خەریکــە دروســت دەبیــت و تــۆوی ئــەم پرۆسەیەش دەمیکە چینراوە.

کاریکی سروشتییە سوسیالیزم بیرو پلانی خۆی بۆ گەشەسـەندنی کوردسـتان هـەبیێ بۆیـە ئـەم بابەتـە پانتاییـەکی گـەورە لـە بەرنامـەی پارتــە سوسیالیسـتەکان دەگریـت. سەبارەت بە گەشـەکردنی رۆژهـەڵات هـەولم داوە لـە ریگـەی خویندنـەوەی روداوەکـانی رابوردو هیندیك لایەنی پەیوەندیدار بە گەشە هەنوکەییەکانی کوردستان بخەمەروو.

لـە کۆتـاییدا سـەرنـج بـۆ ئـەو پروپاگەندانـە رادەکیشـین کـە دەولـەت و هینـدیـك لـە پارتە سیاسییەکان برەوی پیدەدەن بـەوەی زۆر جـاران رایدەگەیـەنن بودجـەی دەولـەت سـەرمایەگوزارییکی زۆری بـۆ رۆژهـەڵات تـەرخانکردوەو دوپـاتی دەکەنــەوە رۆژهــەڵات خەرجییەکی (نفقە) گەورە دەخاتە ئەستۆی دەولـەت بـەڵام ئەگـەر لیکۆلینـەوە لەسـەر ئـەو خەرجییانـە بکـەین دەبینـین خەرجیـەکان لـە دروسـتکردنی بنکـەی جەندرمــە و پۆلیس و زیندان و ریگەی سـەربازی و خـانووی پیـاوانی پۆلیـس و سـوپاو هـەوالگری و شـتی دی سـەرف دەکـریێ. لـەم ساڵانەی دواییـدا لـە ناوچـە جۆراوجۆرەکـانی کوردسـتان زیاتر لە (١٠٠) بنکەی تازە بۆ پۆلیـس و جەندرمـە دروسـتکراوە زیـاتر لـە (٥٠) بنکـەی

تازەش بۆ پۆلیس لە قۆناغی دروست بووندایەو چاوەروان دەکرێ بنکەی زیاتر دروست بکرێ. ئەو پیگە سەربازییانەی جاران بۆ حەوانەوەی ٨-٩ سەرباز تەرخاندەکرا ئەوا ئەمرۆ زیاتر لە (٦٠-٧٠) سەربازی تیا دەژی، هەروەها رۆژانە ژمارەی بنکەکانی پۆلیس و ژمارەی دروستکردنی خانوی فەرمانبەرە مەدەنی و عەسکەرییەکان زیا دەکات. لەم سالآنەی دواییدا دەولەت زیاتر لە (٥٠) بەندیخانەی دروستکردوەو پلان بۆ دروستکردنی زیاتریش دادەریژیت.

دەولەت بۆ ئەوەی شەری نیوان کورد و کورد خەستتر بکات بەردەوام ژمارەو موچەی پاسەوانی گوند زیاد دەکات و مەشقیکی زۆر بەهیزە تایبەت و سیخورەکانی دەکات بۆیە شتیکی ئاشکرایە ئەو خەرجییانەی دەولەت پیویستی بە تەرخانکردنی بودجەیەکی زۆر هەیە چونکە ئەو جۆرە کارانە تەنها بە پارە دیتەدی. ئەگینا ئەستەمە کاریکی وەك پاسەوانی گوند سەرنجی خەلکی رابکیشێ. ئەمە خەرجییە سەرەکییەکانی بودجەی دەولەتە.

لە پالٚ ئەوەشدا تیچونی (تکالیف) پرۆژەی GAP هەیە (پرۆژەیەکی ئاودیری مەزنە لە باشوری رۆژهەلآتی ئەنادۆل لە کۆمەلیك بەربەست پیکدیت). ئاشکرایە ئامانجی پرۆژەی GAP خزمەتکردنی ناوچەکانی رۆژئاوای تورکیایە نەك رۆژهەلآتی تورکیا.

کوردستان سەرچاوەی سروشتی زۆری هەیە وەك نەوت، خەلوز، فۆسفات، کرۆم، مس، ئاسن و سەرچاوەی ئاو،.. هتد، لەبەرئەوە کاریکی سروشتیە ئەو دەولەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنییەکی هاوبەش دەچەوسیننەوە بە مەبەستی بەکارهینان و تالآنکردن و زامنکردنی پرۆسەی بە تالآن بردنی ئەو سەرچاوە سروشتییانە ناچارن سەرمایە گوزاری بکەن.

## بنەما مادییەکانی لایەنە لاوازەکانی کۆمەلگەی کوردەواری

پێشتر باسمان کردوە ئەو میللەتەی دەبێتە ئامانجی سیاسەتی "پەرتکە- زالبە" روبەروی گەورەترین تراجیدیا دەبێتەوە. ئەمرۆ کورد نەتەوەیەکی پارچە پارچەو دابەشکراوەو دۆخێکی سیاسی نیەو تەنانەت باردۆخی لە کۆلۆنی خراپترە. دەولەتە بەهێزەکان کوردستانیان دابەش و پارچە پارچە کردوەو بە مین و تەلی درکاوی و قەلای چاودێری و فرۆکەی سیخوری سنوریان بۆ کیشاوە. ئامانجی سەرەکی ئەو دەولەتانە ئەوەیە ریگە نەدەن کوردەکان پەیوەندییان لە نیواندا هەبێت.

ئەو کۆمەلگەی دەبێتە قوربانی سیاسەتی "پەرتکە- زالبە" لایەنی لاوازی ترسناکی هەیە. لایەنە لاوازەکانی کۆمەلگەی کوردەواری چیە؟ بۆچی کورد لایەنە لاوازەکانی تیناپەرێنێ؟ پیش ئەوەی وەلامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە، سێ بابەت هەیە بە روکەش ناکۆکن بەلام لە واقیعدا تەواوکەری یەکترین پیویستە باسیان بکەین.

## یەکەم- ئەحمەدی خانی و داستانی مەم و زین

(Mehmet Emin. Boz arslan, 2 a. ed, Komal Yayinevi, Istanbul, 1975).

لە دیباجەی داستانەکەی ئەحمەدی خانی هەستیکی پر جۆش و خرۆش بەدی دەکەین (ئەحمەدی خانی لە سەدەی حەڤدەهەمی زاینی ژیاوە). خانی لە بەشی پینجەمی "کول و دەردی مەکوردا" ل ٥٢-٥٩ و لە بەشی شەشەمی "بۆچی داستانی مەم و زین م بە زمانی کوردی نوسیوە"، ل ٦٠-٦٧ باسی کیشەی کوردو زمانی کوردی دەکات و بە هەستیکی نەتەوەیی قول و کاریگەر باسی ژیردەستەیی کورد دەکات. بۆچی کورد وای لیهاتووە کە بیگانە فەرمانرەوایی بکات. دابەشبونی کوردستان لە نیوان عوسمانی و فارس دا خانی غەمبار کردوە، دوبەرەکی نیوان کوردان خۆشیان چەند ئەوەندە خانی غەمبار کردوە بەوەی تیمیکیان بۆ سەرکەوتنی فارس شەری تیمیکی دی دەکات کە پشتگیری لە عوسمانیەکان دەکرد، لەبەرئەوەی خانی دەیزانی پەرتەوازەیی و دوبەرەکی تەنها مالی کورد ویراندەکات. خانی زۆر بە راشکاوی دەلیت لەبەرئەوە داستانەکەی بە

زمانی نەتەوایەتی نوسیوە تا بیگانەكان نەتەوەی كورد بە نەزان و پیاوكوژ و خوینریژ تاوانبار نەكەن. وە بلین كورد تەنها شەرو خوین رشتن دەزانێ. خانی بە پیزانینەوە باسی ئەدیبەكانی پیش خۆی دەكات كە بە زمانی كوردی شیعریان نوسیوە وەك عەلی حەریری لە سەدەی یازدەهەمی زاینی و شیخ ئەحمەدی مەلای جزیری لە سەدەی دوازدەهەم و فەقیێ تەیران لە سەدەی چواردەهەمی زاینی. خانی ١٦٤٨ فەرهەنگیكی بە ناوی "نۆبەرەی بیچیگان" بە زمانی عەرەبی- كوردی بۆ منالان داناوە.

لە بەشی پینجەمی داستانی مەم و زین دوازدە بەیتی شیعر هەیە كە لە دەقە توركییەكەدا نەهاتووە. خانی لەم دوازدە بەیتەدا بەوپەری هەستیاری و زۆر كاریگەرانە باس لە خراپی بارودۆخ و تواناكانی كورد. دەكات[١٠].

دوای ئەوەی داستانەكەی ئەحمەدی خانی دەخوینینەوە ئەم پرسیارانە دەبیت بە ئەمری واقیع: ئەگەر كۆمەلگەیەك لە سەدەی حەڤدەهەم شاعیرەكانی هیندە بە بیگەردی و بە پەرۆشی تەعبیر لە هەستی نەتەوایەتی خۆیان بكەن بۆچی یەك ناگریت؟ بۆچی دابەشكردن و پارچە پارچەكردنی كوردستان بەردەوام قولتر دەبیتەوە؟ بۆچی وشیاری نەتەوایەتی لە كوردستان بەرجەستە نابیت؟[١١].

كتیبی دوەم ئەفسەری روسی ئاریانۆڤ- Aurianov داینـاوە بە نـاوی "شەرەكانی نیوان روسیاو توركیاو ئیران و بارودۆخی كورد لە توركیا و ئیران و روسیا لە سەدەی نۆزدەهەم". ئاریانۆڤ یەكیك بوو لە سەركردەكانی دەستەی ئەركانی روسیا. نوسەر لەم كتیبەدا كردەوەكانی "سوارەی حەمیدی" تا سالی ١٨٩٩ باس دەكات. ئەم كتیبە سەرپەل عادل ئەفەندی و رائید مستەفا ئەفەندی وەریانگیراوەتە سەر زمانی توركی. سالی ١٩٢٦ خانەی پەخشی حاكمیەتی میللی Hakimiyeti Milliye لە ئەنقەرە ئەم كتیبەی لە (٢٠٩) لاپەرەدا بلاوكردۆتەوە.

ئاریانۆڤ لەم كتیبەیدا تیبینی گرنگی تۆمار كردوە: ئاریانۆڤ دەلیت كورد نەك هەر هەستی نەتەوایەتی لاوازە بەلكو هەستی نەتەوایەتی نییەو ئەم روداوەش دەكاتە بەلگەی قسەكانی: "لە نزیك روباری ئاراس یەكەكانی ئیمە پەلاماری خیلیكی كوردیان داو لە ئەنجامدا شەریكی قورس لە نیوان هیزەكانی هەردولا هەلایسا كەچی خیلە كوردەكانی

دی هەلویستی تەماشاکاریان هەبو، ئەمەش سەرکەوتنی ئیمەی ساناکرد. ئەمە لە کاتیکدا دوای هەفتەیەك خۆمان بۆ پەلاماردانی خیلـە تەماشاکارەکان ئامادە کـرد. ئـەم ئەفسـەرە روسیە بە تەنها نالیت کورد هەستی نەتەوایەتی لاواز بو بەلکو لە هەمان کاتدا کوردی بـە درنـدەو دزو چەتەو شتی دی ناوبردووە. (ل ١٢٩- لاپەرەکانی دی).

پیـم وایـە سـەرنجەکانی ئاریـانۆڤ دەربـارەی هەسـتی نەتەوایـەتی کـورد زۆر لـە راستیەوە نزیکە چونکە ژمارەی جاش لـە عـراق و پاسـەوانی گونـد لـە تورکیـا بەلگـەی نـەبونی هەسـتی نەتەوایـەتی کـوردە[١٢]. ئایـا بنەمایـەکی مـادی ئەمشـیوە رەفتـارە راڤـە دەکات؟ کاریکی بە سودە بـە وردی لـەم بابەتـە بروانـین. لـەم سیاقەدا ئـەو ریکخسـتنی کارەی لەسەر ئاژەلداری دامەزراوە بـە نیشـاندەریکی گرنـگ دابـنریّ، هـەروەها بونیـادی خیلە کوردییەکانیش پەیوەندی بەم ریکخستنەوە هەیە.

کتیبی سییەم دیوانەکەی جگەرخوین‌ی گـەورە شـاعیری سـەدەی بیسـتەمی کـوردە. جگـەرخوین زۆربـەی ناوچـەکانی کوردسـتان گـەراوەو شـارەزاییەکی زۆری لەسـەر کوردستان پەیداکردوە.

لەبەرئەوەی "شاری ژیـن- Sehri - Jin"ی جگـەرخوین پـەیوەندی بـە بابەتەکـەوە هەیـە بۆیـە پیویسـتە لیکۆلینـەوەی لەسـەر بکـریّ. جیـاوازی نیـوان بەرهەمەکـەی جگـەرخوین و نوسـەرەکانی پیـش خـۆی لەوەدایـە کـە جگـەرخوین چارەسـەر بۆ کیشەکە دادەنیت.

ناوەرۆکی کتیبەکەی جگەرخوین بەمشیوەیە کورتدەکریتەوە:

گەنجیکی سەرشیت و چـەتون بـەردەوام بـە سـواری ئەسـپەکەی و بـە لـووت بـەرزی بەسەر لوتکەی چیاکاندا دەسوریتەوە و هەست بە لیپرسراویتی ناکات و بە بیّ ئامـانج دەژیت و تەنها دەیەویت سەرنجی خەلکانی دی بەلای خۆیدا راکیشیت. رۆژیکیان گەنجە سەرشـیتەکە لـە سـەرچلییەکی سـەر شـاخیکدا چـاوی بــە پــیریژنیکی کلۆلـی ناشـیرین دەکەویت کە دوژمنەکانی فراندبوویـان و دەسـتوقاچیان بـە زنجیر بەسـتبوەوە. وەزعـی پیریژنەکـە گەنجـە سەرشـیتەکە زۆر نارەحـەت دەکـات بۆیــە لیـی نزیـك دەبیتـەوەو سەبارەت بە ناوی و خراپی وەزعی پرسیاری لیدەکات.

کاتێك گەنجەکە لە پیریژنەکە نزیك دەکەویتەوە پیرەژنەکە هێدی هێدی سەردەمی لاویتی و شۆخیتی دیتەوە خەیالی و هەست بە بەختەوەری دەکات، بەڵام ئەو کەسانەی ژنەکەیان یەخسیر کردبو ریگە نادەن گەنجە سەرشیتەکە لیی نزیك بکەویتەوە بۆیە لەم حالەتەدا جەستەی ژنەکە دەئاوسیت و هەمو ئەندامەکانی لەشی دەکەونە قرتەقرت و پاسەوانەکان دەست دەکەنەوە بە ئەشکەنجەدانی و ژنەکەش دەبیتەوە بە پیریژنە ناشیرینەکەی جاران.

گەنجەکە ئەو روداوە لە یاد ناکات و دەیەویت بەهەر نرخیك بوە بزانێ ئەو ژنە کییەو بۆچی وای بەسەرهاتوە، تاکو سەرەرای وریایی و قایمکاری پاسەوانەکان توانی بە نهینی لە پیریژنەکە نزیك بکەویتەوە بزانیت کییە.

پیریژنەکە دایکی کورەکە بوو. لە ناکاو بیرۆکەیەکی بە میشکدا هات کەواتە منیش دایکم هەیە چونکە پیشتر بیری لەم مەسەلەیە نەکردبوەوەو لە خۆیشی نەپرسی بوو دایکی کییەو لە کوییە، لیرەدا لە سەرکیشی خۆی تیدەگات بۆیە بە قولی بیری لە خۆی و لە دایکی دەکاتەوە. کورەکە لە خۆی دەپرسی بۆچی پیش ئیستا بیری لە دایك و براو خوشکەکانی نەکردۆتەوە؟ لەبەرئەوە تا زیاتر بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە زیاتر کلۆلی و چارەرەشی خۆی بۆ دەردەکەوت.

گەنجەکە بریاردەدا دایکە پیرو پەریشانە کۆتکراوەکەی لەو بارودۆخە دژوارە رزگاربکات بۆیە بریاریدا لە ئیستاوە تواناکانی بۆ سەرنج راکیشانی خەلکانی دی و شمشیرەکەی بۆ خزمەتی ئەوانی دی بەکارنەهینێ بەلکو هەمو هیزو توانای خۆی بۆ رزگارکردنی دایکی بخاتەگەر. دایکی لەو چەند دیدارە نهینیەدا بە کورەکەی وتبو؛ خوشك و برای مولکداری گەورەو شیخ و سەرەك خیل و بازرگانی بچوك و دادوەرو جوتیاری هەیە.

گەنجەکە بە سواری ئەسپەکەی هەمو کەسوکاری خۆی دەدۆزیتەوەو سەرگوزشتەی خراپی وەزعی دایکیان بۆ دەگیریتەوەو رزگارکردنی دایکی بە پیویست دەزانی بەڵام خوشك و براکانی بە بونی دایکیان نازانن و تەنانەت بیریان نەکردبوەوە لەوەی ئەوانیش خەلك ئاسا دایکی خۆیان هەبیت بەلکو بە لایانەوە گرنگ نەبو دایکیان

هەبيت يا نە چونكە ژيانيكى دەولەمەندو كامەران دەژيان و دلسۆزترين دۆست و هاوپەيمانى ئەو كەسانەش بون كە دايكيان يەخسيرو كۆتكردبو، لەبەرئەوە حاشايان لە دايك و برا گەنجەكەيان كرد.

گەنجەكە بەرامبەر بە كەمتەرخەمى و نابەرپرسياريتى براو خوشكە دەولەمەندەكانى هەستى بە دلتەنگى و كەساسييەكى زۆر دەكرد و دلنيا بوو لەوەى ناتوانيت پشتيان پێ ببەستيت بۆ رزگاركردنى دايكى ئيتر وەك دوا هەوليك كەوتە گەران بە شوين برا جوتيارەكەيدا. برا جوتيارەكەى پياويكى هەژار بو، ژيانى لەسەر پارچە زەوييەكى بچوك و گاليسكەيەكى بچوكى تەختە بەند بو. ئوميدى بە ژيان نەبوو بەلكو پياويكى كورتبين و ناحالى بو. تواناى شت وەرگرتنى نەبو، لە سەرگوزشتەى بە ديل گرتن و ناهەموارى وەزعى دايكى حالى نەدەبوو.

هەرچەندە كورە گەنجەكە خۆيشى لە بارودۆخيك دا نەبو ئيرەيى پيببريت بەلام سوربو لەسەر رزگاركردنى دايكى بۆيە دواى بيركردنەوەيەكى تيروتەسەل بۆى دەركەوت تەنها پشت بە برا جوتيارەكەى دەبەستريت. لەبەرئەوە پەيوەندى لەگەلدا پتەوكرد تا رۆژيكيان برا جوتيارەكەى دەستى كرد بە گيرانەوەى سەرگوزشتەى خوشك و براكانى كە چۆن مال و مولكيان بە تالان بردوەو چۆن لەسەر دەستى ئەوان توشى چەوسانەوەو ستەم بۆتەوە(١٣).

پيم وايە جگەرخوين زۆر باش لە بارودۆخى چينە كۆمەلايەتييەكانى كوردستان تيگەيشتوە چونكە دەيزانى هۆى مادى، مولكدارە گەورەو شيخ و سەرەك خيل و بيروكراتەكانى وا ليكردوە نكۆلى لە ئەسلى خۆيان بكەن بۆيە پيويستە لەو هۆيانە تيبگەين (بيگومان ئەم دەقەى ئيستا لەوانەيە جياوازييەكى زۆرى لەگەڵ كوردييەكەيدا هەبيت لەبەرئەوەى ئەم دەقە كراوە بە توركى- فرەنسى- عەرەبى و پاشان جاريكى دى كراوەتەوە بە كوردى بەلام سەد مەخابن كە نەمتوانى پوختەى ئەم روداوە لە خودى ديوانەكەى جگەرخوين وەربگرم ياخود بە لايەنى كەمەوە بەراوردى بكەم چونكە ديوانەكەم لەبەردەست نەبو).

## دووەم- شێوەكانی كاركردن و تایبەتمەندییەكانی بونیادی خێڵە كۆچەرو ئاژەڵدارەكان

كوردستان ناوچەیەكی شاخاوییەو دەكەویتە ناوجەرگەی رۆژهەڵاتی نزیك و ئاژەڵداری بە یەكێك لە گرنگترین سەرچاوەی داهاتی كورد دەژمێردرێ. خێل و خێزانە كوردەكان لە پیدەشتە فراوانەكاندا مەروماڵاتیان دەلەوەرینن و ریگەش بە خەلكانی دی نادەن لە پەریزو لەوەرگەكانیان مەروماڵات بلەوەرینن. كاتێك بچوكی پاوانەكان ئالیكی مەروماڵاتیان بۆ دابین ناكات ئیتر ئاژەڵدارەكانیش ناتوانن ژمارەی ئاژەلەكانیان زیادبكەن. بۆیە زەرەرو زیانیان لیدەكەویت ئەگەر خەلكانی دی لە دەرگەكانیان بەكاربهینن. ئەم بارودۆخە خێلە كوردەكانی لە یەكتری جیاكردۆتەوەو بووەتە مایەی دروستكردنی بونیادیكی خێلەكی داخراو. هەرخێلێك لە پیناوی پاراستنی سنوری لەوەرگەكەی شەری خێلەكانی دی دەكات بۆیە گروپی چەكداریان بۆ هینانە دی ئەم ئامانجە دروستكرد چونكە ریكخستنی بونیادی خیل بناغەیەكی لەباری بۆ دروستكردنی ئەو گروپانە هەبو، كەواتە تا ژمارەی مەروماڵاتەكان زیادبكات فراوانكردنی سنوری لەوەرگەكان دەبیتە كاریكی پیویست، ئەمەش مانای شەرو پیكدادانی شەری نیوان خێلە دراوسیكان دەگەیەنیت بۆیە شەر بووە بە رەهەندیكی گرنگی نیوان خێلەكان.

مەترسی لە دەستدانی لەوەرگەكان هۆیەكی سەرەكی پەرتەوازەیی خێلەكان بوو. بیگومان ئەم كیشە گرنگە جگە لە كورد روبەروی گەلانی دی بووەتەوە. ئەم كیشە روبەروی سەرجەم ئەو میللەتانە بوەتەوە كە ئاژەڵداری سەرچاوەی سەرەكی داهاتیان بووە. ئەگەر كشتوكال و ئاژەڵداری پیكەوە بەراوردبكەین ئەوا دەبینین كشتوكال وەك سەرچاوەیەكی داهات پیویستی بە كاری زیاتر هەیە لەبەرئەوە لەم حالەتەدا ئەو خێزانانەی زەوی دەچینن پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ خەلكانی كیلگە دراوسیكان دەبەستن چونكە كشتوكال خێزان و خێلەكان هاندەدا پەیوەندی ببەستن و هەوال بگۆرنەوەو كەشیكی لەبار بۆ لە دایك بون و گەشەكردنی هەستی نەتەوایەتی دەخولقینێ، بە پیچەوانەی ئاژەڵداری كە لە ناوچەیەكی سنورداردا دەبێ و بە ئاشكرا

گیـانی دوژمنایـەتی "ئیمـە دژی ئـەوانین" دەچینیـت، کـەچی کشـتوکاڵ گەشـە بـە پەیوەندی نیوان خیلەکان دەدا.

لـە چوارچیوەی ئـەو پەیوەندییـەی پیـی دەوتـرێ "ژیـانیکی ئـازاد" بـە ئاشـکرا خۆپەرستی دەبیتـە مۆرکی رەفتـاری تاکـەکان و تەنـها بـیر لـە خۆیـان و کەسـوکارو خیلەکەیان دەکەنەوە.

ئەو دەستیوەردانە دەرەکییانەی نەزمی ناوخۆو پەیوەندی نـاوەکی خیـل دەکـەن بـە ئامانجی خۆیان روبەروی پەرچەکرداری راستەوخۆ دەبنـەوە. بـەڵام مـەرجی سـەرەکی سازشکردنی نیوان خیل و داگیرکەران ئەوەیە دەست لە بونیادو پەیوەندی ناوەکی خیل وەرنـەدەن، بـە وشـەیەکی دی، خیـل دەبیـت بـە کۆیلـەی شـاڵاوبەران و ئـەو خیلانـەی پەلاماری لە وەرگەکانیان دەدەن ئەگەر نەتوانیت پاریزگاری لـە نـەزمی نـاوخۆی بکات بۆیە لەم حالەتەدا خیل ناسنامەی خۆی لە دەست دەدا.

## سییەم- کوردستان کەوتۆتە سەر ریگەی کۆچ و داگیرکەران

کاتیك لە سایەی ئەوەی پیـی دەوتـرێ "ژیـانیکی ئـازاد" گوشـاریکی دەرەکـی بـەهیز دەکەویتە سەر هەریمەکە تەنـها لـەو کاتـەدا خیـل بـەرگری خـاك و لەوەرگاکـەی خـۆی دەکات بەڵام بەرگری لە هەریمەکـەو خیلـەکانی دی ناکـات. ئـەو خیلـەی روبـەروی ئـەو جۆرە گوشارە دەبیتەوە لە پینـاوی مانـەوەی خـۆی و پاراسـتنی لەوەرگەکـەی یـا لەگـەڵ دوژمنـی دەرەکـی ریکدەکـەویت یـا هاوکـاری دوژمنەکـەی دەکـات. ئـەم هەلویسـتە تەنـها لەسەر حسابی خیلـەکانی دی دەبیـت. ئەگـەر گوشـاری دەرەکـی لـە هـیزیکی داگیرکـەری بەهیزەوە بیت بە گشتی خیل پیی وایە لەسەر دەستی ئەو هیزە رزگاری دەبیـت و لـەو حالەتەدا خیل ژیانیکی "ئازاد" بەسەر دەبات و کەس نـاتوانیت بیچەوسـینیتەوە خیـل بـە هـەمو لقـەکانی خۆیـەوە نـاتوانیت یـەکبگریت و نیوەندیـك بـۆ بەرهەلسـتیکردنی داگیرکــەری دەرەکــی دروســت بکــات، ئەمــەش مانــای وایــە ئەســتەمە بتوانــن داگیرکەران دەربکەن.

لەم حالەتەدا پێویستە پەیوەندی نێوان ئابوری خێل کە بە پلەی یەکەم پشت بە ئاژەڵدارییەوە دەبەستێت و هێزی داگیرکەر چارەسەر بکرێ. ژمارەیەك لەو خێڵانەی لە هێندێك شـوێنی دیـاریکراو ئـاژەڵداری دەکـەن پێشـوەخت لەوەرگـەو شـوێنی نیشـتەجێ بونـی زسـتانەیان دەسـت نیشـان دەکـەن و لەوەرگـەکانیان لـە دەسـتدرێژی خـەڵکانی دی دەپارێزن. کورد بەر لە شاڵاوی عەرەبەکان، واتە لە قۆناغی بە ئیسـلامبونی لـە سـەدەی حەوتی زاینی ڕێکخستنی ئابوری و کۆمەڵایەتی لەو جۆرەی هەبو. مـن پێـم وایـە کـورد بە یەکگرتویی ڕوبەڕوی شاڵاوبەران نەبۆتەوە، بەڵکو هەر خێڵێـك بـە جیـا بـەرگری لـە زەوی و لەوەرگەکانی خۆی کـردوە، واتـە هـەر خێلێـك بـە مەبەسـتی لاوازکردنـی خێڵـە ناحەز یا دراوسێ یا دوژمنەکانی هاوکاری هێزی داگیرکەری کردوە، ئەمەش بە دیویکی دی ئـەوە دەگەیـەنێت کـە کـورد وەك میللـەت لـە پێنـاوی بـەرژەوەندی خـۆی خـەباتی نەکردوە بەڵکو لە پێناوی بەرژەوەندی خەڵکانی دی خەباتی کـردوە، بـەوەش پاسـاو بـۆ مانەوەی خۆی دەهێنیتەوە.

هێندێـك دەقـی دی ئـەو تیـۆرەی پـێ ڕاسـت نیـە کـە دەڵێـت کـورد بەرامبـەر بـە شاڵاوەکانی عەرەب-ئیسلام یەکگرتو نەبوە بەڵکو پێیان وایـە کـورد بەرهەڵسـتی سـوپای ئیسلامی کردوەو شەڕێکی خویناوی لە نێوان هەردوولا هەڵایساوە و سوپای عەرەب لـەو شـەڕەدا سـەرکەوتنی بـە دەسـت هێنـاوەو لـە ئـەنجامدا کوردە دیلـە بـە تەمەنـەکانیان کوشتوە و گەنجەکانیان وەك کۆیلە و کچ و ژنەکانیشیان وەك کەنیزەك فرۆشتووە.

پەلاماری تورکە ئۆغۆزەکانی ئاسیای ناوەڕاست نەك هەر هەمان ڕوداوی لێکەوتـەوە بـەڵکو دژایـەتی و ململانـێی نێـوان خێڵـە کوردەکانی قووڵـتر کـرد. لـە ڕاسـتیدا ئـەو دژایەتی و ناکۆکییانـە خۆیـان هـەر هـەبون و داگیرکـەران تەنـها سـودیان لێوەرگـرت بـۆ ئەوەی کوردستان کۆنترۆڵ بکەن. لە لایەکی دی، هێندێك لە خێڵـەکان پـەیوەندییان بـە داگیرکەرانـەوە دەکـرد بـۆ ئـەوەی هەڵویسـتێکی بـەهێزیان بەرامبـەر بـە خێڵـەکانی دی هەبێت و ئەمەش لە نوسینی ئەو لێکۆڵیـارو نوسـەرانە بـەدی دەکرێـت کـە لێکۆڵینـەوە لەسەر مێژوی کورد دەکەن. هەروەها هێندێك نوسەر لە جیاتی ئەوەی جـەخت لەسـەر تایبەتمەندییـەکانی میللـەتی کـورد بکـەن بـە عـەرەب یـا فـارس یـا تۆرانیـان لـە قەڵـەم

دەدەن. ئەو ئیعتیبارانــە پشت بـە سروشـتی پـەیوەندی نیـوان ئـەو نوسـەرانەو دەولەتـە عەرەب و فارس و تورکەکانەوە دەبەستیت. بـۆ نمونـە، ئـەو نوسـەرانە کـورد بـە فـارس ناودەبەن ئەگەر پــەیوەندییان لەگـەڵ ئـیران هـەبیت بـە شـان و بـالی کـوردا هەلئـەدەن بـەلام بـە فـارس دایـان دەنیـن. بیگومـان نوسـینەکانی ئـەو نوسـەرانە لـە ئاسـتی قسـەی پروپوچدایـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا گرنگــی تایبــەتی خۆیــان هەیــە، چونکـە رەهــەندیکی سەرەکی لە فیکرو رەوشتی ئەو نوسەرانە ئاشکرا دەکات.

سەرباری ئەوەش، پەلامارەکان ئەو هەولانەیان لەناوبرد کە بـۆ بـە نیوەنـدی کـردن دەدراو جوگرافیای کوردســتانیش کـە دەکەویتـە سـەر ریگـەی هـاتوچۆی داگیرکـەران لـە رۆژهەلاتـەوە بـۆ رۆژئـاوا بـە پیچەوانـەوە هـەمو هەولـەکانی ریکخسـتن و بـە نیوەنــدی کردنی لەباربرد. شالاوی عەرەبەکان لە سەدەی حەوتەمی زاینی و تورکە ئۆغۆزەکان لە سەدەی یازدەهەمی زاین و مەغۆلەکان لە سەدەی سیازدەهەم و شالاوی تەیمور لەنگ لـە سـەدەی پازدەهـەم کاریگەرییـەکی گـەورەی لەســەر بونیــادی ئــابوری و کۆمەلایــەتی و سیاسـی کوردسـتان هـەبو. سـولتان سـەلیم سـالی ١٥١٤ (شـەری چـالدیران) بـە مەبەسـتی داگیرکردن پـەلاماری کوردسـتانی دا. شـەرەکانی عوسمـانی-فارسـی لایــەنیکی تراجیــدی هەبو چونکە لە لایەك سوپای هەردوولا لـە کوردسـتان شـەریان دەکـردو لـە لایـەکی دی وسوپای هەردولا پشتیان بە مرۆڤی کورد دەبەست. بیگومـان ئـەو روداوانـە گۆرانکـاری گرنگیان لە بونیادی کۆمەلی کوردەواریدا دروستکرد.

ئــەم بابەتــە لایــەنیکی دی هەیــە: لەبەرئــەوەی ئــاژەلدارە کوردەکــان لــە خیلــە کۆچەرییەکان بون لە کاتی شالاوەکاندا زۆر بە ئاسانی خۆیان لە بەرەنگاری داگیرکـەران دەدزییەوە. ئەم هەلویستە ئەو هەولانەی لاوازتر کرد کە بـۆ دروسـتکردنی سیسـتمیکی نیوەندی دەدرا تا خیلە کوردەکان کۆبکاتەوە. کـاتیك هینـدیـك لـە خیلـەکان بـەرەنگاری شالاوبەران و داگیرکەران دەبونەوە خیلەکانی دی پەنایان بۆ چیـا بلنـدە دور دەسـتەکان دەبرد. زۆربەی خیلە ئاژەلدارەکان بە هەمو شیوەیەك هاوکاری یەکتریان رەتدەکـردەوە. بۆیە هەر جاریك کوردستان روبەروی داگیرکردن دەبو ئەم حالەتە دوبارە دەبوویەوە.

مەبەستم نیە باسی میژوی هەزاران سالەی کورد بکەم بەلکو هەولدەدەم گەشە بە گریمانە دیاریکراوەکانی بنەما مادییەکانی دابەشکردن و پارچەپارچە کردنی کوردستان بدەم. بۆ نمونە، بۆچی کورد بوو بە ئیسلام و نەبوو بە مەسیحی یاخود بۆچی لەسەر ئاینە کۆنەکەی خۆیان واتە ئاینی زەردەشتی نەمایەوە. ئەمەیان بابەتیکە خەلکیکی زۆری سەرقال کردوە. پیم وایە کورد توشی زەحمەت نەبوە کە ئیمانی بە ئیسلام هیناوە چونکە بە زۆر نەبوە بە ئیسلام ، رەنگە لە هیندیك شوین شەری خویناوی لە نیوان کورد و عەرەب رویدا بیت بەلام راستی دەکەمەوە ئیسلام لە کوردستان روبەروی هیچ کیشەیەك نەبۆتەوە چونکە ئیسلام وەك ئاینی دەولەت گەشەی کردوە هەروەها لەبەرئەوەی موسلمانە داگیرکەرەکان زۆر بەهیزبون دەزانین خیلە گۆشەگیرە کوردەکان بەرامبەر بەو هیزە گەورەیە چۆن هەلویستیان وەرگرتوە. خیلە کوردەکان لە ئەنجامی ریکەوتن لەگەلْ داگیرکەراندا دریژەیان بە ژیانی خۆیان دەداو لە سایەی ریکەوتن یا ملدان بۆ دەستەلاتی موسلمانەکان پاریزگارییان لە بونی خۆیان دەکرد. داگیرکەران ئەم خاسیتەی خیلە کوردەکانیان قۆزتەوەو گروپە چەکدارەکانیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکاردەهینا، بەلکو گروپە چەکدارەکانی کورد خۆبەخشانە بون بە شمشیری دەستی داگیرکەران. بیگومان مسۆگەر کردنی ژیانی هیندیك لە خیلەکان لەسەر حیسابی خیلەکانی دی بو، لەبەرئەوە تەنها لەم هەلومەرجەدا تیدەگەین بۆچی کورد نەبو بە مەسیحی چونکە مەسیحیەت وەك دینی هەژاران و شۆرشیك لە دژی سیستمی بالادەست گەشەی دەکردو ئاینی مەسیحی لە سەرەتای مەسیحیەتدا هیچ هاندەریکی نەبوو ولاتانی دی داگیر بکات، و ئاینی مەسیحی هەرەشەی لە سیستمی خیلەکی کورد نەدەکردو دۆخیکی ئەوتۆی نەدەخولقاند هەرەشە لە بونی کورد بکات. پیم وایە ئیسلام- مەسیحیەت لە رووی بونیادو گەشەکردن و پەیوەندییان بە دەولەتەوە جیاوازی زۆر لە نیواندا هەیە(١٤).

گریمانەیەکی دی هەیە پەیوەندی بە ژیانی کۆچەری و ئاژەلداری و بونیادی خیلەکی و شیوەی ژیانی نیشتەجیْ بونی کوردەوە هەیە پیش ئەوەی بە ئاینی ئیسلام

ئاشنا بیت. کورد پیش ئەوەی ببیت بە ئیسلام قۆناغی سیستمی خیلەکی و ژیانی کۆچەری تیپەراندبوو، هەروەها لە ناوچەی میزوپۆتامیا (ناوچەی نیوان دوو رووبار) کۆمەلگەی کشتوکالییان دامەزراندبوو. کورد لەو سەردەمەدا دراوسێی عەرەب بوەو هیندیك جاریش لەسەر حیسابی ئەوان گەشەی کردوە. لە داگیرکردنی ئیسلامەوە تا سەردەمی ئەمەوی زۆرینەی کورد بە کشتوکالەوە خەریك بووە. لەو سەردەمەدا خیلە عەرەبەکان بە پالپشتی دەولەت شەری کوردیان دەکرد، بەلام لەبەرئەوەی دەولەت پشگیری لە کورد نەدەکرد بە ناچاری و بۆ خۆپاراستن پەنایان بۆ چیاکان دەبرد. بەمشیوەیە سیستمی کۆچەری و پەیوەندی خیلایەتی و ئاژەلداری جاریکی دی بۆ کوردستان گەرایەوە. زۆریك لە میژنووسان بروایان بەم گریمانەیە هەیە، لەوانەش Ziya Gokalp و خەلکای دی

(Ziya Gokalp, Kurt Asiretleri Uzerinde, Sosyolojik Arastirmalar, Komal Yayinlari, Istanbul, 1976).

لە لایەکی دی، لیکۆلیاران دوپاتی دەکەنەوە کە بەشیکی زۆری کورد مەسیحی بوە بەلام دوای ئەوەی ئاینی ئیسلامی وەرگرتوە ژمارەیەکیان بوون بە موسلمان و بەشەکەی دی لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە و تیکەلی ئەرمەنیەکان بون. کوردە مەسیحیەکان بە ئاین و ئینتمای نەتەوایەتی خۆیانەوە پابەندبون. کوردە مەسیحیەکان بە زۆری لە ناوچەی پەریڤانی ئەرمینیا دەژین.

کورد لە سەدەی دەهەم و یازدەهەم بە هۆی لاوازی ئیمپراتۆریتی ئەمەوی هەولیکی زۆریدا ریزەکانی خۆی ریکبخات، هەولی مەروانییەکان لە ناوچەی دیاربەکرو جزیرەو حەسنەوییەکان لە باشوری کوردستان بە مەبەستی یەکگرتنەوەی خیلەکانی کورد بوو، هەروەها لە رۆژهەلاتی کوردستان و لە ناوچەکانی لورستانی گەورەو بچوك هەمان هەولی یەکگرتنەوە هەستی پیدەکرا. هەر لەو ماوەیەدا یەکیك لە خیلە کوردەکان دەولەتی ئەیوبی دامەزراند بەلام شالاوی بەردەوامی تورکە ئۆغۆزەکان ئەو پرۆسەیەی لەباربرد. سەرباری ئەوەش کورد نەیتوانی بونیادی سیاسی ریکبخات بۆیە خیلە کوردەکان بە هۆی بونیادی داخراوی خیل نەیانتوانی یەکبگرن.

## چوارەم- فرەیی سەرچاوە سروشتیەکانی کوردستان

سەرچاوە سروشتیەکانی کوردستان یەکێك بوو لە هۆکانی لاوازکردنی کوردستان و کۆمەڵگەی کوردەواری. دەولەتە رۆژئاواییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆیان دەرکەوت کوردستان سەرچاوەی سروشتی زۆری هەیە بۆیە کاتێك بیرە نەوتی زۆر گرنگیان دۆزییەوە دەولەتە ئیمپریالییەکان لە نێوان خۆیاندا کەوتنە پێشبرکێ بۆ ئەوەی دەست بەسەر بیرە نەوتەکاندا بگرن. بەمشێوەیە بە هێدی هێدی سامانی کوردستان بووە گەورەترین دوژمنی کورد. کاتێك دەولەتە ئیپمریالی و کۆلۆنیالییەکان دلنیا بون لەوەی هەمو خاکی کوردستانیان بۆ کۆنترۆل ناکرێ پلانی دابەشکردنیان دارشت تا بە باشترین شێوە کوردستان کۆنترۆل بکەن. بەوەش زۆری سەرچاوەی سروشتی کوردستان دەچێتە پال هۆکانی لاوازی و دابەشکردنی کوردستان کە پێشتر باسم کردوەو بریتین لە: ئابوری ئاژەلداری کە پشت بە بونیادی خێل دەبەستێت و گرنگی ئیستراتیجی جوگرافیای کوردستان کە دەکەوێتە سەر رێگەی هاتوچۆی داگیرکەران. ئەم پێوەرە تازەیە کارئاسانی لە دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستاندا کردو بەوەش پرۆسەی دابەشکردن قولتر و فراوانتر بووە.

بە گشتی زۆری سەرچاوەی سروشتی دەبێتە مایەی خۆشگوزەرانی ئابوری و پێشکەوتنی کۆمەل بەلام سەبارەت بە کورد ئەو ئەنجامەی لێنەکەوتەوە چونکە کورد خاوەنی ولات و نیشتمانی خۆی نەبو. ململانێی نێوان دەولەتە ئیمپریالی و کۆلۆنیالییەکان بە مەبەستی کۆنترۆل کردنی سەرچاوەی سروشتی کوردستان هەمیشە دژی بەرژەوەندییەکانی کورد بوەو هاوکاری نێوان ئەو دەولەتانە خەباتی رزگاریخوازی کوردی نوقمی دەریایەکی خوێن کردوە.

## پینجەم- بونیادی سیاسی خیلە کۆچەرەکانی کورد

بیگومان بونیادی خیلەکی کورد ترسناکترین لایەنی لاوازی کۆمەلگەی کوردەوارییە. شیوەی ریکسختنی خیلەکی کۆمەلگەی کوردەواری و سروشتی چالاکی ئـابوری کـە پشت بـە ئـابوری ئـاژەلداری دەبەسـتیت جیـاوازی زۆری نیـە لەگـەلّ میللـەتانی وەك تـورك و مەغۆل و لە ئاسیای ناوەراست و عەرەب لە رۆژهەلأتی ناوەراسـت و بەربـەر لـە بـاکوری ئەفریقیا.. هتد. بە شیوەیەکی ئاسایی خیل لە چەند تیرەو گروپیك دروست دەبیت کە پییان وایە بۆ بەرەبابیك دەگەرینەوەو پەیوەندی نیوانیـان لەسـەر خزمایـەتی دروسـت دەبیّ و ئـەندامانی خیـل بـە یـەك زمـان یـا بـە یـەك زاراوە قسـە دەکـەن و نـەریت و کولتوریکی هاوبەشیان هەیە. خیل لە ریکخستنی سیانی کۆمەلگەی کوردەواری بە پلەی یەکـەم دیـت. ریکخسـتنی کۆمەلأیـەتی لـە دەزگـای خـیزان و عەشـیرەت پیکدیـت و پەیوەندی نیوانیان لەسەر خزمایەتی و رەچەلەکی هاوبەش دادەمەزریت.

ئەو خیلأنەی ژیان و گوزەرانیان لەسـەر ئـاژەلداری بـەند بـو زۆر جـاران نیشـتەجیّ نەدەبوون و یاخود لە دوای نیشتەجیّ بونیان وازیان لە نەریتی خۆیـان نـەدەهینا. ئـەو خیلأنە لە دوای نیشتەجیّ بونیان دەستیان کرد بە فەلاحـەت کـردن بـەلأم پییـان وابـو یـەك ئەسـلیان هەیـە. ئـەو خیلأنـە بـە دریژایـی سـەدان سـال لـە ریگـەی هینـانی ژنـی رفینراو یەخسیری خیل و نەتەوەکانی ترەوەو کۆیلـەو کریکارە کشـتوکالییەکان.. هتـد، خوینیان تیکەل بە خوینی خیل و میللەتانی دی دەبیت. بۆ نمونە لـە کـاتی شـەرەکاندا خەلکانی خیلی دۆراو دەبن بە رەعیەتی خیلی سەرکەوتو ئەگەرچی خیلـە دۆراوەکـەش شانازی بە بن و بنەچەی خۆیەوە دەکات.

خیـل کۆمەلگەیـەکی بچوکەو ئەندامـەکانی لـە ریگـەی پـەیوەندی خزمایەتییـەوە یەکدەگرن. خیل بـە شـیوەیەك خـۆی ریکدەخـات تـا بتوانـیّ وەلأمـی پیداویسـتییەکانی ژیـان بداتـەوە، واتـە خیـل بنکەیـەکی ئـابوری دروسـتدەکات. خیـل بـە مەبەسـتی خۆپاراستن لەو مەترسییانەی هەرەشە لە سامانی ئاژەل یا بەروبومی کشـتوکالی دەکـات یا بە هۆی پیشـبرکیّی لەگـەلّ خیلـە ناحـەزەکانی دی یـا لـە کـاتی گـەرمیان و کویسـتان

دروست دەبیت بۆ ئەوەی پاریزگاری لە هیزی خیل و بنەماله بکات، هەروەها خیل لە دەرەوەی چوارچیوەی خیزان ژن و ژنخوازی دەکات.

رەچەلەك و بن و بنەچەی خیل و پەیوەندی خوین و خزمایەتی بە ژنهینان دروست نابیّ بەلکو لە ریگەی منالبونەوە دروست دەبیّ، ئەمەش مانای سیستمی باوکایەتی دەگەیەنیت، واتە ناوو، ئابروو میراتی بە پیی سیسمی باوکایەتی دەست نیشاندەکریّ.

لەبەرئەوەی خیل کۆمەلگەیەکە پشت بە کاری بە کۆمەل دەبەستیت بۆیە ئامرازەکانی بەرهەمهینان بە مولکی هەمو خیل دادەنریّ و بە تەمەنترین کەس بە هەلبژاردن خیل بەریوە دەبات و لەسەر شیوەی کارکردن ژن و پیاو بە کۆمەل بریار دەدەن. پەیدابون و بلاوبونەوەی سیستمی مولکداریتی تایبەت و دابەشکردنی کار هۆی راستەقینەی داروخانی بونیادی خیل بو.

پەیکەری خیزان لە خیلە کۆچەرییەکاندا تەنها لە باوك و دایك و منالەکانیان دروست نابیت بەلکو زۆر جاران باپیرو کورەکەی و کورەزاکانی دەگریتەوەو لە هیندیك حالەتی دەگمەندا خیزان لە باپیرەو داپیرەو کورو کورەزاکانیشیان دروست دەبیت. لە راستیدا ئەو جۆرە خیزانانە کۆمەلگەیەکی بچوکەو خەلکانیکی زۆر لە ژیر چەتری خیزانیکدا لە ژمارەیەك خانوی بچوك پیکەوە دەژین. کاتیك ژمارەی خانوەکان زیاد دەکات خودی خیزانەکان دەبیت بە عەشیرەتیکی تازە. خیل لە (٣-٤) یا تەنانەت (١٠) عەشیرەت دروست دەبیت. عەشیرەتەکان تا ژمارەیان زیاتر بیّ و روبەری لەوەرگەکانیان فراوانتر بیّ ژمارەی ئەو کەسانەش زیاتر دەبیّ کە لە دەرەوە پەیوەندی بە خیلەوە دەکەن و بەوەش خیل گەورەتر دەبیت و سەرزەمینیکی فراوانتر کۆنترۆل دەکات و زۆر جاران ئەو گەورە بوونە لەسەر حیسابی خیلەکانی دی دیتەدی.

خیلەکانی کورد لە ئەنجامی زۆربونی ژمارەی دانیشتوانی کوردستان ژمارەیان زیاتر بووە. هەروەها هەلومەرجی جوگرافیاو پیداویستی لەوەرگەکانی گەرمیان و کویستان بەشداری لە زۆربونی ژمارەی خیلەکان دەکەن.

خیل یەکەیەکی سیاسی تەکنیکی- کارگیرییە. لە راستیدا خیل "دەولەتیکی" بچوکەو ناوکی ریکخستنی حکومەتیك پیکدەهینیّ. لە سیستمی خیل دابەشکردنی ئەرك و فرمان هەر لە سەرەك خیلەوە تا سەرەك خیزان دەگریتەوە. خیل بە پەیوەندی خوین، واتە پەیوەندی خزمایەتی و سیستمی سەرکردایەتی کردن و گویرایەلی دەبیتە دەزگایەکی بە دیسپلین، بەلاّم ئەم دیسپلینە تەنها کاروباری ناوخۆی خیل دەگریتەوە چونکە پەیوەندی نیوان خیلەکان و پەیوەندی بە خیل و نەتەوەکانی ترەوە بیسەروبەری بالی بەسەرا دەکیشیت. خیل هەمیشە بە وریایی دەروانیتە ئەو مەترسیانەی لە دەرەوە هەرەشەی لیدەکات. هەرکاتیك خیلەکانی ناوچەکە یا خیلەکانی نەتەوە دراوسیکان بەرەو لاوازی برۆن یەکسەر شەروتالآنکردن دەست پیدەکات و بچوکترین دەرفەت دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی دەست بە سەر بەروبومی ئەو خیلآنەدا بگرن کە کشتوکال دەکەن.

دەکریّ بۆ خۆپاراستن لە شەری نیوخۆیی خیلەکان کۆنفدراسیۆنیکی سیاسی لەسەر ئاستی سەرەك خیلەکان دامەزریت بەلاّم پیویستە سەرەك خیلەکان واز لە هیندیك دەسکەوتی خۆیان بهینن بۆ سەرکردایەتی کۆنفدراسیۆنەکە. ئەم کارە لەبەر سروشتی بونیادی ناوخۆی خیل کاریکی زۆر زەحمەتە لەبەرئەوەی میملانیی نیوان خیلەکان لە پیناوی ناوو ناوبانگ و رەچەلەك و شەرەف کۆسپیکی گەورە لە بەردەم کۆنفدراسیونەکە دروستدەکات. کاتیك یەکیك لە خیلەکان ئەوەندە بەهیزبیت بتوانیت هەمو خیلەکانی دی بخاتە ژیر رکیفی خۆیەوە ئەوکاتە یەکیتی سیاسی نیوان خیلەکان دادەمەزریت. ئەمەش هەنگاویکی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی دەولەت دروست بیت، واتە لە پیناوی ئەوەی ریکخستنیکی نیوەندی دروست بکریّ.

## بۆچی دەولەتیکی کوردی لە رۆژهەلاتی نزیك دروست نەبو؟ چۆن کورد ملکەچی سیاسەتی "پەرتکە- زالبە" کرا؟

لە سایەی سیستمی خیلەکیدا بە دەگمەن زیدە بەرهەم دەبیٔ. خیل – وەك ریسایەکی گشتی- تەنها بە گویرەی پیداویستیەکانی خۆی بەرهەم دەهینیٔ، ئەمەش حالەتی شەرو ململانیی بەردەوام لە نیوان خیلەکان دروستدەکات. شەرەفنامەی بەدلیسی: بە تیروتەسەلی پشیوی نیوان خیلە کوردەکانی باس کردوە.

یەکیك لە هۆ گرنگەکانی کەمی زیدە بەرهەمی خیل پەیوەندی بە خزمایەتی نیوان سەرەك خیل و ئەندامەکانیەوە هەیە چونکە پەیوەندی خوین و خزمایەتی ناهیلیت دژایەتی لە نیوان هەردوولا دەربکەویت. سیستمی فیودالی لە ئەوروپا ئەم حالەتەی تیا بەدیناکریت لەبەرئەوەی پەیوەندی نیوان ئاغاو ئەو کۆیلانەی لە زەویوزارەکانی کاریان دەکرد لەسەر زیدە بەرهەم و کەلەکەبونی سامان دامەزرابو کە دواتر دژایەتی نیوان کۆیلەو مولکدارەکانی لیکەوتەوە.

ئەو کۆمەلگانەی گەشەکردنیان لە کۆمەلگەی کوردەواری دەچیت، چەمکی مولکایەتی تیا بەرجەستە نەبوو، هەروەها ئەم چەمکە هیچ ئیعتباریکی بۆ دانانریت بۆیە لەم حالەتەدا چەمکی دادپەروەریش گەشە ناکات- ئەم حالەتە لەسەر کۆمەلگەی تورکی و مەغولی پیادە دەبیت. ئەو خیلانە ئەوەندەی هیزی سەربازی بواری پیدابن روبەریکی بەرفراوانیان لە خاکی میللەتانی دی داگیرکردوەو ئیدعای خاوەنداریتی ئەو سەرزەمینانەیان کردوەو سەروەری ئەو میللەتانەشیان لەسەر خاك و زەوی خۆیان رەتکردۆتەوە.

بە پیی هیندیك دیدوبۆچونی دی سیستمی خیل زیدە بەرهەمی هەبوە بەلام ئەو زیدە بەرهەمە مولکی تایبەت بوەو لەم حالەتەدا دژایەتی نیوان سەرەك خیل و ئەندامەکانی سەرهەلداو دەرئەکەویٔ. ئەم حالەتە لە دوای جیگیربون و دەسکردن بە کشتوکال بە تەواوەتی بە دیارکەوت، کەچی لەگەل ئەوەشدا پیداویستیەکانی بن و بنەچەو شەرەف هەر مایەوە. ئەمەش یەکیکە لە خالە لاوازە سەرەکیەکانی کۆمەلگەی

کوردەواری. ئەو کۆمەلگانەی بەردەوام ژمارەی خیلەکانی زیاد دەکات و پیداویستیەکانی بن و بنەچەو شەرەف تییدا سەروەر دەبیت لەبەر فرەیی ئارەزوەو بۆچونەکان زۆر زەحمەتە بتوانیت ریکخستنیکی نیوەندی بۆ سەرکردایەتی کردن و بەریوەبردنی کاروباری خیلەکان دامەزرینیت. بیگومان ناتوانریت هەمو داواکارییەکان جیبەجیّ بکریّ، ئەمە سەرباری ئەوەی کەشیکی لەبار بۆ یەکگرتن دروست نابیت چونکە دەولەت بە دەستەلاتیکی نیوەندی خاوەن دەستەلاتیکی گشتگیر دادەمەزریت. هەروەها جوگرافیای کوردستانیش بۆ دروستکردنی دەستەلاتیکی نیوەندی لەبار نەبو بەلکو تۆپۆگرافیای زەوییەکەی بە چیا سەرکەش و دۆلی قول و روباری خورو نەبونی ریگەوبان هاندەریك بوون بۆ دروست بونی بونیادی دەستەگەری و سەربەخۆی.

ئیبن خەلدون ئەم حالەتەی بەمشیوەیە وەسف کردوە: "ئەو مەلبەندانەی فرە خیل و فرە کۆمەلگەیە زەحمەتە دەولەتیکی بەهیزو جیگیری تیا دامەزریت". بروانە:
(Mukaddima I,2 a. Ed, Dergah Yayinlari, Istanbul, 1988. pp. 496-499).

لە کوردستاندا کە خیلی دراوسیّ و نزیك بە یەك زۆرن زۆر سروشتیە "تاکەکانی بۆ دەستەلاتیکی بالاّ ملنەدەن" و "دەستەلاتیکی بالاّیان پیّ قبول نەبیت"، هەروەها لە کوردستان گروپی دی هەیە لە پەراویزی سیستمی خیلایەتی کوردا دەژین. ئەو گروپانە هیچ سیفەتیکی خیلەکیان تیا نیەو لە ناوچە شاخاوییە دوردەستەکان دەژین. ئەو خیلانە بە هۆی دوری ناوچەکانیان لە ریگەی سەرەکی شاروگوندەکان بە دەگمەن روبەروی سوپای عەرەب و سەلجوق و جەنگیز خان بونەتەوە.

لە پال ئەو گروپانەی سەرەوە گروپی ئەرمەنی و سریانی و ئەرسودوکسی و تورك و چەرکەس و.. هتد، لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان هەبون وەك مەسیحی و یەهودی و کوردی ئیزیدی و سوننە و عەلەوی و حەنەفی و شافعی.. هتد.

یەکیك لە خەسلەتە گرنگەکانی بونیادی خیل ئەوەیە ریگە نادات کەشیکی لەبار بۆ کارکردن گەشە بکات چونکە بونیادی خیل سیستمی هەرەمی بۆ کەسایەتییەکان هەیە. بە پیی ئەم سیستمە ئەو کەسانەی نازناوی ئاشیر، واتە "کورانی خیل"یان هەیە کارناکەن وەك داربرین و دارهینان ئەوانە لایان وایە هەرکەس پلەوپایەی کۆمەلایەتییان لەوان کەمتر بیّ مسکینی ئەوانە. چالاکی ئاشیرەکان بریتیە لە

راوکردن و بەشداریکردن لە شەرو.. هتد. یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی سیستمی خێڵ ئەوەیە کە کارکردن بە ناشایستە دەزانریت و ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی بونیادی خێلی ئیفلیج کردوە، هەروەها یەکێکە لەو هۆیانەی تیماندەگەیینێ کە هۆی دواکەوتن و گەشەنەکردنی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری چیە.

هەروەك لە سەرەوە باسمان کردوە بونیادی خێل لایەنیکی لاوازی کۆمەلگەی کوردەوارییە لە بەردەم دروست بونی دەستەلآتیکی نیوەندی. ئەم لاوازییە خەسلەتیك نیە تایبەت بە کورد بەلکو لە هەمو میللەتەکانی دی هەبوە، بۆ نمونە عەرەب و تورك. ئیمپریالیزمی بریتانی لە سالآنی بیستەکان و لە کاتی پیادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زالبە" ئەم لاوازییەی لە دژی عەرەب قۆزتەوەو چەند دەولەتیکی عەرەبی دروست کرد لە جیاتی ئەوەی دەولەتیکی عەرەبی دروست بکات چونکە خێلە عەرەبەکان زۆر هەستیار بون بەرامبەر بە ملکەچ کردن بۆ خێلەکانی دی یا لە ژێر سەرکردایەتی خێلیکی دی بمیننەوە بۆیە ئیمپریالیزمی بریتانی دروستکردنی چەند دەولەتیکی عەرەبی بە ئاسانترین چارەسەر دادەنا.

نەبونی دەولەت و دەستەلآتیکی نیوەندی دیاردەیەکە لەگەڵ رەگەزەکانی دی دینەمۆی کۆمەلگەو دەستیوەردانە دەرەکییەکان یەکدەگریتەوە. پیشتر رونمکردۆتەوە هۆیەکی سەرەکی دروست نەبونی دەولەت و دەستەلآتیکی نیوەندی جوگرافیای کوردستان بوو کە دەکەویتە سەر ریگەی هاتوچۆی داگیرکەران، هەروەها هەولمداوە روپیویکی (مسح) گشتی بکەم لەسەر ژیانی کورد لە سەدەکانی پیش ئیسلام.

کاتیك تورکە ئۆغۆزەکانی ئاسیای ناوەراست لە ناوچەکانی فارس و عیراقەوە گەیشتنە ئەنادۆل و کوردستان بونیادی خێلی وەك ئۆغرەکان هەبو، بۆ نمونە مەروانیەکان و حەسنەوییەکان و شەدادییەکان و روادییەکان.. هتد. ئەو خێلآنە قوارەیەکی شیوە دەولەتیان هەبو بەلآم لە ماوەی پەلامارەکانی تورکە ئۆغزەکان هیدی هیدی ئەو پەیکەرانە خەسلەتی خۆیان لە دەست دا چونکە ئەو خێل -دەولەت- تانە رازیبون مل بۆ سەلجوقیەکان کەچ بکەن بە مەرجیك سەربەخۆییان لە کاروباری ناوخۆی خێلەکان پیبدرێ.

سەرباری بونیادی ئـابوری ئـاژەلداری و بونیـادی خیـل کـە پشت بـە بـن و بنەچەو پەیوەندی خوین و چەمکی شەرەف دەبەستیت ئەو شالاوو پەلامارانـەش ریگـەیان نـەدا دەستەلاتیکی نیوەندی لە کوردستان دروست بیت. کوردستان دوابەدوای ئەو شالاوانە لە لایـەن ئیمـپراتۆریتی عوسمـانی-فـارس گـەمارۆ دراو لـە راسـتیدا کوردســتان دەوری ناوچەیـەکی دابـراوی دەبینـی. گرنگـترین بەلگـەش لەسـەر ئــەو قسـانە ئیمـپراتۆریتی عوسمانی- فارسی بەردەوام لەسەر خاکی کوردسـتان شـەریان دەکـرد، بـەلکو لـە واقیعـدا هـەردوولا بـە سـەربازی کـورد شـەریان دەکـرد. هـەروەها کـوردە سـوننەو عەلەوییـەکان رەهەندیکی دی ئەم کیشەیە بون.

لە کۆتاییدا دەولەتە ئیپمریالی و کۆلۆنیالییەکان لـە پینـاوی کۆنـترۆلکردنی سامانی سروشتی کوردستان بە تایبەتی بیرە نەوتەکان ململانییان دەکرد.

کۆمەلگەی کوردەواری ئامـادەگی شـەری تیـا نـەبو تـا ئـەرکی هـیزە ئیمپریـالی و کۆلۆنیالیـەکان سـانا بکـات بۆیــە ئـەم دوو فاکتــەرەی دوایــی پارچـە پارچـە کـردن و دابەشکردنی کوردستانی کرد بە شتیکی حەتمی بـۆ ئـەوەی کۆنـترۆلکردن و تـالانکردنی سامانی سروشتی ئاسانتر بیت.

کـاتیك ئـەو فاکتەرانــە دەچیتــە پـال دینـــەمۆی نـــاوەکی کۆمەلگــەو کاریگــەرە دەرەکیـەکان پیویسـتە سـەرمان سـورنەمینیّ لـەوەی بۆچـی دەسـتەلاتیکی نیوەنــدی لــە کوردستان دروست نەبو بەلام لە رۆژهەلاتی نزیك دروست بوو.

## دەستەواژەی "کورد خولیای ئازادییە" چ مانایەك دەگەیەنێت؟

زۆر جاران دەوترێ کورد خولیای ئازادییەو پرەنسیپی سەرەکی ژیانیان ئەوەیە بە ئازادی بژین و سەر بۆ کەس شۆڕنەکەن. ئەم گوتەیە لەسەر ژیانی تاکەکانیش پیادە دەبێت. ڕاستە کورد لە دژی کورد بەرگری لە ئازادی خۆی دەکات بەڵام ئایا دژی ستەم و چەوساندنەوەی ئەو دەولەتانەی گەمە بە چارەنوسیان دەکەن بەرگری لە ئازادی و کەرامەتی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن؟ ئەگەر مەسەلەی توانای بەرگریکردن لە ئازادی بەلاوە بنێین ئایا داوای ئازادی لە دەولەتە داگیرکەرەکان دەکەن؟، ڕوداوەکانی کۆمەلی کوردەواری ئەو قسەلۆکانە بە درۆ دەخەنەوە. ئەگەر بابەتی تۆلەسەندنەوە بە نمونە وەربگرین ئنجا دەزانرێ کورد تا چ ئاستێك بە "ئازایەتی و قارەمانی و بوێری" ناوی دەرکردوە. چەند گروپی خێلێك لەناو خۆیاندا یا لەگەڵ خێلێکی دراوسێی خۆیان، لەوانەیە خزمایەتیشیان لە نێواندا هەبێت لەسەر مەسەلەی شەرەف بە شەر دێن و کوژراو و برینداریکی زۆریان دەبێت بۆ ئەوەی پەلەی شەرەف لەسەر شانی خۆیان بسرنەوە. بەڵام پیاوانی جەندرمە و یەکتری لەتوپەت نەکەن خۆیان بە دوور دەگرن و تەنها کاتێك تەدەخول دەکەن کە ڕەوشتی ئەو قارەمانانە ڕیسوایی و جێگای بەزەییە ئیتر ئەوەی بە زیندویتی مابێتەوە بە ڕیز کەلەپچەیان دەکەن بەرەو بنکەی پۆلیس پەلکیشیان دەکەن، تەنانەت زۆرجاران ژن و منالّ و کەسوکاری شەرکەرەکانیش بە کەلەبچە کراوی بەرەو بنکەی پۆلیس پەلکیش دەکەن. گەورە لێپرسراوی دەستەیەکی سەربازی یا سەربازیکی ئاسایی دەتوانێت ئەم کارە بکات، کەچی شەرکەرە ئازاکان بە بێهودە لە جەندرمەکان دەپارێنەوە بۆ ئەوەی بەرەڵایان بکەن.

لە بنکەی پۆلیس یا بەندیخانەکان ژنان بە تایبەتی کچان جیادەکرێنەوە بۆ ئەوەی سەربازو جەندرمەکان دەستدرێژی بکەنە سەریان. لەم حالەتەدا ئەو مێرخاسانەی لە شەری تۆلەسەندنەوەی ئابروتکاویان سلیان لە مردن نەدەکردەوە چ دەکەن؟ ئەو مێرخاسانەی دەیانزانی جەندرمەو سەربازەکان چ لە ژن و کچ و خوشکەکانیان دەکەن بەڵام بێدەنگ دەبن.

ئـەو قارەمانانـەی بیبەزەییانـە یـەكتریان دەكوشت و شـیر ئاســا شــەری شــەرەفیان دەكـرد تەنانـەت نـاویرن هـەوالی چارەنوسـی ژن و كــچ و خوشـكەكانیان لــە ســەربازو جەندرمـەكان بپرسـن. ئەمـە چ چـەمكیكی ئازادییـە؟ ئایـا ئەمـە رەفتـاری كەسـیكە بــە ئازادی و سەربەخۆیی و سەربەرزی خۆی بنازیت؟ هـەولدەدەم ئـەو بنـەما مادییـەی لـە پشت ئەم هەلویست و رەفتارەوەیە لیكبدەمەوە.

لـە سـەرەتاوە پیـم باشـە ئاماژە بـە دژایـەتی نیـوان ئـازادی و ســەربەخۆیی تاكەكـەس و ئـازادی بـە شـیوەیەكی گشـتی بكـەم چونكـە یـەكیكیان كاریگـەری ئـەوی دی نـاهیلیت. پیشـتر ئەوەم رونكردۆتەوە كورد لە چوارچیوەی بونیادی خیل پشت بە ئاژەلداری دەبەسـتیت. ئـەم دەزگا كۆمەلایەتیـە (سیسـتمی خیلـەكی) خیـل و تاكـەكان لـە یـەكتری جیادەكاتـەوە. كـاتیك هەر خیلیك هەولدەدا لەوەرگەكەی لە دەستدریژی ئەوانی دی بپاریزیت ئەم جیاكردنەوەیـە قولـترو چرتـر دەبیتـەوە. ئـەم دیاردەیـە پـەیوەندی نیـوان تاكـەكان لاواز دەكـات، هـەروەها نـاهیلیت دانیشـتوان بـە چـری لـە شـــوینیكدا كۆببنــەوە. ئەمــە ســەرەرای ئــەوەی فاكتــەری جوگرافیـاو دوری نیـوان گوندەكـان دەبیتــە مایــەی دورەپــەریزی و پەرتــەوازەیی تاكـەكان. لـیرەدا بۆمـان دەردەكـەویت بۆچـی هەسـتی نەتەوایـەتی گەشـە ناكـات. ئــەو ناوچانــەی دانیشتوانی لە یەك دورن و هـەر (٣-٥) مـالیك لـە بـەرزایی شاخەكان یـا لـە قولایـی دۆلـەكان پـەرش و بلاوبونەتـەوەو پــەیوەندی كۆمەلایـەتی و ئـابوری تاكـەكانی لـە جیـی نەبوانــەو هەوال و بیروراكان بە دەگمەن بلاودەبیتەوە، هەستی نەتەوایەتی بەهیز لەو ناوچانـە گەشـە ناكات لەبەرئـەوەی هەسـتی نەتەوایـەتی لـەو ژینگـە ئـابوری و كۆمەلایەتییـە گەشـە ناكــات. ئــەندامانی خیــل نــاتوانن واز لــە پابــەندی خیــل و ســەرەك خیــل بــهینن بۆیــە تــا ئـــەو بەربەستانە بە یەكجارەكی لەناونەبریت ئەسـتەمە هەسـتی نەتەوایـەتی گەشـە بكات و ئـەو بەربەســـتانەش تەنـــها لـــە ریگـــەی پرۆســـەی گەشەســـەندنی وشـــیاری نەتەوایەتییـــەوە لەناودەبریت، واتە گواستنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە ئاستی خیلەوە بۆ ئاستی نەتەوە.

شتیكی ئاساییە ئەو كەسانەی لە هەلومــەرجیكی ئـابوری و كۆمەلایـەتی و كولتـوری لـەو جـۆرە پـەروەردە دەبـن خـەلكانیكی خۆپەرسـتن و تەنـها بـیر لــە ئـازادی كەسـیتی خۆیان دەكەنەوە.

پیشتر ئەو هۆكارە سەرەكیانەمان باس كرد كە تەحەكومیان بە میژوی كورد كردوە بەڵام هەنوكە پیویستە رەهەندیكی نویی بۆ زیادبكەین. ئەو رەهەندەش بە شیوەیەكی هەستپیكراو پەیوەندی بە پەسەند كردنی پرەنسیپی رازی بوون هەیە. كورد بە دریژایی میژو هەولیداوە بە پیی پرەنسیپی رازی بوون كاربكات كاتیك وڵاتەكەی روبەروی داگیركردن و شاڵاو بۆتەوە. كورد میكانیزمیكی بۆ پاراستنی وڵاتەكەی دروست نەكردوە تا بۆ بەرەنگاربونەوەی شاڵاوبەران و داگیركەران بەكاری بهینێ. مادامەكی ئازادی خیل و ئازادی تاكەكەس مسۆگەر دەبێ و مادامەكی شاڵاوبەران و داگیركەران دەست لە كاروباری خیل وەرنادەن كورد خۆبەخشانە سەر بۆ هیزی شاڵاوبەرو داگیركەر شۆردەكات، تەنانەت سەرشۆركردن لە پیناوی پاراستنی ئازادی خیل و ئازادی تاكەكانی ئەگەر لەسەر حیسابی چەوسانەوەی نەتەوەش بیت قبول دەكریت. خیلْ و تاكەكانی پەیمانیكی بەهیزیان بۆ روبەروبونەوەی شاڵاوبەرو داگیركەرە دەرەكییەكان نەبەست بەلكو تەنها بەرگرییان لە قەوارەی خۆیان دەكرد. هیزە شاڵاوبەرو داگیركەرەكان ئەو لاوازییەی كۆمەلگەی كوردیان بۆ پیادەكردنی سیاسەتی "پەرتكە-زالبە" قۆزتەوە، دوای ئەوەی لایەنە لاوازەكان بناغەیەكی لەباری بۆ پیادەكردنی سیاسەتیك رەخساند كۆمەلگەی كوردی وردوخاش و ویرانكردو كردی بە كۆیلە. ئەمرۆ كۆمەلگەی كوردەواری كۆمەلگەیەكی كۆیلەیە. چونكە لە جیهاندا كۆمەلگەیەك نیە جگە لە كۆمەلگەی كورد ژمارەی لە (٣٠) ملیۆن كەس زیاتر بێو تەنانەت وەزعی لە ئاستی كۆلۆنی خراپتر بیت.

ئەمەش مانای وایە ئازادی تاكەكەس و ئازادی خیل تەنها یەك هەنگاو لە كۆیلایەتی نەتەوە دورە.

لە واقیعدا ئەم دوو راستییە دوو دیوی دراویكە چونكە ئازادی نەتەوایەتی تەنها بە هینانە دی ئازادی نەتەوەو وازهینان لە بەشیكی ئازادی تاكەكان دیتەدی.

چەمكی ئازادی تاكەكەس پەیوەندی بە شیوەی رەفتارو هەلویستی كەسەكەوە هەیە: كاتیك كەسیك هەلویستیكی دیموكراسی دەبیت مانای ئەوە نیە هەمو شتیك بە ئارەزوی خۆی دەكات بەلكو مانای وایە ئەو كەسە ئامادەیە لەسەر هەلویستەكەی

گفتوگۆ لەگەڵ خـەلكانى دى بكـات بـيرورا ئـالوگۆر بكـات بـۆ ئـەوەى سياسـەتيكى تـەباو گونجـاو دابنيـت و هەسـتى بالادەسـتى بەسـەر خـەلكانى دى لـە كـن دروسـت نـەبيت و چاوەروان نەبيت خەلكى گويرايەلى بكات و دەبێ لە گەليإندا سنگ فراوان بيت.

كورد تا هەنوكە نازانيت چۆن لـە پيناوى ئـازادى و سـەربەخۆيى نيشـتماندا گيـانى بـەخت بكـات بـەلكو دەزانيـت چـۆن بـە دنـەدانى دەولـەت لـە شـەرى تۆلەسـەندنەوەدا يەكترى بكوژن، بەلام كاتيك سەربەخۆيى نيشتمان ديتە ئاراوە ئيتر ئازادى تاكەكەسـيان وەبير ديتەوەو كۆيلايەتى پەسەند دەكەن. ئايا شتيكى ئاشكرا نيـە كـە كەسـيك لەسـەر ئاستى نيشتمان ئازاد نەبێ لەسەر ئاستى خيزان و خيليش ئازادى راستەقينەى نـابيت؟ ئـەو كەسـەى لـە ئـازادى و سـەربەخۆيى نيشـتمان بيبـەش بـێ بيگومـان لـە ئـازادى تاكەكەسيش بيبەش دەبيت.

هەرگيز گرنگ نيە مرۆڤ بزانيت چۆن لە پيناوى تۆلەسەندنەوەدا دەمريـت بـەلكو گرنـگ ئەوەيـە بزانيـت چـۆن لـە پينـاوى سـەربەخۆيى نيشـتمان و شـكاندنى كۆتـى كۆيلايەتى گيان بەخت دەكات.

دامەزراندنى پارتى كارگەرانى كوردستان وەرچەرخانيكى گرنگ بو لـە ميـژوى كوردو كوردسـتاندا چونكـە ئـەم پارتـە فيرمـان دەكات چۆن لـە پينـاوى ئـازادى و سـەربەخۆيى نيشتمان گيان بەخت بكەين. پارتى كارگەرانى كوردستان بە هەلويستيكى تۆكمـەو ژيرانـە كـە پشـت بـە شـارەزايى دەبەسـتيت گـەليك كيشـەى بـۆ دەولـەتى رەگەزپەرسـت و كۆلۆنياليزمى توركيا دروست كردوە. دەولەتە داگيركەرەكانى كوردستان چـەندە ريكخـراوە كورديـيەكان تاوانبار دەكەن بە نەتەوەگەرايى چەپەكانيش بە تايبەتى چەپى توركيـا بـەو شـيوەيە تاوانباريـان دەكـەن و ريكخـراوە كورديـيـەكان بــە "بزوتنــەوەى نەتەوەپەرسـتى" ناودەبەن و تەنانەت ئەو تۆمەتە ئاراستەى ئەو ريكخراوە كوردانەش دەكەن كە خۆيان بە ريكخراويكـى ماركسيسـتى-لينينسـتى دەزانـن. بـە بۆچونـى مـن ئـەو تاوانباركردنـە لـە راستيەوە زۆر دورە. بەلام نابەرجەسـتەيى هەسـتى نەتەوايـەتى گـەورەترين خـالى لاوازى ريكخراوە كوردستانيەكانە. هەستى نەتەوايـەتى زۆر بـە سـانايى بريتيـە لـە خۆشەويسـتى نيشتمانى و خۆشەويستى ئينتما بۆ نەتـەوەو بـەرگريكردن لـە بـەهاو هيمانيشـتمانيەكان.

ئایا ئەمە لەسەر بارودۆخی کورد پیادە دەبێت؟ بەلێ، پیادە دەبێت، بەڵام بۆچی کورد بایەخی زیاتر بە زمان و کولتوری خۆی نادات؟ ئەو کەسەی بە زمانی کوردی قسە بکات یا بیەوێت بە زمانی کوردی قسە بکات بە "نەتەوەپەرست" تاوانبار دەکرێ، کەواتە چۆن بە کەسێك بڵێین سوسیالیست کە قسەکردن بە زمانی کوردی رەتدەکاتەوە؟ چەپەکان ئەو کەسانەی ناوێکی کوردی وەك "بروسك" لە منالەکانیان دەنێن بە "نەتەوەپەرست" وەسفیان دەکەن، ئەی بۆچی پێیان دەوترێ ئینتەرناسیونالیست ئەگەر ناوێکی تورك وەك "ئالپاسلان=جەنگیز" لە منالەکانیان بنێن؟ ئایا شۆرشگێرە فەلەستینیەکان بە زمانی عیبری دەنوسن و قسە دەکەن؟ ئایا ئەگەر بە زمانی عەرەبی قسەبکەن و بنوسن پێیان دەوترێ "نەتەوەپەرست"؟

سیاسەتی بەشێکی گەورەی سوسیال دیموکراتەکانی تورکیا و مارکسیە تورکەکان داواکارییەکانی میللەتی کورد لە بەرچاوناگرن بەلکو سیاسەتیان بە جۆرێك دادەرێژن تەعبیر لە بیروکرداری هیندێك "نیوەندی هەستیار" بکات. بە دلنیاییەوە ئەمجۆرە رەفتارە، رەفتارێکی تەمومژاوییە، هەروەها بە هەمان ئەندازەی ئەو تەمومژییەش نازانرێ بۆچی کورد هەوڵدەدا بیروچالاکیەکانی بە جۆرێك ئاراستە بکات چەپی تورك و سوسیال دیموکراتەکانی تورکیا بە راست و دروستی بزانن. سەرەتا پێویستە کورد بزانێت مافیان لە شتە دیاریکراوەکان هەیە بۆیە کاتێك لەو شتانە تێگەیشتن و بروایان پێهێنا هیچ بونەوەرێك ناتوانێت کار لەسەر شێوەی رەفتارو هەڵویستیان بکات.

کورد نابێت چاوەروانی بکات چەپەکانی تورکیا پێیان بلێن چۆن بیربکەنەوەو چۆن کاربکەن چونکە مافێکی سروشتی خۆیانە بە زمانی کوردی قسەبکەن، بەلکو پێویستە داوای ئەو مافاش بکەن لەبەرئەوە لە ئێستا بە دواوە ئەرکی کورد نیە درەندەترین نوێنەری رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی تورکیا لە وێنەی بلند ئەجەوید، ئەردال ئینونو، پرۆفیسور مومتاز سویسال، ئوغور مومجو، ئیسماعیل جەم و پرۆفیسۆر توکتایش ئاتەش تێبگەیەنن کە مافێکی سروشتی خۆیانە بە زمانی کوردی بنوسن و قسە بکەن، بۆیە کاتێك بە هۆی بیروچالاکیەکانیانەوە دەدرێنە دادگا پێویستە ئامادەگی ئەوەیان تیا بێت بە هەمو شێوازێك بەرگری لە بیروچالاکیەکانی خۆیان بکەن.

## "پاسەوانی گوند" بەڵگەی لاوازی کۆمەڵگەی کوردەوارییە

لە دوای هێرشەکەی ناوەراستی ئابی ١٩٨٤ بۆ سەر ئێرۆو شەمدینلی بارودۆخێکی نوێ لە تورکیا هاتە ئاراوە چونکە بە سەرەتای شەری پێشمەرگایەتی لە کوردستان بارودۆخێکی تازەش لە تورکیا دەستی پێکرد.

تورکیا پێی وایە پاسەوانی گوند باشترین شێوازە بۆ رووبەروبونەوەی گەریلا. دەولەت گوندنشینە کوردەکان چەکدار دەکات و ئەرکی دابینکردنی ئاسایشی گوندەکانیان پێدەسپێرێ. زۆر جاران جوتیارەکان بە زۆر دەکرێن بە پاسەوانی گوند. دەولەت بە شێوازی جۆراوجۆر پشتگیری لەم دەزگایە دەکات بۆ ئەوەی میللەت بکات بە پاسەوانی گوند. پاسەوانی گوند لە پال موچەکەی خۆیان خەڵاتی مادی و مەعنەوی دەکرێن و دەولەت بەرامبەر بە تەسلیم کردنی سەری هەر پێشمەرگەیەك بە هەزاران لیرە پاسەوانی گوند خەڵات دەکات و بەهای خەڵاتەکەش بە پێی گرنگی گەریلاکە و پلەی سەرکردایەتی لەناو رێکخراوەکەی دەگۆرێت.

دەولەت بۆ ئەوەی پێویستیەکانی بە پاسەوانی گوند مسۆگەر بکات و ژمارەیان زیاد بکات مامەلە لەگەڵ زیندانیەکان دەکات بە تایبەتی ئەوانەی بە تاوانی کوشتن حوکمدراون، دەولەت بەلێنی بەردانیان پێدەدات ئەگەر ئامادەگی دژایەتی کردنی پارتی کارگەرانی کوردستانیان تیا بێ بەلاّم ئەگەر لە دەستی داد رایانکردبێت ئەوا دەولەت بەلێنیان پێدەدا نەیانگرێت و دوسیکەشیان دابخات. فەرمانبەرە گەورەکانی دەولەت و سەرەك خێلەکان دەربارەی ئەم بابەتە گفتوگۆی جیدیان لەگەڵ تاوانبارەکان دەکردو ئەگەر ئەو گفتوگۆیانە کۆتایی بە رێکەوتن بهاتایە یەکسەر بە پاسەوانی گوند ناونوسیان دەکردن. بەمشێوەیە سالی ١٩٨٥ گەلێك لە تاوانبارە ئاساییەکان کران بە پاسەوانی گوند. رێکەوتن و گفتوگۆی نێوان فەرمانبەرە گەورەکانی دەولەت و تاوانبارەکان تۆمارنەکراون لەبەرئەوەی بە سەرزارەکی ئەنجام دەدرا. بۆ نمونە، تایەر ئادیامانی سەرۆکی خێلی ژیرکی Jirki لە بەیتولشەباب، سالی ١٩٧٥ بە بۆنەی خەتەنەکردنی کورەکەی ئاهەنگێکی سازکرد. لە کاتی ئاهەنگەکە دەمەقالەیەك لە

نیوان خۆی و بریکاری پاریزگارو نوینەری دادگای گشتی رودەدا، بریکاری پاریزگار لە بەردەم ژمارەیەك لە ئەندامانی خیلەکەی شەپازلەیەك دەسرەوینیتە تایەر ئادیامان دوابەدوای ئەو روداوە لە هەمو لایەکەوە تەقە لە بریکارو دەستەکەی دەکریّ و لە ئەنجامدا (٦) جەندرمە دەکوژریت و بریکاری پاریزگارو نوینەری دادگای گشتی رادەکەن و خیلی ژیرکی-یش دەدەنە شاخ و ماوەی (١٠) سال لە شاخ دەمیننەوە، بەلاّم لە ئایاری سالی ١٩٨٥ گەرانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان دوای ئەوەی ریکەوتن لەسەر ئەوەی تاوانبارەکانی روداوەکە بکەن بە پاسەوانی گوند

(2000 e Dogru, 22-5-1988, pp. 8-15; Milliyet, 10-8-1987; Sabah 15-8-1989).

دیاردەی پاسەوانی گوند زەقترین لایەنی لاوازی کۆمەلگەی کوردەوارییە. فەرمانبەرانی دەولەت بە ئاشکرا دەلین: "دەزگای پاسەوانی گوند ناویکی دییە بۆ پرۆسەی لەناوبردنی کورد بە دەستی کورد لە ناوچەی رۆژهەلاّت" و رۆژنامەکانی تورکیاش بەردەوام جەخت لەسەر ئەم بۆچونە دەکەن. (بروانە گۆڤاری سەباح، رۆژی ١٣-١٩/٨/١٩٨٩).

گەشەکردنی ئەم دەزگایە لە دوارۆژدا دەکەویتە سەر لایەنە لاوازەکانی کۆمەلگەی کوردەواری. ئەو لایەنانەی پیشتر رۆژنامەکانی تورکیا سەرنجیان بۆ راکیشابو.

دەزگای پاسەوانی گوند یەکیکە لە میکانیزمە مەزنەکانی تیرۆرو سەرکوتکردن. لە هیندیك ناوچە پۆلیس و جەندرمەو سوپا گیراوەکان تەسلیم بە پاسەوانی گوند دەکەن جونکە لەسەر دەستی ئەوان دزیوترین و دلرەقانە ترین جۆری ئەشکەنجە دەدرین. بۆ نمونە لوت و گوییان دەبرن و چاویان هەلدەکۆلن و لاشەکانیان پارچە پارچە دەکەن. ئەرکی پاسەوانی گوند بە پلەی یەکەم ترساندن و تۆقاندنی میللەتە بۆ ئەوەی ریگە لە پیداویستیەکانی بەردەوامی بون و چالاکی گەریلا بگرن (بروانە گۆڤاری 2000 e Dogru، رۆژی ١١/٦/١٩٨٩، ل ٢٠-٣٢، رۆژی ٢٥/٦/١٩٨٩، ل ١٦-١٨).

دەولەت بە هۆی توانا ماددییەکانیەوە دەتوانیت خەلکانیکی زۆر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و موچەی مانگانەیان پیبدات و خەلاّتی مادی و مەعنەوییان بکات. بەشیك لە سەرکەوتنەکانی دەولەت دەگەریتەوە بۆ بەربلاّوی ئاستی بیکاری دانیشتوان و هەلومەرجی ژیان و گرانی گوزەران لە کوردستاندا، ئەمە سەرەرای ئەوەی دەولەت

چەکی بەسەر زۆریك لە جوتیاراندا دابەشکردوەو زۆر بە ئاسانی کردونی بە پاسەوانی گوند. دەولەت بۆ ئەوەی سیاسەتی "پەرتکە- زالبەو لەناوبەرە" قولتر و توندتر بکاتەوەو ئاستی پیادەکردنی فراوانتر بکات سود لە خراپی هەلومەرجی کوردستان وەردەگریت هەرچەندە من پیم وایە کاتیك دەولەت بتوانیت هەزاران کەس بکات بە پاسەوانی گوند بەلگەی لاوازییەکی ترسناکی کۆمەلگەی کوردەوارییە. مەسەلەی پاسەوانی گوندە کوردنشینەکان هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بریتیە لەو کوردانەی لەسەر حیسابی دەولەت هەلدەستن بە ترساندن و تیرۆر و کوشتنی ئەو کوردانەی داوای یەکسانی و ئازادی دەکەن. لەنیو بزوتنەوەرزگاریخوازەکانی جیهان خەلکانی خائین هەبوە دژی میللەتەکەی خۆیان هاوکاری هیزە ئیمپریالیو کۆلۆنیالی و دەستەلاتدارانیان کردوە، بۆ نمونە هیند، جەزائیرو باشوری ئەفریقیاو ئەنگۆلاو فەلەستین.. هتد. بەلام سەبارەت بە کورد بارودۆخەکە جیاوازە چونکە ئەم دیاردەیە رەهەندیکی کۆمەلایەتی وەرگرتوە. ئەمەش تەنها بەوە لیکدەدریتەوە کە هیندیك تویژی کۆمەلایەتی کۆمەلگەی کوردەواری هەستی نەتەوایەتییان نیە. لەبەرئەوە پیویستە لیکۆلینەوە لەسەر دیاردەی پاسەوانی گوند لە باکوری کوردستان و جاشایەتی لە باشوری کوردستان بکری.

هەروەها چارەسەرکردنی ئەم بابەتەش گرنگە: ئەو هاوکارو بریکارو یارمەتیدەرانەی دەولەت، ئەوانەی لە ریزی پاسەوانی گوند کاردەکەن لە لایەن دەولەتەوە دەخرینە ژیر چاودیرییەکی وردەوە چونکە زانیاری زۆریان لەسەر کردەوە نایاساییەکان و ئەشکەنجەدان و قەتلوعامەکانی هیزەکانی ئاسایش و شوینی گۆرە بە کۆمەل و شتەکانی دی هەیە، بۆیە هەمیشە لە لایەن خودی دەولەتەوە هەرەشە لە ژیانیان دەکری (بروانە گوڤاری 2000 e Dogru، رۆژی ١٩٨٩/٢/١٦ و رۆژی ١٩٨٩/٣/١٨، ل ٣٦، رۆژی ١٩٨٩/٣/٧، ل ٢٤، رۆژی ١٩٨٩/٦/٤، ل ٨-١٤).

لەوانەیە پاسەوانی گوندەکان قسە لەسەر قەتلوعامەکانی دەولەت بکەن و تاوان و ئەشکەنجەدان و پیلانەکانی ئاشکرا بکەن بۆیە دەولەت دژی ئەو کەسانەی زانیارییان لەسەر نهینیەکانی هەیە پشت بە سیاسەتی "پاکتاوکردن" دەبەستیت. ئەو کەسانەی

پاكتاو دەكرين هەر لە سەرەتاوە هـۆی مردنەكـەيان ديـاريكراوە: لـە شـەڕی گـەريلاكانی پارتی كارگەرانی كوردستان كوژراون.

لەم بارەيەوە پيـم باشـە چـەند نمونەيـەك لەسـەر ميـژوی كـورد بهينمـەوە، يەكـەم نمونە شۆڕشەكەی شيخ سەعيدی پيرانە لە سالی ١٩٢٥.

ئەو مولكدار و شيخ و سەرەك خيلانەی بەشدارييان لە شۆڕشەكەی شـيخ سـەعيددا كردبوو يا ئەوانەی بەشدارييان نەكردبو، بەسەر چوار گروپ دابەشدەكرين:

١-ئەوانەی راستەوخۆ بەشدارييان لە شۆڕشدا كردبو،

٢-ئەوانەی لايەنگيرييان لە دەستەلاتی نيوەندی دەكرد،

٣-ئەوانـەی پـەيوەندييان بـە شۆڕشـەوە نـەبو بـەلام لـە ناوچـەكانی ژيـر دەسـتەلاتی شۆڕش دەژيان،

٤-ئەوانەی نە پەيوەندييان بە شۆڕشەوە هەبو، نە لەژير دەستەلاتی شۆڕش دەژيان.

گروپی يەكەم جگە لە (٥-٦) يەكە گشت سوارەی حەميدی دەگرتەوە و گروپـی دوەم سەرەرای شيخ جەميل چـەتۆی گـارزان و ئـەمين رامـانلی باتمـان شـيخەكانی نورسـين و كوفرەڤی و هيزان-ی دەگرتەوە و گروپی سييەم ناوچـەی زيـلان و گروپـی چوارەميـش باقی ناوچەكانی كوردستان و ئەنادۆلی دەگرتەوە.

بەم بۆنەيەوە رووداويكی دزيـو هەيـە شـايانی سـەرنجدان و تيروانينـە: ئـەو سـەرەك خيل و شيخانەی پشتگيرييان لە شۆڕش كردبو يا سۆزيان بەرامبەر بە شۆڕش هـەبو يـا بەشـدارييان لـە شـۆڕش كردبـو يـا بەشـدارييان نـەكردبو يـا لـە سـەركوتكردنی شــۆڕش پالپشـتی هيزەكـانی حكومـەتيان دەكـرد، هـەموويان گـيران و ئەشـكەنجەدران پاشــان لــە سـيدارە دران يـا دورخرانـەوە. بـۆ نمونـە لـە گەرمــەی شۆڕشــدا شــيخ جــەميل چــەتۆ لايـەنگيری لــە دەولــەت دەكــردو هاوكــاری زۆری پيشــكەش بــە هيزەكــانی حكومــەتی نيوەندی دەكرد كەچی نە خيانەت و نە پەيوەندی گەرموگوری لەگەلْ ئەتاتورك كە بە وشەی براكەم نامەی بۆ دەنوسی و شيخيش بە هەمان شيوە وەلامی دەدايـەوە لـە پـەتی سيدارە رزگاری نەكردو خيزانەكەشيان بۆ دەرەوەی ولات دورخستەوە، هەروەها ئـەمين

رامانلی سەرەرای ئەوەی پێشتر لایەنگری لە هێزەکانی حکومەت دەکرد بەڵام هەر گوللەبارانیان کرد. دواتر بە تیروتەسەلی باسی ئەو روداوانە دەکەین.

سەرەرای ئەوەی شیخ نورسین و شیخ کوفرەڤی پشتگیری زۆریان لە دەولەت دەکرد کەچی لە سزای دورخستنەوە رزگاریان نەبو. ئەوانەی ناویان لە گروپی دوەمدا بو روداوی زۆر نایاب و دزیویان بینی. کاتیك شۆرش گەیشتە بەتلیس زۆر بە خیرایی گەلیك هەریمی گرتەوە و شۆرشگیرەکانی والی بەدلیس بە دیل گیرا لە لایەن شۆرشگیرەکانەوە بەڵام شیخ نورسین و شیخ کوفرەڤی دەستیان لەگەڵ حکومەت تیکەل کردو والی بەتلیسیان لە دیلیتی رزگار کرد. لە دوای دامرکاندنەوەی شۆرش هەردوکیان بۆ شاری قونیە دورخرانەوەو لە پاش ماوەیەکی کورت والی پیشوی بەتلیس بوە والی شاری قونیە. هەردوو شیخە دورخراوەکە بە پەلە شاندیکیان پیکهیناو داوای چاوپیکەوتنی والی تازەیان کرد. بەشداربوانی شاندەکە (وەفدەکە) بریتی بون لە باوکی شیخ قاسم و شیخ عەبدولباقی و شیخ مەعسوم و شیخ سەلاحەدین و برازاکەی شیخ ئەحمەد. ئەم گفتوگۆیە لە نیوان وەفدەکەو والی تازە رویدا:

-بەریز جەنابی والی:

"بیگومان جەنابتان ئاگادارن ئیمەیان بۆ قونیە دورخستۆتەوە"

-بەلێ، ئاگادارم.

-هەروەها، دەزانن ئیمە بەشداریمان لە شۆرشدا نەکردوە بەلکو هاوکاریمان لە دامرکاندنەوەی شۆرشدا کردوە.

-ئەمەش دەزانم.

-هەروەها ئیمە جەنابی عالی مەقامتمان لە دەستی چەتە کوردەکان رزگارکرد.

-بەلێ دەزانم.

-ئایا ئەنقەرەتان لەو کارە ئاگادارکردۆتەوە؟

-بەلێ، ئەوەشم کردوە.

-کەواتە ئیوەو ئەنقەرەش بە وەزعمان دەزانن، ئەی بۆچی بریاری دورخستنەوەی ئیمەتان داوە؟

-بەلی، دەولەت چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کردون لە جیاتی ئـەوەی ملتـان بقرتینـێ فرمـانی دورخسـتنەوەتانی دەرکـردوە چونکـە دەولـەت بەمشـیوەیە بیردەکاتــەوە: ئیــوە پیش ئیستا بەهیزبون و هـەر بـەو هیزەتـان شۆرشـتان لـەناوبردو تـا ئیسـتاش هیزتـان ماوە، کەواتە چۆن دلنیابین لەوەی لە پاشەرۆژ ئەو هیزە لە خزمـەتی جوداخوازەکانـدا بەکارناهینن؟ لەبەرئەوە حوکمی دوورخستنەوەتان دراوە. سەرباری ئەوەش ئیوە شەری میللەتەکەی خۆتان کردوەو دەولەت چۆن بـروا بـە یـەکیك دەکات شـەری میللەتەکـەی خۆی بکات.

گروپی سییەم توشی کوشتن و قەلاچۆکردن و دورخستنەوە بووە. ســەرەرای ئـەوەی ناوچەی زیلان دەرەسی بەشدارییان لە شۆرشدا نەکردبو بەڵام دانیشتوانەکەی روبەروی کوشتنی بــە کۆمـەل بونـەوەو ئـەو کەسانەشـی نـەکوژران بریـاری دورخسـتنەوەیان درا. گروپی چوارەم روبەروی گرتن و دورخستنەوە بووە.

لیرەدا پیویستە پرۆسەی دورخستنەوەو دادگاییکردن لە یـەکتری جیابکریتـەوە. لـە دوای شکست هینانی شۆرشەکەی شیخ سەعید ژمارەیەك سـەرکردەی نـاوداری کـورد بـۆ سوریا رایانکردو دادگای ئیستقلال (لە دوای دادگای ئاسایشی دەولەت دامەزرا) بە ئامادە نەبوونی خۆیان دادگاییکردن سزای دان و بـەڵام لەبەرئـەوەی لـە سـوریا بـون بریارەکـە جیبەجێ نەکراو لە نیو ئەو کەسانەی بۆ سـوریا رایـانکردبو خـەلکی سـەر بـە هـەردوو خیلی چەتۆو کلیچاسلان هەبو کە دوای ئەوەی پارتی دیموکـرات لـە سـالی ١٩٥٠ حوکمـی گرتە دەست بە لیبوردنیك گەرانەوە بۆ تورکیا.

هیندیـك لـە دورخراوەکـان دوای دەرچونـی بریارنامـەی ١٩٤٧ دەیـانتوانی بـۆ مــال و نیشتمانی خۆیان بگەرینەوە بە پیی بریاریکی ئەو سەردەمەی حکومەت کەسێ مەرجی بۆ گەرانەوەیان دانابو:

١-لە رۆژئاوای وڵات نیشتەجێ بن.

٢-یا زەوییەکانیان بدەنەوە بە دەولەت و زەوی تازە لە دەولەت وەربگرن.

٣-یا زەوییەکانیان بە خەلکی ناوچەکە بفرۆشن.

ئەم بریارە جوتیارەکانیشی دەگرتەوە، بۆ نمونە خیلی بابان و مۆنکی دوای ئەوەی بۆ ئەنادۆل دورخرانەوە زەوی دەولەتیان وەرگرت و لە بناری چیای نەمرود گوندی سۆفروت (ئاتفان) یان دروستکرد، فیودالەکانی وەك مولکدارو شیخ و سەرەك خیلەکان دوای ئەوەی سالی ١٩٤٧ لە تاراوگە گەرانەوە بۆیان هەبو زەوییە زەوتکراوەکانیان وەربگرنەوە.

نمونەی دوەم، پەیوەندی بەو شۆرشگیرە کوردانەوە هەیە کە راستەوخۆ شانبەشانی شیخ سەعید بەشداریان لە شۆرشدا کردبو. مەلیك فورات کورەزای شیخ سەعید بە زمانی (کازم دیریك)ی والی ناوچەکە ئەم روداوە دەگیریتەوە (بروانە گۆڤاری Girisim، ئاب/ ١٩٨٩، ل٢١). مەلیك فورات دەلیت: ئەو ماوەیەی کازم دیریك لە سالی ١٩٣٦-١٩٤٧ لە تراقیا دەژیا، سەردانی شیخ عەلی رەزا ئەفەندی مامی کردوەو هیندیك روداوی دیاریکراوی سەردەمی شۆرشی بۆ گیراوەتەوە بە وتەی کازم دیریك: لە کاتی شۆرشدا حاجی موسای سەرەك خیلی هویتی و شیخ موحسین و شیخ عەبدولباقی بنەمالەی کوفرەڤی سەردانیان کردوەو پییان وتوە ئەگەر دەولەت ٥٠٠٠٠ لیرەی ئالتونیان پیبدات ئامادەن دژایەتی شۆرش بکەن. شیخ دەیزانی حکومەتی تورکیا ئەم سازشە قبول ناکات بەلام لەگەل ئەوەشدا دووجار ئەم پیشنیارەی پیشکەش بە حکومەت کردو جاری دوەم حکومەت رازی بو پارەکە بدات بەو مەرجەی دژایەتی شۆرش بکەن، بەلام لە دوای دامرکاندنەوەی شۆرش حکومەت ئەو دوو شیخەی بانگ کردو پیشەکی دوو ئەوەندەی پارەکەی خۆی سەندەوە لییان و ئنجا لە ولات دوریخستنەوە.

نمونەی سییەم روداویکە لە سالانی سییەکان لە ناوچەی ساسون رویداوە. ئەمینی پەریخانی پەیوەندییەکی ئەوەندە توندوتۆلی لەگەل دەولەت هەبوو تەنانەت سلی لە تەسلیم کردنی براکانی خۆیشی نەکردەوە کە دۆستایەتی شۆرشیان دەکرد، لەگەل ئەوەشدا دەولەت ئەمینی گرت و لە سیدارەی دا. لە کاتی گرتنی ئەمینی یەکیك لە براکانی لە کولانەی مریشك خۆی شاردبوەوەو ئەمینی بە شوینی براکەی دەزانی و بە دەنگیکی بەرز لە بەردەم جەندرمەکان هاواریکرد: وەرە دەرەوە، ئەگەر فراڤین بە من بکەن ئەوا شیو بە تۆش دەکەن و بەمجۆرە براکەی خۆی بە کوشتن دا. رژیم لەبەرئەوە

ئەمینی لە سێدارەدا چونکە لەپاڵ هێزەکانی حکومەت بەشدرای لە دامرکاندنەوەی شۆڕشدا کردبوو، گەلێك نهێنی دەوڵەتی دەزانی، هەروەها دەوڵەت متمانە بە کەسێك ناکات برای خۆی بە کوشتن بدات.

راپەرینی دەرسیم لە ساڵی ١٩٣٧-١٩٣٨ نموونەی چوارەم زیاتر روندەکاتەوە. دەوڵەت هەوڵیدەدا لە ریگەی پیشکەشکردنی خەڵاتی مادی و مەعنەوی هیندیك کورد بە تایبەتی ئەو کەسانەی لە سەرکردایەتی شۆڕشەوە نزیك بون بەلای خۆیدا رابکیشیت. رابەری برازای سەید رەزا-ی سەرکردەی شۆڕش یەکێك بو لەو کەسانە. لە سەرەتای شۆڕش ئەفسەریکی گەورەی سوپای تورکیا پەیوەندی بەرابەرەوە کردو بەرامبەر هەر زانیارییەك خەڵاتی مادی پیشکەش دەکرد وەك پارەو قوتوی ئالتونی جگەرە یا نیرگەلەیەکی بەنرخ یا چەرخێك یا زنجیریکی ئالتون یا گەردن بەندیکی مرواری.. هتد. بیگومان زانیارییەکانی رابەر زۆر گرنگ بو چونکە خزمایەتی لەگەڵ سەرکردەی بزوتنەوەکە هەبو، رابەر بە زووترین کات زانیاری لەسەر پلانی شۆڕش و ئەندامەکانی بزوتنەوەکە گۆڕانکاری لە ناوچە ئازادکراوەکان دەگەیاندە دەزگای هەواڵگری دەوڵەت.

یەکێك لە کردەوەکانی رابەر ئاشکراکردنی شوینی عەلی شیر بو. عەلی شیر یەکێك بو لەو کەسانەی بەشداری لە شۆڕشی کۆچگیری کردبو، هەروەها سەرکردەیەکی دیاری راپەرینی دەرسیم-یش بو.

هێزەکانی ئاسایش شەوێك غافلگیریان کردو کوشتیان، کە ژنەکەی ویستی بەرەنگاری هێزەکەی ئاسایش ببیتەوە ئەویشیان کوشت لەگەڵ منداڵە ساواکەیدا.

رابەر گەلێك خراپەکاری و تاوانی بۆ تورکیا کردوەو پاشان ئەو خیانەتە گەورەیەی بۆ میللەتی کورد ئاشکرا بوە. تورکیا لە شوینی خۆی خەڵاتی مادی و مەعنەوی ئەو خائنەی کردوە. ساڵی ١٩٣٨ دوای ئەوەی شۆڕشی دەرسیم سەرکوتکرا، هێزەکانی ئاسایش دوا ئۆپەراسیونی خۆیان ئەنجام دا شەوێك لە ناکاو هەلیانکوتایە سەرماڵی رابەرو زۆر بە خشکەیی کوشتیان و ماڵەکەیان بە وردی پشکنی و ئەو دیاریانەشیان بردەوە کە ئەفسەرە گەورەکەی تورك بەرامبەر بە زانیارییەکانی پیشکەشی کردبو، وەك بریك پارەی نەختینەو قوتوی ئالتون و چەرخ و زنجیری ئالتون و بازنگ و گەردنبەندی

مرواری.. هتد. هیزەکانی ئاسایش دوای ئەوەی کارەکەیان ئەنجام دا واتەواتی ئەوەیان بلاوکردەوە کە دزو ریگر چونەتە سەرمالی رابەرو خۆیان کوشتوەو مالەکەشیان تالان کردوە. چارەنوسی رابەر حالەتیکی نمونەیی هەمو خائنیکە هەر لە کرینی تا کوشتنی. کورد لە دوای ئەو روداوە ناوی رابەر لە منالەکانیان نانین، هەروەها ناوی ئەو منالانەشیان گۆری کە ناویان رابەر بو.

ئەگەریکی گەورە هەیە ئەم حالەتە لەگەلْ پاسەوانی گوندەکانیش دوبارە بیتەوە بەلام لەبەرئەوەی پاسەوانی گوند نەیتوانی ریگە لە گەشەسەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بگریت بۆیە دەولەت ئەرکیك بە پاسەوانی گوند دەسپیری لە ریکەوتنامەکاندا نەهاتوە چونکە بە پیی ریکەوتنامەکان پاسەوانی گوند تەنها بەرگری لە گوندەکەی خۆیان دەکەن، واتە ریگە نادەن "چەتەکان" بچنە گوندەکانیان و هیزەکانی ئاسایش لە وەزعی گوندەکەیان ئاگادار دەکەنەوەو لە دۆزینەوەو ئاشکرا کردنی ریگاو شوینیان و ئەو جیگایانەی بۆسەی لی دەنینەوە یارمەتییان دەدەن بەلام هیزەکانی ئاسایش داوا دەکەن پاسەوانی گوند لە چیاکانی شەری "چەتەکان" بکەن، واتە ناچاریان دەکەن لە دەرەوەی گوندەکانی خۆیان شەری گەریلا بکەن. ئەو کەسەی سەرپیچی لەو فرمانە بکات هەمو موچەکانی لیدەسەننەوە.

هەنوکە دەولەت بیر لە چەکدارکردنی خیلەکان دەکاتەوە بۆ ئەوەی شەری پارتی کارگەرانی کوردستانیان پیبکات. بەمشیوەیە دەولەت دەزگا فیودالەکان دەپاریزیت و دریژە بە تەمەنیان دەداو پشت بە دەزگای مولکدارو شیخ و سەرەك خیلەکان دەبەستیت بۆ ئەوەی ریگە لە گەشەسەندنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بگریت. پیشتر گفتوگۆمان لەسەر ئەو مەسەلانە کردوە.

## ئەنجام

## چۆن دۆخی پارچە پارچەکردن و دابەشکردن تیدەپەرینریٚ

پیشتر رونکردنەوەی دیاریکراوم لەسەر پارچە پارچە کردن و دابەشکردنی کوردستان و ملکەچ پیکردنی نەتەوەی کورد بۆ سیاسەتی "پەرتکە-زالبە" پیشکەش کردوە و ئاماژەم بەوەش کردوە ئەو میللەتەی لە ساتیکی میژوییدا دەبیتە قوربانی سیاسەتی "پەرتکە-زالبەو لەناوبەرە" گەورەترین کارەساتی بەسەرا دیت، هەروەها ئەوەشم رونکردۆتەوە چۆن شیخ و مولکدارو سەرەك خیل و بازرگان و بیروکرات و فەرمانبەران بون بە چینیکی بەکریگیراو و چۆن نکولییان لە ئینتمای نەتەوایەتییان کردوەو لە ئەسلی خۆیان داشۆراون. کورد لە دوا چارەکی سەدەی بیستەم لە ناشایستەیی ژیانی خۆی تیگەیشتوە بۆیە لە پیناوی بونی نەتەوایەتی و لە پیناوی ئەوەی هەمان مافی گەلانی دی هەبیٚ دەستی بە شۆرش کردوە.

ژمارەی کورد لە ناوچەی رۆژهەلاتی نزیك لە (٣٠) ملیۆن کەس زیاترە، بەلاّم سەرەرای ژمارەی دیموگرافی گرنگی کورد دۆخیکی سیاسی سەربەخۆی نیە، ئەمە لە کاتیکدا لە جیهان دەولەت هەیە ژمارەی دانیشتوانەکەی ٢٥٠٠٠- ٥٠٠٠٠ کەسە. هاوکاری نیوان ئەو دەولەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنیەکی هاوبەش دەچەوسیننەوە خەباتی رزگاریخوازی کوردیان لە دەریایەکی خویندا نوقوم کردوەو نەیهیشتوە خەباتی سەرفرازیی کورد سەرکەوتن بە دەست بهینیٚ.

جاریکی تر دووپاتی دەکەینەوە کە هۆی سەرەکی نوشوستی کورد و دوبارە بونەوەی قەتلوعام و قەلاچۆکردن دەگەریتەوە بۆ ئەوەی سەرکردایەتیەکی پیشەکەوتوو رابەریتی خەباتی کورد ناکات و بۆ بالاّدەستی عەقلیەتی خیلەکی لەنیو ریکخستنەکانیدا و ئەو دەورەی شیخ و مولکدارو سەرەك خیلەکان دەیبینن لە شکستی خەباتی نەتەوایەتی کورد و هەروەها بۆ ئەوەی کورد پشت بە هیزی تایبەتی خۆی نابەستیت و پەنا بۆ ئەو دەولەتانە دەبات کە سیاسەتی کوشتنی کورد بە دەستی کورد دادەریژن، هەروەها دەگەریتەوە بۆ باوەرهینانی کورد بەوەی تا ژمارەی مارکسیست-

لینینیستەكان لە ریزی ریكخراوە كوردستانیەكان زۆرتر بێ دەرفەتی گەیشتن بە ئامانج زیاتر دەبیت.

پیم وایە ئەو بیروڕایانە زۆر سادەو سەرپیین و ناتوانیت لیكدانەوەیەكی گرنگ بۆ نوشست هینانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی بكات لەبەرئەوەی دابەشكردنی كوردستان هۆی سەرەكی خراپی ئەو واقیعەیە چونكە دابەشكردن و پارچە پارچەكردنی كوردستان لە جیهاندا هاوتای نیە. داگیركەران كوردستانیان كردوە بە گۆرەپانی تاقیكردنەوەی نویترین و فرکەرترین چەك و ئەوەندەی چەكی كیمیایی بە چری و بە فراوانی بەكاردیت لە هیچ شوینیكی دی دونیا بەكارنەهاتووە. لە كوردستان رۆلەكان نیودەولەتییانە دابەشدەكرێ. دەولەتیكیان كورد كیمیاباران دەكات و دەولەتیكی دی نەبونی بەلگەی بەكارهینانی چەكی كیمیایی راستدەكاتەوەو هەردوو دەولەتەكەش بە بیانوی "دەستیوەردان لە كاروباری ناوخۆی ولات ریگە نادەن بە ریكخراویكی نیودەولەتی وەك نەتەوە یەكگرتوەكان لیكۆلینەوە لەسەر بەكارهینانی چەكی كیمیایی بكات[١٥].

دابەشكردنی ئیمپریالییانەی كوردستان وەك كۆلۆنییەكی هاوبەش بەكارهینانی چەكی كیمیایی ئاسان كردوە. خەباتی رزگاریخوازی كوردستان بە تەواوەتی لە لایەن دوو دوژمنەوە گەمارۆ دراوە، لەبەرئەوە لەم حالەتەدا كیشەی كورد بۆ نمونە بە كیشەی فەلەستین بەراورد ناكرێ چونكە بە راستی ناهەقی دەكەین ئەو لاوازییەی لە خراپی هەلومەرجی دابەشكردنی كوردستان كەوتۆتەوە بخەینە ئەستۆی ریكخراوە كوردستانییەكان چونكە ئەگەر وا بكەین ئەركی شیكردنەوەی كیشەكە زۆر ئاسان دەكەین سەبارەت بە "هیزی زاتی"یش هەلبەتە كورد خەبات لە پیناوی بەرژەوەندییەكانی خۆیدا دەكات بۆ ئەوەی ولاتەكەی رزگار بكات و چیژ لە سەروەت و سامانەكەی وەربگریت بۆیە كاریكی نابەجییە خەبات بكەیت بۆ ئەوەی كوردستان تەسلیم بە خەلكانی دی بكرێ، هیچ نەتەوەیەك بە نەتەوەی كوردیشەوە كاری نابەجێ لەو جۆرە ناكات. كورد لە پیناوی ولاتەكەیدا شەر دەكات لەبەرئەوە شتیكی ئاساییە بە دوای هاوپەیماندا بگەریت بەلام جیگیر نەبونی پەیوەندی نیوان

هاوپەیمانـــەکان کیشـــەیەکە پـــەیوەندی بـــە دابەشـــکردن و پارچـــە پارچـــەکردنی کوردستانەوە هەیە.

ئیستا پیویسـتە ئـەم پرسـیارانە بکـەین: بۆچـی وڵاتـانی یـەکیتی سـۆڤیت و چـین و ئەلبانیاو ئوروپای رۆژهەڵات بە پیی پرەنسیپی مافی بریاری چارەی خۆنوسینی گەلان پشتگیرییان لە شۆرشـی رزگـاریخوازی نەتـەوەی کـورد نـەدەکرد؟ بۆچـی ئـەو دەولەتانـە مەسەلەی کوردیان پشتگوێ دەخست، ئەمە لە کاتیکدا پارچە پارچە کردنـی کوردسـتان دەستکردو لە بـەرژەوەندی سیاسـەتی ئیمپریـالیزم بـوو؟ بۆچـی دەولەتـە کۆمۆنیسـت و سۆسیالیستەکان نەك هەر پشـتگیرییان لـە کـورد نـەدەکرد بـەلکو دەولەتـە کۆنـەپاریزو رەگەزپەرست و کۆلۆنیالیەکانیان پوچەل دەکردو زۆر چاکیش دەیانزانی ئەو چەکە لـە کوردسـتان بـەکاردەهینرێ؟ هـەروەك دەزانـرێ زیـاتر لـە (٣٠) پسـپۆری سـۆڤیت لەسـەر چۆنیتـی بـەکارهینانی چـەکی کیمیـایی ئامۆژگـاری سـوپای عراقیـان دەکـرد. ئەمـەش رونیدەکاتەوە بۆچی یەکیتی سۆڤیت دژی رژیمی سـەدام حوسـەین نـارەزایی دەرنـەبری کـاتیك گـازی ژەهـراوی بەرامبـەر بـە کـورد بـەکارهینا. لـەم رووەوە دەکـرێ گـەلیك پرسیاری دی بکرێ.

کوردستان تراجیدیای ناوجەرگەی رۆژهەڵاتی نزیکـەو ژمـارەی دانیشـتوانی لـە (٣٠) ملیـــۆن کـــەس زیـــاترەو پارچـــە پارچـــە و دابەشـــکراوەو مافـــە دیموکراســـی و نەتەوایەتییـەکانی لیزەوتکراوەو نەتەوەیەکـە تەنانـەت لـە ئاسـتی کۆلۆنـی نزمـترە و بـەردەوام روبـەروی پرۆسـەی لـەناوبردن دەبیتـەوە. تراجیدیـای کـورد لـە کارەسـات و قـەلاچۆکردنی گـەلانی ئـەزتیك و مایـاو ئـەنکا ترسـناکترە کـە لـە سـەدەی شـازدەهەم روبـەروی ئـەو گەلانـە بۆتـەوە، گـەلانی ئـەنکا لـە ماوەیـەکی کورتـدا بـون بـە قوربـانی پرۆسەی قەلاچۆکردنی دەولەتە کۆلۆنیالیزمەکان. ئـەو قۆناغـە بەخیراییـەکی ریژەیـی لە ژیانی ئەو گەلانە کۆتایی هات کەچی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ئەمرۆ دەبیت بە قوربانی قەتلوعام و قەلاچۆکردن بەلام کورد ئیستا لە نالەباری ژیـانی خـۆی تیگەیشـتووە. ئـەو دەولەتانـەی کوردسـتان وەك کۆلۆنیـەکی هاوبـەش دەچەوسـیننەوە چەکی کۆکوژی ئـەوتۆیان هەیـە کـورد نـەتوانیت بەرامبـەری بـەرگری لـە خـۆی بکات.

لیرەدا لایەنی تراجیدی کورد زۆر بە جوانی دەردەکەویت. چەکی کیمیایی و گازی ژەهراوی بە مەبەستی بەکارهینان بەرهەمهینراوەو بە کردەوەش بەکاریان هینا بۆیە لەم ئاستەدا مەسەلەکە پەیوەندی بە پیشمەرگە کوردەکانەوە نامینیّ و دەبیت بە مەسەلەی گشت مرۆڤایەتی چونکە بە راستی ریسواییە بۆ مرۆڤایەتی هیندە بە بیباکی چەکی کۆکوژی لە بەردەم رای گشتی بەکاربهینریّ. یاد کردنەوەی قوربانیەکانی هیرۆشیما لە رۆژی ٦ ئاب و قوربانیەکانی ناکازاکی لە رۆژی ٩ ئاب و گوتارە پرجۆش و خرۆشەکانی ئەم دوو بۆنەیەو نەفرەت و ریسواکردنی ئەو کەسانەی تراجیدییەکەیان خولقاندوە ریگەیان لە بەکارهینانی ئەم گازە ژەهراوییە نەگرت. لە ١٧ی ئازاری ١٩٨٨ شاری هەلەبجەو لە کۆتایی ئابی هەمان سال ناوچەکانی باشوری کوردستان کیمیاباران کران بۆیە شەرمەزارییە بۆ مرۆڤایەتی یادی روداوەکانی (٤٥) سالْ لەمەوبەر بکاتەوەو نەفرەت لە سەبەبکارانی ئەو تاوانە بکات کەچی ئەمرۆ لە ئاست کیمیابارانی باشوری کوردستان چاو دەنوقینیّ.

پیم وایە سیّ ریگە بۆ تیپەراندنی پارچە پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان هەیە. ریگەی یەکەم، ئاستی لیکۆلینەوەی زانستی لەسەر کوردستان و کۆمەلی کوردەواری فراوان بکریّ. زانست بۆ کەسیکە پیویستی پیی هەبیت و کوردیش پیویستیەکی زۆری بە زانست هەیە. هەروەها پیویستە بە دیدیکی نویّ لیکۆلینەوە لەسەر میژوی رۆژهەلاتی نزیك و میژوی تورکیاو ئیران و عراق و سوریا بکریت و ئەم لیکۆلینەوە تازەیە بۆ کورد زۆر زەرورییە چونکە گەشەکردنی زانیاری زانستی وشیاری نەتەوایەتی کورد زیاد دەکات.

ریگەی دوەم بریتیە لە گەشەپیدان و فراوانکردنی ئاستی خویندنەوەو نوسین بە زمانی کوردی. چونکە بە کوردی نوسین رۆلیکی گەورەی هەیە بۆیە پیویستە گشت هەولەکان بخریتە گەر بۆ ئەوەی بە ئەلفبایەکی هاوبەش یەك شیوازی نوسین لە زمانی کوردی بسەپینریّ. رەنگە ئەلفبای لاتینی باشترین شیواز بیت بۆ تیپەراندنی ئەو سنورە سیاسییەی کە ئیمپریالیزم و دەستوپیوەندەکانی لە هەریمەکە دایانرشتوە.

ریگـەی سـییەم باسـکردن و خسـتنەروی مەسـەلەی کـوردە وەك مەسـەلەیەکی نیودەولـەتی، لەبەرئـەوەی تـا ئیسـتا هـەولدراوە مەسـەلەی کـورد لـە چوارچیـوەی پەیوەندییە دووقۆلییەکانی نیوان تورکیا و ئیران یا تورکیاو سوریا یا عـراق و ئـیران چارەسەر بکریّ. ئەمجۆرە چارەسەرکردنە لە کۆتاییدا دەبیتە هۆی "لەناوبردنی کـورد" چونکە گفتوگۆ نهینییەکان تەنها بۆ ئەوەیە کارەساتیکی نویّ بەسەر کورد بهینریّ.

کـاتیك لیکۆلینـەوە لەسـەر مەسـەلەی ئـەلفبا دەکـەین ئنجـا دەبینـین سیسـتمی کۆلۆنیالیزمی نیودەولەتی تا چ رادەیەك ئامانجەکانی بەدی هیناوە. کورد لە تورکیا بـە ئەلفبای لاتینی و لە عراق و سوریاو ئـیران و بـە ئـەلفبای عـەرەبی و لـە روسـیاش بـە ئەلفبای سیریلی- سلاڤی دەنوسیت. سەرەرای ئەوەی ئەم وەزعـە یارمـەتی گەشـەکردن و پیشخستنی نوسین و قسەکردنی زمانی کوردی داوە بەلاّم بە دلنیاییـەوە گەشەسـەندنی هەستی یەکیتی لەلای مرۆڤی کورد دواخستوە. لیرەدا زۆر بە جوانی دەردەکەویت چۆن هـەمو دەزگاکـان سیاسـەتی "پەرتکە- زالبـەو لەناوبـەرە" پیـادە دەکـەن بۆیـە وشـیار کردنەوەی کورد لەم مەسەلەیە باشترین شیوازە بۆ ئەوەی ریگـە لـە فراوانبونـی ئاسـتی ئەم ئەنجامە نیگەتیڤانە لەسەر زمانی کوردی بگریت. زمانزانەکان پییان وایە ئـەلفبای لاتینی زۆر شیاوە بۆ فۆنەتیکی کوردی.

لە سییەکانی سەدەی بیسـتەم بـالیۆزی تورکیـا لـە تـاران خەسـرەو قـەرەدە Husrev Gerede لە سەردانیکی شای ئیراندا کوردی بە دوژمنـی هاوبـەش نـاوبردوە. قـەرەدە لـە کاتی قسەکانی سوربو لەسەر گەشەپیدانی پەیوەندی دۆستایەتی نیوان هـەردو دەولـەت تاکو بە شیوەیەکی باشـتر بتوانـن شـەری دوژمنـی هاوبـەش بکـەن. "پلانیکـی سـەربازی هاوبەشمان لە دژی کورد دارشتوە"

(Husrev Gerede, Siyasi Hatiralarim I, Iran (1930-1934), Vakit Basimevi Istenbul, 1952, pp. 68-69).

سەرجەم ریکەوتننامە مۆرکراوەکانی نیوان تورکیاو عراق بە مەبەستی لەناوبردنی کورد مۆرکراوە، بەلکو ئەستەمە هیچ گفتوگۆیەکی دوقۆلی و سـیّ قۆلـی ئـەو ئامانجـەی نەبیت. مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی نیودەولەتیە لەبەر ئـەوە پیویسـتە هـەول بدەیـن بـۆ ئـەوەی ئـەم مەسـەلەیە بخریتـە بـەردەم ریکخـراوە نیودەولەتیـەکان بۆیـە پیویسـتە

نوینەرانی کورد بانگهیشتی ئەو ریکخراوانە بکرین تا تەعبیر لە دیدو بۆچونەکانی خۆیان بکەن بەڵام ئەو دەولەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنیەکی هاوبەش دەچەوسیننەوە بە بیانوی "دەستیوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵات" نارەزایی دەردەبرن. لە راستیدا ئەو بیانوانە دیدیکی رەهانیە، بۆ نمونە عراق سنور بەزاندنی سوپای تورکیاو ئۆپوراسیونە سەربازییەکانی لە باشوری کوردستان بە دەستیوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵات لە قەلەم نادات کەچی هەردوو دەولەتەکە دوای کیمیابارانی باشوری کوردستان بە بیانوی دەستیوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵات ریگەیان نەدا تیمیکی نەتەوە یەکگرتوەکان لیکۆلینەوە لەسەر خاکی وڵاتەکەیان بکات، سەرباری ئەوەش خودی بیرۆکەی "دەستیوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵات" دژی پرەنسیپی مافەکانی مرۆڤە.

لە بیستەکانی سەدەی بیستەم کاریگەری ئیمپریالیزم لەسەر مەسەلەی کورد زۆر بەهیزبو. ئیمپریالیزم ئازاریکی گەورەی بە کوردستان گەیاندوە. کۆلۆنیالیستەکان بۆ ئەوەی کوردستان کۆنترۆل بکەن و هەر بزوتنەوەیەك چەند بچوکیش بێ لە پیشکەدا لەناوبەرن هەمو تەکنەلۆجیاو چەکیکی مۆدیرنی ئەو سەردەمەیان بەکارهینا وەك ئەوەی بیانەوێ هەواش لە کورد قەدەغە بکەن بۆیە لیکۆلینەوەی زانستی گرنگترین میتۆدە بۆ ئەوەی ئەم وەزعە خراپە بگۆریت، هەروەها فیربون و گەشەپیدانی نوسین و قسەکردن بە زمانی کوردی هەمان کاریگەری میتۆدی زانستی هەیە چ جای ئەوەی چارەسەر کردنی کورد بۆ ئاستی جیهانی بەرزبکریتەوە.

زانست بە شیوەیەکی باشتر یارمەتیمان دەدا لە کوردستان تیبگەین، هەروەها فرەیی لیکۆلینەوەی زانستی یارمەتی بەرجەستەبونی وشیاری سیاسی دەدا. ئەو گفتوگۆیانەی لیکۆلینەوەکان دەیانوروژینێ بەشداری لە بلاوبونەوەو قولکردنەوەی وشیاری سیاسی دەکات و هیدی هیدی دەبیتە هیزیکی مادی. ئیتر بە ئاسانی لە چەمکی کۆمەلگەو نەتەوە تیدەگەین[١٦].

لەبەر ئەو هۆیانە پیویستە زۆر بە وردی ئاستی کاریگەری لیکۆلینەوە زانستیەکان لەسەر مەسەلەی کورد چارەسەر بکەین. مامۆستا فواد کۆپرولو Fuad Koprulu بە

جوانی پەیوەندی نیوان زانست و ئایدۆلۆجیای لە میژودا ئاشکرا کردوە کاتیك دەلیت:
"کاریکی بیهودەو مایەی پەژارەیە بە مەبەستی هینانەدی ئامانجە سیاسیەکان یا بەرگریکردن لە ئایدولوجیا نادروستەکان میژو بکریت بە شاهیدیکی ساختە، سەرەرای ئەوەش بە خۆشحالییەوە دەبینین ئەو جۆرە هەولانە، هەولدانیکی رەفتەنییە (عابر) چونکە ئەو زانایانەی دەربارەی حەقیقەتی میژو لیکۆلینەوەی بابەتی ئەنجامدەدەن رۆژ لە دوای رۆژ ژمارەیان زیاد دەکات"

**(W. Barthold- F. Koprulu, Islam Medeniyeti Tarihi, 2a. ed, Diyanet Isleri Baskan Ligi Liyi Yayin Lari, Ankara, 1963, pp XXII- XXIII).**

مامۆستا کۆپرلو بەم راستکردنەوەیە تەعبیر لە میتۆدیکی زانستی دەکات بەلام مەرج نیە ئەو کەسە پشتگیری و بەرگری لە بیرۆکەیەك دەکات بەرامبەر بەو بیرۆکەیە سەر راست و راستگۆبیت. پیم وایە مامۆستا کوپرولو بەم راستکردنەوەیە دەیەویت رەخنە لە زاناکانی بلۆکی رۆژهەلات بگریت بەلام ئەو بارودۆخەی باسیدەکات جیاوازییەکی زۆری لەگەل باردۆخی تورکیا نیە چونکە خودی کوپرولو وەك ئەوانی دی بە مەبەستی هینانەدی ئامانجی سیاسی و بەرگریکردن لە ئایدۆلۆجیای رەسمی دەولەتی تورکیاو متمانە پیبەخشینی میژو دەکاتە شاهیدیکی ساختە. ئەو کەسانە هەمو توانایەکی خۆیان دەخەنەگەر بۆ ئەوەی کورد لەناوبەرن و وەك گروپیك پیشنیان بدەن کە دەوری لە میژودا نیە. ئەو کردەوانەی دژایەتی زانست و بەرگری لە ئایدولوجیای رەسمی دەکات رۆژ لە دوای رۆژ چرتر دەبێ. هەروەها ئەو هەولانەی مامۆستا کۆپرولو نوقلانەی بۆ لیدەدا رەفتەنی نیە بەلکو بە پیچەوانەوە بەردەوام ئاستی ئەو کردەوانە فراوانتر دەبێ. بۆ نمونە ئەو ولاتانەی تورکیا ئاسا ئایدۆلۆجیای رەسمی تیدا بالادەستەو دەبێ بەهایەکی زانستی هەبیت ئەمجۆرە رەوشتە دەبیتە هەلویستیك کە زانکۆکان وەك نیوەندیکی زانستی ناتوانن دەستبەرداری بن.

سەرەرای ئەوەش پیویستە زانست بە پیی میتۆدی زانستی پیادە بکرێ چونکە یەکیکە کە پرەنسیپەکانی زانست. تاقیکردنەوەکان دەریانخستووە ئەو کەسەی لیکۆلینەوە لەسەر کاروباری کوردستان و کۆمەلگەی کوردەواری دەکات پیویستە کەسیکی ئازاد بیت و بابەتییانە بیربکاتەوەو رەفتارو بیرکردنەوەی ئازادانە بیت و

چاوەری نەکات دۆخیکی دیموکراسی و ئازادی بیتە ئاراوە ئنجا لیکۆلینەوە بکات بەلکو پیویستە لە رەفتارو بیرکردنەوەدا ئازاد بیت، بەلام ئەو کەسەی ری. لە ئایدۆلۆجیای رەسمی و یاساو سیستمی کارگیری بگریت و کەسیکی کراوە نەبیت و بە پیی یاساو سیستم رەفتار بکات ئەوا رەفتارو بیرکردنەوەی ئازاد نابیت و پیویستە لیکۆلیار بە ئازادی لیکۆلینەوە بکات و ئەنجامی لیکۆلینەوەکەیشی لە ئەستۆ بگریٚ. بۆ نمونە کاتیك لیکۆلینەوە لەسەر ریکخراوە کوردستانییەکانی دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا دەکەین دەبینین هەمو سەرچاوەکانی بەردەستمان سەرچاوەی رەسمییە، واتە ئەو بەلگانەی تەعبیر لە دیدوبۆچونەکانی ئایدۆلۆجیای رەسمی دەکەن، بەلام پیویستە لیکۆلیار ئاگای لەو سەرچاوانەش بیت کە نوسەرە کوردەکان لەسەر هەمان بابەت نوسیویانە چونکە هەلسەنگاندن و شیوازی تیگەیشتنی پەیمانگە جیاوازەکانی کورد لە ئوروپا لەسەر ئەم بابەتە لە پەیمانگەیەکەوە بۆ پەیمانگەیەکی دی بە تەواوەتی جیاوازی هەیە. ئایا راویژکردن بە نوسەرە کوردەکان پیویست نیە بۆ ئەوەی لیکۆلیار بیرۆکەیەکی دروستی لەلا گەلالە بیت؟ کەچی گەرانەوە بۆ ئەو جۆرە بەلگەنامانە بە تاوان دادەنریت، کەواتە لەم حالەتەدا هەلویست و رەوشتی لیکۆلیار چۆن دەبیٚ؟

لە لایەکی ترەوە دەتوانریٚ رەخنە لەو بەلگەنامە رەسمییانە بگیریٚ بە مەرجیك ئەو رەخنەیە پشت بە روداویکی کردەیی هەست پیکراو ببەستیت و لە راڤەکردنی روداوەکان دا ئاماژە بە سەرچاوە جۆراوجۆرو دیدو بۆچونە جیاوازەکان بدریٚ و ناتەبایی و روداوو لیکدانەوە رەسمیەکان راست بکریتەوە. ئایا لیکۆلیار رەچاوی ئەو رەخنانە دەکات تەنانەت ئەگەر روبەروی گرتن و راوەدونانیش بیتەوە؟ ئەگەر لیکۆلینەوە لە مەیدانیکدا بکەین رەخنەگرتن یا راستکردنەوەی دژە تیروانینەکانی بەلگەنامە رەسمیەکان حەرام بیٚ تییداو دیدو بۆچونی جیاواز تاوان و سزای یاسایی لەسەر بیٚ، ئایا لەم حالەتەدا هەلویستیکی دوگما وەرناگرین ئەگەر رەخنە رەچاو نەکەین؟ ئایا زانست لە کەشیکی لەو جۆرەدا پیشدەکەویت؟ ئایا لە سایەی هەلومەرجیکی لەو بابەتە بیرکردنەوەو کارکردن بە چ شیوازیك دەبیت؟

لـيرەدا ئـازادی بیرکردنـەوەو ئـازادی کـارکردن دەبیتــە کـاریکی پیویسـت. ئەمــەش مـەرجیکی سـەرەکی هـەمو میتۆدیکـی زانسـتی و خەسـلەتیکی بنــەرەتی هـەمو زانــاو لیکۆلیاریکـە، بــەلکو ئـازادی بیرکردنــەوەو ئـازادی کـارکردن ئــەرکی سـەرەکی هـەمو لیکۆلیاریکە و لە ریگەی ئەو دوو ئازادییە بریار لە جیّ متمانـەیی لیکۆلیـار دەدریّ کـە پەیوەندییەکی توندوتۆلی بەدەست بە پاکی و لیکۆلینەوەی بابەتیانەی لیکۆلیار هەیەو ئەمــــەش خەســــلەتیکە لــــە دەرەوە بەســــەر لیکۆلیــــار ناســــەپینریّ بــــەلکو لە ناخییەوە هەلدەقولیّ.

ئازادی بیرکردنەوەو ئازادی کارکردن بۆ کورد دوو ئەرکی زۆر پیویستە چونکە ئـەو زانیاریانەی ئیستا لەبەر دەستدایە یا ناتەواوە یا ساختەیە. سیاسـەتی ئـەو دەولەتانـەی کوردسـتان وەك کۆلۆنیـەکی هاوبـەش دەچەوسـیننەوە وا دەخوازیـت ئـەو زانیارییانــەی پـەیوەندی بـە کۆمەلگـەی کوردەوارییــەوە هەیـە ناتــەواو و نادروسـت بیـت و هــەمو ریوشوینیکی پیویست بۆ هینانەدی ئەم ئامانجە دەگرنەبەر. ئەو بەلگەنامەو دۆسیانەی پەیوەندییان بە کوردەوە هەیـە یـا لـە ناویـان بـردوە یـا لـە شـوینیکدا هـەلیانگرتوە بـە زەحمەت دەستی لیکۆلیارانی پیدەگات چونکـە حەزناکـەن لیکۆلیـارو دەزگـا زانسـتیەکان لە ناوەرۆکی مەسـەلەی کـورد تیبگـەن و بـە هـەمو ریگەیـەك هـەولدەدەن ئـەو ئامانجـە بهیننـەدی، ئەمە سەرەرای ئەوەی بە ئەنقەست راسـتییەکان دەشـیوینن بۆیـە دەربـارەی کوردستان و کۆمەلگەی کوردەواری پیویستیمان بــە زانیارییـەك هەیـە پشت بـە راسـتی ببەستیت و شەفافیەتیکی زۆری تیابی. ئەو زانیارییانە تەنها لە سایەی کەشیکی ئازاددا دیتە دی کە گشت کۆت و بەندەکانی ئایدۆلۆجیا بشکینیت.

لــەم سـیاقەدا لایــەنیکی بنــەرەتی دی مەســەلەکە دەردەکــەویت ئــەویش: ئــازادی وتەزایەك نیە بەروی دەولەت و دەزگاکانی پۆلیس و بریکاری گشتی و دادگاکان بوتریت بـەلکو پیویسـتە ئـازادی لیکۆلیـار لـە تەوژمـە سیاسـییە جیاوازەکـان بپـاریزیت، بۆیــە پیویسـتە کـورد لیکۆلینـەوەی زیـاتر لەسـەر ئـەم لایەنـە بکـات چونکـە کوردسـتان لــە ناوجەرگـەی رۆژهـەلاتی نزیـك دا دابـەش و پارچــە پارچــە کـراوەو خـودی نەتــەوەی کوردیـش روبـەروی سیاســەتی "پەرتکـە-زالبــە"ی ئیمپریـالیزم و دەسـتوپیوەندەکانی

دەبیتەوە. هەنوکە چەند دەولەتیکی دیاریکراو لەبەر گەلیك هۆی جیاواز بە شیوازی جۆراوجۆر پشتگیری لە پارت و گروپە سیاسییەکانی کورد دەکەن. لەم هەلومەرجەدا پارت و گروپە سیاسییەکانی کورد بە هۆی ئەو یارمەتیانەی وەریدەگرن رەخنە لەو دەولەتانە ناگرن بەلاّم ئەم هەلویستە دژ بە میتۆدی لیکۆلینەوەی زانستیە. هەروەها ئەو دەولەتانە ریگە نادەن لیکۆلیاران زانیاری باوەرپیکراویان لەسەر کوردستان دەست بکەویت.

ئەو کاتەی کوردستان لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا دابەش و پارچە پارچە دەکرا گەلانی ئاسیاو رۆژهەلاّتی نزیك و باکوری ئەفریقیا داوای مافی چارەی خۆنوسینیان دەکردو پیادەکردنی ئەم مافەش لەسەر ئاستیکی بەرفراوان گفتوگۆی لەسەر دەکرا. لەبەرئەوە پیویستە لەم چوارچیوەیە لیکۆلینەوە لەسەر هەلویست و رەفتاری ئەو سەردەمەی شۆرشی ئۆکتۆبەر لە سالی ١٩١٧ و بۆلشەفیزم بکەین. شتیکی ئاشکرایە ئیمپریالیزم کوردستانی دابەش و پارچە پارچە کردوەو ئەم دابەشکردنەش ئەرکەکانی ئاسان کردون و برەو بە سیاسەتیان دەدا. هەروەها پیویستە لیکۆلینەوە لەسەر میژوی دامەزراندن و داروخانی کۆماری (سالی ١٩٤٦) بکەین چونکە تەنها بە لیکۆلینەوە زانیاریمان لەسەر کوردستان و رۆژهەلاّتی نزیك زیاد دەکات، ئنجا دوبارەکردنەوەی کتیبەکانی لینین و ستالین دەربارەی بریاری مافی چارەی خۆنوسینی گەلان ئەگەر لە چوارچیوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە لیکۆلینەوەی لەسەر نەکەین نە هیچمان فیردەکات و نە کیشەکانمان چارەسەر دەکات لەبەرئەوەی واقیع پیمان دەلیت: ئەوەی لینین و ستالین لەسەر ئەم بابەتە نوسیویانە بە فیعلی زۆر بە نیوەناچلی پیادە کراوەو روداوەکانی یەکیتی سۆڤیت و رۆمانیاو بولگاریاو یوگسلافیاو چین و.. هتد، ئەو راستیە ئاشکرا دەکات بۆیە پیویستە بە وردی لیکۆلینەوە لەسەر هۆیەکانی جیاوازی نیوان تیۆری و پراکتیك بکریّ. ئەمەش یەکیکە لە ئەرکە گرنگەکانی سوسیالیستەکان. لیکۆلینەوە لەسەر ئەم بوارە دەبیتە سەرچاوەیەك بۆ زیادبونی زانیارییەکانمان.

کاریکی بیسودە ئامۆژگاری کورد بکریّ بەوەی مەسەلەی کورد بەبیّ "پیشرەوایەتی چینی کریکار چارەسەر ناکریّ. لەبەرئەوە پیویستە لیکۆلینەوە لەسەر ئەو هۆیانە

بکەین کە چینی کریکاری تورکیا وا لیدەکات لە مەسەلەی کورد پشتگیری لە دەولەت و حکومەتی تورکیا بکات و بۆچی هەرگیز پشتگیری لە داواکاری شۆرشگیرو دیموکراتخوازەکانی کورد نەکردوە.

لە تورکیا بەردەوام دەوپاتیدەکەنەوە کەمالیزم دەوری سەرکردایەتی لە رینمایی و رزگارکردنی گەلانی رۆژهەلات و گشت گەلانی چەوساوەو کۆلۆنی وازیکردوە. کەمالییەکان چۆن دەتوانن برەو بە پروپاگەندەی "گەلانی چەوساوە" بدەن ئەمە لە کاتیکدا هیشتا مەسەلەی کوردستان مەسەلەیەکی زیندوەو بە یارمەتی و هاوکاری خۆیان ئیمپریالیزمی بریتانی کوردستان دابەش و پارچە پارچە کردوە؟

پیویستە بپرسین بۆچی سەدام حوسەین بەبێ رەچاوکردنی رای گشتی جیهانی هیندە بە بیباکی چەکی کیمیایی بەکاردەهینێ؟، ئایا ئیسرائیل دەتوانێ چەکی کیمیایی لە دژی فەلەستینیەکان بەکاربهینێ، ئەی ئەگەر دەتوانیت بۆچی بەکاری ناهینێ؟ پیویستە زۆر بە وردی لیکۆلینەوە بکەین لەسەر ئەوەی بۆچی یەکیتی سۆڤیت پشتگیری لە رژیمی رەگەزپەرست و فاشیستی و کۆلۆنیالیزمی سەدام حوسەین دەکردو چ شتیك ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وا لیدەکات لە رۆژهەلاتی نزیك راپۆرتی نهینی لەسەر کورد ئامادە بکات و گرنگی زیاتر بەم بابەتە بدات، ئەمە لە کاتیکدا تا چەند سالیك لەمەوبەر تەنها وەك مەسەلەیەکی هەوالگری تەماشای مەسەلەی کوردی دەکرد. بۆچی (٣٠) پسپۆری سۆڤیت لە عراق لەسەر چۆنیتی بەکارهینانی گازی ژەهراوی مەشقیان بە عراقیەکان دەکرد، بۆچی؟

خالیکی سەرەکی دی هەیە: لە زۆربەی ولاتانی جیهان لە بەرامبەر کیمیابارانی میللەتی کورد خۆپیشاندان دژی حکومەتی عراق سازکرا، بەلام بۆچی تورکیا ریگەی نەدا خۆپیشاندان لە دژی عراق سازبکرێ؟ لە تورکیا پۆلیس بلاوەی بە خۆپیشاندەرەکان کردو ژمارەیەك لەو خۆپیشاندەرانەی گرت کە لە بەردەم بالیۆزخانەی عراق لە ئەنقەرە تاجە گولینەی رەشیان بە دەستەوە بو، هەروەها ژمارەیەك لەو خۆپیشاندەرانەشیان گرت کە بلاوکراوەیان لە دژی رژیمی عراق بلاودەکردەوە. ئەم کارە تەنها مانای پشتگیریکردنی عراق و رژیمەکەی سەدام حوسەین دەگەیەنیت.

پێویستە هاوکاری نێوان عێراق و تورکیا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ. بۆچی لە تورکیا ڕێگە نادرێ دژی کیمیابارانی میللەتی کورد ڕژێمی سەدام حوسەین شەرمەزار بکری، بەڵام ڕێگە دەدرێ لە دژی سیاسەتی حکومەتی ئیسرائیل خۆپیشاندان و کۆڕو کۆبونەوەی گشتی بۆ پشتگیری کردنی فەلەستینیەکان سازبکرێ و بە کوشتنی دوو فەلەستینی بە ئاشکرا تاوانبار بکرێ؟

لەبەر ڕۆشنایی ئەو شتانەی سەرەوە دەتوانم بلیم زانست و سیاسەت دوو پیشەی زۆر جیاوازن. زانست بواری قابیل کردنی تیا نییە و لێکۆڵیاری زانستی چەمکە زانستیەکان لە شوینی شیاوی خۆی بەکاردەهینیت و لە ژێر گوشاری ئایدۆلۆجیای رەسمی و یاساو سیستم و گەڵاڵە نامەکان واز لە هیچ شتیکی خۆی ناهینیت. بەڵام سیاسەت پیشەیەکی دییە و زۆر جاران سیاسییەکان لەگەڵ گروپەکانی دی پەنا بۆ چارەسەری مامناوەندی و پیکهاتن و دەست بەردار بوون لە هەندێ شت دەبەن و لە بەرامبەر ئەوەشدا گروپەکانی دی دەست بەرداری هیندیك شتی خۆیان دەبن. ئەمەش تاکە شیوازە بۆ پیادەکردنی سیاسەت بۆیە پیویستە بە ئاشکرا جیاوازی لە نیوان سیاسەتمەداران و لێکۆڵیاران بکرێ، هەروەها پیویستە سیاسەتمەداران و دەزگا سیاسیەکان لە سەربەخۆیی زانست تیبگەن. ئەم بیرۆکەیە لە ماوەیەکی دوردا خەسلەتی گەورەی بۆ کوردستان دەبیت لەبەرئەوە پیویستە پشتگیری لە زاناو دەزگا زانستیەکان بکریت چونکە ئەوەی فیکر لە زانست وەربگرێ کار بۆ پیشخستنی دەکات و کوردیش پیویستیەکی زۆری بە زانست هەیە[١٧].

ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە دەشیت بۆ ئامانجی جۆراوجۆر سودیان لیوەربگیریت. ئەو ئامانجە کاتیك دەبیت بە ئامانجیکی گرنگ ئەگەر بە مەبەستی دۆزینەوەی چارەسەریکی دیموکراتی و شۆرشگیرانەی مەسەلەی کورد بەکاربیت بەڵام لێکۆڵینەوەکان بە مەبەستی لەناوبردن و تواندنەوەی کورد ئەنجامدەدرێ تا ئۆپۆزیسیۆنیکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دروست نەبیت پشتگیری لە کورد بکات. لێکۆڵیاران بیرو هەلویست و رەوشتیان بە پیی جیاوازی دیدو بۆچونەکانیان جیاواز دەبیت. ئەگەر لێکۆڵینەوە بە مەبەستی هینانەدی ئامانجی دووەم

بيت ئەوا بە شيوەيەكى نهينى ئەنجام دەدرێ بۆيە ئەو جۆرە ليكۆلينەوانە ناخريتە بەردەم راى گشتى بۆ ئەوەى قسەيان لەسەر نەكرێ و رەخنەيان لى نەگيرێ بەلاّم دروستترين شيوازى ليكۆلينەوە ئەوەيە پابەند بێ بە ميتۆدى زانستييەوە. چونكە يەكيك لە گرنگترين سيفەتەكانى زانست بريتيە لەوەى ئەنجامى ليكۆلينەوەكە بخريتە بەردەم راى گشتى. ئەمەش هەنگاويكى زانستى سەرەكييە كە بابەتييانەى ليكۆلينەوەكان دابين دەكات.

ژنە پرۆفيسۆر "يونا ئەليكسەندەر Yona Alexander لە زانكۆى جۆرج تاون لە واشنتن وەك پسپۆريك لە كاروبارى سياسى نيودەولەتى و تيرۆر كاردەكات و كاتيك لەسەر كورد دەنوسيت چەمكى "ئەو نەتەوەيەى لە پيناوى سەركردەكانى دى شەر دەكات" بەكاردەهينێ. "جيل هامبۆرگ Jill Hamburg" وتاريكى بە ناوى "ميللەتيكى لە بيركراو: جيهان و كورد" لە گۆڤارى "The Nation" بلاّوكردۆتەوە. جيل لە وتارەكەيدا دەليت كورد هەميشە دەورى بەكريگيراو دەبينێ بۆيە ناتوانيت لە پيناوى رزگاركردنى نيشتمانەكەى خۆى دريژە بە خەبات بدات. جيل بە كورد دەليت "جاشى هەمو كەسيك".

يۆنا ئەليكساندەر لە كۆريكدا بە ناوى "هاوسەنگى هيزو تيرۆر لە رۆژهەلاّتى ناوەراست "پيشنيازى پەيمانيك لە نيوان عراق و توركيا و ئيسرائيل دەكات بۆ ئەوەى مەترسى مەسەلەى كورد لەناوبەريت (رۆژنامەى سەباح- Sabah- رۆژى ١٩٨٩/٨/٢٨).

ئەو زانياريانە بە دوو ريگە بەكاردەهينرێ، لە لايەك دەليـن: مادامەكى كورد هەميشە لە پيناوى سەركردەكانى دى شەر دەكات كەواتە دەتوانين سوديان ليوەربگرين، هەرچەندە ئەو سودە كەميش بيت لەبەرئەوە پيويستە دژى نەيارەكانى خۆمان پر چەكيان بكەين و هەمو پيداويستيەكانى دەستپيكردنى پرۆسەكەيان دابين بكەين و بە تيرو تەسەلى بير لە هەمو خەسلەت و ئەگەرەكان بكەينەوە و سياسەتى "پەرتكە-زالبە"ش پيادە بكەين.

ئەم ليكدانەوەيە ريز لە مافەكانى مرۆڤ و مافى نەتەوەكان ناگريت بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا سياسەتيكە ئەو دەولەتانەو دەزگا هەوالگرەكانيان پشتى پيدەبەستن، بۆ نمونە

پاسەوانی گوند لە تورکیا لەسەر ئەو بنەمایە دروست بووە. لە لایەکی دی، دەشیت ئەو بیروراyانـەی سـەرەوە بـە ئاراسـتەیەکی دی بەکاربـهینرێ، واتـە لــە پینــاوی هینانــەدی ژیـانیکی سـەرفرازو خولقـاندنی کەشیکی لـەبار کـە شایستەی مـرۆڤ بیـت هاوکـاری و یارمەتی میللەتی کورد بدات. ئەم راڤەکردنـە بـە تـەواوەتی لەگـەڵ مافـەکانی مـرۆڤ و مافی نەتەوەکان یەکانگیر دەبیت.

بیگومــان بــۆ کــورد رووســوری نیــە لــە ســەریان بنوســریت: "کــورد لــە پینــاوی سەرکردەکانی دی شەر دەکات" یا بە "جاشی هـەمو کەسـیك" ناوبـبرین بـەلکو زۆر بـە ئاسانی شــەمەزارییە ئـەو شـتانەیان لەسـەر بنوسـریت بۆیـە پیویسـتە کـورد خـۆی ئـەو ریسوایی‌و شەرمەزارییە لەسەر شانی خۆی لابەریت. راستە سیاسەتی "پەرتکە- زالبـە" سیاسـەتیکی ئیپمریالییـە بـەلآم خـودی کوردسـتان و نەتـەوەی کـورد دابــەش و پارچــە پارچە کراوە. پیشتر ئاماژەم بۆ پەیمانی نیوان تورکیاو عراق و ئیسرائیل کردوە کـە لـە کۆری "هاوسەنگی هیزو تیرۆر لە رۆژهەلاتی ناوەراست" پیشنیاز کرابوو. ئەم پیشنیازە لە رۆژی ١٩٨٩/٨/٢٨ لە رۆژنامەی –سەباح- بلآوکراوەتەوە. هەروەها گۆڤاری گوین ئایدن Gun aydtin هەمان رۆژ زانیاری لەسەر ئەو بابەتە بلآوکردۆتەوە. گۆڤاری گویــن ئـایدن لەسەر دەرمانخواردکردنی پەنابەرە کوردەکانی ئۆردوگای قیزل تەپەی نزیك بە ماردین لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٨٨ نوسیویتی: "بریتانیـا دلنیایـە عـراق (٢٠٠٠) پیشـمەرگەی کوردی لە نزیك ماردین دەرمانخوارد کردوە. بەلآم Bora Pazan لە لەندەن هەوالیکی بە مانشیتی "هـەوالیکی دزیـو" بلآوکردۆتـەوە. کـەنالی تەلـەفزیۆنی بریتانیــا INT و بــە هاوکـاری دەزگـای پزیشـکی نیودەولـەتی International- IMP Medical Relict ئاشـکرای کردوە کە دەزگای هەوالگری عراقی پیشمەرگە کوردەکانی دەرمانخوارد کردوە.

بە پیی زانیارییەکانی Gwynne Roberts ئازمایشـەکانی خویـن و مـیزو ئـەو نـانەی بۆتـە هـۆی ژەهراویکـردن دەیسـەلمینیت "ئاویتـەی فۆسـفاتی ئۆرگــانی" کــە ژەهریکــی ئاویتەی جیوەیە ئەو حالەتەی دروستکردوە، هەروەها بـە پیـی راپۆرتـەکانی ئـەو کاتـە (غازی ئەتروشی) کـە سـیخوریکی عراقـی بـو بـە ئـازادی لـەناو ئۆردوگـای پەنابـەران دا هاتوچۆی دەکرد.

کوردەکانی عـراق دوای ئـەوەی گونـدو شـارەکانیان کیمیابـاران کـرا بـە ناچـاری بـۆ رزگارکردنی ژیانی خۆیان پەنایان بۆ تورکیا هینا. کاتیك کوردەکان گەیشتنە تورکیا لـە ئۆردوگای زۆرەملیی چوار دەور گیراو بـە تـەلی دەرکاوی و قوللـەی چاودیری و بنکـەی پۆلیس نیشتەجێ کران و ریگەیان پینەدرا پەیوەندی بـە کوردەکـانی بـاکورەوە بکـەن و ریگـە بـە کوردەکـانی بـاکوریش نـەدرا یارمـەتی کوردەکـانی باشـور بـدەن. پەنابـەرەکان نـەیاندەتوانی بـەبێ مۆلـەت لـە ئۆردوگـا بچنـە دەرەوە و بیگاریـان بـە هـەمو کەسـیك دەکـردو پیداویستییە سـەرەکییەکانی وەك نـان و ئـاو و خیـوەت و پـەتو و.. هتـد بـە گویرەی پیویست بۆ دابین نەکردن و بایـەخیان بـە لـەش سـاغی و خوینـدن و خۆراکـی منالەکانیان نەدەدا، ئەمە لە کاتیکدا سیخورەکانی عـراق بـە ئـازادی و بـەبێ پرسـینەوە هـاتوچۆی ئۆردوگاکـەیان دەکـرد و دەیـانتوانی بـە مەبەسـتی ژەهراویکردنـی نـانی پەنابەرەکان پەیوەندی بە خاوەن نرخەکانەوە بکەن. ئایا بەم ئاسـانییە هـەزاران کـەس دەرمانخوارد دەکرێ؟ ئایـا بـەبێ ئاگاداری دەولـەتی تورکیـا و دەزگـا هـەوالگرەکانی ئـەو کارە دزیوە ئەنجام دەدرێ؟ لە کۆتاییدا بەبێ ئەوەی لیکۆلینەوە لەگەڵ خاوەن فرنـەکان بکـە ن دۆسـیەی کیشـەکەیان داخست. بیگومـان ئـەم حالەتـە یەکیکـە لـە ئەنجامـەکانی دابەشـکردن و پارچـە پارچـەکردنی کوردسـتان. ئـەو دەولەتانـەی کوردسـتان وەك کۆلۆنیەکی هاوبەش دەچەوسینەوە سود لەم کارئاسانییە وەردەگرن.

ئەو میللەتەی بە پیی سیاسـەتی "پەرتکـە-زالبـە" دابـەش و پارچـە پارچـە دەکـرێ توشی گەورەترین کارەسات دەبیتەوەو بەشیك لە کارەساتی ئەو میللەتە بریتیە لـەوەی: "لە پیناوی سەرکردەکانی دی شەر بکات" یا دەوری "جاشی هەمو کەسیك" وازیبکات. ئەم وەزعە ریسواییە بۆ ئەو میللەتەو ئەو بارودۆخە پر شەرمەزارییە بە تـیروانینیکی قول و لیکۆلینەوەیەکی وردی سیاسەتی "پەرتکە-زالبە" کۆتایی پیدیت، و ئەمـەش بـە گەشـەپیدانی وشـیاری کۆمەلایـەتی و میژویـی دیتـە دی. راسـتە کـورد بەرهەلسـتی حالـەتیکی وەك دەرمانخواردنەکـەی پەنابـەرەکانی بـۆ نـاکریت کـە دەزگـای هـەوالگری پلانـی بـۆ دادەریـژێ بـەلام دەتوانیـت نۆکەرایـەتی دەولەتـە داگیرکـەرەکانی کوردسـتان نەکات بۆیە نابیت کورد لـە جیـاتی ئـەو دەولەتانـە شـەربکات بـەلکو پیویسـتە بـە پیـی

بـەرژەوەندی نەتەوایـەتی خـۆی رەفتـار بکـات و هـەر بـەو شـیوەیەش ولاتەکـەیان رزگار دەکەن.

بـە پیـی هەلومـەرجی هەنوکـەیی پیـادەکردنی پرەنسـیپی بریـاری مـافی چـارەی خۆنوسـینی گـەلان بـۆ کـورد بـوە بـە مـافیکی حاشاهەلنەگر. رودواەکـان سـەلماندویانە عـەرەب و تـورك و ئیرانیـەکان تەنـها لـە ریگـەی بـەکارهینانی چـەکی کیمیـایی و بایۆلۆجی و گازی ژەهراوی سەرکوتکردن و نایەکسانی و راگواسـتن دەتوانـن حوکمرانـی کورد بکەن. ئەو دەولەتانە هەمو توانایەکی خۆیان دەخەنـە گـەر بـۆ ئـەوەی ناسـنامەی کوردسـتان لەناوبـەرن. ئـەو دەولەتانـە لـە ریگـەی سیاسـەتی دورخسـتنەوەو راگواسـتن خیزانی کورد لەبەر یەکهەلدەوەشیننەوە و منالەکانیان لە ژیانیکی پر لە تـرس و لـەرز گەورە دەبن و کورد ناچار دەکەن لە ئۆردوگای زۆرەملی بژیـت و بـە چـەکی کیمیـایی و گـازی ژەهـراوی جوگرافیـاو ژینگـەی کوردسـتان ویـران و پیـس دەکـەن و دارسـتانەکانی دەسوتینن و ئاژەل و پەلەوەر لەناودەبەن و دارستانەکان دەکەن بە زەوییەکی روتـەن و نۆکـەرو سـیخورەکانیان بـۆ دنـەدانی کـورد لـە دژی کـورد بـەکاردەهینن و پیـادەکردنی سیاسەتی "پەرتکە-زالبە" قولتر دەکەنەوەو بچوکـترین نـاکۆکی نیـوان کـورد دەقۆزنـەوە بۆ ئەوەی ئاگری ئاژاوەو شەری تۆلەسەندن هەلگیرسینن.

شـتیکی ئاشـکرایە ئـەم حوکمـە خویناوییـە پشـت بـە تـیرۆری دەولـەت دەبەسـتیت. بۆچـی تـورك و عـەرەب و ئیرانیـەکان سـورن لەسـەر ئـەوەی حوکمرانـی کـورد بکـەن؟ حوکـم کردنـی کـورد هیـدی هیـدی بـوە بـە کـاریکی تاقـەت پروکیـن چونکـە وشـیاری نەتەوایەتی کورد وردە وردە گەشەدەکات و بە خیرایی بلاودەبیتەوە.

پیم وایە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا توانای چەوساندنەوەی هیچ کەسیك نامینێ بۆیە بە خویناویترین ئامراز نەبیت رابونی نەتەوایەتی کورد لـەناو نـاچیت لەبەرئـەوە کـاریکی حەتمیـە کـورد بریـاری مـافی چارەی خۆنوسـین پیادەبکات، چونکە تەنـها لـە ریگەی پیادەکردنی مافی چارەی خۆنوسین پرۆسەی راگواسـتن و دورخسـتنەوەو ژیـانی ئۆردوگای زۆرەملی و تینویتی و برسیتی و نەخۆشی کۆتایی پیدیت.

پێشتر ئەوەم ڕونکردۆتەوە چۆن پەنابەرە کوردەکانی تورکیا لە ئۆردوگـای زۆرەملـی لـەژێر قوللـەی چـاودێری و بنکـەی پۆلـیس ژیانیـان دەگوزەرانـد و چـۆن ڕێگـەی چونـە دەرەوەیــان لــە پەنابــەران دەگــرت و ســیخورەکانی عراقیــش بــە ئــازادی هــاتوچۆی ئۆردوگاکانیان دەکرد. هەروەها ئەوەشم ڕونکردۆتەوە چۆن بە دەستی هەوالگری عـراق و تورکیا (٢٠٠٠) کورد دەرمانخوارد کران. ئـەو ڕوداوانـە دەیسـەلمێنن عـەرەب و تـورك و ئێرانییـەکان تەنـها لـە ڕێگـەی چەوساندنەوەو سـتەم و تـیرۆر دەتوانـن حوکمـی کـورد بکـەن. لـێرەدا جـارێکی دی پیـادەکردنی مـافی چارەی خۆنوسـین بـۆ کـورد دەبێـت بـە مافێکی حاشاهەلنەگر.

ڕۆژگـارێك کـورد بـۆ ماوەیـەکی زۆر کـورت حوکمرانـی خـۆی کـردوە و تەنـها لـەو کاتانەدا هێمنی و ئاشتی بالی بەسەر کوردستاندا کێشـاوە. ئەگـەر کۆتـایی شەسـتەکان و سـەرەتای حـەفتاکان وە بـیر بهێنینـەوە کـە مـەلا مسـتەفای بـارزانی سـەرکردایەتی بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی ئـەو سـەردەمەی دەکـرد، هـەمو کەسـێك سـەرنجی دەدا چـۆن هێمنــی و ئاشــتی بــالی بەســەر کوردســتاندا کێشــابو، هــەروەها چــۆن ناکۆکییــە کۆمەلایەتییەکان شەڕی چەکدارییان لێنەکەوتەوە بۆیە پێویسـتە لێکۆلینەوەیـەکی ورد لەسەر هەمو دامودەزگاکانی ئەو سەردەمە بکرێت. ئەگەرچی تەمەنی کۆمـاری مـەهاباد زۆر کـورت بـو (سـالی ١٩٤٦) بـەلام خـەلکی ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان بـە هێمنــی و ئاشـتی دەژیا. ئەو ڕوداوانەش دەیسەلمێنن کورد لە هەمو کەسێك باشـتر بـە لێـك حـالی بـون و دادپـەروەری و ڕێزگرتـن لـە مافـەکانی مـرۆڤ دەتوانیـت حوکمرانـی کوردسـتان بکـات. بەلام ئەوانەی بە ئاگرو ئاسن حوکمی کوردستان دەکەن خۆیان ئاژاوەو پشێوی لە ولات دەخولقێنـن. هـەروەها لـە سـەردەمی حوکمـی ئـەمیر بـەدرخان لــە ١٨٤٠-١٨٤٨ هێمنــی و ئاشتی و دادپەروەری لە ناوچەی جزیـرە سـەروەر بـو، بـەلام عوسمـانی و بریتـانی و فەرەنسی و ڕوسییەکان ئـەو سیستەمەیان بـە دل نـەبو بۆیـە هـەمویان هاوکار عوسمانییـەکانیان دەکـرد بـۆ ئەوەی دەستەلاتی بەدرخان لەناوبەرن.

چەمکی ئاشتی لەلای کورد و ئەو دەولەتانەی کوردستان وەك کۆلۆنییەکی هاوبـەش دەچەوسێننەوە جیاوازییەکی گەورەی هەیە چونکە چەمکی "نەزم" و "ئاشتی" لە لای

ئـە و دەولەتانـە جگـە لـە داپلۆسـین و تـیرۆرو ئیفلیـج کـردن و هەناسـە لیـبرینی کـورد هیچی دی ناگەیەنیت.

لە سایەی سیستمیکی دیموکراسی کە جیگەی تیرۆری دەولەتی تیا نابیتـەوە نـەزم و ئاشتی و ئازادی و دادپەروەری گەشە دەکات. دەلین کورد و عەرەب بەشداری لە حوکمی عراق دەکەن و تورك و کورد بەشداری لە حوکمی تورکیا دەکـەن.. هتـد. ئایـا میللـەتی کورد کیمیاباران دەکریت ئەگەر بە ئازادی بەشداری لە بەریوەبردنی عـراق بکات؟ ئایـا پرۆسەی راگواستنی بە زۆر رویدەدا؟ ئایا ئەفسەریکی عراقی دەویری بلیت: "بە چەکی کیمیـایی هـەموتان لەناودەبـەین و شـینایی لـەم ناوچەیـە نـاهیلین"؟ ئایـا کـورد دەرمانخواردو قەلاچۆ دەکریت؟

سەبارەت بە تورکەکانی بولگارستان: گریمان تورکەکان بە نـاوی بولگـاری رازیبـون و هیـدی هیـدی دەبـن بـە بولگـاری. شـتیکی ئاشـکرایە ئـەو کـەس و تاقمانــەی دەبـن بـە بولگـاری هـەمو توانایـەکی مـادی و مەعنـەویان دەخریتـە بەردەسـت، هـەروەها کـاریکی مەنتیقیـە ئـەو تورکانـەی نکۆلـی لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی خۆیـان دەکــەن لــە گشـت ئیدارەکانی دەولەت و حزبی دەستەلاتدار و دونیای سیاسەت کاریان پیبدریت، ئایـا لـەم حالەتەدا دەتوانین بلیین تورك و بولگار بەشداری لە حوکمی بولگارسـتان دەکـەن؟ ئـەم بارودۆخە کتومت لە بارودۆخی کورد دەچیـت. لەبـەر رۆشـنایی ئـەو شـتانەی سـەرەوە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی پیویسـتە کوردیـش وەك هـەمو نەتـەوەکانی دی مـافی چـارەی خۆنوسین پیادە بکات.

زۆرجـاران دەوتـریَ کـورد ئـامیری دەسـتی بیگانەیـە -واتـە ئیمپریـالیزم- و ولاتـانی رۆژهـەلاتی نزیـك کـورد بـۆ دژایـەتی کردنـی ولا تـانی دی بـەکاردەهینن کـەچی کـاتیك باسی وەزعی کورد دەکەن فرمیسکی تیمساحی بۆ دەریژن. بەلام ئەگەر لـە قولایـی ئـەو هەستە وردبینەوە جگە لە قەشمـەری و گالتـەکردن بـە کـورد لـە پـال جۆریـك لـە لـوت بـەرزی و هەسـتی شـانازی بـە نەتەوایـەتی کردنـەوە هیچـی دی بـەدی ناکـەین. ئەوانـە هەرگیز پەنجە بۆ سیاسەتی "پەرتکە-زالبە" دریژناکەن، ئەگـەرچی خراپـی بـارودۆخی کـورد و بـەکارهینانیان لـە لایـەن خـەلکانی دی ئـەنجامی سیاسـەتی "پەرتکـە-زالبـە"یـە

لەبەرئەوە پێویستە بە توندی دژایەتی ئەو سیاسەت و کەسانە بکات کە گاڵتەیان پێدەکەن و ئابڕوی نەتەوایەتییان پێشێل دەکەن، هەروەها پێویستە کورد بە دوای شێوازی گونجاودا بگەڕێت بۆ ئەوەی خەڵکانی دی ئیستغلالی نەکات.

## پەراویزەکان

١-پیم باشە سەبارەت بەم چاوپیکەوتنە لە بارەی بابەتیکە دی قسە لەسەر هەلویستی جیهان سەلجوق Jihan Selcuk و نادر ماتەر Nadire Mater بکەم. نادر لەسەر پارتی کارگەرانی کوردستان پرسیاری لە سەلجوق کرد. سەلجوق لە وەلامدا دەلیت: لەبەرئەو هۆیانەی رونیکردۆتەوە پارتی کارگەرانی کوردستانی قبول نیە ل١٧. پرسیارو وەلامی نیوان ئەو دوو کەسە بە پیی مینۆدیکی زانستی نەبوو چونکە بە هۆی ئایدۆلۆجیای رەسمی و پیادەکردنی یاسا لە تورکیا ناتوانریت وەلامیکی باوەرپیکراو لەسەر "بابەتی پارتی کارگەرانی کوردستان" پیشکەش بکریّ بۆیە لیکدانەوەکانیان دیدو بۆچونی رەسمی دەولەت و چەمکەکانی دوبارە دەکاتەوە. ئەمەش بە کورتی مانای تاوانبارکردنی پارتی کارگەرانی کوردستان و ناوزراندنی و وەسفکردنی ئەو پارتەیە بە کۆمەلیك "چەتەی تاوانبار" و "تاقمیك دزو جەردە" کە ژن و منال و گەنج و پیر دەکوژیت و.. هتد. ولاتیك قورسترین سزای لایەنگرانی پارتی کارگەرانی کوردستان بدات و جنیودان بە کاریکی زانستی بزانیت و ئەم شیوازە هیچ شتیکمان بۆ رون ناکاتەوەو ئەمەش هەمان شیوازو دیدو بۆچونی ئایدۆلۆجیای رەسمی دەولەتە چونکە ئەو شتانە دوبارە دەکەنەوە کە دەولەت حەز بە بیستنیان دەکات. ئەمەش هەلویستیکی ترە کە بیرەوشتییەکی زۆری پیوە دیارە. لەبەر ئەم هۆیە ئەرکی روناکبیرو رۆژنامەکانی تورکیا خولقاندنی کەشیکی کۆمەلایەتی و سیاسی ئەوتۆیە ریگە نەدات ئەو کەسانە سزا بدریت کە خەباتی پارتی کارگەرانی کوردستان بە باشی ناو دەبەن. هەروەها پیویستە خەبات لە پیناوی هینانەدی کەشیك دا بکەن لە سایەیدا بیری نەیاری ئەتاتورك و کەمالیزم بە تاوان دانەنریت.

هەروەها پیویستە وتەکانی سەرەك ئەرکان جەنەرال نەجیب تورمتای Necip Torumtay. کە لە رۆژی ١٩٨٩/٨/١٧ بلاوکرایەوە لە هەمان چوارچیوەی راڤە بکریّ. تورومتای دەلیت: ئەو کەسەی پشتگیری و کۆمەکی پارتی کارگەرانی کوردستان بکات

دوژمنــی ئیمەیــە (ڕۆژنامــەی Cumhuryet، ڕۆژی ١٩٨٩/٨/١٨). ئەگــەر لــەم حالەتــەدا بمانەوێ خۆمان لە مەترسی گەورە بپاریزین نابیت بە زانیاری بڕواپیکراو قسە لەسەر ڕوداوەکانی ڕۆژهەلاّت و پارتی کارگەرانی کوردستان بکەین. لیرەدا مرۆڤ ناتوانیت بیر لەم وتەیەی ڤۆلتیر نەکاتەوە کە دەلیت: "هەرگیز لەگەلّ وتەکانت تەبا نیم بەلاّم هەمو توانایەکی خۆم دەخەمەگەڕ بۆ ئەوەی بەرگری لە دیدوبۆچونەکانی خۆت بکەیت".

نادر ماتەر هەلەی کرد ئەو پرسیارەی کرد چونکە پرسیارەکەی پیشوەخت وەلاّمەکەی ئامادە کرابو، هەروەها سەلجوقیش هەلەی کرد هەر لە سەرەتاوە پرسیارەکەی ڕەتنەکردەوە و بلیت هەلەیە وەلاّمی پرسیاریك بدەیتەوە ئەگەر مافی ئەوەت نەبیت هەلویستیکی پۆزەتیڤ لەسەر ڕیکخراویك دەربریت چونکە ئەگەر هەلویستیکی پۆزەتیڤ لەسەر ئەو ڕیکخراوە دەربرین ڕوبەڕوی سزای یاسایی دەبیتەوە.

بۆ ئەوەی وینەیەکی ڕونمان لەسەر سزادانی ئەو کەسانە هەبیت کە هەلویستیکی پۆزەتیڤیان لەسەر پارتی کارگەرانی کوردستان هەیە، پیویستە بگەڕیینەوە بۆ سەر دادگاییکردنەکەی مەهدی زانا (ڕۆژنامەی جمهوریەت، ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٣). مەهدی زانا-ی حاکمی شاری دیاربەکر لە مانگی ئاب لە چاوپیکەوتنیکدا لەگەلّ ڕۆژنامەی ناوبراو دەلیت: "من لایەنگیری لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی دەکەم بە سەرکردایەتی پارتی کارگەرانی کوردستان". مەهدی زانا لەسەر ئەم قسانەی لە لایەن دادگای سەربازییەوە بانگهیشت کرا بۆ ئەوەی بە (٥-١٠) سالّ زیندانی حوکم بدریّ.

لە لایەکی دی سەلجوق بە گالتەپیکردنەوە ڕەخنە لە پارلەمانتارەکانی ڕۆژهەلاّت دەگری چونکە داوای مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی خۆیان نەدەکرد بەلاّم نوسەر و ڕوناکبیرانی تورك زۆر بە گەرمی پیشوازییان لەو پارلەمانتارە کوردانە دەکرد کە نارەزاییان لەسەر سیاسەتی تواندنەوەی کورد دەرنەدەبڕی و هیچ داواکارییەکی نەتەوایەتییان پیشکەش نەدەکرد و پییان دەوتن: "وەك هەر تورکیك و ڕەنگە لە تورك باشتریش بەرگرییان لە بەرژەوەندی دەولەتی تورکیا و نەتەوەی تورك کردوە". ئەم هەلویستە پشتگیرییەکی زۆری لیدەکراو ڕوناکبیرانی تورك ئەم هەلویستە یان بە

هەلویستیکی پیشکەوتوخوازانە و شۆرشگیرانەو ریبازیکی دیموکراسی ناودەبرد بۆیە توشی شاگەشکە دەبون کاتیك کەسانیکی وەك تەحسین سەراج نکۆلی لە کوردبونی خۆیان دەکرد و خۆیان بە تورك دەزانی. ئەم تویژە هەرگیز شایانی ئەوە نیە رەخنەی لی بگیرێ.

بیگومان نکولی کردن لە ناسنامەی نەتەوایەتی و هاندانی پرۆسەی تواندنەوەو تەتریك کردن هەلویستیکە بە هیچ شیوەیەك پەیوەندی بە دیموکراسی و شۆرشگیرییەوە نیە. پیشوازیکردن و هاندانی ئەو هەلویستانە لە لایەن نەتەوەی بالادەست جگە لە ساختەو تەلە نانەوە هیچی دی نیە و یەکیکە لە پیداوویستییەکانی سیاسەتی رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالی. ئەو کەسانەی لە رابوردودا نکۆلیان لە کوردبونی خۆیان کردوە، لە ماوەی پرۆسەی بەرجەستەبونی وشیاری نەتەوایەتی کۆمەلگەی کوردەواری کە هەردەم بەرەو پیشەوە دەچیت ریسوا دەبن و فیکرو هەلویستیشیان بە بیرەوشتی لە قەلەم دەدرێ.

سەرەرای ئەوەی نوسەر و رۆژنامەنوس و فەرمانرەوایان پیشوازی لەو کەسانە دەکەن کە نکولی لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن بەلام رەتکردنەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی لە رابردو، و داهاتوشدا تەنها رقوکینە بەرهەم دەهینێ. ئەم نکۆلی کردنە رەفتاریکە شایانی ئەوەیە ریسوا بکریت. و نەوەکانی ئیستاو داهاتوش رەخنەی لیدەگرن. پیشوازی و هاندانی ئەو کەسانە بۆ هەتاهەتایە بەردەوام نابیت چونکە دینەمۆی کۆمەلایەتی و سیاسی لە کوردستان. زۆربە خیرایی گەشە دەکات بۆیە ئەو کەسانە درەنگ یا زوو ناچاردەبن دەربارەی ئەو بابەتە هەلویستی دیاریکراو وەربگرن.

٢-بە هەستیکی پر جۆش و خرۆش وەلامەکەی بریاری تاوانبارکردن پیشکەش بە دادگا دەکرا. بەرپرسانی باری نائاسایی و دەستەی دادگا نەیاندەویست بەلگەیەك بۆ دۆسیەی کیشەکە زیادبکرێ بەرگری لە ناسنامەی کورد و کوردستان و زمانی کوردی بکات لەبەرئەوەی وەلامەکە بە بەلگەیەکی رەسمی دادەنراو دەبو لە داهاتودا لەسەر ئەو بنە مایە مامەلە لەگەڵ کیشەکە بکرێ بۆیە دادگا بە توندی رەتیدەکردەوە ئەو بەلگەنامەیە بخاتە سەر دۆسیەکەیان چونکە لە گرنگی وەلامەکە تیدەگەیشت. دادگا

داوای له تاوانباران کرد هەرچیان هەیە بە سەرزارەکی لـە بـەردەم دادگـا قسـەی لەسـەر بکەن تا لە کۆنوسی دانیشتنەکاندا وتەکانیان تۆمار بکرێ. دادگا سەربازییەکانی تورکیـا لـە بەرئـەوەی وەك هۆبەیـەکی دەزگـای هـەواڵگری لـە کوردسـتان کاریـان دەکـرد بۆیـە وەرگرتنی وەڵامەکە و زیادکردنی بۆ دۆسیەی تاوانباران بە کیشـەیەکی سیاسـی دادەنـرا نەك کیشەیەکی یاسایی.

ساڵی ١٩٧١ لە کاتی دادگاییەکانی رۆژهەڵات گەنجەکان بەرهەلستی هەڵویسـتیکی لـەو شیوەیەی دادگایان کردو سوربون لەسەر ئەوەی نەچنە دادگا ئەگەر دادگا لە هەڵویسـتی خـۆی پەشـیمان نەبیتـەوەو وەڵامەکـەیان لیوەرنـەگریت. ئـەم هەڵویسـتەی گەنجـەکان بەرهەلستییەکی ئاشکرا بـو چونکـە گـەنجان زۆر بـە تونـدی و بـە پـەرۆش و هۆشـیاری بەرگرییان لە کیشەیەك دەکرد داواکارە گشتییەکان بە تاوانیان دادەنا. بەرپرسانی باری نائاسایی و داواکاری گشتی سـەربازی لـە هەڵویسـتی بیوینـەی گەنجـەکان سەرسـام بـون. دادگـا چـاوەروان بـو ئـەو گەنجانـەی ئیدعـای کوردبونـی خۆیـان کـردوە دانبنیـن بـە هەڵەکـەی خۆیـاندا و داوای لیبـوردن بکـەن و بلیـن جـاریکی دی ئـەو هەڵەیـە دوبـارە ناکەنەوە لەبەر ئەوەی نیازیان نەبوە جەخت لەسەر رەگەزیکی نـاتورك لـە وڵاتەکـەیان بکەنەوە چونکە خۆشیان بە تورك دەزانن. کاتیك بەمشیوەیە لە ئیفادەکـەیان دەبنـەوە ئیتر دەکرێ وەڵامی بریارەکانی تاوانبارکردن بخریتـە سـەر دۆسـیەی کیشـەکەیان بـەڵام ئـەوەی چاوەروانیـان نـەدەکرد رویـدا. دادگـا ترسـی لـەم هەڵویسـتە هــەبوو بۆیــە نەیدەویست بیکاتە بەڵگەنامەیەکی رەسمی. دادگا لـە دوای وتویژیکـی دورودریـژ ناچـار بـوو وەڵامـی ئەوانـە لەسـەر بریـاری تاوانبـارکردن وەربگریـت. دوای ئــەوەی وەڵامەکـە هـاوپیچی دۆسـیەی تاوانبـاران کـراو لـە کۆنوسـی دانیشـتنەکانی دادگـا ئامـاژەی بـۆ کـرا قۆناغیکی نوێ دەستی پیکرد. گەنجەکان دەیانویست دەقـی وەڵامەکـە لـە بـەردەم دادگـا بخویننـەوە بـەڵام دادگـا بـە بیـانوی دریـژی وەڵامەکـە ریگـەی خویندنـەوەی پینـەدان. گفتوگۆکان لە کۆتایی ١٩٧١ تا سەرەتای ١٩٧٢ لە چـەندین دانیشـتن و دادگـای جۆراوجـۆر دریـژەی کیشا تـا لـە دواییـداو لـە یـەکیك لـە دانیشـتنەکانی دادگـا گەنجـەکان دەقـی وەڵامەکەیان خویندەوە.

به بۆچوونی من ئەو ئەنجامەی لـەو روداوانـە کەوتـەوە بریتـی بـو لـە: بەرپرسـانی بـاری نائاسـایی گومانیـان لـە پیـاوانی ئاسـایش و کاریگـەرییان لەسـەر گەنجـەکان پەیداکرد و بە شایستەی ئەوەیان نەدەزانین متمانەیان پیبدەن بۆیـە ئیستا لـە جیـاتی ئەوان سەرباز بەکاردەهینن.

لایەنیکی پر بایەخی دادگاییەکانی رۆژهەلات لە سالی ١٩٧١ ئەوەیە کورد بە دیدیکی سیاسـی بـەرگرییان لـە ناسـنامەی نەتەوایـەتی و خاسـیەت و خەسـلەتەکانی کۆمەلگـەی کـوردەواری دەکـرد. دادگاییـەکانی کوردسـتان لـە دوای ١٩٨٠/٩/١٢ بـووە مایـەی بەرجەستەبونی هەلویستیکی زۆر توندوتۆل و وشیارانە. زینـدانـی و بـەندکراوەکان لـە بـەردەم دادگـاو داواکـاری گشـتی بـە زمـانی کـوردی قسـەیان دەکـرد و هـەر بـە زمـانی کوردیش لە بەردەم دادگادا داکۆکییان لە خۆیان دەکرد. بۆیە دادگا بە ناچاری هانای بۆ وەرگیری زمـانی کـوردی –تورکـی بـرد. لـە ناوەراسـتی هەشـتاکانەوە تەنانـەت ئـەو کوردانـەی زمـانی تورکیشیان دەزانـی بـە زمـانی کوردی داکۆکییـان لـە خۆیـان دەکـرد. بەمشیوەیە هەلویستیکی تۆکمە و وشیارانە لەنیو کوردەکان بەرجەستە بو.

داکۆکی لەخۆکردن بە زمـانی کوردی لـە بـەردەم دادگـای تورکیـا شـتیکی کـەم نیـە. دادگاکان بە توندی دژایەتی ئەو هەلویستەیان دەکرد و رایاندەگەیاند هـەر کەسـیك بـە زمانی کوردی قسە بکات و سور بێ لەسەر قسەکردن بـە زمـانی کـوردی و هـەر کەسـیك بلیت زمانی دایکی زمانیکی کوردییە سزای یاسایی دەدرێ و ئیسـتا بـە سـەدان دۆسـیەی تایبەت لەو جۆرە دادپرسیانە (الدعاوی القضائیة) هەیە. هەمو کەسیك مافی هەیـە بـە زمانی کوردی قسە بکات ئەمـەش بـە تەنـها خـەلکی شـاری دیاربـەکر ناگریتـەوە بـەلکو هـەمو خـەلکی کوردسـتان دەگریتـەوە. کـاتیك زینـدانیـە کوردەکـان لـە گرتوخانـەی دیاربـەکر بـۆ گرتوخانەیـەکی تایبـەت بـە رۆژئـاوا دەگویزرینـەوە لـە بـەردەم دادگـاو داواکـاری گشـتی بـە زمـانی کـوردی قسـە دەکـەن، زۆربـەی بـەندکراو و زینـدانـی و تاوانبارەکان ئەم رەفتارە دەنوینن.

سالی ١٩٧١ کوردەکان هەولیاندەدا سەربەخۆیی زمانی کـوردی بسـەلمینن بـەلام ئیسـتا لە ریگەی قسەکردن بە زمانی کوردی بـە کـردەوە دەیسـەلمینن زمـانی کـوردی زمـانیکی

سەربەخۆیە، کەچی سەرەرای ئەوانەش داواکارە گشتیەکان بەردەوام بە زمانی تورکی بریار ئاراستەی کوردەکان دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ شتیك لە وەڵامی کوردەکان تیبگەن بۆیە دەبینین بە سەدان کەسی وەك مەهدی زانا-ی حاکمی پیشوی شاری دیاربەکر بە بیانوی ئەوەی بە زمانی کوردی قسەیان کردوە حوکم دەدرین- رۆژنامەنوسەکانی ئەو سەردەمە بەمجۆرە لەسەر مەهدی- یان دەنوسی: "لەبەرئەوەی مەهدی زانای حاکمی پیشوی شاری دیاربەکر سەر بە ریکخراوی "Ozqurlok Yolu"یە بە تۆمەتی ئەوەی بە زمانی کوردی بەرگری لە خۆی کردوە داوایەك لە دژی بۆ دادگای سەربازی سەر بە لەشکری حەوت بەرزکراوەتەوە".

مەهدی زانا لە دوا دانیشتندا بە دادگای سەربازی راگەیاند بە زمانی کوردی بەرگری لە خۆی دەکات بۆیە دەستەی راویژکاری دادگاو داواکاری گشتی بریاریاندا بە تاوانی ئەوەی بە زمانی کوردی قسەی کردوە سەرلەنوێ رەوانەی دادگای بکەنەوە. ویداد ئەرکان Vedat Erkan-ی داواکاری گشتی سەربازی زۆر بە راشکاوی دەلیت: "لەسەر خاکی دەولەتی تورکیا زمانیك نیە ناوی زمانی کوردی بیت و ئەوەی هەیە زمان نیە بەلکو وشەگەلیکی تیکەڵاو و دیاریکراوی بە ئەسل تورکیە و بە تیپەربونی کات شکلی زاراوەی وەرگرتوە. بەڵام بەکارهینانی ئەم زاراوەیە لە لایەن کەسانیکی دیاریکراوەوە بە هاندانی دەولەتە بیانیەکان و بۆ مەبەستی دیاریکراو هەرگیز مانای بونی رەگەزی کورد و زمانی کوردی لە نیو میللەت و نیشتمانی تورك ناگەیەنێ. ئەمرۆ ئەم زاراوەیە لە رۆژهەڵات و باشوری ئەنادۆل وەك ئامرازیکی دەربرین بەکاردەهینری.

ئیمە روبەروی ئەم زاراوەیە نەبوینەوە تا نەبوە بابەتی پروپاگەندەو جیگەی شانازیکردن لەبەرئەوەی ئەم زاراوەیە رۆژیك لە رۆژان بە زمانی دایك دانەنراوە.. ئەمەش راستیەکە کەس لاری لیی نیە. بەڵام هەستی نەتەوایەتی تورك برینداردەکەین ئەگەر ئەو کەسانەی لە زمانی تورکی تیناگەن بە کورد و خاوەن زمانی خۆیان ناوبەرین. (رۆژنامەی جومهورییەت رۆژی ١٩٨٨/٨/١١).

ئەو برگەیەی سەرەوە ئاستی رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمی تورکیا لە کوردستان ئاشکرا دەکات. بە راستی ئەو وتانە کینە ئامیزن. زیندانیەکان دەلین ئیمە کوردین و

داواکارە گشتیەکان وەڵامیان دەدەنــەوە: "کــورد لــە تورکیــا نیــە، و ئیمــە هــەمومان تورکین"، بەندکراو و زیندانییەکان بە زمانی کوردی دەدوین و داواکارە گشتیەکان سەرەرای ئەوەی لە قسەکانیان تیناگەن کەچی دەلین: "زمانی کوردی نیە بەلکو وشەگەلیکی دیاریکراوی تورکی کۆنە". هەروەها دەلین ئەم زمانە هەستی نەتەوایەتی تورك بریندار دەکات. ئایا ئەم وتە نابەجییانە جنیودان و سوکایەتی کردن نیە بە کورد؟ ئایا ئەم جنیودانە هەستی نەتەوایەتی کورد بریندار ناکات؟

کیشەیەکی دی هەیە: ئیفادەی زیندانییەکان لە ریگەی وەرگیری راستەوخۆ وەرگیریت. بەلام چۆن دلنیابین لەوەی ئەو وەرگیرانە شارەزاییان لە زمانی کوردی هەیە؟ بۆ نمونە، ئاستی زانیاری هەر وەرگیریك لە زمانی تورکییەوە بۆ زمانی فرەنسی و بە پیچەوانەوە لە ریگەی بروانامەی دبلۆم لە وەرگیرانی راستەوخۆو لە ریگەی لیکۆلینەوەی لەسەر زمان و ئەدەب و فەلسەفەی فرەنسی زامن دەکریَ. دادگاکان خۆیان ئەم مەرجە دادەنین بەلکو مەرجیکی سەرەکی دادگاییکردنیشە لەبەرئەوەی تەنها وەرگیرانیکی ورد دەستەبەری ئەوە دەکات بەرگری تاوانبار بە راستگۆی بۆ دادگا بگویزیتەوە بۆیە تەنها زانینی زمانی فرەنسی بۆ وەرگیران بەس نیە بەلکو پیویستە دبلۆمی لە فەلسەفەی فرەنسیش هەبیَ. چۆن بزانین ئەو کەسانەی دادگاکان بە وەرگیریان دادەمەزرینیَ شارەزاییان لە زمانی کوردیدا هەیە؟ ئایا پیویست نیە دبلۆمیان لە فەلسەفەی کوردیدا هەبیَ؟

٣-یەکیك لەو هەواڵانەی لەسەر ئەم بابەتە لە رۆژنامەکان بلاوکراوەتەوە: "رەوانە کردنی تیمە ئاینیەکانە بۆ (١٧) ویلایەت- هیرشی راگەیاندن".

ئەم تیمانە سەرباری ئەوەی وتاری هەینیان لە مزگەوتەکان دەخویندەوە قسەیان بۆ جەماوەر دەکرد و وەڵامی پرسیاری فیرگەو دەزگا فیرگوزارییەکانی دی و زانکۆ و سەربازگەکانیان دەدایەوە.

تیمەکانی راگەیاندن پیش ئەوەی دەست بەکاربن لە چوارچیوەی ئەو سیمینارەی بۆ ئەم مەبەستە ریکخرا بو مەشقیکی قورسیان لەسەر دەستی پیاوانی هەوالگری و

فەرمانبەرانی ئیدارەی گشتی پۆلیس دەبینی. هەر تیمیك لە ٢ یا ٣ پیاوی ئاینی پیكدەهات و بەسەر ئەم هەریمانەدا دابەشكران:

-تیمی یەكەم: هەریمی تاكیرداغ- كیركلارەلی- Tekirdag- Kirklareli

-تیمی دوەم: هەریمی ئاگری- قارس- Agri- Kars

-تیمی سییەم: هەریمی ئەرزرم- ئەزرینجان- Erzurum- Erzincan

-تیمی چوارەم: هەریمی وان- هەكاری- Van- Hakkari

-تیمی پینجەم: هەریمەكانی سیرت- موش- بتلیس- Sirrt- Mus- Bitlis

-تیمی شەشەم: هەریمی ماردین- دیاربەكر- Mardin- Diyarbakir

-تیمی حەوتەم: هەریمی بنگۆل- تونجەلی- Bingol- Tunceli

-تیمی هەشتەم: هەریمكی ئادیامان- Adiyan an- San liurfa

(رۆژنامەی حورییەت Hurriyet، رۆژی ١٩٨٧/٤/٢١) هەر لە هەمان رۆژنامەو لەسەر هەمان بابەت هەوالیكی دی دابەزیوە: راگری زانكۆی (سەدەمین سالْ)ی شاری وان پرۆفیسۆر تەنها دبایسون رایگەیاند: گوتاری ئاینی لە زانكۆكەمان نەخویندراوەتەوە بەلكو كۆنگرەیەكمان لەسەر یەكیتی و هاوكاری بەستوە. ئەم كۆنگرەیە بە هاوكاری نوسینگەی والی شاری دیاربەكرو زانكۆی دیجلە و پەیمانگەی ئەتاتورك بۆ كولتورو زمان و میژو ریكخراوە. وا چاوەروان دەكریّ كۆنگرەی لەم بابەتە لە هەریمەكانی دی رۆژهەلات وەك قازانتاپ Ganizntep و شانلویرفا Sanliurfa و قارەمانماراش Kahramanmarus ببەستریّ و مامۆستایانی زانكۆش بەشداری تیا دەكەن (رۆژنامەی حورییەت، رۆژی ١٩٨٧/٤/٢١). سالی ١٩٨٥ پەیمانگەی لیكۆلینەوەی توركیا كتیبیكی لە ئامادەكردنی كۆمەلیك مامۆستای زانكۆ بە ناوی (ئەنادۆلی رۆژهەلات و یەكیتی نیشتمانی توركیا" بلاوكردەوە.

٤-یەكەم ژمارەی گۆڤاری Dogru e 2000 لە لاپەرەی یەكەمیدا بابەتیكی بە ناوی "دەولەتی عەلمانی بانگهیشتی جیهاد دەكات" بلاوكردۆتەوە كە تیدا هاتوە سوپاو پۆلیس و فەرمانبەرانی ئیدارەكان لە ریگەی دابەشكردنی بلاونامەی ئایەتی قورئانی و فەرمودەكانی پیغەمبەر خەلكی رۆژهەلات بۆ "گویرایەلی خوداو پیغەمبەری خودا" و

"جیهاد له ریگەی خودا" له دژی "بەرەی گاوران" بانگهیشت دەکەن. ئەو بلاونامانه له کۆتایی سالی ١٩٨٥-دا بە فرۆکەو هەلیکۆپتەر بلاودەکرایەوە، هەروەها پۆستەریان بە هەمان دروشم به دیواری مزگەوت و چایخانەکانەوە هەلدەواسی و داوایـان لـه دوکاندار و چایچیەکانیش دەکرد پسولەی وەرگرتنی پۆستەرەکان ئیمزا بکەن.

ئەمەش دەقی چوار لەو بلاونامەو پۆستەرانەیە:

دەقی یەکەم:

هاولاتیان، بیر لە ئامۆژگارییەکانی ئیسلام بکەمەوە، "وقاتلوا فی سبیل الله الذین یقاتلونکم، و لاتعتدوا ان الله لا یحب المعتدین (سورة البقرة، الآیة ١٩٠) (لە پیناوی خوادادا شەری ئەوانە بکەن کە شەرتان لەگەڵ دەکەن، وە دەست دریژی مەکەن، خودا دەست دریژکارانی خۆش ناویت.

هاولاتیان:

چەتە جوداخوازەکان دەیانەوێ لە بەها پیرۆزەکانی وەك ئاین و منال و ژن و نیشتمان و ئالای ولات و رەوشت دورتان بخەنەوە بۆیە ئەرکی سەرشانتانە وەك هەمو موسلمانیك دژایەتیان بکەن کەواتە ئەرکی سەرشانی خۆتان بەجیبهینن و هاوکاری هیزەکانی سوپا بکەن.

دەقی دوەم:

هاولاتیان: پیغەمبەری کەریم (د.خ) دەفەرمویت: "من حمل علینا السلاح فلیس منا، و من غشنا فلیس منا"، واته ئەوەی چەکمان لیهەلگریت لە ئیمە نیە، و ئەوەی فیل و گزیشمان لیبکات له ئیمه نیه.

ئەو چەتە تاوانبارانە چەکەکانیان ئاراستەی خۆت و دایك و باوك و براو خوشك و ژن و منالەکانت دەکەن و دەیانکوژن و شەرەفیان دەشکینن له ئیمە نین، ئەو چەتانە شەرەف و کەرامەت و ژیانت پیشیلدەکەن و نۆکەرایەتی ئەرمەن دەکەن. کەواتە پیویستە هیزەکانی ئاسایش لە شوین و جیگەی چەتە جوداخوازەکان ئاگاداربکەنەوە ئەگینا خۆتان بەرامبەر بە خودا تاوانبار دەبن.

دەقی سییەم:

هاوڵاتیان، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت: "و اطیعوا الله و رسوله و لا تنازعوا فتفشلوا و تذهب ریحکم و اصبروا ان الله مع الصابرین"، سورة الانفال الآیة ٤٦، (فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پیغەمبەری خودابن، کیشەو دوبەرەکی لەناو خۆتان دا پەیدا مەکەن چونکە فاشیل دەبن و بەختتان دەروات و، خۆراگربن خودا لەگەڵ خۆراگراندایە).

هاوڵاتیان، ئەو چەتەو ریگرانەی بە ناوی "خەبات لە پیناوی رزگاری نیشتمانی" و "ئازادی" قسەت بۆ دەکەن لە راستیدا یەکیتی و نەفس بەرزیت دەشکینن لەبەرئەوە مەهیلن ئەو خائین و دەستدریژکارانە بە خۆیانەوە توشتان بکەن.

ئەو چەتە خائینانەی بەبێ جیاوازی تەقە لە ژن و منال و پیرو پەککەوتە دەکەن و دەیانکوژن و سەروەت و سامانیان دەدزن و دەستدریژی دەکەنە سەر ژنان هیچ نرخیك بۆ ئاین و ئابرو و رەوشت دانانین.

باوەر بە درۆکانیان مەکەن. هاوکاری هیزەکانی ئاسایش بکەن کە لە پیناوی ئیوەدا دەجەنگن.

دەقی چوارەم:

هاوڵاتیان، خوا لە کتیبی پیرۆز دەفەرمویت: "ولا تکونوا کالذین تفرقوا و اختلفوا من بعدها جاءهم البینات و اولئك لهم عذاب عظیم". سورة ئال عومران. ئایەتی ١٠٥ (ئەی موسلمانان ئیوەش مەبن بەو میللەتانەی دوای ئەوەی ئایەت و بەڵگەی رونیان بۆ هاتە خوارەوە ریگەی پەرتەوازەیی و ناکۆکی و جیاوازیان بەرنەدا، خودا ئەشکەنجەیەکی سەخت و دژواری بۆ ئەو کەسانە ئامادە کردوە).

ماوەی هەزار سالە نەتەوەی تورك بە خوینی ملیۆنان شەهیدی موجاهید ئیسلام دەپاریزیت. ئەمرۆ نەتەوەی تورك بوە بە ئامانجی دەولەتە ئیمپریالیەکان و دوژمنانی تورك و ئیسلام. بنوارە خیزانەکەت و پرسیار لە دایکت و باوکت بکە و بیرت نەچیتەوە چەند موجاهید لە پیناوی ئەم خاکەدا شەهید بون.

سوپای تورکیا گـەورەترین و یەکـەمین سـوپای جیـهانی ئیسلامە کـە خیانـەتکارانی لەناوبردوە، ئەو راستیەش دوژمنانی ئیسلام و تورکیا دەیزانن. ئەوانە لە ریگەی پـارتی کارگـەرانی کوردسـتان و دەسـتوپیوەندەکانیان هـەولدەدەن چەواشـەت بکـەن. ئاگاداربـە نەکەویتە داوی خیانەتکارانەوە.

هەروەك تیبینی دەگریت ئـەو چـوار دەقـەی سـەرەوە بـە پیـی ئایـەتی هـەلبژاردەو فەرمودەی دیاریکراو جەخت لەسەر دژایـەتی نیـوان ئیسلام و ئنتیمـاو تایبەتمـەندیتی نەتەوایەتی دەکات. لیرەدا مەسەلەکە پەیوەندی بە راڤـەکردنی ئـەهلی سـوننەوە هەیـە بۆ قورئان، هەرچـەندە راڤـەکردنی ئـەهلی شـیعەش جیاوازییـەکی زۆری لەگـەڵ ئـەهلی سوننەدا نیە، بۆ نمونە حکومەتەکەی خومەینی هەولیدەدا بـە هـەمان ئـامراز خـەباتی پارتی دیموکراتی کوردستان و رابونی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەناوبەریت.

سەرەرای ئەوەش پەیوەندی نیوان حکومەتی ئـیران و پـارتی دیموکراتـی کوردسـتان بـە سـەرکردایەتی مەسـعود بـارزانی دروشمـەکانی ئیسـلام لاواز دەکـات (هەرچـەندە گەشـەکردن و نـاوەرۆك و هۆیـەکانی ئـەو پەیوەندییـە دەزانـین بـەلام ئـەم بابەتـە لـە چوارچیوەی ئەم لیکۆلینەوەیە دەچیتە دەرەوە) لەبەرئەوەی بـەردەوام جـەخت لەسـەر دژایەتی نیوان ئیسلام و ئینتمای نەتەوایـەتی دەکـەن کـەچی لـە هـەمان کـاتدا شۆرشـی کوردستانی باشور لە دژی حکومەتی عـراق بـە رەوا دەبینـن بـەلکو زۆر جـاران شۆرشـی کورد و داوا نەتەوایەتییەکانی کورد ئاینی ئیسلام بە تەواوکەری یەکتر دادەنین.

لـە دەقـی چـوارەم بـاس لـە ئامـانجی دەولەتـە ئیمپریالیـەکان دەکــەن لـە تورکیـا و ئایدۆلۆجیای رەسمیش بەو هیزە دادەنین کە بتوانین ئەو ئامانجانـە لەناوبـەریت بـەلام هەنوکە کورد دەزانیـت دەولەتـە ئیمپریالیـەکان چـۆن ململانییـان لەسـەر دابەشـکردنی کوردسـتان دەکـردو چـۆن خـودی بریتانیـاو کەمالیـەکانی دۆسـتیان کوردسـتانیان دابەشـکرد، لەبەرئـەوە ئایدۆلۆجیـای رەسمـی نـاتوانیت ریگـە لــە رابونــی وشــیاری کورد بگریت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، دەولـەتی تورکیـا بـە هـۆی رەهـەندەکانی خـەباتی پیشـمەرگایەتی کوردستان بایەخیکی نیوەندی بە پروپاگـەندە ئاینیـەکان دەدا. دەسـتەلاتدارانی تورکیـا

لە ئابی سالی ١٩٨٩ کوردستانیان لە بلاونامەو پۆستەری ئاینی نوقوم کرد (بروانە Gunaydin, Tercuman Gunes). مەلەسەی یەکیتی و هاوکاری و چارەنوسی هاوبەش و برایەتی ناوەرۆکی ئەو بلاونامەو پۆستەرانە بون. بەلام کاتیك دەستەلاتداران گوو دەرخواردی گیراوە سیاسیەکان دەدەن ئیتر چۆن یەکیتی و هاوکاری دیتە دی؟ ئایا کوشتنی جوتیاران بە بیانوی تیرۆریست و سوتاندنی تەرمەکانیان بۆ ئەوەی بەلگەی تاوانەکانیان بسرنەوە، یەکیتی و هاوکاری دیتەدی؟ دەستەلاتدارانی تورکیا لە لایەك پروپاگەندە بۆ هەستی ئاینی دەکەن و لەلایەکی دی گوو دەرخواردی زیندانیەکان دەدەن و جوتیاران دەکوژن و تەرمەکانیان دەسوتینن و ریگە نادەن هەوالەکانیان بلاوبکریتەوە. ئایا ئیسلام لەسەر ئەو کردەوانە چ دەلیت؟

٥-پیویستە زیاتر لە زاراوەی "نیونەتەوەیی" وردبینەوە. سالی ١٩٧٤ لە عراق شەری نیوان کۆلۆنیالیزمی عەرەب و کورد هەلایسا. کوردەکانی باشوری کوردستان دژی رژیمی سەدام حوسەین شۆرشی رزگارییان بەرپاکرد. پیشمەرگە کوردەکان دوو فرۆکەی میك-یان خستە خوارەوەو یەکیك لە رۆژنامەکانی تورکیا وینەی فرۆکەکانی بلاوکردەوە کە منالانی کورد لە نزیکەوە تەماشایان دەکرد. بە راستی وینەیەکی خەماوەر بوو. ئایا ئەو منالانەی سەیری پارچە فرۆکەکانیان دەکرد بیریان لە چ شتیك دەکردەوە؟

ئەو دوو فرۆکە میکەی کوردستانیان دەسوتاند و روبارو دەریاچەکانیان ژەهراوی دەکرد و پیکهاتەی کیمیایی زەوییان دەگۆری، دەستکردی بەهیزترین دەولەتی سوسیالیستی جیهان بوون. ئەو فرۆکانەی دارستان و کیلگەیان دەسوتاند و خانوبەرەو بەربەستیان خاپور دەکرد و ئاژەل و بالندەیان دەکوشت تەمسیلی تەکنۆلۆجیایەکیان دەکرد زۆر بیبەزەییانە دژی منال و ژن و پیری کورد بەکاردەهینران.

ئەو منالانەی ئەو دەمە تەمەنیان لە نۆ سال کەمتر بو، ئەمرۆ پیشمەرگەی کوردستانن، ئایا ئەو کەسانە چۆن تەماشای ئەو کۆمەك و هاوکارییە دەکەن کە یەکیتی سۆڤیت پیشکەشی رژیمی کۆلۆنیالیزمی فاشیستی رەگەزپەرستی بەعسی دەکرد؟ تەقینەوەی سەدان بۆمبی کریکارانی سۆڤیت بەسەر خەلکانی کەساسترین نەتەوەی سەرزەمین واتە نەتەوەی کورد چۆن لیکبدەینەوە؟

نەتەوەی کورد چۆن بەشداری لە خەباتی چینی کریکارانی ژاپۆن و ئەلمانیاو ولاتە عەرەبیەکان و تورکیا بکات؟ کورد نەتەوەیەکی دابەشکراوەو مافە نەتەوایەتیو دیموکراتییەکانی لیزەوتکراوەو زۆر بیویژدانانە سامانە سروشتییەکانی بە تالان دەبریّ. کورد نەتەوەیەکە لە پیناوی مانەوەیدا شەری چەکی کیمیایی دەکات کەواتە کاتیك نەتەوەی کورد ژن و منالّ و گەنج و پیرەکانی کیمیاباران دەکریت و بە کۆمەل لە ئۆردوگای پەنابەران دەژین چ پشتگیرییەکی یەکیتی سۆڤیت و کۆماری چینی میللی و ئەلبانیاو ڤیتنامی بۆ دەکریّ، ئەمە لە کاتیکدا ئەگەر ئەو ولاتانەو چینی کریکارانی پشتگیری خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد بکەن رەنگە کاریگەرییەکی بنەرەتی و هەست پیکراوی لەسەر کورد هەبیت.

سالی ١٩٨٨ عیراق زۆربەی ناوچەکانی باشوری کوردستانی کیمیاباران کرد. رۆژانی ١٦ و ١٩٨٨/٣/١٧ هەلەبجەو رۆژانی ٢٣-٢٥/ ئاب/ ١٩٨٨ ناوچەکانی ئامیدی و بادینانی کیمیاباران کردو زیاتر لە (٣٠) پسپۆری سۆڤیت لە کارگەکانی بەرهەمهینانی چەکی کیمیایی کاریان دەکرد، بۆیە کاتیك کوردەکان پییان زانی داوایان لە یەکیتی سۆڤیت کرد پسپۆرەکانی لە عیراق بکشینیتەوە. رۆژنامەی "الشرارة" کە زمانحالی یەکیتی نیشتمانی کوردستانە لە ژمارە (٣)ی نیسانی ١٩٨٨ لیستیکی بە ناوی (٣٠) پسپۆرەکەی یەکیتی سۆڤیت بلاوکردەوە کە لە کارگەکانی بەرهەمهینانی چەکی کیمیایی عیراق کاریان دەکرد، بەلام سۆڤیت داواکەی کوردی پشتگویّ خست. رۆژنامەی پراڤداری سۆڤیتی لە رۆژی ١٩٨٨/٩/١١ نوسیویتی "ئەمریکا ئیدعای بەکارهینانی چەکی کیمیایی دەکات"، ئەمە لە کاتیکدا وەزیری بەرگری عیراق عەدنان خەیروللا تولفاح لە رۆژی ١٩٨٨/٩/١٥ لە بەغدا وتی: "چەکی کیمیایی بە مەبەستی بەکارهینان دروستکراوە" (Medya Gunese ژمارە ٧ و Amegun Bayrayi، تەموزی ١٩٨٨).

بەرهەمهینانی چەکی کیمیایی و بەکارهینانی دژی میللەتیکی چەوساوە چۆن لەگەلّ بیری سوسیالیزم و چەمکی نیونەتەوەییدا دەگونجیت؟

ئەوانە جگە لە کورد میللەتیکی دی شك نابەن بەردەوام چەمکی نیونەتەوەییان وەبیر بهیننەوە "پیویستە ئەرکە نیونەتەوەییەکانتان بیرنەچیتەوە"، ئایا چینی

کریکاران و ئەو دەولەتانەی ئیدعای سوسیالیزم و کۆمۆنیزم دەکەن پابەندییکی نیونەتەوەییان بەرامبەر بە کورد نیە؟!!

ئایا هیچ ئاسەواریك یا نیشانەیەك یا هەوالیك هەیە بەلگە بیت لەسەر ئەوەی چینی کریکارانی تورکیا پشتگیری لە خەباتی رزگاری نەتەوەیی و دیموکراتی کورد دەکات؟ کەواتە لەم حالەتەدا چەمکی نیونەتەوەیی چ مانایەك دەگەیەنیت؟

لە لایەکی دی پیویستە بابەتیانە و بەدەر لە کاریگەری دروشمەکان لیکۆلینەوە لەسەر پیادەکردنی چەمکی بریاری مافی چارەی خۆنوسینی گەلان لە یەکیتی سۆڤیت و ولآتانی ئوروپای رۆژهەلآت بکەین. هەروەها پیویستە زۆر بابەتیانە لیکۆلینەوە لەسەر کیشەکانی ناوەوەی یەکیتی سۆڤیت بکەین وەك کیشەکانی نیوان کۆماری ئەرمینیاو ئازەربایجان و مەسەلەی قەرەباغ و ململانیی ئەتنی و مشتومر و کیشمەکیشی جۆرجیا و کۆمارەکانی دیو کیشەی نیوان کۆمارەکانی بەلتیق و مۆلداڤیاو کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست و پرۆسەی تواندنەوەی کەمایەتی تورکی بولگارستان و خاپورکردنی گوندەکانی هەنگاریا لە رۆمانیاو لەناوبردنی ناسنامەی نەتەوایەتیان. هەروەها پیویستە لیکۆلینەوەی تیروتەسەل لەسەر ململانیی نیوان سرب و ئەلبانەکانی ناوچەی کۆسۆڤوی نزیك بە سنوری یوگسلافیاو ئەلبانیا بکەین، سەرباری لیکۆلینەوەی مەسەلەی مەکدۆنیا بۆ ئەوەی بزانین ئەو دەولەتانە چۆن پرەنسیپی بریاری مافی چارەی خۆنوسینی گەلانیان پیادە کردوە.

٦-بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بەکارهینانی ئەم چەمکە بروانە

**(Alprslan Turkes, Temel Gorusler, Dergah Yayinlari, 3. Bs, Istanbul, 1976, s. 35).**

**Turhan Feyzioglu, Milliyiet, Dergah Yayinlari, Istanbul 1975, s. 243-250.**

**Ahmet Kabakle, Komsu Hakki, Tercuman, 6.10. 1985.**

**Ahmet Kabakl, Esraiya Aicaktir, Tercuman, 12-13-10. 1985.**

**Ilhan Bardakcl, Gukurdaki Kahpe, Tercuman, 13-10-1984.**

**Ergun Goze, Hakkari'den ingitereye Kader, Yahut Yalan cinin Mumu, Tercuman, 15. 10. 1984.**

**Coskun Kirca, Milli Birlik ortami, Hurriyet, 6-3-1987.**

**Coskun Kirsse, Diller, Dileikler, Hurriyet, H-3-1987.**

**Rauf Tamar, Bu Adam Ne Diyor? Tercuman, 7-1-1985.**

**Rauf Tanar, Tepkiler, Tercuman, 12-1-1985.**

**چوشکون قیرجە Coskun Kirca لە وتارەکەی سەرەوەیدا بە ناوی Milli Birlik or tami بە ئاشکرا جەخت لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکات: "جوداخوازو لایەنگرەکانیان، ئەوانەی داوای قەوارەیەکی سەربەخۆ دەکەن نوشستی دەهێنن و هەر خۆشیان دەگەنە ئەو باوەڕەی هیچ کەسیك جگە لە تورکبون و توانەوەی لە پرۆسەی تەتریك ریگەیەکی دی بۆ نامینیتەوە". هەر هەمان نوسەر لە نوسینیکی دی بە ناوی Diller Dilcikler دەلیت: زمانی کوردی زمانیکی زۆر سەرەتاییە و لە ناوچونی ئەو زمانە یەکیکە لە پیداویستیەکانی مەدەنییەت. سەرباری ئەوەش تەتریك کردن بۆ ئەم زمانە زەرورییەو خزمەتی دەکات.**

**٧-گەلیك جار بۆ ئەوەی رۆلی ئەسپ لە شەری نیوان داگیرکەرانی ئسپانی- پورتوگالی و دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکە رونبکریتەوە ئاماژە بەم تراجیدیایە دەدریّ: کاتیك هەردوو هیزە شەرکەرەکە لە مەیدانی جەنگ روبەروی یەکتر دەبنەوە، لە سەرەتای شەرەکە یەکیك لە سەرکردەی خیلەکان پەلاماری سەرکردەی داگیرکەران دەدا کە بە خۆی و چەك و شمشیرەکەیەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی بو. سەرکردەی خیلەکە ئەسپەکە بریندار دەکات و سەرکردەکەش لەسەر پشتی ئەسپەکە دەکەویتە خوارەوە بەلام خیرا هەلدەستیتەوەو لولەی تفەنگەکەی دەکاتە پەلاماردەرەکە- لەو ساتەدا سەرکردەی خیلەکە بە حەپەساوی ئەم پرسیارە لە خۆی دەکات.. چۆن هەستایەوە، هەر ئیستا من کوشتم و کەوتە سەرزەوی، ئەی کەواتە ئەو کەسەی بەرامبەرم راوەستاوەو دەیەویت شەرم لەگەلدا بکات کییەو لە کویوە هاتوە؟ سەرکردەی خیلەکە دەگاتە ئەو باوەرەی ئەوەی بەرامبەری راوەستاوە مرۆڤ نیە بەلکو خوداوەندە بۆیە یەکسەر چەکەکەی دەستی فریدەداو کرنوش بۆ سەرکردەی داگیرکەرەکان دەبات و دوابەدوای ئەویش سەرکردەو جەنگاوەرەکانی دی کرنوش بۆ سەرکردەی داگیرکەران**

دەبــەن ئیــتر دەبیتــە گــەرەلاوژێ و تــرس و سەرســامی هــەمویان دەگریتــەوە داگیرکەرەکانیش ئەم دەرفەتە دەقۆزنەوەو هەمویان لەناودەبەن.

پوختەی مەسەلەکە ئەوەیە سەرکردەی خیلەکە تا ئەوکاتە ئەسپی نەدیبو بۆیە وا دەزانیت ئەسپ و سوارەکەی سەری یەکشتن. کاتیك سەرکردەی خیلەکە ئەسپەکە دەکوژیت بەلام سوارەکە دەبینێ ئامادەیە شەری بکات ئیتر دەگاتە ئەو باوەرەی شەری کەسیکی پیرۆز دەکات و بەرامبەر بە خوداوەند هیچی پیناکریت. بروانە:

Eduardo Galeano: Lasvenasabiertasde Americalatina, La Habana, Casade Las Amricas, segunda (edicion, 1979, p. 38).

٨-بروانە ئەو دادگاییکردنەی پەیوەندی بە کۆمەلەی (٤٩) هەیە (گۆڤاری میدیا گوینئیشی Medya Gunesi، رۆژی ١/٤/١٩٨٨، ژمارەی یەکەم، ل ٤٧). فەوزی بیلگە (Fevzi Bilge) لە وتاریکیدا بە ناوی "بەشیك لە میژوی سیاسیمان" ناوی هەر (٤٩) کەسەکەی نوسیوە بەلام لیستەکە ناوی شەرەفەدین ئەلچی Serafettin Elci تیانیە کە ئەندامیکی کۆمەلە بو، بەلکو لە جیاتی ئەلچی ناوی کەسیکی دی دوو جار دوبارە بۆتەوە.

دکتور ناجی کوتلای- Nacikutlay. ئەندامیکی کۆمەلەی (٤٩)ە وتاریکی لەسەر کۆمەلەکە نوسیوە، ناجی لە وتارەکەیدا دەلیت پیویستە لیکۆلینەوەیەکی جیدی لەسەر کۆمەلەی (٤٩) بکرێ (بروانە گۆڤاری Beryeh، رۆژی ١/١٩٨٩، ل ٢٩-٤١). Bergeh گۆڤاریکی کوردی- تورکیەو لە سوید دەردەچیت.

٩-بروانە ئەو دادگاییکردنەی پەیوەندی بە کۆمەلەی (٢٣) هەیە.

(Bir Kurt, Devrimcisi Edip Karahan in anisina, Komal Yayinlari, Istanbul 1997. pp-89-136).

١٠-سالی ١٩٦٨ چاپی یەکەمی داستانی مەم و زین لە وەرگیرانی مامۆستا محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان Mehmet Emin Bozarslan کەوتە بەر دیدەی خوینەران (ئەستەنبول Gun Yayinevi). دەقە کوردی و وەرگیراوە تورکییەکەی لە یەك لاپەرەدا بەرامبەر بە یەك چاپکرابو بەلام ئەو دوازدە بەیتە شیعرەی کە بابەتی لیکۆلینەوەکەی ئیمەیە چاپنەکرابو زۆرم پێ خۆش بو ئەو دوازدە بەیتە لەم کتیبە بنوسمەوە بەلام لەبەر دەستم نەبو بۆیە هیوادارم ئەم یادەوەرییە هیندیك لایەنی مەسەلەی کورد رون بکاتەوە.

لە هاوینی ١٩٧١ لە کاتی حوکمی کودەتاکەی ١٢/ ئازار لە گرتوخانەی سەربازی دیاربەکر بوین و محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان-یش یەکێك بو لەو زیندانیانەی بە تۆمەتی پەیوەندی بە یانەی کولتوری شۆرشگێر لە رۆژهەڵات گیرابو.

پاش نیوەرۆیەکیان داواکاری گشتی سەربازی بۆز ئەرسەلانی بانگ کردو ماوەی دوو کاتژمێر لەلای خۆی گلیدایەوەو لە کاتی گەرانەوەیدا هاتە لام و پیی وتم: "جاریکی دی لیکۆلینەوە لەسەر دۆسیەی مەم و زین دەکەن بەڵام ئەمجارەیان خودی داواکاری سەربازی لیکۆلینەوەکە دەکات و منیش بە هۆی بەشی پینجەم (دەردەکانمان) و بەشی شەشەم (بۆچی مەم و زین بە زمانی کوردی نوسراوە) تاوانبارکرام کە بانگەواز بۆ کیشەی کورد و جوداخوازی دەکات و هەستی نەتەوایەتی تورك بریندار دەکات.

ئەمینی لەسەر قسەکانی بەردەوام بو: "پیم وتن بانگەوازم بۆ هیچ کیشەیەك نەکردوە، ئەگەر بانگەوازم بکردایە ئەو دوازدە بەیتە شیعرەشم بڵاودەکردەوە بەڵام هەروەك لە کتیبەکە تیبینی دەکرێ تەنها نوقتەم بۆ داناوە، ئەمەش مانای ئەوەیەو ویستومە خۆم لە کیشە بە دور بگرم. لە وەڵامدا پییان وتم: "ئەمەیان راستە، ئیمە زۆر باش ئەمە دەزانین، هەروەها ئەوەش دەزانین ئەو کتیبەی پیشکەش ئیسماعیل بیشکچیت کردوە بە دەستوخەتی خۆت ئەو دوازدە بەیتە شیعرەت بۆ نوسیوە"، بەڵام نکۆلیم لیی کرد، ئنجا کۆپی کتیبەکەیان پیشاندام و دیسانەوە نکولیم لە دەستوخەتەکەی خۆم کردو دواتر شیعرەکەیان بە دەست و خەتی خۆم پێ نوسیمەوە و رەوانەی دائیرەی لیکۆلینەوەی سزادانیان کرد.

ئەو کتیبەی بۆزئەرسەلان پیشکەشی کردبوم رەوانەی زانکۆی ئەتاتورك-ی کردبو لە شاری ئەرزروم چونکە لەوێ مامۆستا بوم. پیاوانی ئاسایش زەرفەکەیان کردبوەوەو تەنها ئەو لاپەرانەیان کۆپی کردبو کە بە دەستوخەتی خۆی نوسیبوی و پاشان نامەکەیان داخستبوە.

ئەو دوازدە بەیتەی بڵاونەکرابوەوە بە شیوازیکی زۆر نایاب و سەرنج راکیش داریژرابون.

له دوای ماوەیەکی کورت دادگای رۆژنامەنوسی ئەستەنبول له بارەی بڵاوکردنـەوەی کتیبەکه لیکۆلینەوەی خۆی دەست پیکرد بەلام دوای تویژینەوەیەکی دورو دریـژ دادگا بریاریدا دۆسیەکه دابخات.

سـالی ١٩٧١ لەوکاتـەی لیکۆلینـەوەیان لەگـەلم دەکـرد سـەرۆکی زانکـۆی ئـەتاتورك و هیندیـك لـه راگـری کۆلیـج و مامۆسـتاکان شـاهیدییان لەسـەرم دەدا. سـەرۆکی زانکـۆ پرۆفیسۆر کەمال بایکئوغلو Kemal Biyiloglu بەمشـیوەیه وەلامـی پرسـیاریکی دادوەری لیکۆلینەوەکـەی دایـەوە: "بـه ئـەرکی سەرشـانی خۆمـم دەزانـی چـاودیری نامـەکانی ئیسماعیل بیشکچی بکەم چ ئەو نامانەی پۆستی دەکرد یا ئەو نامانەی بۆی دەهات".

ئەمه لایەنیکی روداوەکه بو بەلام لایەنی دوەمـی روداوەکـه بـه راسـتی تراجیدییـه. له کاتی قسەکانمان بۆز ئەرسـەلان پیـی وتم: "باشـتر وایـه نامەیـەك رەوانـەی ئەنقـەره بکـەیت و بـه شـیوازیك تییـان بگەیـەنیت ئـەو کتیبـه لـه کتیبخانەکـەت لابـەرن و لـه جیگەیەکی دی بیشارنەوه بۆ ئـەوەی نەکەویتـه بەردەسـتیان لەبەرئـەوەی لەوانەیـه لـه رۆژانی داهاتوودا مالەکەت بپشکنن. منیش یەکسەر به قسەیم کرد.

لـه ناخـەوە پیـم وابـو شـتەکان ریگـەی ئاسـایی خـۆی گرتۆتەبـەر تویژینەوەکـه ماوەیـەکی دورو دریـژ دەخایـەنیت و پاشـان دۆسـیەی کیشـەکه دادەخـەن. بـەلام بـۆز ئەرسەلان لەسەر یانەی کولتوری شۆرشگیر له رۆژهەلات لیکۆلینەوەیان لەگەڵ دەکرد.

له تەموزی ١٩٧٤ به لیبوردنیکی گشتی ئازاد کرام و گەرامەوە بۆ مـالی خۆمـان و لـه کاتی ریکخستنی کتیبخانەکەم تیبینیم کرد ژمارەیەك کتیـب و لەتـه رۆژنامـەو پارچـه گۆڤـار دیارنـەمابو کـه پـەیوەندی بـه کوردسـتان و کۆمەلگـەی کـودەواری و زمـانی کوردییەوە هەبو. کاتیك له خیزانەکەم پرسـی پیـی وتم: "سـالی ١٩٧٢ کـاتیك نامەکەتم پیگەیشت ترسیکی زۆرم لینیشت و وامدەزانی یەکسەر مالەوە دەپشکنن بۆیه تەنها ئەو کتیبانـەم نەسـوتاند کـه نـاوت هینـابون بـەلکو هـەمو ئـەو کتیـب و لەتـه رۆژنامـەو گۆڤارانەشم سوتاند پەیوەندییان به کوردەوە هەبو" کەچی مالـەوەیان نەپشکنی بـەلام من هیمنی خۆمم له دەستدا.

لـە مـاوەی کودەتاکـەی ١٢/ ئـازاری/ ١٩٧٩ و ١٢/ ئـەیلول گـەلیك کتیـب و ڕۆژنامــەو گۆڤارم لە کیس چو کە سەرچاوەیەکی گرنگی لیکۆلینەوەکانم بو. بەشیکی پۆلیس دەستی بە سەرا گرت بەلام زۆربەی بوە قوربانی ئەو ترسەی بالی بەسەر مالەکەمدا کیشابو بۆیە ئەو بەلگەنامـە بەنرخانەی لە کیسم چوە مەحالە بتوانم لە لیستیکدا ریزیان بکەم. هەر کاتیك قسە لەسەر مەم و زین و پۆلیس بکریَ هەمیشە ئەو روداوەم بیردەکەویتەوەو دلم بۆ ونکردنی ئەو گەوهەرە بە نرخەی مەم و زین دەگوشریت. پاشان زۆر بە پەرۆشەوە کەوتمە گەران بە دوای ئەو دوازدە بەیتەداو داوای یارمەتیم لە برادەرەکانی خۆم کرد بەلام دەستم نەکەوتەوە.

لە ناکاو رۆژیکیان بیرم کەوتەوە کتیبەکەی مەم و زین-م دابو بە یەکیك لەو برادەرانەی خۆم کە گرنگی بە لیکۆلینەوە دەدا تا سەرنج و دیدو بۆچونەکانی خۆیم لەسەر کتیبەکە پیَ بلیت بەلام دوای خویندنەوەی بریاریدا خۆی لیکۆلینەوەی لەسەر بکات و کتیبیکی مەم و زین-ی بە زمانی کوردی بەهەر دوازدە بەیتەکە دەستکەوتبو، ئەو دوازدە بەیتەی لە وەرگیرانەکەی بۆزئەرسەلان نەبو. ئەو دوازدە بەیتەو وەرگیراوە تورکییەکەی بۆ رەوانە کردم. ئەو دوازدە بەیتە لە سیاقی داستانەکەی مەم و زین بەمشیوەیەی خوارەوە بو:

**کول و دەردیَ مە کوردا**

| | |
|---|---|
| گە رویَ هەبویا مە پادشاهەك | ظاهیر ڤەدبو، ژبۆمە بەختەك |
| حاصل بیویا ژ بۆ وی تاجەك | ئەلبەتە دبو مەژی رەواجەك |
| غەم خواری دکر ل مەیەتیمان | تینانە دەریَ ژ دەست لە ئیمان |
| غالب نەدبو ل سەر مەئەڤ روم | نەدبونە خرابەیَ د دەست بوم |
| مەحکومیَ عەلییەو صەعالیك | مەغلوب موطیعی تورك و تاجیك!! |
| ئەمما ژ ئەزەل خودیَ و ساکر | ئەڤ روم و عەجەم لسەر مەراکر |
| تەبەعییەتی وان ئەگەرچی عارە | ئەو عارە ل خەلقی نامدارە |
| ناموسە ل حاکم و ئەمیران | تاوان چیە شاعیر و فەقیران؟ |

ئەڤ قولزومێ روم و بەحرى تاجيك — هندى كوبكن خروج و تەحريك
كورمانج دبن ب خون موله ططەخ — وان ژيك ڤەدكن ميثالى بەرزەخ

گەردێ هبووا مە ئيتيحادەك — ڤيكرا بكرامە ئينقيادەك
روم و عەرەب و عەجەم تەمامى — هەميان ژمەرا دكر غولامى

## تێبینی:

له وەرگێرانی ئەم شیعرانەدا پشتم بەستووە بە دەقە فەرەنسیەکەوەو لەگەڵ دەقە ئسپانییەکەدا بەراوردم کردوەو گەراومەتەوە سەر وەرگێرانیکی د. عیزالدین مصطفی رەسول لە کتیبی (ئەحمەدی خانی شاعیرو بیرمەندو فەیلەسوف" کە لە چاپخانەی (الحوادث) چاپ کراوە سالی ١٩٧٩، هەروەها ئاگادار بووم لەسەر لیکۆلینەوەیەکی رەشید فەندی لەسەر خانی. (وەرگیر).

١١-لە دوای چاپکردنی داستانی مەم و زین کتیبیکی دی بە زمانی تورکی بە هەمان ناونیشان لەگەڵ دەستکارییەکی بچوك (مەموزین) کەوتە بازارەوە. ئەم کتیبە نوسەرەکەی ناوی ئەحمەد فایەق بو. ئەم نوسەرە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە مەموزین بەشیکە لە کەلەپوری کۆنی تورك بروانە:

(Sirri Dadas Bilge, Istanbul, 1969 D. VII).

و داستانەکەش لە ناوچەی جزیرە رویداوە بەڵام نوسەر بە هیچ جۆریك باسی ئەحمەدی خانی نەکردوە. نوسەر پەنای بۆ میژونوسی تورك (فەخرەدین کیرز ئوغلو Fahrettin Kirzioglu) بردوەو دەلیت: ئەو خیلە تورکانەی پییان دەوترێ بۆتان لە سەردەمی داریوش دا لە ناوچەی جزیرە ژیاون و کەناری رۆژهەلاتی روباری دیجلەش بە ناوی ئەو خیلانە ناونراوە.

ئەم کتیبە هەر زوو لە بازار کۆکرایەوە. پیم وایە هەوالگری تورکیا لە پشت بلاوکردنەوەو کۆکردنەوەی ئەم کتیبەوە بوو. ئەمەش نمونەی ئیمپریالیزمی کولتوری

دەولەتی تورکیایە بەرامبەر بە کوردستان، رەنگە بەراوردکردنی دەقە ئەسلی و دەقە ساختەکە کاریکی شیاو بیت بۆ ئەوەی زانیاریان لەسەر سروشت و شیوازەکانی شیواندنی کەلەپوری کورد هەبیت.

١٢-ئەم پرۆسەیە بە دیویکی دی ئیعتباراتی پۆزەتیڤی هەیە. بۆ نمونە، ئەو پیشمەرگانەی لە کاتی روبەروبونەوە لەگەڵ هیزە چەکدارەکانی تورکیا گیان لە دەست دەدەن میللەت بە شەهیدیان لە قەلەم دەدا بۆیە دەبینین لە هەمو شاریك گۆرستانیکی تایبەت بە شەهیدان هەیە کە بەریورەسمیکی پرشکۆ تەرمی گەریلاکانی تیا بە خاك دەسپیردریّ. سەرەرای ئیجاراتاتی گرتن و تۆقاندنی پۆلیس و سوپا لە دژی خەلکی بۆ ئەوەی بە ریزو شکۆمەندی دزو جەردەکان بە خاك نەسپیردریت و پرسەیان بۆ دانەنریت کەچی هیندیك جار پرسەی شەهیدان چەندین هەفتە دریژە دەکیشیّ. هەروەها دەزگاکانی دەولەت دەیانەویت هاولاّتیان بە هیچ جۆریك بایەخ بە تەرمی گەریلا کوژراوەکان نەدەن تا لەسەر بیباکی خەلکی بەرامبەر بە تەرمی گەریلا کوژراوەکان و پشتگیری نەکردنی جەماوەر لە هیزی پیشمەرگە بەلگەیەکیان بە دەستەوە بیت، لەگەڵ ئەوەشدا خەلکی بەشداری بە خاکسپاردن و پرسەی پاسەوانی گوندەکان ناکەن و خودی خیزانی کوژراوەکان سکالاّ لەو وەزعە دەکەن و بە زمانی خۆیان دەلین: کەس بایەخ بە مردوەکانمان نادات.

لە باشوری کوردستان ئەو کەسانەی خیانەت لە میللەتی کورد دەکەن پییان دەوتریّ جاش بۆیە پیویستە وشەی جاش لیکۆلینەوەی لەسەر بکریّ.

لە واقیعدا بیرۆکەی ئەم ناولینانە لە دیاردە سروشتیەکانەوە سەرچاوەی گرتوە. کاتیك جاشەکەریك دەچیت بۆ لەوەر لە دایکی جیادەبیتەوە ئیتر ناگەریتەوە و تیکەل بە ئاژەلەکانی دی دەبیت بۆیە هەولدەدا لە ئەسپ و هیسترەکان نزیك بیتەوە بەلاّم دەکەیتە بەر پیّ لەقەیان یا ئەگەر بە تەنیشت گاگەلەوە بروات دەکەویتە بەر شاخە تیژەکانیان لەبەرئەوە لەگەڵ مریشك و مانگا دەلەوەریت، واتە هەمیشە لە دایکی دور دەکەویتەوە.

١٣-بڕیاری رزگارکردنی دایکیان دەدەن و بە رزگارکردنی دایکیان شەر لە نێوان مولکدارە گەورە و شێخ و بازرگانە بچوك و خێل و ئەو حاکمەی دایکیانی بە دیل گرتوە، هەلدەگیرسێت بەلآم تا شەرەکە کۆتایی نەیەت دایکیان رزگاری نابیت. ئەفسانەی شاری ژین زۆر دورو درێژەو زۆر زەحمەتە لێرەدا کورت بکرێتەوە چونکە لەهەر بەشێك لە بەشەکانی ئەم داستانە هەستیکی نەتەوایەتی بێگەردو پرجۆش و خرۆش دەبینرێ، ئەمە سەرباری هێندێك هەلویستی شۆرشگێرانە دەبینرێ چونکە سەرپێچی کردن لەم داستانە شتیکی ئاساییە.

١٤-لەبەرئەوەی ئەسلی کورد بۆ گۆتی و مادەکان دەگەرێتەوە بۆیە لێکۆلینەوە لەسەر مێژوی کورد و سروشتی پەیوەندی نێوان گۆتی و ئاشوری و گەلانی ئۆراتوو مادەکان گرنگی تایبەتی خۆی هەیەو پەیوەندییەکی توندوتۆل لە نێوان ئەرمەن و ئورارتەکان هەبوو.

١٥-دوای ئەوەی ئاگربەستی عراق-ئێران لە ١٩٨٨/٨/٢٠ راگەیەنرا، عراق بە ماوەیەکی کورت باشوری کوردستانی کیمیاباران کرد. لە گەورەترین پرۆسەی جینۆساید هەزاران کەس لە باشوری کوردستان بون بە قوربانی ئەم چەکەو بە سەدان هەزار کەسیش بەرەو سنوری ئێران- تورکیا رایانکرد. ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە هۆی بنکەی سەربازی و ویستگەی راداری لە هەریمەکە دەیتوانی بەلگەی تەواو لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بخاتەروو بەلآم لە جیاتی ئەو کارە ئەنجومەنی پیران نارەزایی دەربری و سزای بەسەر عراق دا سەپاند (رۆژنامەی جومهورییەت، رۆژی ١٩٨٨/٩/١١) حکومەتی عراق نکۆلی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کردو بارزانی و تالەبانی-یش بە خائین لە قەلەم دا.

حکومەتی تورکیا بەیاننامەیەکی بلآوکردەوە کە تییدا هاتوە: "تورکیا دوای ئەوەی لیکۆلینەوەی لەسەر خاکی عراق ئەنجامدا هیچ بەلگەیەکی لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەست نەکەوت (رۆژنامەی میللیەت، رۆژانی ١٤-١٩٨٨/٩/١٥).

هەروەها (١٢) دەولەتی ئوروپی داوایان لە نەتەوە یەکگرتوەکان کرد بە مەبەستی لیکۆلینەوە تیمیکی پسپۆر رەوانەی باکوری عراق بکات و نەتەوە یەکگرتوەکانیش

لەلای خۆیەوە عیراقی لەم داواکارییە ئاگادارکردەوە بۆ ئەوەی ریگـە بـە تیمیکـی پسـپۆر بدات لە باکوری عیراق لیکۆلینـەوەی پیویست ئـەنجام بـدات (رۆژنامـەی جومهورییـەت، رۆژی ١٩٨٨/٩/١٤)، بـەلام عـراق بـە بیـانوی "دەسـتیوەردان لـە کاروبـاری نـاوخۆی ولات" پاداشـتنامەکەی نەتـەوە یـەکگرتوەکانی رەتکـردەوە. عـراق بـەیانیکی رەسمـی دەرکــردو تییدا ئاماژە بە "لیکۆلینەوەکەی تورکیا دەکات کە هیچ بەلگەیەکی لەسەر بەکارهینانی چـەکی کیمیـایی دەســت نەکــەوتوە" (رۆژنامــەی جومهورییــەت، رۆژی ١٩٨٨/٩/١٥). هەروەها تورکیاش داواکاری تیمیکی پسپۆری بۆ ئازمـایش کردنـی پەنابـەرە کوردەکـانی لە تورکیا رەتکردەوە (رۆژنامەی میللیەت، رۆژی ١٩٨٨/٩/١٦).

تورکیـا دەیـوت پزیشـکە تورکــەکان ئازمایشــی پیویســتیان ئــەنجامداوەو هیــچ بەلگەیەکیان لەسەر بەکارهینانی چەکی کیمیـایی لـە دژی کـورد دەسـت نەکـەوتوەو بـە بیـانوی بروانــەبون بــە توانــاو لیـهاتوی پزیشـکەکان رەتیکـردەوە پزیشـکی نەتــەوە یەکگرتوەکان ئازمایش لەسەر کوردەکان بکات.

لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٨٩ حکومەتی بولگارستان تورکەکانی بولگاریای ناچـارکرد ولات بەجێ بهیلن، لەو سەردەمەدا حکومەتی تورکیـا ئیدعـای دەکـرد "دەسـتەلاتدارانی بولگارستان تورکەکانیان بە سیرەمیکی (مصل) نەزانراو کوتاوە" بۆیە داوای لە تیمیکـی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد لیکۆلینەوە لە تورکیاو بولگارستان بکەن و هـەر بـە فیعلیـش تیمەکــە لــە هــەردوو ولاتەکــە لیکۆلینــەوەی کــرد و بەمــەش دۆســیەی "سیرەمی نەزانراو" داخرا.

دوورویـی نزمـترین رەوشـتی مرۆڤـە. تورکیـا لـە لایـەك سـورە لەسـەر "کەرامـەتی پزیشکە تورکەکان" و لیکۆلینەوەی تیمیکـی نەتـەوە یـەکگرتوەکان رەتدەکاتـەوە، بـەلام هەر خودی تورکیا داوا لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەکات تیمیك بۆ ئازمایشـی تورکـەکانی بولگارسـتان رەوانـە بکـات. تورکیـا لـەم حالەتـەدا گومـان لـە توانــاو لیـهاتویی پزیشـکە تورکەکان دەکات.

هەلویستی تورکیـا بەرامبـەر بـە پەنابـەرە کوردەکـان زۆر رون و ئاشـکرایە: تورکیـا بەدەست تیکەلاوکردنی لەگەل رژیمی عیراق روی دزیو و ناشیرینی عیراق دەشاریتەوە.

١٦-نكۆلی كردن له ناسنامەی نەتەوایەتی كورد و لەناوبردنی ناسنامەی كوردستان گرنگترین جیاوازییە كوردستان له كۆلۆنیە كلاسیكیەكانی دی جیادەكاتەوە. رۆژانە ئەم جیاوازیە دەبینین.

رادیۆو تەلەفزیۆنەكانی توركیا بەم دەستەواژانە باسی پەنابەرە كوردەكانی توركیا دەكەن: "ئەو عراقیانەی له توركیا داوای پەنابەریتی دەكەن" و "ئەوانەی له باكوری عراقەوە هاتون" و "پەنابەرە عراقیەكان" و .. هتد. بەڵام هەرگیز باسی كورد ناكەن، چونكە ئەگەر قسە لەسەر كورد بكەن دان به ناسنامەی كوردا دەنین.

نوسەری باشوری ئەفریقیا J.M. Coetzee چیرۆكیكی بە ناوی "لە چاوەروانی بەربەرییەكان"دا بلاوكردۆتەوە تییدا پەیوەندی نیوان كۆمەڵگەی كۆلۆنی و فەرمانرەوا سپییپیستەكان چارەسەر دەكات.

ئەم چیرۆكە باس له دانیشتوانی گوندیك دەكات یا بە شیوەیەكی دیاریكراو باس لە كۆمەلیك كۆچەری دەكات بە بیانوی پشتگیریكردن له گەریلاكان دەیانگرن. گیراوەكان بۆ سەربازگەیەك دەگویزنەوەو لەویٚ زۆر درندانە ئەشكەنجەیان دەدەن بۆ ئەوەی ئیعتراف لەسەر پەیوەندی نیوان خۆیان و گەریلاكان بكەن بەڵام گوندنشینەكان ورتە ناكەن بۆیە ژمارەیەكی زۆریان لەژیر ئەشكەنجە گیان له دەست دەدەن و ئەوانی دی بە سەختی بریندار دەبن.

باوك و كچیك له نیو گوندنشینە گیراوەكان دەبن، له كاتی لیكۆلینەوە باوكەكە لە پیش چاوی كچەكەی دەمریت و تەرمەكەی بۆ چەند رۆژیك لە تابوتیكدا لە بەردەم كچەكەی بەجیٚ دەهیلن، ئنجا دەست دەكەن بە ئەشكەنجەدانی كچەكەو چاویكی دەردەهینن و هەردوو دەست و قاچی دەشكینن بەڵام كاتیك حاكمیكی سپییپیست لیكۆلینەوە لەگەڵ دەكات بەزەیی وەزعی دیتەوە پاشان هیدی هیدی ئەو بەزەییە دەبیت بە خۆشەویستی.

لیرەوە چیرۆكەكە دەست پیدەكات. نوسینی چیرۆكەكە ئەوەندە كاریگەرو هەست بزوینەرە تەنانەت له دوای خویندنەوەیشی تا ماوەیەكی زۆر كاریگەری لەسەر ناخی مرۆڤ دەمینیتەوە. رۆژیكیان بیرم له پەیوەندی مرۆڤانەی ئەو چیرۆكە دەكردەوە كە

به شیوازیکی زۆر نایاب داریژرابو کەچی بیهودە هەولدەدا ناوی کچەکەم بیربکەویتەوە. کاتیك جاریکی دی چیرۆکەکەم خویندەوە ئنجا بۆمدەرکەوت نوسەر ناوی بۆ کچەکە دانەنابو، بەلکو هەر ئەوەندە دەلیت: "زامی قاچی کچەکە خەریك بو بۆگەنی دەکرد" یا "لە ناکاو کچە چکۆلانەکە تەرمی پارچە پارچەکراوی باوکی و گریان و لاوانەوەی سەر تابوتەکەی بیردەکەوتەوە" و.. هتد. هەرگیز ناولینەنانی کچەکە سەرسامی نەکردم چونکە نکۆلی کردن لە ناسنامەی کەسەکان و ریگەنەدان بە وەرگرتنەوەی ناسنامەی خۆیان زەقترین خاسیەتی کۆلۆنیالیزمە چونکە کۆلۆنیالیستەکان کەسەکانی بندەستیان بە خاشاك و میگەلیکی بێ سیماو مرۆڤی بێ ئارەزو و بێ ئیرادە دادەنین و بە داپلۆسین و سەرکوتکردن و توندوتیژی ئیرادەیان لەناودەبەن.

Coetzee بەم چیرۆکەی دەگاتە ئاستی کەلەنوسەرەکان. نوسەر پەیوەندی روحی نیوان کۆمەلگەی کۆلۆنی و کۆمەلگەی کۆلۆنیالی بە شیوازیکی رەمەکی بۆ ناخی مرۆڤ شۆردەبیتەوە.

لیکۆلینەوە زانستیەکان لە پال بەرجەستەبونی ناسنامەی نەتەوایەتی ئەنجامیکی سیاسی گرنگ بە دەست دەهینێ. کاتیك ریکخراوە کوردستانیەکان لە هۆی دابەشکردن و چۆنیتی دابەشکردنی کوردستان تیدەگەن ئیتر چەوساندنەوەی کورد لە لایەن ولاتە کۆلۆنیالیەکان بۆ نزمترین ئاست دادەبەزیت یا ئەگەر ریکخراوە کوردستانیەکان تیگەیشتن بۆچی بەم شیوازە مامەلەو روبەروی کورد دەبنەوە ئەودەمە ئەنجامەکانی ئەو روبەروبونەوەیە بۆ نزمترین ئاست دادەبەزیت.

١٧-ئەو لیکۆلینەوانەی پەیوەندییان بە کوردستانەوە هەیە لەگەڵ ئەو لیکۆلینەوانەی پەیوەندییان بە چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردەوە هەیە دوو میتۆدی زۆر جیاوازن و نابێ تیکەل بکرین.

لە حالەتی دوەمدا، واتە لە حالەتی بەرجەستەبونی پیشنیازەکانی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد، ئایدۆلۆجیاو سیاسەت دەبیت بە بابەتی لیکۆلینەوە، ئەمەش پشت بە دەستەلاتی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو ریکخراوانەوە دەبەستیت کە ئەو چارەسەرانە

پێشنیاز دەکەن چونکە تا هێزی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەو لایەنانەی چارەسەرەکان پێشنیاز دەکەن بەهێزتر بێت چارەسەرە پێشنیازکراوەکانیش بەهێزتر دەبن.

بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە پەیامێکی زانستی هەیەو پشت بە کۆکردنەوەی زانیاری دەبەستێت بۆیە پێویستی بە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و سیاسی نیە بەڵکو تاکە کەسێك دەتوانێت ئەو لێکۆڵینەوەیە ئەنجام بدات. پێم باشە لەم بوارەدا ئەزمونێك بخەمە بەر دیدەی خوێنەران:

لە حوزەیرانی سالی ١٩٨١ لە لایەن بنکەی سەرکردایەتی پۆلیسی ئەنقەرە دەستگیر کرام، ئەو ماوەیە تیرۆری دەولەت هێندە چر بوو زیندانیەکانیشی گرتبۆوە. ماوەی سێ شەو لە بنکەی ناوبراو مامەوە. لە بەرەبەیانی شەوی سێیەمدا یەکەی تایبەتی شاری ئادا پازاری- Adapazari- داوای کردم. من و شۆفێرەکەو دوو پۆلیس و دوو فەرمانبەری مەدەنی بە سەیارەیەك دەرویشتین بۆ ئادابازاری. هەردوو پۆلیسەکە کورد بون چونکە کورد بون لە روخسارو فۆنەتیکی تورکیەکەیاندا دیاربوو، بەلکو خۆشیان وتیان خەلکی رۆژهەڵاتن. ئەو دوو پۆلیسە، یەکێکیان نزیك شۆفێرەکەو ئەوی دی لە تەنیشت منەوە دانیشت بو. ئەو پۆلیسەی لە تەنیشتی من دانیشتبوو، لە ناکاو بەبێ هیچ پێشەکیەك لێی پرسیم: باشە، ئەم مەسەلەیە چۆن چارەسەر دەکرێ؟

بەم مانایە وەڵامم دایەوە: مەبەستت لە کام مەسەلەیە؟

"ئەو مەسەلەی لە سەرت نوسیوە، واتە مەسەلەی کورد"

ئیتر تێگەیشتم پۆلیسەکە زانیاری لەسەر دۆسییەکەم هەیە.

ئۆتۆمبیلەکە لە شەویکی ئەنگوستەچاو لە ئەنقەرەوە بۆ ئاداپازار بەری کەوتبوو. شەقامەکان چۆل و هۆل بون. کەس بە گرتنەکەمی نەدەزانی. بە ترس و دلەراوکێ بیرم دەکردەوە چۆن وەڵامی پرسیاری پۆلیسەکە بدەمەوە کە جارێکی تریش دووبارەی کردەوە.

کەواتە پێم بلێ ئەم مەسەلەیە چۆن چارەسەر بکەین؟ رات لەسەر ئەم بابەتە چیە؟ وەڵامم دایەوە: "هەولمداوە لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر کۆمەلگەی کوردەواری و مەسەلەی کورد بکەم چونکە زەروری نیە لێکۆڵیار پێشنیازی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بکات".

بەڵام پۆلیسەکە سور بوو لەسەر پرسیارەکەی خۆی: لەگەڵ ئەوەشدا، پیم بڵێ چۆن ئەم مەسەلەیە چارەسەر دەکرێ و رات لەسەر ئەم مەسەلەیە چیە؟، "من لیکۆلیارم و هەولدەدەم لیکۆلینەوە لەسەر کۆمەلگەی کوردەواری بکەم و شارەزایی لەسەر هەمو لایەنەکانی مەسەلەی کورد پەیدا بکەم". پۆلیسەکە بەم وەڵامە قایل نەبو. بەلکو هەولیدەدا وەڵامیکی دیاریکراوی لەسەر پرسیارەکەی دەست بکەویت:

"زۆر باشە، گەلیك لیکۆلینەوەت کردوەو لیکۆلینەوەی تریش ئەنجام دەدەیت. هەمو شتیك فیربویت و تیگەیشتی، هەنوکە چۆن ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەین؟

بە دریژایی وەقتەکە شۆفیرو پۆلیسەکەی تەنیشتی بیدەنگ بون، کەچی پۆلیسەکەی تەنیشتم سوربو لەسەر ئەوەی وەڵامیکی دیاریکراوی لەسەر پرسیارەکەی دەست بکەویت. وەڵامم دایەوە:

"هیشتا لیکۆلینەوەکانم تەواو نەکردوەو کاتی پیویستم بۆ تەواوکردنی لیکۆلینەوەکانم نیە چونکە زۆربەی کاتەکەم لە زیندان بەسەر دەبەم".

لەگەڵ ئەوەشدا جاریکی دی پرسیارەکەی دوبارە کردەوە. ئەم پەیڤینە بۆ ماوەیەکی کورتی دی دریژەی کیشا تا لە کۆتاییدا ئەم چەند وشەیەم پیی وت: "چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد مانای پیادەکردنی چالاکی سیاسی دەگەیەنێ، ئەم چالاکییەش ئەرکی پارت و ریکخراوە سیاسیەکانە کە تا رادەیەکی زۆر پشت بە هیزی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو پارت و ریکخراوە سیاسیانە دەبەستیت. ئەو ریکخراوانە دەتوانن سنوریك بۆ قەدەغەکردنی زمان و کولتوری کوردی دابنین و داوای ئازادی نوسین و قسەکردن بە زمانی کوردی بکەن و داوابکەن رۆژنامەی کوردی دەربکرێ و رادیۆو تەلەفزیۆنی کوردی دامەزریت و خویندنگە بۆ فیرکردنی زمانی کوردی دروست بکرێ بە بۆچونی من رەنگە ئەمە چارەسەری کیشەکە بکات. لە لایەکی دی خەلکانیك هەیە لەوەش زیاتر داوا دەکەن. داوادەکەن کورد خۆی ناوچە کوردنشینەکان بەریوەبەریت. لەوانەیە لایەنیك ئەم پیشنیازانە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد پیشکەش بکات. کۆمەلیکی دی دەلیت، بۆچی لەگەڵ تورك بژین؟ ئیمەش حەزدەکەین دەولەتی خۆمان هەبێ و خەبات بۆ هینانەدی ئەو ئامانجە دەکەن. گروپیکی دی

بەمشیوەیە هەلویستی خۆی دەردەبرێ: بۆچی کورد لە نیوان ئیران و عـراق و سـوریاو توركیا دابەش كراوە؟ ئیمەش دەولەتیکی سەربەخۆ و دیموكرات دروسـت دەكـەین. ئـەو پیشنیازانە بە مەبەستی چارەسەركردنی مەسەلەی كورد دەخرینە روو بەلاّم جیبەجێ كردنی ئەو پیشنیازانە تا رادەیەكی زۆر پشت بـە هـیزی سیاسـی و كۆمەلاّیـەتی خـاوەن پیشـنیازەكان دەبەسـتیت. چونكـە تـا بـەهیز بـین ئـەو پرۆژانـەی پیشـكەش دەكـەین بەهیزتر دەبیت. لە بارەی ئـەم مەسـەلەیە مـن شـتیكی زۆرم پـێ نیـە، ئەمـە سـەرەرای ئەوەی زانیاری تەواوم لەسـەر هـیزی ئـەو گـروپ و ریكخراوانـە نیـە. ئەگـەر رەئـی مـن وەربگـرن ئـەوا دەلیـم: ئـەمرۆ لـە جیـهان ١٦٦ دەولـەت هەیــە بـا كوردســتانیش ببیتــە دەولەتی ١٦٧، خۆ بومەلـەرزە رونـادات ئەگـەر كوردسـتان ببیتـە دەولـەتی ١٦٧ی جیـهان. ئەمەش ئارەزوی منـە بـەلاّم چارەسـەر كردنـی كیشـە سیاسـیەكان بـە ئـاوات و ئـارەزوی كەسیتی نایەتەدی. ئەمرۆ زۆر ولاّت سود لە كوردستان وەردەگریت بۆ ئەم پیشكەوتن و پیشــنیازانە ئــەو دەولەتانــەی كوردســتان وەك كۆلۆنیــەكی هاوبــەش دەچەوســیننەوە نارەحـەت دەكـەن و بـە هـەمو شـیوازیك هــەولدەدەن ریگـە لـەو روداوە بگـرن، ئەمــە سەرەرای ئەوەی لیكۆلینەوە لەسەر ئارەزوی شەخسی ئەنجام نـادرێ. ئیمـە ناچـارین لـە ریگەی دیاریكردنی فاكتە فیعلیەكانەوە لە كیشـەكان تیبگـەین بـەبێ ئـەوەی پـەیوەندی نیوان ئەو فاكتانە پشتگوێ بخەین".

لـە دوای ئـەم رسـتانە گفتوگۆكـەش كۆتـایی هـات و تـا گەیشـتینە ئاداپـازاری كــەس ورتــەی نــەكرد. پۆلیســەكان بــە دریژایــی ریگەكـە بـەبی تورەبـون و قسـەپێ بریــن گوییان لی دەگرتم.

# گەشتی ژیانی ئیسماعیل بیشکچی

ئیسماعیل بیشکچی سالی ١٩٣٩ لە ئسکلیپ- Isklip لە نزیك پاریزگای چوروم- Corum-ی تورکیا لە دایك بوەو هەر لەوێ خویندنی سەرەتایی و ئامادەیی تەواوکردوە. لە زانکۆی ئەنقەرە بروانامەی لیسانسی لە زانستە سیاسییەکان بەدەست هیناوەو سالی ١٩٦٧ لە زانکۆی ئەتاتورك لە ئەرزروم پلەی دکتۆرای لە زانستی کۆمەلایەتی بەدەست هیناوە. بیشکچی لە کاتی خزمەتی سەربازی لە ناوچەی بەدلیس و هەکاری لە سالانی ١٩٦٢-١٩٦٤ بە میللەتی کورد ئاشنا بووە.

بیشکچی دەلیت:

کاتیك بە مەبەستی خزمەتی سەربازی گەیشتمە باشوری رۆژهەلاتی تورکیا بە چاوی خۆم میللەتیکم بینی زمان و میژو و دابونەریتی لە ئیمەی تورك جیاواز بو. ئەم میللەتە بە خۆی نالیت: تورکی شاخاوی، هەروەك ئیمەی تورك پییان دەلیین، بەلکو بە خۆیان دەلین: کورد.

لەوکاتەوە بیشکچی هەولە فیکری و چالاکییە زانستییەکانی بۆ لیکۆلینەوەی بارودۆخ و میژوی کورد و بەرگریکردن لە مافە نەتەوایەتی و دیموکراتی و تایبەتمەندە شارستانیەکانی میللەتی کورد تەرخانکردوەو هەولدەدا روناکبیرانی تورك لەو راستیە تیبگەیەنێ کە زۆربەیان نکولی لیدەکەن و دەولەتی تورکیاش ماوەی حەفتا سال زیاترە بە ئاگرو ئاسن روبەروی دەبیتەوە.

بیشکچی پەیامی خۆی لە (٣١) لیکۆلینەوەو تویژینەوە بلاوکردۆتەوە، بۆ نمونە:

-"ریکخستنی کۆمەلایەتی یەکیك لە خیلە کۆچەرەکانی کورد کە زستانان لە ناوچەی سیلڤان باروبنە دەخەن و هاوینانیش دەچنە سەرچیاکانی نەمرود و سۆڤان" _نامەی دکتوراە، ١٩٦٧).

-"ئەو گۆرانکارییە کۆمەلایەتیانەی لە رۆژهەلاتی ئەنادۆل بەسەر خیلە کۆچەرەکانی کورد هاتوە".

-"شیکردنەوەی خۆپیشاندانەکانی رۆژهەلات"، ١٩٦٨.

-"گۆرانکارییەکانی رۆژهەلات و کیشەکانی بونیاد" (خیلی کۆچەری عەلیخان)، ١٩٦٩.

-"سیستمی کۆمەلایەتی لە رۆژهەلاتی ئەنادۆل"، ١٩٦٩.

-"بنەما کۆمەلایەتی و ئابورییەکانی گروپە ئەتنیەکان"، ١٩٦٩.

-"پیادەکردنی میتۆدی زانستی لە تورکیا- یەکەم، راگواستنی کورد"، ئەم کتیبە دەستی بە سەرا گیراو نوسەرەکەیشی درایە دادگا، ١٩٧٧.

-پیادەکردنی میتۆدی زانستی لە تورکیا- دوەم: تیزی تورك بۆ میژو، تیۆری زمانی خۆر. ئەم کتیبە دەستی بەسەرا گیراو نوسەرەکەیشی درایە دادگا.

-پیادەکردنی میتۆدی زانستی لە تورکیا- سییەم: پەیرەوی ناوخۆی پارتی گەلی کۆماری (١٩٢٧)، کتیبیکە لەسەر مەسەلەی کورد، بە هۆی ئەم کتیبەوە بە تاوانی بریندار کردنی هەستی نەتەوایەتی بە سێ سال زیندانی حوکم درا، ١٩٧٨.

-کوردستان کۆلۆنییەکی نیودەولەتییە". ئەم کتیبە دەستی بە سەرا گیراو نوسەرەکەیشی زیندانی کرا، پاشان بە شیوەیەکی کاتی ئازاد کرا.

-"زانست و ئایدولۆجیای رەسمی دەولەت: دیموکراسی و مەسەلەی کورد".

-"روناکبیریك و ریکخراویك و مەسەلەی کورد" ئەستەنبول، ١٩٩٠.

بیشکچی بەم تویژینەوەو لیکۆلینەوانەی بوە دیرینترین زیندانی سیاسی دەولەتی عەلمانی و دیموکراسی تورکیا چونکە بە پیشیلکاری کەرامەت و شەرەفی دەولەت تاوانبار کراوە لەبەرئەوەی تورکیا لیکۆلینەوە لەسەر مەسەلەی کورد بە یەکیك لە قەدەغەکراوەکان دادەنێ و نابیت کەس قسەی لەسەر بکات. بەلام بیشکچی دەلیت: "من لە پیناوی رزگارکردنی شەرەفی تورك خەباتیکی ئاشتیخوازانە دەکەم تا بوار بە گفتوگۆی زانستی بدرێ چونکە گفتوگۆی زانستی قەدەغەکردن و سانسۆر رەتدەکاتەوەو پشت بە ئازادی رادەربرین و ریزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ دەبەستیت.

بیشکچی لە سالی ١٩٧١ بە دواوە ریگەی دادگا مەدەنی و سەربازییەکانی بەرنەداوەو تا ئیستاش بە دوو سەدەو نیو حوکمدراوە کە (١٥) سال و نیوی لە زیندان بەسەر بردوە.

بيشكچي جيگەيەكی شايستەی لەنيو روناكبيرانی تورك و خۆشەويستيەكی زۆری لە لای ميللـەتی كـورد و ريزيكـی بيپايـــانی لـــەنيو روناكبـــيرانی ميللـــەتانی هەريمـــەو ناوبـانگيكی جيـهانی هەيـە. زۆريـك لـە روناكبـيرو سياســەتمەدارانی ئوروپــاو ئــەمريكا چەنـدين جار بەرگرييان ليی كردوەو داوای بەردانيان كـردوەو سـالانەش لـە پايتـەختی ولاتە ئوروپاييەكان كۆرو كۆبونەوە بۆ ليكۆلينەوەی بيروراو تيۆرييەكانی ساز دەكریَ.

تـا ئيسـتا ژمارەيـەك ريكخـراوی نـاحكومی خـەلاتی زانسـتی و ئـەدەبييان پيشـكەش كردوە بەلام تەنها خەلاتی يەكيتی نوسەرانی نـەرويجی وەرگرتـوە لەبەرئـەوەی ولاتـانی ئەسـكەندەناڤيا چـەك بـە توركيـا نافرۆشـن. بيشـكچی بـەم وتانـەی خەلاتـەكانی دی رەتدەكاتەوە: من دووروويی ئەو دەولەتانە رەتدەكەمەوە كە چەك و پـارە بـە دەولـەتيك دەدەن بەرپرسـيارە لـە ويرانكردنـی قـەوارەی كوردسـتان و لـەناوبردنی ميللـەتی كـورد، هـەروەها خـــەلاتی ئـــەو ريكخـــراوە ناحكوميانـــەش رەتدەكەمـــەوە كـــە دەيانـــەويت بـــە خـەلاتكردنی قوربانيـەكانی سياسـەتی دزيـوی دەولـــەتی توركيـا تاوانـــەكانی سەرشـــانی خۆيان بسرنەوە.

# سەرچاوەکان

-VAN ROOY, TAMBOER, Kees; Kurdish Bibliography No 1, Amesterdam, Internation Society Kurdistan, 1968. 2 Vol.

-MINORSKI, Vladimir: Encyclopedie de I, Islam O

-NIKITINE, Basile: Les Kurdes. Etude Sociologigue et historique. ethistorique Paris, Editions d’aujourd’hui, 1965.

-BRUINESSEN, Maarten Martinus van: Aqha and Sheikh and State. On the Social and political orynis ation of Kurdistan, 1978.

-BARB, Heinrich Alfred: Geschichte von funf Kurden Dynastien, Wien, 1958.

-CHERIF PASHO, General: Memorandum sur les revendications du peuple Kurde (Presente a la Coference de pix de paris, 1919.

-BEDIR KHAN/ EMIR SOUREYA AUIH. GIBBONS: the case ot Kurdistan against Turkey. Phildelphia, 1928.

-OLSEN, Robert: the emeryence of Kurdish Nationalism, and the sheikh said Rebellion, 1880- 1925. Texas, University of Texas, 1989,

-ZAZA, Noureddine: Me vie de Kurde ou lecri du Peuple Kurde, laus anre, Pierre- Marcel Favre, 1982.

-EAGLETON, william Jr: The Kurdish Republic of 1946. London. Oxford University press, 1963.

-VANLY, Ismet Cherif: Le Kurdistan irakien, entite nationale- Etude de lavevolution de 1961- Neuchate, la Baconniere, 1970.

-BOIS, Pere thomas (Lucien Rambout): Connaissance des Kures. Beyrouth, Khayats. 1965.

-Chaliand, Gerard (ed), KENDAL, A.R. GHAS,SEMLOU, A. ROOSEVELT Jr, I. S. VANLY, M. NAZDAR: LES Kurdes et le Kurdistan. La question nationale au

proche- Orient Preface de Maxime R,dinson. Paris, Francois Maspero (petite Collection Maspero). 1978.

-ROTH, Juryen (ed.), I BESIKGI, A. R- GHASSEMLOU, H. RESO,K. YASAR: Geoyraphie der Unterdruckten, Die Kurden Hambury. Rowohlt (rororo-Taschenbuch 7125), 1978.

-KUTSCHERA, Chris: le mouvement national Kurde- Paris, Flammarion, 1979.

-DESCHNER, Gunter: Saladins Sohne, Munchen, Droener Knaur, 1983.

-MORE, Christiane: les Kurde saujourd, hui, Mouvement national et partis politiques. Preface de Maxime Rodinson- Paris, L'Harmattan, 1984.

-MARTORELL, Manuel: los Kurdos: historia de una resis tencia. Madrid, Espasa- Calpe, 1991.

**بەشی یەکەم:**

١٢-دروشمەکانی کەمالیزم.

١٣-مافەکانی مرۆڤ و کورد.

١٤-دوو هەلویستی لە راڤەکردنی پرەنسیپی "یەکسانی"دا.

١٥-دروشمی "یەکیتی و هاوکاریکردن".

١٦-مەسەلەی ناسنامە لەلای "روناکبیرانی کورد".

١٧-نەتەوە یەکگرتوەکان و کورد.

١٨-کوردستانی ئەمرۆ، کوردستانی جاران نیە.

١٩-مەسەلەی کورد و پرۆژەی باشوری رۆژهەلاتی ئەنادۆل (GAP).

٢٠-تیرۆری دەولەت لە کوردستاندا.

٢١-بنەما مادی و مەعنەوییەکانی زەبروزەنگی گەریلا.

٢٢-کاریگەرە نیگەتیڤەکانی ئایدۆلۆجیای رەسمی.

٢٣-ئەنجامە هەست پیکراوەکانی زەبروزەنگی گەریلا.

٢٤-ریو شوینەکانی کۆلۆنیالیزم و روناکبیرانی تورك.

٢٥-گرنگی لیکۆلینەوەی زانستی.

**بەشی دووەم:**

١-تیروانینیك لەسەر "چینە بالادەستەکانی کورد".

٢-کورد و ریو شوینی سەرکوتکەرانەی دەولەت.

٣-گۆرانکارییەکانی بونیادی چینە کۆمەلایەتییەکانی کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

٤-شیخ خزمەتی ئایدۆلۆجیای رەسمی دەکات.

٥-"دادگاییەکانی رۆژهەلات" لە ١٩٧١.

٦-کودەتا سەربازییەکان دوو بواری گرنگ بۆ کارکردن هەلدەبژیرن.

٧-بەکارهینانی ئایدۆلۆجیای ئیسلامی لە دژی مەسەلەی کورد.

٨-گرنگی تەبایی تورك- ئیسلام و مەسەلەی کورد.

٩-بناغە کلاسیکیەکانی بیرۆکەی نیشتمانپەروەری: لەناوبردنی و ئەنجامەکانی.

**تيبينـــی: بـەريز ( ريبـوار رەشـيد ) بەشـيكی لـە كتيبـــی " كوردســـتان كۆلۆنييەكی نيو دەولەتی" وەرگيراوەتە سەر زمانی كوردی.**